زەینەب سالبی و لاوری بێکلوند



# لەنێوان دوو جیهاندا






وەرگێڕانی

هێمن تاهیر
دڵشاد محەمەد
عەدنان ئیبراهیم



حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان

xanecontact@yahoo.com

- ناوی کتێب: لەنێوان دوو جیهاندا
- نووسەر: زەینەب سالبی و لاوری بێکلوند
- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: هێمن تاهیر- دلشاد محەممەد- عەدنان ئیبراهیم
- بابەت: سیاسی
- پێتچنین: سەنتەری نیشتمانی بۆ لێکۆڵینەوەی جێندەر
- هەڵەبڕی: محەممەد سالح
- دیزاینی ناوەرۆک: زانا کەمال
- بەرگ: ئارام عەلی
- تیراژ: ٥٠٠
- زنجیرە: ٤٢٨
- چاپخانە: شڤان
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی ڕۆتین: ٣٢٠/٩- س ٢٧٢
- ژمارەی سپاردن: (١٨٧١) ساڵی (٢٠١٣) لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی پێ دراوە

# سوپاس و پێزانین

سوپاسی تایبەت بۆ ئەو گروپەی وەرگێڕان کە ماندوو نەناسانە کاریان بۆ وەرگێڕانی کتێبەکە کرد لەگەڵ ئەوەی دەیانزانی ناویان لەم بەشەدا دەنووسرێت کە ئەوانیش هەریەك لە بەڕێزان

- هێمن تاهیر
- دڵشاد محەمەد
- عەدنان ئیبراهیم

# ناوەرۆک

# پێشەکی چاپی کوردی

بەدەوری هەر دیکتاتۆرێکدا پەرژینێك چنراوە لە مرۆڤی بەردەستو کۆیلەو کاڵفام کە دواجار دەبنە شوراو لەمپەر لەبەردەم بینینی راستەوخۆی هەم دیکتاتۆر بۆ کۆمەڵگە هەم کۆمەڵگە بۆ ئەو دادەنێت. لە وەها ژینگەیەکدا مرۆڤەکان هەمیشە ئەکتەرنو رۆڵی جیاواز لەوەی کە خۆیان کێن وازیدەکەن، فەرمان جێبەجێدەکەنو ناپرسنەوە، لە بۆتەقەی ترسدا دەژین، بیرناکەنەوە چی دەکەن بەڵکو تەنها رادەپەڕێنن، بەو مانایەی متمانەی سەد لە سەدیان بە سەرکردەکانیان هەیەو خاترجەمن. شیرازەی کۆمەڵگە لەبن دەستو هەوەسی دەستەو تاقمی سوودوەرگری ئەو دۆخەدایەو پیشەسازی جەماوەری ملکەچو گوێڕایەڵو یەکبڕواو یەکچارەنووس دەبێت بە بەشێك لە ستراتیژی ئەم کۆمەڵەیە. دنیای چارەکی کۆتایی سەدەی رابردووی عێراق شانۆی نمایشی یەکێك لە دیکتاتۆرەکانی مێژووە، کە کۆمەڵگەی بەئاقاری خوێنو کوشتنو جەنگی یەك لەدوای یەكو ئابلۆقەو تاڵی ژیاندا ئاڕاستەکردووەو هەڵکێشانی رەگوریشەی ئەو سیستمەش زیاد لە زەمەنی ژیانی خۆی دەوێت.

کتێبی لەنێوان دوو جیهاندا، گوزارشتە لە ژیانی بەرزەخی نابەین بژاردەی کاربەدەستانی چینی دەسەڵاتو هاوڵاتیانی سادەو سڤیلدا، باسە لە وەهمو ترسی تاقمو دارودەستەی نزیكو دەوری دیکتاتۆر (سەدام) خۆی، شەنوکەوی ترسە لەتەنیشت نیهادی ترسەوە، گێڕانەوەی راشکاوانەی ژیانە بەشێوەی نمایشیو بەویستی دیکتاتۆر، زیندەگییە لە کەشی ترسدا بەخەندەی دەستکردو درۆینەی تۆپزییەوە. پاشان هەڵوەستەو رامانە لەو ژیانە، هەنگاو بزاوتنە بۆ هەڵهاتن لەو قەفەسە، ئازادبوونە بەمۆتەکەی ئەو ترسەوە، گەڕانە بەدوای شوناسێکی مرۆڤانەدا، دواجار خۆدۆزینەوەو سەرکۆنەی ئەو دنیا سەپێنراوەیەو هەڵکشانە بەرەو شکانی گشت دابو نەریتەکان. هاتنەگۆیە بۆ وتنی راستییەکانی ژیانو هەڵماڵینی پەردەیە لەسەر گشت خەمە کوژراوو نێژراوەکان. مەنیفێستی ژنێکی ئازاو بەئەمەکە لەئاست پەیمان، خەباتی خانمێکە بۆ هاریکاری ژنانی لاقەکراوو ئەتکراوی پاش جەنگو خەراباتی ژیان.

ناونیشانی کتێبەکە بۆخۆی ئاماژەیە بۆ ئەو دنیایەی دەبوو بژین و ئەژیان لەگەڵ ئەو دنیایەی بە تۆپزی گوزەراندیان، هێمایە بەوەی کە لەناو هاووڵاتیانی سیڤیل وەك تاقمو چینی دەستەڵات هەژماردەکران و لەویش وەك بەشێك لە ئادەمیزادی ئاسایی چاولێدەکران. بەدیوێکیشدا ئەشێت گوزارشت بێت لەو دنیای خەون بوو و دوور، لەگەڵ ئەو مۆتەکەیەی نزیك بوو و لەهەر ساتێکدا ئامێزانی بوون، باسبێت لە ژیانی کۆیلەیی و گوێڕایەڵی رەها لەگەڵ راچەنین و هەڵپە بەرەو ئازادی دیسانەوە رەها. وەرچەرخانێك لە ژیانی ئەم نووسەرەدا روودەدات کە "دەشێت بەشی یەکەمی ژیانی بخوێنیتەوەو پێنەزانیت نیوەی دووەمی زیندەگی هەمان مرۆڤ گوزەراندوویەتی"، چوون ئەو دوو جیهانە هێند لێکجودان باریکترین دەزووی پەیوەندی پێکیانەوە گرێنادات. دنیایەکیان ژیانە بە ستەمگەری ئەویان تێکۆشانە بۆ وەدەستخستنەوەی ماف، یەکەمیان سوککردنی مرۆڤەو ئەویان گەڕانەوەی شکۆی لەدەستچووە بۆی، ئەمیان توانەوەیە لەترسداو ئەویان رەوانەوەی ترس و شادبوونە بە ئارامی و نومێد، لەیەکەمدا مرۆڤ لە زێدی هەڵدێ و نیشتمانی جێدێڵێ لە عەودالی بۆ ئازادی، دووەمیان مرۆڤ تێیدا ئاشتدەبێتەوە بەخاك و دێتەوە باوەشی ئازادی.

"زەینەب سالبی" نووسەری ئەم کتێبە، ئێستا دەنگێکی دیارە لە کایەی بەتەنگەوەهاتنی ژنان و داکۆکی لە هەق و مافەکانیان، نووسینی ئەم کتێبە بەدیوێکدا سەداهەڵبڕینە لەئاست گشت ئەو جەورو ستەمانەی بەسەر ئەم گۆی زەوییەوە دەرهەق بەژنان پیادە کراوەو دەکرێت و جیهان بێدەنگە لەپایاندا، لەولاشەوە خاڵیکردنەوەی دەرونیەتی لە مۆتەکەو ئەو ترسەی لە منالییەوە تێدا چێبووەو ئاوەڵاکردنی خۆیەتی بۆ ژیان ئەمجارە بەرەو ئاسۆی خەونەکانی. ناوبراو لەنوسینەکانیدا هەوڵیداوە دان لەو راستیانە بنێت کە بڤەن بۆ کۆمەڵگایەکی سوننەتی لەمەڕ خۆمان، روناکی خستۆتە سەر گشت ئەو تاڵی و چەرمەسەری و ئەهامەتی و سوکایەتیانەی کە ژنان پێیانەوە بەپەنهانی ژیاون لەسایەی دیکتاتۆرێکدا، ئەکا بێت و دووچاری کوشتن یان ئابڕوچوونی خانەوادەیی ببنەوە، پەلی کێشاوە بۆ باسی وردودرشتی ریشەکانی ترس لە ژیانی کۆمەڵایەتی منداڵ و جەوان و تەواوی ئەندامانی کۆمەڵگادا بێ جیاکاری. پەنجەی خستۆتە سەر

هەژمونی باڵکێشاوی ترس بەسەر گشت کوچەو شەقام‌و بیناو دامودەزگاکانی حکومەتەوە، باسی پەتی باریکی پەیوەندی دەکات لەگەڵ ویدا، هاوکات چەمکی هاوڕێیەتی لە فەرهەنگی ویدا، گوایە بۆشایی نێوان دۆست تا ببێتە دوژمن یەک هەنگاوە، یەک سەرپێچییە، یەک بەڵی نەگوتنەو هتد.

خاڵێکی ناوازەو دانسقەی بەهێزی ئەم کتێبە ئەوەیە، خاتوو سالبی لە کۆتایی هەموو بەشێکەوە هەندێك لە یادەوەرییە نووسراوەکانی بەخامەی دایکی گواستۆتەوە، کە بۆخۆی دەرگیری گەلێك لە سوچ‌و کەلەبەرو کارە ژێربەژێرەکانی سەدام بووەو لەنزیکەوە لەگەڵی ژیاوە. ئەم کورتەنووسینانە سروشبەخشن‌و زیندوێتی ئەو ساتانەیان پاراستووە کە خانەوادەی خاتوو سالبی سەرەتا ئاشنایەتییان لەتەك سەدام‌و رەوتی گەشەی پەیوەندییانی بەرەو چڕتربوون تێدا بەرقەرار بووە.

رەهەندێکی جەوهەری ئەم پەرتوکە بیستنی ئازارەکانی قوربانییە بەخامەی قوربانی خۆی، نزیکی ئەوە لە ژنانی ئێمەوە، ئەوی لێرەو لەم هەرێمە ژنان لەدووری سەدام بەناوی بەعسەوە چێشتییان، ئەو لەنزیکییەوە ئەزموونی کرد، لەکورتیدا مەبەستمە بڵێم زمانی باسکردنی لە ژان زوو دەگاتە خوێنەر، دواجار هەم ئەو هەم گشت ژنانی ئەم وڵاتە دوو دیوی یەك ئازارن. خاتوو سالبی لێرەدا نموونەیەکی زیندووی ژنی بەهێز، بە بەخت‌و هەم بەدبەخت، کۆڵنەدەرو پشوودرێژ، داکۆکیکارو باسکار بەرجەستە دەکاتەوە. بەهێزەو نەپساوە لەژێر ستەمی سەدامدا، بەبەختەو راپسکاوە لەو بەدبەختییەی ژیان لە تافی جەهێڵی‌و سەروبەندی هاوسەرگیریدا بەرۆکی پێگرت‌و چەند هەنگاوی چاپوکی هەڵگرتووە، لەسەرەتای هۆشیاربوونەوەیەوە تێکۆشاوەو دواجار رێکخراوی نێونەتەوەیی "ژنان لەپێناو ژنان"ی دامەزراندووە، لەسەر مافی زەوتی ژنان هاتۆتە دەنگ‌و چ مەیدانی چ بە نووسین بەرگری لێکردوون.

پاڵنەری وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ سەر زمانی کوردی لەلایەك ئاشنابوونە بەو پریشکانەی لەنزیکی دیکتاتۆرەوە مرۆڤیان هەراسان‌و دووچاری نەخۆشی‌و تێکشکان‌و خەمۆکی کردووە، خستنە بەربینایی ئەو نهێنییانەیە لەچوارچێوەو سنورێکی زۆر بچووکدا زانرابوون. بینینەوەی ئەو دیوەی ژیانە، ژنانی کورد

نەشێت بەجۆرێك پێیدا گوزەریان کردبێت، بەجۆرێك واهەستدەکەم دەشێت خوێنەر هەبێت لە زۆر شوێندا هەستبکات ژیانی خۆی بۆ دەگێڕنەوە. دواجار تێگەشتنە لەو سیاسەتەی بواری رەخساند رژێمێکی وەها ستەمگەر ئەوەندە درێژ بتوانێت بژی. رۆچوونە لەناو ئەو سیستەمو ژینگەو زەمینەیەی وەها دیکتاتۆرێکی دروستکرد، تا ئێمە ئەو زەمینەیە نەناسین دووبارە نەکردنەوەی ئەو هەڵانەی مێژوو بە سەدەو نیوسەدە وەپاش دەخەن هەمیشە وەك نەگەرێکی کراوە دەمێنن. لەپاڵ هەموو ئەمانەشەوە پێویستە بڵێین کۆمەڵگەکانی رۆژهەڵاتی ناوێن کەمیان هەیە لە کەسانی بوێری بەدەنگی وەك سالبی، بۆیە لەم مەیدانەدا دەشێت وەك سەرمەشق پەنجەی ئاماژە بۆ ئەم خانمە درێژبکرێت.

*هێمن تاهیر*

*لەبری سەنتەری نیشتیمانی بۆ لێکۆڵینەوەی جێندەر*

*سلێمانی ٢٠١٣*

# سەرەتا

لە بالکۆنی ماڵە کۆنەکەماندا، کە حەوشەکەی بەسەر رووباری دیجلەدا دەڕوانێ وەستاوم، لەم شوێنەدا دایکم منداڵیی خۆیی بەسەربردووە. تەماشای ئەو نەورەسانە دەکەم کە دەفڕن‌و سێبەریان بەسەر ئاوی لێڵی رووبارەکەوە شوێن دادەنێت. گوێبیستی دەنگی بڵندی ئەو بانگەم لە مزگەوتێکی نزیک مەزاری دێرینی ئلیاوە دێت‌و بیر لە دەنگی ناسکی دورگەی بەراز[1] دەکەمەوە. لەتەنیشت رووبارەکەوەو نزیک بەو شوێنەی کە بەلەمەوانەکان سەرلەنوێ لەنگەری تێدا دەگرنەوە، یەکێك لە دێرینترین زانکۆکانی جیهان هەڵکەوتووە. لە خوارەوەی رووبارەکەشدا دوکەڵێکی باریك بەرزدەبێتەوەو بەسەر پەیکەرێکی تەواونەکراوی "عەمو"دا بڵاودەبێتەوە. ئەبێت چەند شار لەم سەر زەمینە ئەوەندە دێرین بن‌و کەچی هێشتاش دروست نەبووبن؟

بەردەوام دەگەڕامەوە بۆ هۆنراوەیەکی رۆمی، کە لەبارەی سێ ماسییەوەیە.

یەکەم ماسی ژیر بووە، کاتێك راوچی‌و تۆڕەکانیانی دیوە، وتویەتی"من دەڕۆم". شوێنپێی هەڵگرتووەو رۆیشتووە، تا سەرەنجام گەیاندویانەتە قوڵایی دەریای بێ کەنارو سەلامەت. ماسی دووەم نەختێك ژیر بووە، وتویەتی"رێبەرەکەم رۆشتووە، من پێویستبوو لەگەڵ ئەودا بڕۆم بەڵام نەڕۆشتم، ئێستا چیتر هەلی دەربازبووم لەدەسچووە". بۆیە خۆی کردووە بەمردوو سکی خۆی سەرناوخستووە بۆ ئەوەی نەیخۆن. سێیەم ماسیش گەمژە بووەو یاری بەتۆڕەکە کردووە، کاتێکیش بەخۆی زانیوە کەوتۆتە ناو تۆڕەکەوە. ئەوکاتەی لەناو تاوەکەشدا خۆی بینیبوویەوە خەیاڵی کردووە "ئەگەر قوتارم بێت، هەرگیز جارێکی تر لە سنووری دەریاچە بچوکەکاندا خۆ قەتیس ناکەم. ئەمجارە ئیدی ئەچمە زەریا! لەوێش بێسنووری دەکەمە لانەی خۆم".

---

[1]. دورگەیەکە لەناو رووباری دیجلەدا کە بە"دورگەی ئوم خەنازیر" ناسراوە بەهۆی بوونی بەراز تێیدا. (وەرگێڕ)

لە شوێنی وەستانمەوە جگە لەو حاجییە پیرە ریشنانەی کە لەسەر دیواری ناوەکەو لەخواری منەوە یاری تاولەیان دەکرد، هەندێ ڕوخساری ترم بەدینەکەم. روونتر بڵێم، ئەوانە هەندێك سیمای ترن لە زیهنمدا، روخساری دایك و باوکم و هاوڕێکانمانن کە عەمو خێزانەکانیانی وەك فستەق شکاندو وردوخاش کرد. ئێمە هەموو رووبەڕووی هەڵبژاردنێکی نابەجێ بووینەوە: ئەویش یان وڵات یان داهاتوو بوو. بەڵام عەمو فەرمانیدەدا کام ماسییانە لەدەریاچەکانیدا مەلە بکەن و دیجلەی دێرینی کەمکردبوویەوە بۆ چەند چۆمێك. لێرەدا پرسیار ئەوەبوو کەی کاتی هەڵبژاردنی ئێمە دێت؟ بەغدا مایسی ٢٠٠٣

# سکەی عەباسی

دایکم لەماڵێکدا بەسەر رووباری دیجلەوە کە ئەشێت ئەوکات مەزن بووبێت، گەورەبووە، خانووەکە شانزە ژووری هەبووە لەگەڵ حەوشی خۆیدا. ئەم خانووە موڵکی باپیرمە، هەڵبەت بەرلەوەی من لەدایك بم کۆچی دوایی کرد. دایکم لە باوکییەوە سامانێکی ئابڕومەندانەی بەمیراتی بۆ مایەوەو پێکهاتبوو لە پشکێك لە خانووەکەو کارگەکانی باپیرم و بڕێك زێڕو هاوکات نازناوی بنەماڵەکەش کە هێشتا ناوبانگی هەیە، بەڵام تاکە شتی ماددی ئەو پیاوە بەڕاستی بۆ من جێی بایەخ بووبێت دراوێکی زێڕی عەباسی بوو و هەزار ساڵ پێش ئێستا لەلایەن ئەو خەلیفە عەباسییانەوە دروستکرابوو، کە ناوەندی سیاسی و کلتوری ئیمپراتۆرییەتی ئیسلامییان لە دیمەشقەوە بۆ بەغدا رکێفدەکرد. بەغدا سوکوسانا نهێنییەکانی دەدا بەدەستی ئەو کەسانەوە کە خەریکی هەڵکەندنن، لەو میانەشدا هاوڕێیەکی باپیرم جانتایەك دراوی کانزایی لە کاتی روخاندنی بینایەکی کۆندا دۆزیبووەوە، سێ دانە دراوی لێدابوو بەباپیرم، ئەمیش لای خۆیەوە یەکی دانەیەکی بەهەریەکە لە سێ کچە لاوەکەی بەخشیبوو. دایکیشم کە بچووکترینیان بوو، چوارچێوەیەکی بۆسازکردبوو پاشان زنجیرێکی بچووکی پێوەئاڵاندو هەمیشە لە ملی دەکرد. قوپاوییەك لە ڕۆخێکییەوە هەبوو ئێستاش لەبەرچاومە، چونکە زۆرجار لام پرسیاربووز ئەشێ چ کەوتنە خوارەوەیەك مەڵامەتی ئەم لەکەیە بێت.

سەروەختی منداڵیم دایکم مامۆستایی دەکرد، کاتێکیش لە خوێندگە دەگەڕایەوە لەماڵەوە بەسەر قەنەفەکەوە سەرخەوێکی دەشکاند. ئەو بەهرەیەکی هەبوو، دەیتوانی بەخێرایی خەوی لێبکەوێت، وەختێکیش دەنووست ئارام دەبووەوە. منیش خۆم ئەخزاندە ئەنیشتییەوەو بۆنی خۆشی ئەو پۆلەم لێهەڵئەمژی کە لەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵ دەیهێنایەوە، هاوکات هەوڵمدەدا هەناسەکانم بەتەواوی لەگەڵ ئەفەسی ئەودا یەکخەم. دراوە عەباسییەکەش بەتەواوی دەکەوتە نێوان هەردوو مەمکییەوە. بیرمدێت ئەو سکە کۆنە بەسەر سنگییەوە هاودەم بە هەناسەکانی بەرزئەبووەوە و نزمئەبووەوە، هێماکانی سەر دراوەکەش

بەڕوونی لەبەر ڕوناکی دوانیوەڕواندا دەدرەوشانەوە. بەهیواوە خۆم دڵنیادەکردەوە، کاتێك گەورەبووم ئەم دراوە لەمل دەکەمو وەك ئەو وریاو جوانو سەرەنجڕاکێش دەبم، ئەو نومێدەشم لەخۆما ئەچاند کە عێراق هەردەم ماڵو وڵاتم دەبێت.

هەرچەندە وێناکردنی سەختە، بەڵام ڕوودانی هەموو ئەوانەو گەورەبوونم لە بەغدا ڕەنگە هاوشێوەی گەورەبوون لە ١٩٧٠کانی دەڤەرێکی ئەمەریکا نەبووبێت. من کاتێکی زۆرم بە سوڕانەوەوە لەگەڵ دایکم بەسەردەبرد، ئەرکەکانیم جێبەجێ دەکردو بازاڕمان دەکرد، هاتوچۆی خوێندنگەمان دەکرد، دەچومە وانەی پیانۆو سەمای باڵێتو فێربوونی مەلەوانی، یاخود هەروا هاوەڵی دەبووم. ئەو زەمانە دایکم ڕۆژانە بەردەوام سەرقاڵبوو، منیش ئیدی ڕاهاتبووم لەئۆتۆمبێلەکەدا کاتەکانمی لەگەڵدا بەسەرببەرم. دایکم بەغدای خۆشدەویست—بۆخۆی بەغدایی بوو—کاتێکیش بە ئۆتۆمبێل بەو شەقامە فراوانانەدا هاتوچۆمان دەکرد کە بەدارخورمای بەرگرتوو ڕازێنرابوونەوە، دەکەوتە باسی ئەو ناوچانەی گوزەرمان پێدا دەکردن. لە جامی لای سەرنشینیشەوە من چێژم لە بینینی دیمەنی شارەکەم—بەغدای کۆن—بەبازاڕە پێکەوەبەستراوە تاریکەکانییەوە کە تێیدا خەڵکی مزگەرییان دەکردو باسی سیاسەتیان دەکرد، لەگەڵ بەغدای نوێ بەکافتریای تازەو بۆتیکەکانی ناوچەی مەنسورەوە وەردەگرت. هەموو ئەوەی بەئێرس تا تەمەنی نۆ ساڵی بۆم مابووەوەو ڕاست بوو، ئەوەبوو لەڕێگەی دایکمەوە فێرببووم.

ڕۆژێکیان لەساڵی ١٩٧٩دا لەگەڵ پوورە لەیلا بە شەقامی چواردەی ڕەمەزاندا گوزەرماندەکرد، کاتێك لە ڕادیۆی ئۆتۆمبێلەکەوە گوێمان لە ڕاگەیەنراوێك بوو وتی، ئەحمەد حەسەن بەکر کە پیاوێکی قژ ماشوبرنجی بوو و وێنەکەی لە هەموو پۆلەکانی خوێندگە سەرەتاییەکەی مندا هەڵواسرابوو، لەبەرخاتری ئامۆزاکەی سەدام حسێنی جێگری سەرۆك واز لە پۆستی سەرۆك کۆماری دەهێنێت، پوورە لەیلاو دایکم لەپێشەوەی ترۆمبێلەکەدا دانیشتبوونو باسی هەواڵەکانیان دەکرد، وادیاربوو خەبەرەکە شاگەشکەی کردبوونو بیرمبێ قاقا دەخەنینەوە.

پوورە لەیلا گوتی "ئەمە دواجارەو ئیتر هەرگیز نایبینینەوە!".

دایکم هاواریکرد "چیتر ... تەواو ... عاااممموو!".

ئەمە منی خستە دڕدۆنگییەوە. داخۆ ئەوان ئەو کەسەیان دەناسی بەنیازبوو ببێتە سەرۆك کۆمار؟ مەگەر ئەو مامەیەکمان بوو، واتە عەمو بوو؟ من هیچ پەیوەندییەکی خزمایەتیم لەگەڵی هەبوو؟ ئەگەر سەرۆك مامان بوو، دەی بۆچی خۆشحاڵ بوون بەوەی کە چیتر نایبیننەوە؟ تێنەدەگەیشتم. لەبارەی ئەو بەدگومانییەوە لە دایکم پرسیو وەڵامێکی راستەوخۆی روونم لێیەوە دەستکەوت.

ئاوڕی دایەوەو وتی "ئازیزەکەم هەندێك شت هەن شایانی ئەوەی نییە بەگوێی منداڵانیدا بدەی. ئەمانە شتگەلێکن لە گوێیەکەوە دەچنە ناوەوەو لەوی ترەوە ڕاست دەچنەدەرەوە، واتە پێویستە لەیادەوەریتدا بیانسڕیتەوە".

لە تەمەنی نۆ ساڵو نیوییەوە ناشنایەتیم لەگەڵ چەمکی وشەی خەیاڵبزوێن پەیداکرد.

وەڵامە بێسەروبەرەکەی دایکم هانیدام زیاتر حەز بە فزولی بکەم، هاوکات لای خۆشمەوە لەدواوەی ترۆمبیلەکە کاتێکی زۆرم بۆ قسەکردن هەبوو لەگەڵ دوو ژنی زۆربلێی دیکەی چەشنی دایکمو پوورە لەیلا کە لە کوشنی پێشەوە بوون. بۆیە کاتێك دەڕۆیشتین، مەشقم دەکرد. وێنای ئەو بیرۆکەیەم دەکرد کە ئەوان نەختێك پێشتر وەك تیرێك هاویشتیانە گوێی راستەمەوەو هەوڵیاندەدا راستەوراست بەبێ ئەوەی لەسەرمدا هیچ ئەسەرێك بەجێبهێڵێ لەگوێی چەپمەوە دەربچێت. بۆیە هەرجارێك لەخۆم دەپرسی ئاخۆ ئەو خەیاڵە هێشتا لەمێشکمدایە، دەمودەست دەردەکەوتەوە. لەڕاستیدا هیچ شارەزاییەکم پەیدانەکرد، چونکە ئەمڕۆکە هەموو دیمەنەکەم زۆر بەڕوونی بیردێتەوە، هەر لەوکاتەی بەڕێگاکەدا هاتینە خوارەوەو بەناوچەی کازمییەو بەتەنیشت ئەو بازاڕە کۆنەدا تێپەڕین کە زێڕی عەیار بیستوچواریان تیادەفرۆشتو تا لەوێشەوە رووماندکردە ئەو مزگەوتەی منارەو گومەزی ئاڵتونیو پیرۆزەیی بەسەرەوەبوو. بەڵام ئەوێ کاتیش سەیربوو لام، ئەگەر بڕیارە من ئەو ئەندێشەیە لەسەرم دەرکەم، دەی چۆن دەتوانم گوزارشت لەمە بکەم؟

هەموو ئەو وارسکانەی لە مندا هەبوون وەکی ژیاندۆستی، دڵسۆزی، توڕەیی،

بێزاری، تاوان، پتر لەوانەش ترس، ڕێگەم لێدەگرن بەسەدای بەرز ناوی سەدام حسێن بهێنم. ئەو ڕاستییەی کە ئێستا ناوی دەهێنمو دان لە پەیوەندیی تایبەتیم لەتەك ئەو دەنێم، بۆ خۆشم وەك ترازانە لەدۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر، ئەوجا گرنگ نییە چەندە بێئەرزش بکەوێتەوە. ئەو خزمایەتی نە لەگەڵ خۆم نە لەگەڵ بنەماڵەکەمدا نەبوو، وێڕای ئەوەش هەندێك لە پشووی هەفتەی تەمەنی منالّیو سەراپای لاویم لەگەڵ ئەودا بەسەربرد. فێرکرابووم بە عەمو بانگی بکەمو ئەویش وەك برازایەك هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردم. هەرچەند بێزارم دەکات، بەڵام ئێستاش دەتوانم بچمەوە ناو ڕابردوو هەندێ لە یادەوەرییەکانی بەیاددا بهێنمەوە. بێشك من ئەوم بەتاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی تۆمەتبار دەکرد، ئەوەك لەبەر دڵڕەقیو بەهۆی ئەوەی دووری خستمەوە.

لەڕووی تەکنیکییەوە ئەو تەنها سەرۆککاری باوکم بوو. باوکم فڕۆکەوانی ئەو بوو و کاپتنی هێڵی فڕۆکەوانی بازرگانی بوو، سەدام لەسەرەتای هەشتاکاندا بۆ خزمەتی خۆی وەك فڕۆکەوانێکی تایبەت دایمەزراندبوو. کاتێك لە عێراق گەورە دەبووم، خەڵکی ئاسایی بە "کچی فڕۆکەوانەکە" ئاماژەیان بۆ دەکردم، منیش ڕقم لەو دەستەواژەیە دەبووەوە، ئێستاشی لەسەر بێت هەر ڕکم لێ ئەبێتەوە. چوون ئەو دەستەواژەیە شوناسی تەواوی خۆمو هەموو ئەو شتانەشی کە دەمویست ببم، لێ زەوت دەکردم. ئەو گوزارەیە منی لەڕێگەی باوکمەوە دەناساندو شوناسی ئەو بوو، شایانی باسە باوکم لەڕێگەی سەرنشینە هەرە بەدناوەکەیەوە ناسرا، واتە ئەو دیکتاتۆرەی مایەی ترسی ملیۆنان هاووڵاتی عێراقی بوو. ئەگەر لە عێراق مابامەوە، خەڵکێك هەبوون بێشك وەك زەمانی کۆن هەر بە کچی فڕۆکەوانەکە ناویان دەهێنام، سەرباری ئەوەی باوکم زۆرساڵە وازی لە فڕۆکەوانی ئەو هێناوەو لەمێژە هەر فڕۆکەوانیش ناکات. بۆیە بەهۆی زنجیرەیەك ڕووداوەوە سەدام حسێن کەوتەخۆی، هەرچەندە ئەوکات ئەو پیلانانەم نەدەزانی، بەڵام بۆ سەروەختی شەڕی کەنداو خۆمم بە ئاوارەیی لە ئەمەریکا دۆزییەوە. ئەوە سەختترین ماوەی ژیانم بوو. لەبەر هەندێ هۆکاری زۆر بەبنەما متمانەم بەکەس نەمابوو، تەنانەت بەدایکیشم. تازە تەمەنم گەیشتبووە بیستویەك ساڵانو بۆ یەکەمجار خۆمم بەتەنها بینییەوە، لەوکاتەدا هەرچی ترسی نوێش هەبوون چوونە سەر مەلۆی

ترسە کۆنەکانم. لەپێناو مانەوەمدا ئەوی پێویستبوو دەمکرد، ئەگەرچی ئەمە هەر بەدەم خۆشە: کچی فرۆکەوانەکەم سڕییەوەو سەرلەنوێ دەستم پێکردەوە. ژیانی خۆمم نوشتانەوە وەك چۆن بەتوندیو لەناوەڕاستەوە لاپەڕەکانی کتێبێك بۆ دواوە دەچەمێنیتەوە. ئەشێت نیوەی یەکەمی کتێبی ژیانم بخوێنیتەوەو پاشان نیوەی دووهەمی، بێنەوەی هەستبکەیت کە هەمان کەس ئەو ژیانانەی ئەزمونکردووە. مەبەستمە بڵێم ئەمە ئەو شێوەیەبوو کە من دەمویستو پێویستم پێیبوو.

وەك دامەزرێنەرو سەرۆکی رێکخراوێکی قازانجنەویستی ژنان بەناوی(*Women for Women International*) "ژنان لەپێناو ژنانی نێودەوڵەتی" کە پاڵپشتی ژنانی پاش ئافاتی جەنگ دەکات، شوناسێکی تەواو نوێم بۆ خۆم دروستکرد. هەنوکە زیاد لە دەیەیەکە بەجیهاندا دەسوڕێمەوە، چاوم بەو قوربانییانەی جەنگو پەلاماردانو کۆمەڵگەی زۆرەملێ کەوتووە، کە جیهان وەك دەرهاویشتەی ناچارەکی جەنگ لەئاستیاندا بێدەنگە. بەدیتنی ئەو پاشهاتە درندانانەی لەئاکامی توندوتیژی تاوانبارانەوە کەوتونەتەوە، ئەنگێزەی ئەوەم کەوتە سەر هانی ژنان بدەم بێدەنگییان بشکێننو سەدایان هەڵبڕن تا ئەوەی سەرکوتکەرەکانیان سزابدرێن. بۆخۆم هێشتا نەمتوانیوە بێدەنگیم بشکێنم، ئەمەش بەڕاستی مایەی تێڕامانە. من لەسەر تەلەفزیۆن دەردەکەومو لە هەموو جیهاندا وتار پێشکەش دەکەم، کەچی هێشتاش ناتوانم لەدەری حەوشەکەمەوە وشەی سەدام حسێن بڵێم. ئەو هەموو پێشکەشکارەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا سازکردووم هەرگیز لێیان نەپرسیوم ئاخۆ لەنزیکەوە سەدام حسێن دەناسم یان نا، باکیان چییە؟ دەی ئەمە وایلێکردووم بەبێدەنگی بمێنمەوەو چیرۆکی کەسانی تر باسبکەم، هاوکات هەرگیز بەسەرهاتی خۆم نەگێڕمەوەو سەراپای لەتاو ئەو ترسە جاویدانەی کە ئەشێت رۆژێك کەسێك بمناسێتەوەو بڵێت ئەها، خۆ ئەمە کچی فرۆکەوانەکەیە، هاوڕێکەی سەدامە، لەبەر زەین بشارمەوە.

کاتێکیش سەرەنجام لەساڵی ٢٠٠٣دا سەدام حسێن لەو کونەی لە شوێنێکی پیسدا هەڵیکەندبوو گیرا، بەرم بە فرمێسکەکانم پێنەگیرا. ئارەزووم نەبوو چێژ لە ئابڕووچوونی کەسێکی تر وەرگرم، ئەوجا ئەگەر دوژمنیشم بێت. پێموابێت

فرمێسکەکانم زیاتر بۆ خۆم بوون وەك لەوەی بۆ ئەو بووبێتن، بۆ پاراستنی مرۆڤبوونم بوون لەبەرابەر هەستی تۆڵەو رقدا. ئەو رۆژە بەرێکەوت لە کۆنفرانسێك بووم لە ئوردون، هەمووان پێکەوە بەخۆشی مەییان نۆش دەکرد. یەکێك لە کچە هاورێکانم بۆ جوامێری باوکی کە بەرپرسێك بوو بەئاشکرا لەلایەن سەدامەوە لە سێدارە درابوو پێکەکەی هەڵدەدا. یەکێکی تر تۆمەتباری ئەکرد بە کۆکوژی، پێکەکەی بەتۆڵەی خزمە کوردەکانی دەزانی کە لەگەڵ هەزارانی تردا کیمیابارانی کردبوون. لای خۆمەوە ئارەزووم دەکرد لەباتی دایکم داوای هەقێك بکەم، بەڵام کێ سەدامی بە شێوێنەری رۆحی مرۆڤ تۆمەتباردەکرد؟ بیرم لە هەموو پوورە ئازیزەکانم دەکردەوە، ئەوانەیان کە دلێرو سەردەمیانەو بریاردەر بوون، هەنوکە رۆژاوا رەوایی ئازادی پێداون؟ پێم سەیرە کێ ئەو هەموو خەڵکە بێشومارەی بیردەبێ سەدام لەناوی بردن، برین‌و ژانی ئەوانە لەیادناکات رێگەی پێدان بژین؟ داخۆ جارێکی تر ژنان لەرێگەی راپۆرتی رووداوو تێچوون‌و کیلۆتەن‌و شەڕو قوربانییەکانی جەنگەوە دەکەونەوە سەر شانۆی مێژوو؟ مەگەر ژنان تاکەی بەردەوام دەبن لە ئازارچەشتنیان لەسایەی بێدەنگییاندا؟

بۆ یەکەمجار لە ژیانما، دەمتوانی هەستبکەم کە ئەو کچەم خۆم سەرکۆنە دەکرد، یادەوریم دەهێنایەوەو شەن‌وکەوم دەکرد، وێڕای ئەوەی بەهایەکی زۆری دەبوو لەسەر کەسێتیم بەڵام کپم دەکردن. دەمویست دیسانەوە بەتەواوی خۆ دروستکەمەوە، پاکبم، دەمخواست کاری خۆم بکەم‌و هەست بە دووڕوویی نەکەم، بەڵام لەبەرئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ ترسابووم نەمدەزانی چۆن لەدەست ئەو چینانەی ترس لەناوەوەڕا خۆقوتارکەم. بەوپێیەی بەهۆی شاردنەوەی رابردوومەوە تەنانەت لە خۆشم رزگارم ببوو، هەرگیز پارچەکانی چیرۆکی ژیانی خۆم پێکەوە نەبەستبوویەوە. نەمدەزانی ئەو رووداوانەی بەسەرم هاتبوون کامیان هۆکار بوون‌و کامیان ئەنجام؟ کامیان گشتی‌و بۆ هەموو عێراقییەك بوون‌و کامیان تایبەت بوون بە بنەماڵەکەم؟ بەدڵنیاییەوە هەرگیز خۆم لە قەرەی ئەو پرسیارە گەورانەی وەك سەدام حسێن چۆن توانی بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك لەدەسەڵاتدا بمێنێتەوە لەکاتێکدا زۆرینەی خەڵکی عێراق رقیان لێی بوو و بەردەوام پیلان بۆ کوشتنی دەگێڕدرا نەدەدا. بێگومان چەك هەبوو. پێشتر

یارمەتی دارایی لە ولایەتە یەکگرتووەکانو ئەورووپاو یەکێتی سۆڤیەتەوە دەهاتو بۆ مەبەستی سەپاندنی ئەجێندای جیۆپۆلیتیکی خۆیان بوو ئەنێردران. بەلام تەنانەت ئەویش تەقەمەنی تەواوی بۆ کوشتنی بیستوپێنج ملیۆن کەس نەبوو. کەواتە چۆن توانی ڕێگەیەکی سەرتاسەری دابڕێژێت تا هەموو عێراقییەك بەگوێرەی ئەو ڕێسایە قسەبکەن، خۆشەویستی بکەن، هاوسەرگیری بکەن، نوێژ بکەن، یاری بکەن، پێبکەنن، فێربن، بپۆشن، بخۆن، فریوبدرێن، نائومێدبن، ناهەنگ سازکەن و بشمرن؟ کەسانی نابڕوومەندی وەك دایكو باوکم لە جەوروستەمی خۆیانەوە بگلێنن؟ دایکم لە ڕۆحێکی ئازادەوە بگۆڕن بۆ ڕێکخەرێکی نەبەکام تا ئامادەکاری ئاهەنگەکانی کۆشك سەرپەرشتی بکات؟ هاوکات وەها ترسێ لەمندا چێبکات، ڕۆحم بێتە کونەلوتمو ماوەیەکی درێژ پاش لە مردنیو نەمانی دەسەلاتی لێم جیا نەبێتەوە؟

هەموو ئەمانە لە چ وەختێکدا دەستیانپێکرد؟ ڕەنگبێ بۆ وەلامی ئەم پرسیارە دروست بێت بێژین: ئەو ساتەی دایکێك دەترسێ بەڕاستی وەلامی پرسیاری مندالە بچکۆلانەکەی بداتەوە. کاتێك لە تەمەنی بیست سالێدا ڕۆیشتم بۆ ئەمەریکا، خامۆشیو پرسیارگەلی زۆری بێ وەلامو هەلپڕوزاو لەنێوان منو دایکمدا هەلپەسێرابوونو من لۆمەی ئەوم دەکرد لەسەر ئەو ئەدگارە ناشرینانەی ژیانمیان ڕەنگکردووە. تەنها ئەوکاتەی کە گیانی دەدا فامکرد دەبێت چۆن گوێ بۆ ئەو ژنانە هەلخەم لە ستەمکارانی تر ڕزگاریان بووە، داخۆ دایکم ئەو نهێنیانەی پێگوتم کە بەدرێژایی تەمەنم لێی شاردبوومەوە؟ ئێستاش کە بیردەکەمەوە چەندە گەنج بوو وەختی گیانەلای گریانم دێ، چوون پەنجاودوو سالێ بوو. توانای نەبوو قسە بکات، تەنها کەرەستەش بۆ پەیوەندی کەلکی لێوەردەگرت نووسین بوو. پاشان لێم پرسی لەماوەی ئەم دوو دەیەی لەگەلێ باوکم لە بندەستی ئەودا (سەدام) ژیاون زیندەگی چۆن گوزەراوە، ئەویش ئەندێشەکانی لەسەر دەفتەرێکی دەرمانخانە بۆ نووسیم. نووسین بۆی زۆر سەخت بوو، سەرنجو تێڕوانینەکانیشی زۆرجار کورتو بابەتی بوون. بۆ بەرچاوروونی ئەوەی چۆن مندالەکانی خۆیی پاراستووە، وا من لێرەدا چەن دەروازەیەك دەخەمەڕوو. شایانی باسە دەفتەرەکەیم لە جانتایەکی سپی دەستیدا کە لەفرۆکەخانەکاندا

بەکاریدێنم، قایم هەڵگرتووە. دەگمەن دەیکەمەوە، چونکە تاکە شتە کە لەلام مابێتو بۆنی ئەوم بۆ بهێنێت.

عێراقییەکان قسەیەکیان دەربارەی سەدام حسێن هەیە دەڵێن، لەحەفتاکاندا تامەزرۆی بووین، لەهەشتاکاندا تاڵییەکەیمان چەشت، لە نەوەدەکانو دواتریشدا باجەکەیمان دا. هەمیشە وەك کەسێکی خۆشبەخت خۆم مەزەنەکردووە، یەکێکیش لەو هۆکارگەلە ئەوەیە کە لە نایابترین دەیەی عێراقی مۆدێرندا گەورەبووم. لەکاتێکدا رۆژاوا هەوڵی بەدەستێنانی ئابلۆقەی نەوتیی لەسەرەتای حەفتاکاندا دەدا، پیترۆدۆلار دەهاتە ناو خۆماڵیکردنی نەوتی نیشتمانییەوە. نرخی دیناری عێراقی بەرزبووەوە، کارەبا گوندەکانی روناککردەوە، خوێندنگەو نەخۆشخانەی مۆدێرن کرانەوە، ئۆتۆمبێلی ژاپۆنی بەرێگا خێراو نوێکاندا هاژەی رۆیشتنیان بوو، کاتێکیش ئێمە لەپشووی هاویندا بووین بینای بیرۆکان دەچوون بەئاسماندا. دواتریش خوێندکارانی عێراق لەسەر زەماڵەی حکومەت دەرۆیشتنە دەرەوە، هەروەها حزبی بەعسی سۆسیالیستی سەدام ژمارەیەکی زۆر لە کەمپینی ناچارەکی بۆ بەگژاچوونەوەی نەخوێندەواری دروستکرد (ئایدیۆلۆژیای خۆشی بڵاوکردەوە) کە زۆر بەخێرایی خەڵکێکی بێشوماریان فێری خوێندنەوە کردو عێراق بوو بە مۆدێلێك بۆ جیهانی پێشکەوتوو و خەڵاتی یونسکۆی بردەوە. من هەوڵدەدەم لەسەر ئەوە نەوەستم کە باوەڕ چلۆن لەناو خەڵکی عێراقدا بڵاوبۆتەوە یان چەندە لە نەوەکانی خانەوادەکەم خۆیان فریوداوە بەوەی باوەڕبهێنن بەبێ ئەوەی هیچ ئەرزشی پێبدەن.

دایكو باوکم لەسەروبەندی ئەم قۆناخی گواستنەوەیەو لەساڵی ١٩٦٨ هاوسەرگیرییان ئەنجامدا، واتە بەماوەیەکی کورت پاش ئەوەی دایکم کۆلێژی تەواوکردو باوکم بڕوانامەی خوێندنی ئەکادیمیای فڕۆکەوانی لە سکۆتلەندا بەدەستهێنا. پەسەندترین وێنەی ئەو دوانە پێکەوە وێنەیەکی رەشوسپییە لە ئاهەنگی ئەڵقەگۆڕینەوەکەیاندا گیراوەو وێنەکە بەرامبەر باخچەیەکە بە پەرژینێکی ئاسنیی سپی لە بەشی پێشەوە دەورەدراوە، باوکم جلوبەرگێکی رێکوپێكو شانازیبەخشی پۆشیوەو دایکیشم بەپرچێکی رەشی جوانو مکیاژێکی پیکادیلیو تەنورەیەکی کورتی شەستەکانەوە دەرکەوتووە. دەستەواژەیەکی

ئینگلیزی هەیە لەعەرەبیدا بەرامبەرێکی پڕبەپێستیم بەیادا نایەت، کاتێکیش بیری لێدەکەمەوە دڵم هەڵئەکرۆشێ، دەستەواژەکەش دەڵێ (Happy-go-lucky)، واتە ئەوان شادو خۆشبەخت بوون.

من ساڵێك پاش هاوسەرگیرییەکەیان لەدایکبووم، واتە هەمان ئەو مانگەی باوکم لەلایەن هێڵی ئاسمانی عێراقییەوە پلەکەی بۆ کاپتن بەرزکرایەوە. لەوکاتەدا چەند نیمچە دابەشکردنێك لە بەغدادا بەناوی جیاوازی وەك گەڕەکی پرۆفیسۆران‌و گەڕەکی ئەندازیاران (هەروەها گەڕەکگەلی تر بەناوی بچووکەوە بۆ کارگەرە پلە نزمەکان) رێکدەخرا هەروەها پاڵنەرە حکومییەکان وەگەڕخرابوون تا خەڵکی ئەو بوارانە بۆ ئەو جێیانە بگوازنەوە. باوکم سوودی لە پلەبەرزبوونەوەکەی وەرگرت بۆ بەدەستخستنی خانوویەك لە گەڕەکی فڕۆکەوانان‌و خێزانەکەم شانازیاندەکرد کە توانیویانە بەبێ یارمەتی خانەوادەکانیان ئەوکارە بکەن. لەبەرئەوەی لەدایکبوونم لەگەڵ پلەبەرزبوونەوەی باوکم یەکدەگرنەوە، منیان وەك منالێك دەبینی خێر "بەرەکەت"ی بۆ خێزانەکە هێناوەو وەختێك گەورەش بووم ئەم ئەفسوونە بچووکە هەر لەگەڵمدا دەمێنێت. لەگەڵ نوێبوونەوەی مانگدا، دایکم داوای لێدەکردم خەندەیەکی بۆ بکەم، دەیگوت خەندەکەم لە مانگی داهاتودا توشی خێری دەکات وەك چۆن لەدایکبوونم یەکەم ساڵی بۆ سەرشارکردن بەخێربوو. پێنج ساڵ دواتر، کوڕێکیان بوو بەناوی حەیدەر، پێنج ساڵ پاش ئەوەش کوڕێکی تریان بەناوی حەسەن بوو. لەگەڵ لەدایکبوونی هەریەکەیاندا، باوکم دارخورمایەکی لە حەوشەکەی پشتەوەماندا دەناشت، دارخورماکەشیان بەناوی منداڵەکەوە ناودەنا. لەناو بنەماڵەکەماندا باوکم باخەوان بوو. حەوشەکەی پشتەوەمان پڕی داری بچوك‌و گوڵی رەنگاوڕەنگ‌و لیمۆی شیرین‌و داری تری لیمۆناساو دارمیوەی هەمەجۆری کەشی گەرم بوو، من زۆر حەزم لێدەکردن‌و بەدەگمەنیش لەدەرەوەی بەغدا بەرچاوم دەکەوتن.

کاتێك منالّ بووم دایکم ئەلبومێکی بۆ دروستکردم، سپی‌و قەبارە گونجاوەو حاجی لەقلەقێکی بریسکەدارو توتکە سەگێك بەسەر بەرگەکەیەوە هەیەو نێستاش ماوە لەلام. لەدوتوێیدا وێنەی خێزانەکەمان، ئاهەنگەکانی جەژنی لەدایکبوونم لە تافی منالّیما. هەروەها هەندێك وێنەی هاوڕێ‌و دۆستانی وەك ئەو

دراوسێ مەسیحییەمان کە بەردەوام داوای مۆزیاری لە دایکم دەکرد سەبارەت هاوڕێ کوڕە مسوڵمانەکانی کچەکەی، بەهەر هۆکارێکی پەیوەندیدار بووە من نازانم، بەڵام لە ئەلبومەکەدا هەموو وێنەکان پەیوەستن بە لەدایکبوونی منەوە. پاش مردنی، تێبینیم کرد سەرباری ئەوەی وێنەی زۆریشی گیرابوو، کەچی لەم ئەلبومەدا یەك وێنەی عەموی تێدا نییە، بۆیە سەیرە لام داخۆ لایبردون یان هەر لەسەرەتاوە داینەناون، جێی وەبیرهێنانەوەیە دایکم هەمیشە وردەکار بوو لە بژاردەکردنی ئەو یادەوەرییانەی بۆ منی لادەخست.

جاروبار لەیادی ئەکەم چەندە لەتەك باوکم لێك نزیکبووین‌و چۆن بەئاسانیش دەیهێنامە پێکەنین. لە فۆتۆیەکماندا پێکەوە مودێلێکی هاوشێوەی دزداشەی درێژمان لەبەردایە، ئەو چاکەتە درێژانەی تا ئەژنۆ دێن‌و ئەشێت هەردوو ڕەگەز بیپۆشن. چەند باوك ئەوە دەکەن بۆ خۆیان‌و کچە دوو ساڵانەکانیان؟ من بە بابا بانگم دەکرد، ئەم وشە لە عەرەبیدا بەمانای "باوك" دێت، بەڵام خۆی ناوی باسل بوو. زۆرینەی وێنەکانی لەکاتی پشوودا گیراون، ڕوویکردوەتە کامێراکەو کەمەربەندێکی پلاستیکیی مەلەوانی منداڵان لەناوقەدیدایەو لەکەنار دەریایەکی گەرمدایە، لەتەنیشت پەیکەرێکەوە لە تایلەند دانیشتووە، یان وەك هاوڕێیەکی دێرین قسە لەگەڵ پەیکەری کرێکارێکی کانی بەردین دەکات لە کێڵگەی بێری نۆت دا. بۆ ئارامبوونەوەو دورکەوتنەوە لە گەرمای پاشنیوەڕۆی کۆتایی هاوین ڕاهاتبووین بڕۆین بۆ مەلەکردن بۆ نادی سەید یان لەگەڵ خاڵۆزاکانم بە بەلەمەکەی خاڵم بڕۆین بۆ دورگەی بەراز"جزیرەی خەنزیر"، وشکانییەکی لینە لەناو دیجلەدا کە دەبێت لە هەبوونی بەرازی کێوی تێیدا ئەو ناوەی بەسەردا بڕابێت. باوکم لە تافی لاویدا کاتی لەوێ بەسەربردووە، لەچوونەدەرەوەشماندا لاوێتی خۆی دەبینییەوە. هەندێ لە خۆشترین یادەوەرییەکانم شەوە ئارامەکانی هاوینی ئەو شوێنەیە کە پڕبوون لە دەنگی نەرمی بانگی نێوارەو پێکەنین، بەهێزیو سەرقاڵی دایکم، شەڕانی بوونی باوکم بەوەی پارچە سەهۆڵی دەخستە ناو جلە کورتەکانی دایکمەوە، هاوکات دەنگی کۆمەڵێك منداڵیش کە کایەیان دەکرد دەهاتنە بەرگوێ. پاش خۆراوابوونیش، ڕوناکی ئەقش‌و ڕازانەوەی کافتریاکانی سەر کەناری ڕووبارەکە

دەهات و بەسەر ناوەکەوە تیشکی کورت و کزی شین، سەوز، سپی و سوریان دەشکایەوە. رەنگەکان دەدرەوشانەوە، ساتێکیش شنەبایەك وردەشەپۆلی هەڵدەستاند من وا هەستم دەکرد ئەوانە فریشتەن دێن و باڵ لە ناوەکە دەخشێنن.

من خۆشەویست بووم، فێرکرابووم و بەدکرابووم. لەسایەی سودمەندبوون لە هێڵی ئاسمانی و ئەو راستییەی دایك وباوکم لەهەمان خانەوادەی بازرگانەوە کەوتبوونەوە، گەشتمان بەجیهاندا دەکردو—دەچووین بۆ بەرازیل، یۆنان، ژاپۆن و چەندین وڵاتی تریش. لەرووی کولتورییەوە بەهەمان ئەندازەی رۆژهەڵاتی ناوین بوونم رۆژاوایش بووم. کاتێك ساوایەك بووم، بەگریمانەیی هارۆدس یەکەم سەرچاوەی خۆراکی سەرەکیم بوو. ئاوازی گۆرانی "Happy Days"م دەزانی و بەباوکم وت کە (Wonder Woman)[1] بەس لەبەرئەوەی ژنە دەتوانێ ( Six million dollar Man)[2] بباتەوە. وەختێك باوکم پاش گواستنەوەی سەرنشینەکان بۆ پایتەختی وڵاتانی دی دەگەڕایەوە بۆ بەغدا، نوێترین بوکەشوشە و یاری منداڵان، جلوبەرگی بۆتیکە بیانییەکان، ئەو چوکولاتانەی هەرگیز لە عێراق دەسنەدەکەوتن هەروەها بیگ ماکس کە بەتازەیی لە ساردکەرەوەدا بۆی هەڵدەگرتم، لەگەڵ خۆیدا بۆی دەهێنامەوە. بەوپێیەی زۆری کات لەماڵەوە دوور بوو، ئیدی دەیویست دڵم رازیی بکات، واتە شتێك بوو لە بابەتی ئەفسانەی سانتە کلۆز "بابە نوئێل"، کەسێك بوو بەجلی یەکچینەوە بە ئاسمانەکاندا دەفڕی و دیاریی پێبوو.

بەڵێ ئەوە دایکم و هاوڕێکانی بوون پیشانیان دەدام کە ژیان چ مانایەکی هەیە و دەبێت چۆن بیگوزەرێنیت. تۆڕێکی ژنان لە بەغدا هەبوو، لە نەریتی ڕێزگرتنی عێراقییەوە لەئاست بەتەمەنەکان کە گەورەبووم هەموویانم بەپوور یان میمك بانگدەکرد. لەو ساڵانەدا دەیان ژن هەبوون، لە دۆستان و خزمانەوە بگرە تا دایکی هاوڕێکانم، هونەرمەندان و مامۆستایان، هاوسەری فرۆکەوانەکانی تر، ژنانی

[1] واتە "ژنی سەیرو سەمەرە، پاڵەوانی فیلمەکارتۆنیەکانی هونەرمەند ولیام مارستۆن بوو لە ١٩٤٠دا"

[2] واتە "پیاوی (کەس) براوەی شەش ملیۆن دۆلاری"

نادی سەیدو بازنە کۆمەڵایەتییە فراوانەکان. لەماوەی کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا هێزە سۆسیۆئیکۆنۆمییەکان فشاریان خستە سەر ژنانی ئەمەریکی بگەڕێنەوە ناو ماڵەکانیان، پەستانێکی پێچەوانەش لەلایەن مۆدێلی سۆسیالیستیی پیشەسازیی عێراقییەوە دروستبوو هەلێکی بە ئەوەی دایکم بەخشی بۆ جێهێشتن و شکاندنی ئەو چوارچێوانەی سەدان ساڵ تەمەنیان بوو و ڕەگیان لەناو نەریتی ئیسلامیدا داکوتابوو، وێڕای ئەوەش دایکم و زۆرێك لە هاوڕێکانی لەڕووی کولتورییەوە عەلمانی بوون. وێنەی ئەم ژنانەم لا ماوە، هەموویان دەستیان لە کەمەری یەکتر گیرکردووەو بەیادم دێتەوە چەندە یەکگرتوو بوون، ئەو یەکبوونەیان پتر شوناسی ژنێتی و سەردەمیبوون و سەربەخۆییان بوو، هاوکات هەریەك بەدوو یان سێ زمان دەئاخاوتن و هیچ ئاستەنگێکیان نەدەدی ڕێگرییان لێبکات: بڕوانامەی بەرز، ڕاپەڕاندنی کار، منداڵ، گەشت، کاتی خۆش و هەبوونی هاوسەر کە زۆر خۆشیان دەویستن، سیماکانیان بوو.

وەك دەقی یاسایی هیچ بەندێك باسی لە پۆشین و نەپۆشینی عەبا نەکردووە، بەڵام حزبی بەعسی سەدام ژنانیان هاندەدا بۆ نەپۆشینی ئەو عەبا نەریتییەی ڕۆبێکی ڕەشی درێژەو پتر داپیرەم و ژنانی ناوچە دێهاتییەکان لەبەریان دەکرد. زۆرینەی "پوورەکان"م عەبایان فڕێداو تەنورەی کورتیان لە باتیا پۆشی. دایکم و هاوڕێکانی لەندەنیان لە پاریس و تەنانەت بۆتیکە نوێکانی بەغدا کە سەرشاربوون بەژنی قژسور پێ پەسەندتربوو، ئەم پرچ سورانە ژنی بەهێزوبازوی روسی بوون و بەشێوەیەك دەردەکەوتن وەك بڵێی سروش بە "شکۆمەندی ژنانی عێراق" بدەن. عەمو مەراقی لەو گوزارەیە بوو. گشت ژنانی عێراق زۆر شکۆمەندبوون چونکە بەردەوامبوون لە بەڕێوەبردنی ماڵداری و هاوزەمان کاریشیان لە کارگەو وەزارەت دەکردو کۆبوونەوە سیاسییەکانیشیان ڕێکدەخست.

ماڵی ئێمە شوێنی هەندێك نانخواردن و ئاهەنگی چاوەڕواننەکراو بوو و تێیدا پانزە بۆ بیست ژن لەپڕ کۆدەبوونەوەو کەشەکەیان پڕدەکرد لە پێکەنین و قسەکردن و دەوری و مەنجەڵ و بۆنی بیانی. جگەرەیان لە پاکەتی کێنت یان ڤێرجینیا سلیمز دەردەهێناو دایاندەگیرساند، دواتر دوکەڵێکی شین کە ئەوکات لەلام دیمەنێکی ڕۆمانسی بوو، لە بنمیچی ژوورەکەدا پەنگی دەخواردەوە. من

لەنێوانیانـدا دەسـوڕامەوەو گـوێم لـە پێکـەنینو دەمەتـەقێیان دەگـرت، دەمزانـی پێشوازیم لێدەکەن تا ئەوکاتەی بۆ پشـوویەك دەچوونە باخچە بۆنخۆشـەکەمانو تێیدا لە بازنەیەکی توندوتۆڵدا سەریان دەکرد بەیەکداو ئـەو دەنگـۆو نهێنیانـەیان ئاڵوگۆڕدەکرد کە بەیەکیەوە بەستبوون. ئەگەر گفتوگۆکە زۆر درێژ بوایەتەوە یـان بێزێزی تێبکەوتایە، دایکم یەکەم کەسبوو بابەتەکەی دەگۆڕیو دەسـتیان دەکـرد بەسەماکردن. هەنـدێك جاریش دەیگوت "ژیـان وەکـو خـەیارێك وایـە، ڕۆژێـك لـە دەستتدایە، ڕۆژی دواتر لە قونتدایە" ئیدی هەمووان دەستیان دەکرد بەپێکەنینو بارگرژییەکـە هێوردەبـووەوە. دایکـم هەمیشـە لـەوە بـەرزتر پێدەکـەنی کـە لـە کۆمەڵگای عێراقیدا بۆ ژنان بەئاسایی دادەنرێت. پێکەنینەکـەی وەك ئاوگەرمکـەر (گیزەر) بەقوڵی دەستی پێدەکردو کەم کەم قاقاو پچڕانی تێدەکەوت.

لە عێراق وەك زۆرینەی جیهانی عەرەب، پیاوانو ژنان بـەجیا کـۆڕو کۆمـەڵیان دەبەسـتن. ژنـان بەدرێـژایی ژیانیـان بـەجیا هەڵدەپـەڕنو سـەمادەکەن، خۆشـیەکە زۆرینـەی ژنـانی ڕۆژاوایـی لێـی بێبەشـن. یـەکێك لـە ئەفسـوناویترین دیمەنـەکانی هەموو بیرەوەریم، کـە سـیمبولێکە پـێم دەڵـێ ئیـدی زەمـانی بێبـاکیم لەکیسچووە ئەوەیە، دایکم زیاد لە دەرزەنێك ملپێچی ڕەنگاوڕەنگی وەك دیاری بـە هاوڕێکـانی بەخشی. پاشان لەگەڵ مۆسیقای عەرەبی نمایشی ئاسایی خۆیان دەسـتپێکرد، ئـەم ژنە پسپۆڕانە بە پێڵاوە بـن قـورسو گاڵتـەئامێزو باوەکانیانـەوە سـەمایان دەکـرد، پارچەی بریقەداری شیفۆنیان بەسـەر سمـتو شـانیاندا لـەملا بـۆ ئـەولا ڕادەکێشـا، هـەروەها پـڕ بەسـینەیان قولولویـان بـوو و هوتافیـان دەکێشـا. پـوورە سـەمەری خوشـــکە گـــەورەی باڵابـــەرزو میهرەبـــانی دایکـــم، بەشـــێوەیەکی کلاســـیکیو لەسەرەخۆی خۆی با دەداو هەوەسبزوێنانە سمتی دەلەرانـد. دایکـم لـە هـەموویان پەرۆشـتربوو بـۆ تەماشـاکردنی. خێراتـر لـە دەف لەشـی دەجوڵانـدو شـەپۆل پـێ سازدەکرد، هـیچ کەسـێکی تـریش نەیـدەتوانی شـانبدات لـە شـانی، پرچـە ڕەشـە درێژەکەشی دەدرەوشـایەوە وەختـێ بـەدەوری سـەریدا سوڕیدەداو وەك خەرمانـە ئامێزانی دەکردەوە.

باوکیشم هەمان چەشـن سـەماکارێکی بێوێنـەبوو، بەتایبـەت شـارەزای پـۆپو[4]

---

[4] (جۆرێکە لە سەما بە مۆسیقای جازەوە)

ڕۆك بوو. باوك و دایكم له میوانداری "ئاهەنگی دووانی"دا بەناوبانگ بوون و له بازنەی كۆمەڵایەتیی كۆنسێرڤاتیڤەكاندا وەك بۆهیمی دەردەكەوتن. موسوڵمانه كرداریيەكان مەی و كهولیان ڕەتدەكردەوە هەروەك له قورئاندا یاساخكراوە. بۆیه له ماڵی ئێمەدا خواردنەوە بۆ ئەو ژن و پیاوانە دادەنرا كه سوك وسانا دەرگیری مۆسیقای ڕۆژاوایی و عەرەبی و قاپە فستەقی نوێ و بادەم و هەنار ببوون. ماسی برژاوی بەناوبانگی بەغدا كه له ڕووباری دیجله ڕاودەكراو بەشیشی درێژ بەسەر ئاگری كراوەوە بەكاوەخۆ دەبرژێنرا دەهێنرا، هەروەها سەر ئەومێزە دارگوڵه چەماوەییەی له تایلەندەوە لەگەڵ خۆمان هێنابوومانەوە دەڕازێنرایەوە بە: برنجێكی زۆرباش و فاسولیاو گۆشتی كاوڕی پڕ بادەم و میوەو كەستانه. كاتێكیش من لەسەر بانەكەمانەوەو له باوەشی داپیرمدا تەماشای ئەم ئاهەنگانەم ئەكرد تەنها ترسم ئەوە بوو هەرگیز ئەو ڕێوشوێنانەم بۆ جێبەجێناكرێ كه دایكم ڕەوتی لەسەرگرتوون و هیچكات بەو شەرمنییەمەوە وەكو ئەو فێری هەڵپەڕین و سەماكردن نابم یان پێناكەنم و بەكامی دڵ چێژ لەو خۆشییە ڕاستەقینەیە نابینم.

گەرمای عێراق ئەوەندە بەتینە لەهاویندا زۆرینەی بەغدایيەكان لەسەربان دەخەون. زرمەی ئەو دۆشەكە قورسانەی هەموو شەوێك دەهێنرانە سەرەوەو فڕێدەدرانە سەر قەرەوێڵە ئاسنییەكان یەكێكە له دیارترین یادەوەرییەكانی سەرەتای منالێم. لەبەرئەوەی له عێراق ژەمی سەرەكی له نیوەڕۆدا دەدرێت، شەوانە هەمیشە ژەمی سوكمان دەخواردو له شەوانی هاویندا نەشیا له گەڕەكی فرۆكەوانی بڕوانی و ببینی خێزانەكان و منداڵكەنیان لەسەربانی ماڵەكانیان بەر له كاتی خەوتن ئاسایی شوتی یان نان و پەنیر دەخۆن.

ئێمە چیتر لەدەرەوە نەدەخەوتین بەهۆی ئەوەی لەوكاتەدا ئەبو تەبر "بكوژە تەور بەدەستەكە" بۆ ماوەیەك له حەفتاكاندا بەغدای بە شەپۆلێك تاوانكاری توشی ترس و تۆقاندن كردبوو، لەپێشینەی هەندێك لەو توندوتیژییانە دەچوو كه لەدوایدا هاتن. زنجیرەیەك كوشتن ڕوویانداو یارۆ زیاتر ماڵە دەوڵەمەندەكانی بەغدای دەكردە ئامانج، وا باسدەكرا گوایه له شەودا لەگەڵ ژن و منداڵەكانی خۆیدا هەڵدەكوتێتە سەر خێزانەكان و دەیانكوژێت و پارەو سامانەكانیان دەدزێت و پاشان بزردەبێت. زۆرێك لەو ماڵانە هەم دیوارو هەم

پاسەوانیان هەبوو، کەچی هەرچۆنێك دەبوو تەبر بە زیرەکی خۆی بەربەستە ئەمنییەکانی تێدەپەڕاند. دەنگۆی ئەوە بڵاوبوویەوە گوایە دەچێتە سەربانەکانیش، بۆیە ئێمە دەرگای سەربانەکانمان داخستو ترس وای لێکردین بکشێینە ماڵە تاودراوەکانمانەوە. لەبەرئەوەی بەبیرمدا نەدەهات کەسێکی ناو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکەمان بە کارێکی وەها ترسناك هەستێت، ئەبو تەبرم وەك لادێییەکی ترسناك دەهاتە پێشچاو، کە چاوەکانی رەشو تیژ بنو سەرپۆشێکی سپیو عەگالێکی رەشی بەسەرەوە بێ. لە چاوی ئەندێشەمەوە، ژنەکەشی لەچکێکی رەشو جلوبەرگێکی لادێی لەبەردابوو. کوڕەکانیان چەشنی باوکیانو کچەکانیش وەك دایکیان جلیان دەپۆشی. کاتێکیش خۆیو ژنەکەی کەسانی گەورەیان دەکوشت، وا مەزەنەم دەکرد منداڵەکانیان منداڵەکانی تر بکوژن، شایانی باسە ئەم رووداوانە وەختێك دەقەومان گشت قوربانییەکان لە پێخەوەکانیاندا ئارام نووستبوون.

دواجارو کاتێك ئەبو تەبر گیرا، دەرچوو ئەندامێکی پلەبەرزی هێزە ئەمنییەکان بوو و هەموو ئەو هۆڤێتییە خوێناوییەش تاقیکردنەوەیەکی دەوڵەت بوو بۆ چاندنی ترسو سنوردارکردنی هاتووچۆ لە شارەکەدا. بەدەر لە قژە رەشو چاوە ترسێنەرەکانی زۆر کەم لەو شێوەیە دەچوو من لەبیرمدا وێنام کردبوو. کاتێك لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە دەرکەوت تەراشیکردبوو و مووی رەشی تەنها بەسەر سمێڵو چەنەگەیەوە هێشتبووەوە، هاوکات چاکەتێکی گەورەی وەرزشیو تیشێرتێکی سپیشی لەبەردابوو. دواتر لە سێدارە درا، بەڵام هێشتاش وەك ئەفسانەی شار ماوەتەوە. ئەوە ئەبو تەبر بوو کە فێری کردم ترس لە ڕەگو ڕیشەکانی خۆی زیاتر ئەژی.

رادیەی خزمەتکارمان سێ یان چوار ساڵ لەپاش مردنی تەبر بە بەرپرسیارێتییەوە پێمیگوت، "ئەبو تەبر ڕەنگی پێستی شکولاتەییو قژی رەشو لول بوو. چاوەکانی بەقوڵاچووبوونو تیژ بوون—پشیلەچاو بوو، بەجۆرێك لەشەویشدا دەیتوانی ببینێت. هەموو خانەوادەکەشی مویان ڕەشو زبرو لولو چاویان بەقوڵاچوو بوو. تەنانەت منداڵەکانیشی وەك بێچوەپشیلە بەشەو دەیانتوانی ببینن".

رادیە کچی پاسەوانێکی ئەمنی بوو، وەختێ دەچووینە سەفەر، جاروبار ئەهات و ئاگاداری ماڵەکەمانی دەکرد. لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە لەگەڵ ئێمەدا دەژیا، لای کچانی هەژار ئەمە ڕێگایەکی باو بوو بۆ بەدەستهێنانی بژێوی و باشترکردنی گوزەران. من ڕانەهاتبووم خزمەتکارێکی ئەوەندە نزیك لە تەمەنی خۆمەوەم هەبێت، بۆیە پاشنیوەڕۆیەك نەختێك پاش ئەوەی گەشتە ماڵمان، فەرمانم پێکرد نانی نیوەڕۆم بۆ بهێنێت. ئەویش هاواری بەسەردا کردم و ئیدی بووە دەمەقاڵێمان. پێمگوت "تۆ خزمەتکاری، مانای وایە هەرچیت پێبڵێم پێویستە ئەنجامی بدەیت". ئەویش قیژاندی و گوتی، "نەخێر، وانییە!" پاشان بەگریانەوە هەڵهات و لەماڵ ڕۆیشتە دەرەوە. کاتێکیش دایکم هاتەوە، لەبەردەم رادیەدا سەرزەنشتی کردم و ناچاری کردم پۆزشی بۆ بهێنمەوە، هاوکات هەندێك کاری ماڵەوەشی پێسپاردم.

لە هاوین و تەنانەت کاتێکیش من شۆرت و بلوزی بێقۆڵم لەبەردەکرد، رادیە هەمیشە پۆشاکی درێژو قۆڵداری دەپۆشی. دواجار ڕۆژێك لێم پرسی بۆچی بەشەرمەوە بازوم پیشاندەدات. وەڵامی دامەوە "لەنانکردندا یارمەتی دایکم دەدەم"، پاشان شوێن سوتانێکی لە مەچەکییەوە تا سەر شانی نیشاندام. سکم پێی دەسوتا لەوەی ئەوەندە خۆی بەناشیرین دەزانی ناچار لەشی خۆی دەشاردەوە. ڕەنگی پێستی زۆر ڕەش بوو بۆیە دواتر پێمگوت ئەو ژنانەی لە ئەمەریکا هاوشێوەی ئەون شاژنی جوانین. دایکم پێیگوتم وەك خوشکی خۆم هەڵسوکەوت لەگەڵ رادیەدا بکەم سەرەنجام دەبینە دوو هاوڕێی باش، بەڵام دەمزانی هەرگیز نابین بە خوشك. چون ئێمە بۆ هەموو شوێنێك دەڕۆیشتین و ئەویش بۆ هیچ کوێ نەدەچوو. من لە کۆلانە کوێرەکەی خۆماندا لەگەڵ ئامۆزاکانم یاری باسکەم دەکرد; ئەو لە چێشتخانە کاری دەکرد. من بەڕۆژ دەڕۆیشتم بۆ خوێندنگە; بەڵام ئەو لەشەواندا دەڕۆیشت.

خێزانەکەم یارمەتی رادیەی دا بۆ تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی، بەڵام ئەمە لەپاش ئەوەوە هات کە جارێك لەگەڵ دایکم لەکۆتایی هەفتەدا گەیاندمانەوە ماڵەوەو دیمان خێزانەکەی چۆن دەژیان: هەشت کەس بوون لە خانوویەکی دوو ژووری خشتی گڵێندا لەنزیك فرۆکەخانەو بەسەر زەوی

حکومەتــەوە بــوون. بــێ پێچ‌وپــەنا لــێم پرســی لەکوێــدا ئــەرکی خوێندنگــە ئەنجامــدەدات‌و لــەکوێ دایــك‌و بــاوکی ســێکس دەکــەن، بەوپێیــەی خــۆم هەنــدێ زانیــاریم لەوبارەیــەوە هــەبوو و بەدزییــەوە لــە کــونی کلیلــی دەرگــای ژووری نووستنەوە تەماشای دایك‌و باوکم کردبوو. دایکی رادیە عەبایەکی رەشــی لەخۆوە پێچابوو و خــاڵێکی بچوکیشــی بەســەر چــەناکەیەوە بــوو، رۆژانــی بــەنانکردن لــە تــەنوری قــوڕا بەســەردەبرد تــا چــەند عانەیــەکی تریــان دەســتکەوێت. موچــەکەی رادیە تەنها داهاتی جێگیری خێزانەکەی بوو. هەرچی منیش بــووم ساڵانێکی زۆری کارکردنی لەگەڵ ژنانی وڵاتانی تردا دەخایاند بۆ پرسین تا تێبگەم چیم وەك ماڵی خــۆم قــەبوڵکردبوو: لەحاڵێکدا کچانی وەك رادیــە نەشیا وەدەربنــرێن تــا ئــەوەی پــارەی خوێنــدنی برایەکــەی پەیــدابکات کــە وەك فریــادڕەس‌و رزگارکــەری خێزانەکــەیان لــە هــەژاری چــاوی لێــدەکرا. هــەزاران خێزانــی هــەژاری وەك خێزانەکەی رادیە هەبوون لەسەر زەوی دەوڵەت دەژیان. هەرچەندە ئــەبو تــەبر بەوە بەناوبانگ بوو ناوچە دەوڵەمەندەکانی بەغدای دەکردە ئامانج، بــەڵام تــرس لەو کابرایە لە گەڕەکەکەی رادیەشدا ئامادەگی هەبوو. کاتێك رادیــە پاش پشــووی هەفتــەو لــەماڵ دەگەڕایــەوە، زۆرجــاران چــیرۆکی نــوێ‌و ترســناکی لەمــەڕ کــارە بەدەکانی ئەبو تەبر لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە.

پاشــنیوەڕۆیەکیان، وەختێــك پێکــەوە لەســەر قەنەفەیــەکی شــین لــەژووری حەوانــەوەی مــاڵی ئێمــە دانیشــتبووین چپاندی بەگوێمــدا "نازانیــت ئــەبو تــەبر چــەندە زیرەکــە؟ ئەوەنــدە بلیمەتــە دەتوانێــت لەپشــتی دیوارەکانــەوە ببیســتێت. دوورنییە لەم ساتەدا گوێی لە خۆمانەوە بێت چی دەڵێین".

کــاتێکیش خــراپترین گــەرمای هــاوین تێپــەڕی، دایــك‌و بــاوکم گــەورەترین ئاهــەنگی ســاڵیان لــە رۆژی لــەدایکبوونی منــدا ســازکرد. پــێش ئــەوەی گــەورەکان دەســتبکەن بــە هەلەکەســەما باندناســاکەیان، بوکەڵــەی بەتــەل جوڵاویــان بەســەر گشت ئامۆزاو هاورێکانمدا دەبەخشییەوە. یەکێك لە وێنــەکانی ئەلبومــەکۆنەکەم وێنەی شەشەم ئاهەنگی لەدایکبوونمە، لە وێنەکەدا چەند کچێکی بچــکۆلانە هــەن بەســەر چــیمەنەکەوە دانیشــتوون‌و تەماشــای ماجــەرای بوکەڵــەکان دەکــەن: مــن کورتم‌و بەپەلکەیەکی رەشی لولەوە لــەلای چەپەوە وەســتاوم، کچێکی بــەرزتر بــە

پەلکەیەکی درێژی رەنگ کەستانەییەوە کە تا سەر کەمەری دێت لای راستمەوەیە، ئەوە باشترین هاورێم بەسمەیە. من وەك دایکم پێستم ئەسمەرو پرچم رەش بوو. بەسمە چاوی هەنگوینیو روخساری گەشو بێگەردبوو، ئەو شێوازەش لە کۆمەڵگای عێراقیدا پەسەندبوو. بەهەمان شێوەی من ئەویش شەرمن بوو، بۆیە کاتێك بەیەك دەگەشتین ئیدی لەیەکتری دوورنەدەکەوتینەوە، زۆرجار یاریمان دەکرد بێئەوەی پێویستکات وشەیەکیش بڵێین. ئەو لە ناوچەی بەناوبانگی ئەلمەنسور دەژیا،ماڵەکەشیان زۆر گەورە بوو، لەماڵی ئێمە کە سێ ژووری نووستنو چێشتخانەی گەورەو ژووری خێزانیشی تێدا بوو گەلێ زەبەلاحتر بوو. باوکی وەزیری دەوڵەت بوو، بۆیە کاتێك دەرۆیشتم بۆ ماڵیان پێش ئەوەی بە پلەکاندا بۆ ژوورە پەمەییەکەی سەرکەوم، دەبوو پاسەوانی چەکدار دەرگام بۆ بکەنەوە، ژوورەکەی پڕبوو لە بووکەشوشەو یاری منداڵان تەنانەت لەمن زیاتریشی هەبوو. ئەو ساڵە بەسمە جوانترین دیاریی رۆژی لەدایکبوونی پێدام، بووکەشوشەیەکی گەورە بوو، جوانییەکی رەها تێیدا یەکیگرتبوو منیش ناوی ئەوم لێنا چوون: لاشەی ئەسمەر وەك دایکمو چاویشی وەك چاوی خۆی قەشەنگ بوو.

لە قوتابخانەی ئەلتەئسیسیە دەمانخوێند، خوێندنگەیەکی مۆدێرن بوو لەلایەن بەریتانییەکانەوە بەڕێوەدەبرا کاتێك لەسەرەتای هەزارو نۆسەدەکاندا حوکمی عێراقیان دەکرد—یان هەوڵی حوکمکردنیان دەدا. خوێندنگەکە بە گۆڕەپانە گەورەکەیو ئەو چینەی قوتابیەکانەوە کە هەیبوو بەباشترین قوتابخانەی بەغدا ئەژمار دەکرا. بەسمە لە ریزی پێشەوەو لەو جێیە دادەنیشت، مامۆستاکان دەیانویست منداڵی بەرپرسانو کەسە بەناوبانگەکان تێیدا دانیشن. عادەتم کردبوو گاڵتەی پێبکەم لەمەڕ هەڵسوکەوتو زمانشیرینی مامۆستاکان لەناستی کاتێك قسەیان لەگەڵدا دەکرد "نۆی، بەسمە گیان قەیدی چییە، سبەینێ ئەرکی ماڵەوە بهێنە". من هەرگیز بەوشێوە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا نەدەکرا. کارەکەی باوكو دایکیشم زۆر باش بوو، بەڵام ئێمە کەسایەتی گرنگ یان بەناوبانگ نەبووین. ئەگەر ئەرکی ماڵەوەشم جێبەجێنەکردایە، بەدڵنیاییەوە لێم توورە دەبوون.

ئەودەم هەمەچەشنییەکی ئاینیی لەنێوان عێراقییەکاندا هەبوو، هاوکات خوێندنگەکانی ئێمەش لە ناوەندی حەفتاکانەوە خۆماڵیکرابوون بۆ دڵنیابوون لەوەی هەمووان هەمان مەنهەجو پرۆگرامی خوێندنی نیشتمانی پەیڕەو دەکەن، کە سیکولار بوو. پەروەردەی ئیسلامی یەکێك بوو لەو بابەتانەی دەمانخوێند، بەڵام ئەو خوێندکارانەی موسوڵمان نەبوون، بەمەرجێ هەڵیانبژاردایە لەکاتی ئەو وانانەدا دەیانتوانی بڕۆنە دەرەوە. ڕۆژێکیان کاتێك لە پۆلی چوارەم بووم ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی سەدام حسێن ببێت بە سەرۆك کۆمار، مامۆستای ئایین گوتی فێربوونی نوێژ دەخوێنین. داوای لێکردین دزداشەیەکی سپی بهێنین بۆ خوێندنگەو پرسیار لە دایكو باوکمان بکەین بە چ شێوازێك پێیان باشە نوێژ بکەین، چوون خێزانە جیاوازەکان شێوازی جیایان پێپەسەندبوو. ئەو ڕۆژەی بڕیاربوو نوێژ فێربین، وا ڕێکەوت من ئەوەندە زوو گەیشتم هێشتا گڵۆپی پۆلەکە هەڵنەکرابوو. تەنها یەك کەسی تر لە پۆلەکەدا بوو، کاتێك بینیم لێدانی دڵم خێرا بوو، ئەو کەسەش محەمەدی زیرەکترین کوڕی پۆل بوو لەولای پۆلەکەو لەنزیك پەنجەرەکەوە وەستابوو. بینیم بە دزداشە سپیو قژە ڕەشەکەیەوە کە پێچەوانەی پێستە بەفرئاساو چاوە هەنگوینیەکانی بوو لەبەر تیشکی هەتاودا دەستنوێژی هەڵدەگرت. من محەمەدم بێئەندازە خۆشەویست، بەڵام هەرگیز زاتی ئەوەم نەبوو لەگەڵی بدوێم. لەوکاتەی بەشڵەژانەوە کتێبەکانم لەسەر تەختەکەم دانا، سەبارەت بە ئەرکەکانمان قسەمان کردو پیشانمدا ئێمە چۆن نوێژ دەخوێنین، دەستەکانم لەتەنیشتەوە گرتبوو کتومت وەك ئەوەی دایکم شەوی پێشوو فێری کردبووم. ناوچاوی چرچکردو مۆڕەکەیەکی لێکردم وەك بڵێی شتێکی بێزراوی لێ بینیبم. وتی "ئەها، ئێوە شیعەن".

حەزم دەکرد زەوییەکە قوتم بدات، هەستم بەتەریقبوونەوە دەکردو نەشم دەزانی لەپای چی.

کاتێك قوتابییەکانی تر گەیشتن، کچەکان لەچکی سپیو کوڕەکان کڵاوی خڕو سپی چنراویان بەسەرەوە بوو، مامۆستاکە بردینییە دەرەوەو لەبەردەم بەلوعەی باخچەکەدا لەسەر چیمەنەکە ڕیزمان بەست تا دەستنوێژ فێرببین، هەڵبەت پاکژکردنەوەیەکی ڕێورەسمییە لەئیسلامدا پێویستە پێش نوێژ ئەنجامبدرێت.

لەبەردەم بەلوعەکەدا ریزمان گرت و یەکبەیەك مەشقمان کرد. رۆژێکی خۆش بوو، گۆڕەپانی خوێندنگە پڕبوو لە گوڵ و من تامەزرۆی دیتنی دیمەنی شکانەوەی ئاوی بۆرییەکە بووم لەبەر تیشکی خۆردا. کاتێك نۆبەی من گەشت تا مەشقی دەستنوێژگرتن بکەم، بەو چەشنەی مامۆستاکە فێری کردین; دەستەکانم، دەموچاوم، سەر سەرم، هەردوو گوێم، هەردوو پێم بەئاو شۆرد. رۆژێکی گەرم بوو بەڵام ئاوەکە نە تەنها فێنك بەڵکە ئاسودەیی بەرۆحیش دەدا. لەو ساتەدا من خۆشحاڵ بووم تا کاتێك محەمەد دووبارەو ئەم جارەیان لەبەردەمی هەموویان شکاندمیەوە.

وتی "زەینەب ئەمە خۆ تەنها شۆردن نییە، بەڵکە دەستنوێژگرتنە! مەگەر نازانی جیاوازییان چییە؟"

پاشانیش کاتێك چووینە هۆڵی جومناستیك بۆ ئەوەی مەشقی نوێژی تێدا بکەین، بەدەوری خۆمدا چاوێکم گێڕا هەندێ لە منداڵەکان وەك من دەستیان گرتبوو ئەوانی تریش وەك محەمەد دەستیان لەسەر سکیان گرتبوو، بیرمە سەرلەنوێ هەستێکی شەرمەندەم هەبوو بۆ ئەوانەی وەك من نوێژیان دەکرد، ئەگەر تەنها لەبەرئەوەش بووبێت لەلایەن کەسێکەوە سوکایەتیم دەرهەق کرابوو وەك محەمەد نوێژی دەکرد.

کاتێك گەیشتمەماڵەوە سەبارەت بەم بابەتە لە دایکم پرسی، لای خۆیەوە ئەویش هەمان وەڵامی مامۆستای خوێندنگەی دامەوەو گوتی: "لە عێراقدا، خەڵکمان هەیە شیعەن و هەمانە سوننەن، بەڵام هەموومان وەك یەکین و موسوڵمانین". ئەوەنەی بیرمە ئەوە یەکەمجار بوو بیربکەمەوە دایکم بەتەواوی راستییەکەی پێنەوتوم. دەمزانی جیاوازییەك هەیەو ئەوەم لە خەندە گاڵتەئامێزەکەی روخساری محەمەددا بەدیکردبوو. ئەو شەوە بەر لە خەوتن هەر بیرم لای رەفتارەکەی محەمەد بوو و گەشتمە ئەو دەرەنجامەی کە سوکایەتی پێکردوم و لە کولتوری عەرەبدا ئەوە هەڵەیەکی گەورە بوو، بۆیە لای خۆمەوە بڕیارمدا بەوە تۆڵەی لێبسەنمەوە کە چیتر خۆشمنەوێت. چەندساڵێکی خایاند تا رێگام بەخۆمدا کوڕێکی دیکەم خۆشبووێت. ئەویش دواترو پاش ئەوەبوو کە چیدی ژیانم کەوتە ئەمەریکاوە، ئەنگێزەیەك دنەی دەدام کە بشێت وەها

دەربڕینێکی بۆ بەکاربهێنم و بڵێم کەسێکم خۆشویست. وایلێکردم هەستبکەم موچڕکە بەلەشما ئەگەڕێ. ئەگەر من پێویستبێ باسی یەکەم پێشهەستی منالْ بکەم لەو دۆخە مەترسیدارەدا، ئەوا دەڵێم; وەها هەستدەکات ئەسپێ بەلەشیدا بگەڕێ و ئەویش بکۆشێ ئەو وارِسکەی بشارێتەوە.

لە ۲۲ی تەموزی ساڵی ۱۹۷۹ سەدام حسێن بانگی کامێرامانەکانی کرد بۆ ئەوەی ئەو بەرِوارە تۆماربکەن، دایکم لەسەر مێزی چێشتخانەکە دانیشتبوو و چاویبڕیبووە شاشەی تەلەفزیۆنە ڕەش و سپییە بچوکەکەمان، منیش لە نزیکییەوە وەستابووم و لەسەر شانییەوە تەماشامدەکرد. پیاوێکی بەرز بە چاکەت و پانتۆڵ و سمێڵێکی ڕەشەوە لەسەر مەنەسی هۆڵێکی گەورە کە سەرشاربوو بە پیاو وەستابوو، دواتر تێگەیشتم سەدام حسێن سەرۆکی حزبی بەعس و ئەندامانی بەرپرسی حکومەت بوو. زۆر گرژو خەمبار دیاربوو، وەك ئەوەی یەکێك لە منداڵەکانی بەکردنی کارێکی خراپ تەواو بێهیوای کردبێت، ڕایگەیاند کە لەناو حکومەتدا کەسانی "خیانەتکار"ی دۆزیوەتەوە. لەوکاتەدا کەسێکی بەرپرسناسای بانگکردە سەر مەنەسەکە، ئەویش دانی بەوەدا نا کە بەشداری لە پیلانێکدا کردووە بۆ لەناوبردنی ئەو، پاشان دەستی بە خوێندنەوەی ناوی "پیلانگێڕەکان" کرد، پاسەوانە چەکدارەکانیشی دەچوونە ناو ئامادەبوانەوەو دەیاندۆزینەوەو قۆڵیان دەگرتن و پەلکێشیان دەکردنە دەرەوە. من تەنها ڕوخساری دووان لەو سەدان پیاوەم بیردێتەوە کە لە هۆڵەکەدا ئامادەبوون. یەکێکیان پیاوێك بوو هاواری دەکردو دەیووت بێتاوانم و ملمڵانێی لەگەڵ پاسەوانەکاندا دەکرد کاتێك دەیانبردە دەرەوە. ئەوی تریان پیاوێك بوو دواتر وەك عەمو ناسیمەوە بەسیمایەکی باوکانەوە لەسەر ڕوخساری لەکاتێکدا جگەرەی دەکێشا تەماشای سەر مەنەسەکەی دەکرد.

پاش ئەوەی سەرۆك کۆمار ئەم "ناپاکان"ەی دەسگیرکرد (بەشێوەیەکی کاریگەر نەیارە سیاسییە دیارەکانی خۆی لابرد) لەبەر دڵسۆزی و ئەمەکدارییان دەستی بە پیاهەڵدانی هەموو ئەوانە کرد کە لە هۆڵەکەدا مابوونەوە، لێ ئەمانیش بەهۆی نائارامییانەوە لە شوێنەکانیان دەجوڵان. دەشمبینی کە چۆن ترس ڕوخساری زۆرینەیانی تەنیوە. پاشان گروپ گروپ هەستانە سەرپێ و دەستیان

بەچەپڵە لێدان کرد بۆ سەدام. روونبەبوو داخۆ ئەوانە کارەکانیان پێباشبوو یان لەوە دەترسان کە ئەوانیش نۆرەیان دێت، ئافەرین‌و چەپڵەرێزانێکی باشیان بۆ ئەو پیاوە کرد کە بەنیازبوو ئەو هاورێ‌و دۆستانەیان بکوژێت کە بەر لەچەند خولەکێك لەتەنیشتیانەوە دانیشتبوون.

رووداوەکە لە میدیاکانەوە رومالکراو چەندبارەش بەهەموو جیهاندا پەخشکرایەوە. سەدام حسێن هەرگیز هەوڵی نەدەدا ئەوی ئەو رۆژە قەوما بشارێتەوە. ویستی ئەو پیاوانەو ئەوانەی وەك ئەوانن لێی بترسن. من ئەوکات کاسێتەکەم بینی، سەختە بۆم جیابکرێتەوە ئەوێکات چیم بینی‌و ئێستا وەك پێگەیشتوویەك دەگەمە چ دەرەنجامێك. دەزانم من وەك منداڵێکی نۆ ساڵان تێنەدەگەشتم ئەو پیاوانە رووبەرووی دەستڕێژ دەبوونەوە، یان ئەوان لەلایەن ئەو "عەمو"وە فەرمانی سێدارەیان بەسەردا سەپا کە هەفتەیەك پێشتر دایکم‌و پوورە لەیلا لەبارەیەوە قسەیان دەکرد. بەڵام هەستم کرد شەپۆلێکی ترس لە شاشەی ئەو تەلەفزیۆنە بچووکەو مۆبەقە ساردەکەمانەوە هات، ئەگەرچی تا ئەو ساتەش من لەو شوێنەدا تەواو پارێزراو بووم. نیگای سەر روخساری دایکم تەواو بیردێتەوە، بیرمە چاوەکانی زۆر زەق بڕیبوویە شاشەی تەلەفزیۆنەکە، پێشتر هەرگیز ئەو نیگایەم لەسەر روخساری دایکم نەبینیبوو، بەڵام هەرچی چۆنێك بێت درکم بەوە کرد: گەلێ ترسناك بوو.

کاتێك دانیشتنەکە کۆتاییهات، دایکم پێش کوژاندنەوەی تەلەفزیۆنەکە هێشتا هەر لەوێدا دانیشتبوو. هەستم کرد دەیویست پێش ئەوەی تەماشای چاوم بکات‌و لەگەڵمدا بدوێت، بیرو هزری خۆی کۆبکاتەوە. ئەوکات ئەوەندە بچکۆلانەبووم ئەو دانیشتبوو و من بەپێوەبووم، لێ چاومان لە هەمان ئاستدا بوو.

گوتی "ئازیزەکەم، لێرە بەدوا هەندێ شت سەبارەت بە ماڵی بەسمە دەگۆڕێت. ئێوە هەر هاورێکەی جاران‌و دەتوانی لە خوێندنگە بیبینی، بەڵام بەداخەوە چیتر ناتوانی بۆ یاریکردن بڕۆی بۆ ماڵیان‌و لەوانەیە ئەویش نەتوانێت بێت بۆ ئێرە".

"بۆچی نا، دایە؟"

هەردوو دەستمی خستە ناو دەستی‌و لەخۆی نزیکی کردمەوە.

وتی "زەینەب، باوکی بەسمە یەکێك بوو لەو پیاوانەی کە قۆڵیان گرتو بردیانە دەرەوە".

سەرم سوڕماوە، داخۆ بۆ بەسمە گریام—یان بۆ خۆمو سنوورداربوونی هاوڕێیەتییەکەمان، لەیادم نییە. ئێمە بەهۆی مەشقی دوو مانگی فڕۆکەوانی باوکمەوە لەسەر بۆینگ رۆیشتین بۆ سیاتڵ، وەك چۆن زۆرجار لە هاویندا دەڕۆیشتین. جاری دواتر کە بەسمەم دی، بیرمە مانگی ئەیلولو کاتێك بوو خوێندن دەستیپێکردەوە، لە پۆلەکەدا لەڕیزی دواوە دانیشتبوو. مامۆستاکان خۆیان لە ناوهێنانی ئەبوارد، خوێندکارەکانیش خۆیان لێ بەڕێز دەکرد. پشووەکانمان بە پیاسەکردن بەدەوری گۆڕەپانەکەدا بەسەردەبردو دەستی یەکمان دەگرتو سەرمان شۆڕدەکردەوە. شتێکی خراپ روویدابوو، بەڵام پێموایە هیچ یەکێکمان ناوی ئەومان نەهێنا. رۆژێك بەسمە نەهاتەوە بۆ خوێندنگەو ئیدی هەرگیز بۆ جارێکی تر نەمبینییەوە. سێ ساڵ دواترو وەختێك چاوم بەو پیاوە کەوت کە فەرمانی کوشتنی باوکی دابوو، خۆمم راهێنابوو ناوی باوکی بەسمە لەبیرکەم.

# لە یادەوەرییەکانی عالیەوە

ئێمە پەرۆشی ئەم هاوڕێیەتییە نەبووین. سەرەوەختێك لەگەڵ ئەو خێزانانەی ئێمە دەمانناسین ئاشنایەتی پەیداکرد، زۆربەی جار بەبانگهێشتەکانی قایل نەدەبووین‌و بۆمان ڕەخسا ماوەی دوو ساڵ خۆمانی لێ بەدووربگرین، بەڵام نەشماندەتوانی تا هەتایە خۆمانی لێ پەرێز بکەین.

پاش جێهێشتنی ئاهەنگێك، لە دەوری کاتژمێر ١١ی شەو لەنزیك ماڵی هاوڕێیەکەوە وەستاین‌و سەدامیش لە ژووری دانیشتن بوو. لەوێدا ئەو ئێوارەیە سێ کاتژمێرمان بەسەربرد گوێمان بۆ ئەو قسانە هەڵخستبوو ئەو دەیووتن. من چاوەکانیم هەمیشە لەیاد ئەمێنێت. جەختی لەسەر هەریەکە لە ئێمە دەکردەوەو هەموو کەسێکی زۆر لەنزیکەوە ئەپشکنی. لەبارەی زۆر شتەوە دواین، لەنێویاندا خولیای جیاوازو بەتایبەتیش ڕاوکردن، هەروەك یەکێك بوو لە هیوایەتەکانی ئەو. ئەو شەوە کاتێك گەیشتینەوە ماڵەوە واقمان وڕما، چونکە دیمان تاپڕێکی ڕاوکردنی وەك دیاری ناردبوو و ئەمە بانگهێشتی ئەو بوو بۆ دۆستایەتی.

چەند ڕۆژێك بەرلەوەی ببێتە سەرۆك کۆمار، کاتێك ئەهاتە سەردانمان بەتەنها بوو یان یەك پاسەوانی لەگەڵدا بوو. زۆرجار شەوان بە شەقامەکانی بەغدادا دەسوڕایەوەو سەردانی ئەم خانەوادەو ئەو خانەوادەی ئەکرد. شتێکی سەیر نەبوو لە نیوە شەودا لەلایەن ئەوەوە پێتڕابگەیەنن‌و بڵێن لە چەند ساتێکدا دەگات‌و داوای بانگهێشتی هاوڕێیانی زۆر دەکات تا بێن‌و هاوبەشیمان لەگەڵ بکەن. مرۆڤ تەنانەت ئەگەر لە شیرینی خەویشدا با هیچی بۆ نەدەمایەوە جگە لەوەی بانگهێشتی بکات‌و خۆشحاڵی بکات.

مەشروبی زۆر دەخواردەوەو ویسکی شیفاس ریگاڵی سکۆتلەندی لا پەسەند بوو. هەمیشە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە چەند کێسێك لەو ویسکییە بەرن بۆ هەموو ئەو ئاهەنگانەی ئامادەیان دەبوو. مەراقی لەسەما بوو، بەتایبەتی

لەگەڵ میوزیکی رۆژاواییدا. وێڕایی ئەوەی هەرگیز لە سەماکردن ماندوو نەدەبوو، کەچی نە سەماکەرێکی باش بوو نە مەی خۆرێکی باشیش. پیاوێکی بەهێزبوو و هێزو تینی دە پیاوی هەبوو. نکۆڵی لە بەهێزی کەسایەتی ناکەم. لەکاتێکدا بەهۆی کەسایەتی کاریزمییەوە خۆشماندەویست، هاوکات لێشی دەترساین چوون نەماندەتوانی تا بۆ هیچ داواکارییەکی بلێین.

ئەو شەوانە پتر باسی لاوێتی خۆی بۆ دەکردین، دەربارەی منالی خۆی‌و چۆنێتی هەڵاتنی لەدەست ئەشکەنجەی زڕباوکەکەی لەماڵی مامی دەدوا: کە چۆن سەگ شوێنی کەوتوون، تاریکی شەو نەیترساندووە هەرچەندە منداڵێکی دە ساڵانیش بووە. ناچارکراوە بچێتە بەر خوێندن‌و زانیویەتی تەنها مامی هەیە کە بتوانێت یارمەتی تەواوکردنی بدات. کاتێک تەمەنی دە ساڵ بووە لەپۆلی یەکەم وەرگیراوە. زۆرجار باسی ئەوەی دەکرد کە چەند پێی سەیربووە کاتێک یەکەم جار لە ژیانیدا جلی ژێرەوەی لەبەرکردووە. ئەو رۆژە لە خوێندنگە بەردەوام دزداشەکەی بەرزکردۆتەوە تا جلەکانی ژێرەوەی نیشانی هاوپۆلەکانی بدات. وەها مەزەنەی کردووە ئەوە گرنگترین شتە کەسێک بتوانێت هەیبێت‌و پێستویەتی خۆی پێوە هەڵکێشێت. هەروەها باسی چالاکی رۆژانی سیاسی خۆی بۆ دەکردین، وەڵ گێڕانەوەی ئەم چیرۆکانە چەند کاتژمێرێکی دەخایاندو پتر لەو کاتانەدا بوو کە ئێمە لەدەوری خڕدەبووینەوەو بەوردی گوێمان لێدەگرت.

دڵنیانەبووین کاتێک دەبێتە سەرۆک کۆمار بارودۆخەکە چۆن دەگۆڕێت. شەوێکی تەموزی ساڵی ١٩٧٩ بەسەردانێکی بۆ ماڵمان لە کاتژمێر هەشتی ئێوارە توشی سەرسوڕمانی کردین. بیرم دێت پێی گوتین "لە پیاوە پیرەکە نەجاتم بوو" (مەبەستی سەرۆک کۆماری ئەو کات، ئەحمەد حەسەن بەکر بوو). ئەو شەوە زۆر شادومان‌و میهرەبان بوو. سەدام خۆشی لەو راستییە نەدەهات کە بەکر هەمیشە پێش ئەوەی کۆبوونەوەکانی ببەستێت راوێژی بە فاڵچییەکەی دەکرد. رقی لەو راستییە بوو کە ئەم فاڵچییە کوێرە کە لەناوچەیەک بەناوی ئەلدوبجی دەژیا ئەوەندە کاریگەری لەسەر بڕیارە سیاسییەکان هەبوو. پێی گوتین ناردبووی لەشوێنی بیهێنن بۆ کۆشکەکەی‌و بەدەستی خۆی کوشتبووی. لێی زیادکردو گوتی "ئەو ژنە فاڵچییە نهێنی زۆری دەزانی، بۆیە پێویستبوو خۆی لێ رزگار کەم".

ئـەو شـەوە باسـی لـە هاورێیـەتی کـردو گـوتی، هـەر هاورێیـەك خیانـەت لـە هاورێیەکی بکات سزای مردن بەشی دەبێت. ئێمە بێدەنـگ بـووین و سـەرنجی ئـەو وتانـەمان دەدا کـە پێـی دەوتـین. ئەمانـە هـەم هەڕەشـە بـوون هـەم ئاماژەیـەکیش بوون بۆ کوشتنی یەکێك لە باشترین هاوڕێکانی، بەناوی محەمەد ئەلهەمـەدانی کـە وەزیری پەروەردەی ئەو کاتە بوو. سەدام شـەوێك پـێش ئـەوەی بیکوژێت خـوانی ئێوارەی لەگەڵدا خواردبوو.

# ڕستن

کاتێک لەساڵی ۱۹۹۹دا دایکم لە دەفتەری یادەوەرییەکانیدا دەستیکرد بە نووسین بۆم، ئەفسونێکی زۆر کەم لە نووسینەکانیدا هەبوون و پتر لە پەراوێزی کتێبێکی مێژوویی ئەچوون وەك لەوەی چیرۆك بن لەپشت پەیوەندییەکانی دایك و باوکمەوە. بەهەرحاڵ درگم بە هەستنەبزوێنی دەقەکە دەکرد چونکە بۆ چەندین ساڵ ئەمە گشت شتێك بوو کە شکم ئەبرد: ڕاستیگەلێك بوو پێم نەوترابوو و لەکیسم چووبوو. وەختێکیش تەمەنم گەشتە بیست‌ونۆ ساڵ، ئەوە یەکەمجار بوو لەگەڵ دایکم توانیمان کەم تا زۆر ڕاشکاوانە سەبارەت بە عەمو گفتوگۆ بکەین. هەرگیز دایك و باوکە عێراقییەکان ئەو مورتاحییەیان نەبوو وەك زۆرێك لەدایك و باوکی دی بەمنداڵەکانیان بڵێن، نیگەران مەبە ئازیزەکەم، خۆ شتێك نییە مایەی مەترسی بێت. دایکم هەمیشە گیریخواردبوو لەنێوان ئەوەی ڕاستییەکانم پێبڵێت لەحاڵێکدا ئەمە ئارەزووی سروشتی خۆی بوو، یان لێمی بشارێتەوە چونکە زانینی ڕاستییەکان بۆخۆی ترسناك بوو.

نزیکەی چوار چەمك لەژیانمدا هەن، کە شایەنی تێهەڵپێچانەوەن—ژن، جەنگ، بنەماڵە، ئاین. یەکەمجار لەڕێگای چیرۆکەکان و گوێگرتن لە گفتوگۆوە زانیاریم دەربارەی ئەو چەمکانە وەرگرت، پاشان لە ئەندێشەی خۆما شەن‌وکەوم دەکردن. من لەگەڵ دوو چیرۆکبێژی مەزندا گەورە بووم ئەوانیش، داپیرەم و کچە بچوکەکەی، واتە دایکم بوون. دایکم بورجی نەهەنگ بوو، خەیاڵی سەرنجڕاکێشی دەهۆنییەوەو بەناو دەشتی سەوزو پەلکەزێڕینەدا دەیگێڕای. نەنەشم دایکێکی مسوڵمانی ئاسایی بوو، حەزی بە داستانەکانی (هەزارو یەك شەوە) بوو کە پڕی کچەشاو مرۆڤی کێشەسازکەرو بێباك بوو بەسواری ئەسپی سپییەوە بۆ پاراستنیان. ڕیشەی وانە سەرەتاییەکانم لەو چیرۆکانەوە دەردێن سەبارەت بەژن و پیاو، مسوڵمان بوون و عەلمانی بوون، هەروەها جەنگ و باری ژیان لەنێوان شەڕەکاندا ئەوجا گرنگ نییە هەرچی ناوێکی لێدەنێن، بەڵام من هەرگیز ئەو دۆخە بە ئاشتی نازانم.

یۆتۆپیاو خەیاڵی دایکم ئەچوونەوە سەر"لادێی ژنان" شوێنێك بوو دایکم لەگەڵ پوورەکانم—بەتایبەت پوورە سەمەر کاتێك لەگەڵ مێردەکەیدا گەنگەشەیان دەبوو—پاش ساڵانێکی زۆر دەچوونە ئەوێ بۆ گفتوگۆ. کاتێك بۆ یەکەمجار دەربارەی "لادێی ژنان" بیستم، ئەوەندە بچوك بووم لەکاتی گەشتەکانی لەگەڵ خوێندکارەکانیدا بۆ باخچە هەڵواسراوەکانی بابل‌و حەزەری دێرین لە کۆشی دایکمدا دادەنیشتم. لەگەڵ هاورێ مامۆستاکانی شوێنێکی سێبەریان بۆ گەشتەکە دەدۆزییەوەو مەنجەڵە پلاستیکییەکان کە پڕبوون لەگەڵا مێوو بورەك‌و تەپولە دەکردەوە، هاوکات هەموویان دەستیان بە سکاڵاکردن لەدەستی مێردەکانیان دەکرد، هەڵبەت بەو چەشنەی ژنان هەمیشە دەیکەن. لەبارەی ئەوەی پیاو چەندە مەزاجین، چەندە داواکاریيان هەیەو بەبێ ئەوان ژیان چەندە خۆش‌و بێکێشەیە! جیهان چەند باشتر دەبوو گەر هاتباو ژنان بەڕێوەیان بردبا! بۆیە خەیاڵیان دەکرد لە لادێیەکی هێمن‌و خۆشدابن پڕی لە خانووی بچوك‌و کێڵگە بێت، بە جۆرێك هەموویان نزیکبن لەیەکەوە تا منداڵەکانیان وەك ئامۆزا گەورە ببن. ئاسمانی سەر "لادێی ژنان" هەمیشە دەدرەوشایەوەو ئەو رووبارەی پێیدا گوزەری دەکرد لەبەر تیشکی هەتاوا دەبریسکایەوە. لە هەموو شوێنێك باڵندەو گوڵ هەبوون، ژنان کاتەکانیان بەگۆرانی وتن‌و سەماکردن لەگەڵ منداڵە جوان‌و خۆشەویستەکاندا بەسەردەبرد. لەوێ هەژاری‌و جەنگ بوونیان نەبوو، لەبەرئەوەی لەم کۆبونەوە قەشەنگەی نێوان ژیانی راستەقینەو خەیاڵدا، ژنەکان بەئەندازەیەك زیرەك بوون بتوانن قسە لەگەڵ یەکدی بکەن‌و چارە بۆ گرفتەکان ببیننەوە. پیاوان هەفتانە تەنها بۆ چەند کاتژمێرێك رێگەپێدراو بوون سەردانی ئەو بەهەشتە بکەن، من لەوکاتەدا بە ساویلکەیی خۆم ئەو کارەم لاپەسەند بوو، کە باوکان بۆیان هەبوو سەردانی منداڵەکانیان بکەن بەو شێوەی بابا سەردانی دەکردین کاتێك لە ماڵەوە بوو. وەك هەموو یۆتۆپیاکان، لەوانەیە "لادێی ژنان"یش پتر پاساوەکانی قسەکەر نیشانبات بۆ دەربازبوون لە ئێستا نەوەك باسبێت لە دیمەنێکی جوان‌و هێمنی داهاتوو، بەڵام ئەفسوس ئەوێکات من لەوە تێنەدەگەشتم.

چاوەکانی نەنە هەنگوینی بوون‌و پرچێکی زۆر کەمی درێژی سپی هەبوو

لەکاتی چوونە دەرەوەدا لەژێر سەرپۆشی سپی‌و عەبادا دەیشاردەوە. پێستێکی زەردی لاوازو تەڕی هەبوو، هەمیشەو تەنانەت لە هاوینیشدا هەستێکی فێنکیی پێدەبەخشیم. ئەوەکانی لەدەوری خۆی کۆدەکردەوە لە ژوورەکەیدا کە زەوییەکەی بە قاڵیچەی خوری رەنگ تریی‌و ئاڵتونی‌و سور فەرشڕێژ کردبوو، دیوارەکانیشی بەئاوریشم ڕازابوونەوە، ئێمەش پاڵمان بەو پشتیانەوە دەدا کە نەخشێنرابوو بە هۆنراوەو وێنەی هەمان ئەو چاخانەی داستانانەکانی لێوە بۆ دەگێڕاینەوە. بەهۆی بەتەمەنییەوە دانەکانی نەمابوون، دەیبردینەوە ناو جیهانە دێرینەکانی کەشتی تێکشکاوو شەڕو رووداوە جادو ئاساکانەوە. کاتێك گەورە بووم‌و بڕیارمدا خۆم چیرۆکەکان بخوێنمەوە، بەهۆی ئەو توندوتیژی‌و رقبوونەوە لە ژن تێیاندا هەبوو دەتۆقیم، بەڵام گێڕانەوەکانی نەنەم هەمیشە سەرنجڕاکێش‌و رۆمانسی بوون. خۆشترینیان بەلامەوە چیرۆکی ئەو پاشایە بوو کە لە سێ کچەکەی پرسی ئاخۆ سامانەکەی موڵکی خۆیەتی یان خودا. دوو کچە گەورەکەی پێی دەڵێن "بەدڵنیاییەوە سامانەکەت بۆ خۆت دەگەڕێتەوە" ئەویش تورەکەیەك خشڵ‌و زێر وەك دیاری بەهەر یەکەیان دەبەخشێت، بەڵام لاوترینیان پێی دەڵێت سامانەکەی بۆ خودا دەگەڕێتەوە، بەمەش باوکی لە کۆشکەکەی دووری دەخاتەوە. لەلایەن خزمەتکارێکی هەژارەوە دەبرێت کە کوڕەکەی ئەوەندە بێ تواناو شەل‌و کەنەفتە پێویستی بە کەسێکە یارمەتی بدات بۆ تەوالێتیش بچێت. کچە شاکە چاودێری دەکات‌و فێریدەکات پشت بەخۆی ببەستێت، پاشان دەکەونە داوی خۆشەویستی یەکترەوەو هاوسەرگیری دەکەن، پێکەوە شانشینێکی نوێ لەسەر بنەمای باوەڕو خۆشەویستی راستەقینە دروستدەکەن، ئینجا بازرگانییەك سەرڕێ دەخەن، چوون کارە کۆنەکەی باوکی شکست دەخواو هەڵدەوەشێتەوە. چیرۆکەکانی نەنە هەمیشە بەوانەی سادە کۆتاییان دەهات; هەرچی شك دەبەین موڵکی خوایە; سوپاسگوزار بە. ئاگات لەلاوازەکان بێت، هەمووان لەژێر ئاسمانا یەکسانین. باوەڕت بە خۆشەویستی راستەقینە هەبێت، پاداشت دەدرێیتەوە.

لەم دوو چیرۆکخوانە زۆر جیاوازەوە، واتە دایکی ئازادیخواو نەنەی کۆنەخوازمەوە فێربووم کە پیاوان بەدەسەڵاتەوە لەدایك دەبن‌و ژنانیش لەڕێگەی زیرەکی‌و بەناو تەڵەزگەو بەربەست‌و بە دڵە ساخڵەمەکانیان چنگیانخستووە.

ئەگەر میهرەبان و ژیر بایت و کاری باشت بکردایە، دەبوویە ئەو شازادەیەی هەموو ئەوانەی هەبوو.

کەربەلا یەکێکە لە دوو شارە پیرۆزەکەی باشووری عێراق و بەپەنجا میلێک دەکەوێتە باشوری بەغداوە، کەربەلا شوێنی ئەو شەڕە خوێناوییە بوو کە تێیدا لەساڵی ٦٨٠ز دا ئەوەکانی پێغەمبەر محەمەد بوونە قوربانی. ئەو شەڕە بووە هۆی دووکەرتبوونی ئیسلام. ئەوانەی پێیان وابوو، کە میراتگری یاسایی محەمەدو خەلیفەی کوژراوی باوکی برا قوربانییەکان عەلی زاوای محەمەد بوون، بە شیعە ناسران. ئەوانەشی ئەو خەلافەتەیان لا پەسەندبوو کە لەلایەن ئومەوییەکانەوە پاش کوژرانی عەلی دامەزرا بە سونی ناسران. لەپاش چەندین ئەوە، ئەم پێگە سیاسیانە بوونە مەزهەب، هەمان شێوە جیاوازییە مەزهەبییەکانیش پۆلێن دەکران. شیعەکان گومانیان لەدەسەڵات هەبوو و باوەڕیان وابوو دادپەروەری راستەقینە لەسەر زەوی تەنها کاتی هاتنی مەهدی کە کەسایەتییەکی وەك مەسیحە بەرقەراردەبێت. لەبەرابەریشدا، سونییەکان گرنگییان بە جێگرتنەوەی فەرمانڕەوایی لەلایەن چینی نوخبەوە دا. لە عێراقدا ژمارەی شیعە لە سونە زیاتر بوو، کەچی حکومەت بەشێوەیەکی بنەڕەتی هەر لەلایەن سونەکانەوە کۆنترۆڵ دەکرا. ئەمرۆکەش، جیاوازی سەرەکی ئاینی نێوان ئەو دوو مەزهەبە ئەوەیە کە زانا ئاینییە شیعەکان پێیان وایە پێویستە هۆکارەکانی ژیانی هاوچەرخ بەردەوام جێگای قبوڵکردن بێت، لەحاڵێکدا زانا ئاینییە سونەکان ئەوە بەباش دەزانن پشت بەو چوار قوتابخانە جیاوازەی هزرو بیری سونە ببەستن کە چەند سەدەیەك لەمەوپێش و لەلایەن زانا ئاینییەکانەوە وەك مەزهەب بنیادنراون.

رۆیشتن بۆ ماڵی نەنەو کەربەلا بۆ من سەرکێشییەك بوو بۆ ناو رابردوویەکی نامۆو شارێکی پێش سەدەکانی ناوەڕاست، کە سەنتەرێکی بازرگانی بوو. شەقامەکانی تەسك بوون، هەندێکیشیان درێژدەبوونەوە بۆ پیادەڕەو و ڕیزەدوکانی بچووکی کەباب و ترشیات و تەسبیح فرۆشی و جامخانەکانی دوکانی زێڕو خشڵی درەوشاوە. لەدەرەوەی جامی ئۆتۆمبێلەکەمانەوەو لەو شەقامە پڕ ئۆتۆمبێلانەدا کە سەرشاربوو بە پاسکیلسوارو گوێدرێژی بارهەڵگرو خاوەنەکانیان، بۆ شوێنێك دەگەڕاین جێگەی خۆمانی تێدا بکەینەوە. ژنان بەهۆی

کارەوە بە عەبای رەشەوە بەناو شەقامەکاندا جمەیان دەهات، زۆرێك لە پیاوانیش دزداشەی درێژی نەریتییان لەبەردابوو. سەراپای شار بەهۆی خشڵو زێڕی ناو جامخانەی دوکانەکانو درەوشانەوەیان لەبەر تیشکی خۆر لەلایەكو بەهۆی رەنگی ئاڵتونی گومەزەی ئەو دوو مزگەوتەی هەژموونیان بەسەر شارەوە هەبوو لەلایەکی تر وەك گڕێکی ئاڵتونی دەردەکەوت بە لم دەورەدرابێت. هەرکە چووینە ماڵی نەنەوە، کەوتینە ناو بۆنو بەرامەی خۆشی گوڵو هاڵاوی ئەو گۆشتاوەی لە مەنجەڵەکانەوە هەڵدەستا. بیرمە نەنەم گوڵاوی خۆی هێشتا لە چێشتخانەدا دانابوو و چەپکە گوڵێکیش بەسەر کەوانتەرەکەیەوە لە چاوەڕوانی ئەوەدابوو، لە لابوری کەمۆڵەی پلاستیکیو شوشەدا ئامادەبکرێتو گوڵاوی ئەفسانەیی بۆ چێشتلێنانو پەرستشی ئاینی لێ سازبکرێت.

لە بەغدا، دایکم سەرقاڵی چاوپێکەوتنو کۆبوونەوە کۆمەڵایەتییە ناچارییەکان بوو، هەمیشە بەپەلە بووین بۆ شوێنێك، بەڵام لە کەربەلاو لەگەڵ نەنە، هەر لەو ساتەی دەچووینە ئەودیو دەرگاکەو نەنەم توند لە ئامێزی دەگرت، دەحەسایەوە. خۆشەویستی نێوانیان بەئاشکرا دیاربوو، بەڵام شێوازی ژیانو جلو پۆشاکیان جودابوو. من پتر لە منداڵێکی شار کە بشێت خەیاڵی ژیانی ناو گاو جووت بکات ناتوانم وێنای ژیانی وەك گوزەرانی نەنەم بکەم، سەرباری ئەمەش کاتێك لە باوەشی دەکردم، هەستم دەکرد ورردو خاش ئەبم لەئاست خۆشەویستیی پاكو بێخەوشیدا. نموونەی ژنانی پێش مۆدێرنە بوو، ئەوەی من ئەرزشیان زۆر دەگرتن ئەگەرچی بەدوای شوێنپێی ئەواندا نەدەڕۆشتن، ئەو تەنها مرۆڤێکە لەژیانمدا هەرگیز نەگۆڕا. نەرمونیانو بەسۆز بوو، هاوکات بەوشێوەیەی خەڵکانی بەئەمەك بەهێزن بەهێزبوو، لەوکاتەوەی من لەدایکبووم تا ئەوکاتەی کۆچی دوایی کرد وەك خۆی مایەوەو نەگۆڕا.

یەکەمجار کە لەبارەی مناڵییەوە بیستم، بەشێوەیەکی سەیر ساندرێلام بیرکەوتەوە. کاتێك زۆر منداڵ دەبێت، دایكو باوکیو براکانی یەك بە یەك دەمرن تا سەرەنجام هەتیو دەکەوێت. مامێکی چاودێری دەگرێتە ئەستۆی تا گەورەدەبێت، بەڵام چاودێرەکەی خراپ ئەو بەرپرسیارێتییەی بەکاردێنێو زۆرینەی سامانەکەی بەبا دەدا—ئەوەش تاوانێکی گەورەیە بەپێی یاسای ئیسلام.

بۆیە کاتێک تەمەنی دەگاتە سیانزە ساڵان، مامی بەشوی دەدات بەبازرگانێکی سەرمایەداری بەغداو وەک دەڵێن کۆچ دەکات بۆ ئێران. نەنەم ئەوەندە تەمەنی نەبوو بتوانێت یاسای هاوسەرگیری ئەنجامبدات، بۆیە دەخرێتە ژێر چاودێری خەسوی کە دەکاتە داپیرەی دایکم. ئەو داپیرەیە دایکێکی پرشانازی بووە لە بنەماڵەکەماندا، ژنێک بوو کارگەی چنینی تایبەت بەخۆی لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا دامەزراندبوو و بەچەند دەیەیەکیش پێش لەدایکبوونی من کۆچی دوایی کردبوو. شتێک کە بیستوومە لەبارەیەوە ئەوەیە کە پێداویستی کارگەکەی لە لەندەنەوە دابینکردووە، ئەوەش لەبەر هەندێک هۆکار لەوکاتەدا گرنگییەکی بەرچاوی هەبووە. ئەم دایکە بڕیاری داوە هەرگیز کۆنترۆڵی خێزانەکەی لەدەست نەدات، بۆیە بوکەکەی کردۆتە نیمچە خزمەتکاری خۆیو کچەکانی کە بە خەیاڵی من رۆڵی زڕخوشکە بەدکارەکانی ساندرێلایان کایەکردووە. بەم شێوەیە نەنە خراپو بەردەستە گەورە بووە، لەژێر سایەی خەسوی، کچەکانی خەسویو مێردەکەیدا ماوەتەوە تا ئەوکاتەی یەک بەیەک بەبەرچاویەوە مردوون. دواتر بۆ ئارامبوونەوە پەنای داوەتە بەر ئاینو پاشاتریش ئەو هەستەی لە منداڵەکانیدا دیتۆتەوە. چەند ساڵێکی کەم پێش ئەوەی من لەدایکبمو کاتێک مێردەکەی دەمرێت، خانووە گەورە شانزە ژوورییەکەی لەسەر دیجلە لە بەغدا، ئەو خانووەی تێیدا لەتەک ستافێک خزمەتکاری فارسدا ژیابوون بەجێدێڵێتو دەگوازێتەوە بۆ خانوویەکی بچوک لە کەربەلا، لەوێ ڕاوێژکارێکی رۆحی بەناوی رۆحوڵا خومەینی دەدۆزێتەوە، بازنەیەکی نوێ هاوڕێ پەیدادەکات، لەوەش بترازێ حەوشەکەی بە گوڵو دارودەوەن دەچێنێت.

بۆ پیادەڕۆ ماڵی داپیرەم دوور هەڵکەوتووە لەو دوو مزگەوتەی لەسەر مەزاری نەوەکانی پێغەمبەر (ص) کە لەسەدەی حەوتەمدا شەهیدکران بنیادنراون. مزگەوتەکان بەمنارەو گومەزەی ئاڵتونی رازێنراونەتەوەو هەمیشە پڕن لە خەڵک، لەنێویشیاندا ئەو کەسانەی لە هەموو جیهانی ئیسلامییەوە بۆ سەردانکردن دێن. لەبەرئەوەی لە مزگەوتەکاندا ژنانو کچان عەبا لەبەردەکەن، نەنەش یەکێک لە عەباکانی خۆی بەمن دەدا، بیرمە وەک منداڵێک چمکی جلە رەشەکانم گرتبوو تا لە زەوییەکە نەخشێت. پاشان رۆژێک عەبایەکی بچوکی بۆ خۆم سازکرد. رۆژێک

بۆ بۆنەیەك لەگەڵ هاوڕێکانی نەنەم بۆ مزگەوتی ئەلحسێن بانگهێشتکراین، کاتێك چووینە ناو حەوشە گەورەکەیەوە کە بەکاشی سەوزو شین رازێنربووەوە، هەستمکرد کەوتوومەتە ناو جیهانێکی ژنان کە نهێنییەکانی رۆحانییەت دەزانن هەروەها یاپراخی گەڵامێو بەنەریتی عێراقی پێچرابووەوە، لەگەڵ پیازو قیمەی گۆشتو برنجو زۆرێك لە لیمۆ ترشیش دانرابوون. بەدەورماندا، پۆلە کۆتر دەیانباقاند، ئەو سەردانکەرە هەژارانەشی توانای ئوتێل گرتنیان نەبوو، دەبینران لە سێبەرەکاندا دەحەوانەوە.

کاتێك چووینە ژوورەوە، عەبا بچکۆلانە نوێکەم لەژێر چەناگەمەوە گرت تا پرچم دەرنەکەوێت، لەوکاتەدا چاومان بەو ئاوێزەو سورەیا زەبەلاحە کریستاڵانە کەوت کە بەساپیتەکانەوە هەڵواسرابوون و کۆمەڵ کۆمەڵ پیاوان و ژنان لەسەر فەرشی ئێرانی فراوانی رەنگ قرمزو سور بڵاوببوونەوەو نوێژیان دەخوێند. یەکێك لە سوچەکانی مزگەوتەکە بە ژمارەیەکی زۆر شیشی زیوین دەورەدراوەو لەوێدا گوڕە شەهیدەکەی عەلی بەخاك سپێردراوەو هەمووان لەدەوری کۆدەبنەوە، دەزویەکی سەوز یان پارچە قوماشێکیان بەشیشەکانەوە دەبەستن و هەریەك لای خۆیەوە ئاواتێکی دەخواستو داوایدەکرد بۆی بێنێتەدی. دێڕی سەرەکیم لەبیربوو و فێرکرابووم لەکاتی نوێژکردندا بیڵێم "باوەڕم وایە کە جگە لە خوای گەورە هیچ خوداوەندێکی تر بوونی نییە، هەروەها محەمەد پێغەمبەری ئەو خودایەیەو عەلی هاوەڵییەتی". ئەمە هەموو شتێك بوو. من تەماشای نەنەو دایکم دەکردو بەهەموو توانامەوە لاسایم دەکردنەوە. کاتێك نەنە کڕنوشی دەبرد، کڕنوشم دەبرد. کاتێك نوێژی دەخوێند، منیش دەمخوێند. "بسم الله الرحمن الرحیم"، بەناوی خودای بەخشندی دلۆڤان.

پاش ئەوەی ئەو رۆژە لە مزگەوتەکە هاتینە دەرەوە، چووین بۆ دوکانێکی شیرینی فرۆشی و لەوێ شوکولاتی هاوردەی سۆڤیەتیمان کڕی.

دوکاندارەکە پێیگوتم "چەندە کچێکی خنجیلانەو جوانی. جوانییەکەت ئێرانیانە هەڵکەوتووە".

منیش گوتم "ئێرانی نیم، عێراقیم".

وتی "تۆ خەڵکی بەغدای، مەگەر نا؟"

پرسیم "تۆ لەکوێ ئەوە دەزانی؟"

"لەبەرئەوەی عەباکەت زۆر توند گرتووە، وادیارە دەترسی دابکەوێت".

من نەمزانی گاڵتە دەکات، بەڵام نەنەم دەستیکرد بەپێکەنین، هێند بەهێز خەنییەوە، بەجۆرێك لەدەرەوەی سنوری هەموو شەرمو نەریتێکدا بوو.

بیرمدێت پێکەنینەکەی وەك ئەوە بوو کاتێك دایکمو پوورە سەمەر تورەیان دەکرد بەقسەکردن دەربارەی ئەو پیاوە ئاینییەی هەندێ جار ڕاوێژی پێدەکردو ناوی خومەینی بوو، زانایەکی ئاینی دیاری ئێرانی بوو پێیان وابوو تەنها نامۆیی ئەوەیە، کە بەپەیامەکەی ژنان بۆ سەدەکانی ڕابردو دەگێڕێتەوە. خومەینی پاش ئەوەی لەلایەن شای ئێرانەوە بەهۆی هەڵگیرساندنی شۆڕشەوە لە ١٩٦٠ کاندا دوورخرایەوە، هاتو لە کەربەلا نیشتەجێ بوو. دواترو لەساڵی ١٩٧٨ لەسەر داوای شا ڕەزای پەهلەوی ئێران عێراقیش دەریکرد، چونکە باوەڕوابوو دەستی لە تێکدانی ئارامی ناوچەکەدا هەبوویێت. وارێکەوت ئەو ڕۆژە باوکم فڕۆکەوان بوو کاتێك بەرەو ڕۆژاواو پاریس بەفڕۆکە گواستیانەوە، بەڵام خومەینی لەوێش نەمایەوە. پاش ساڵێكو لەسەرەتای ١٩٧٩ لەرێگای ڕاپەڕینێکی جەماوەرییەوە دەسەڵاتی گرتەدەست لە ئێرانو جیهانی ئیسلامیو ڕۆژاواشی توشی شۆك کرد. شا ڕەزای پەهلەوی بۆ ماوەی نزیکەی چوار دەیە حوکمی ئێرانی کرد. بەهۆی کرانەوەشی بەرووی بازرگانیو کولتورو بەرژەوەندی سەربازی ڕۆژاوادا پاڵپشتی ئەوانی بۆ خۆی مسۆگەر کردبوو. بەڵام لە کاردانەوەیەکی توندو کلاسیکیدا، ئەو ملیۆنان ئێرانییەی پەراوێزخرابوون بەهۆی گەندەڵیو دیکتاتۆریەتی دڕەندانەی ژێر ماسکی ڕۆژاواییەوە ڕاپەڕینو داوای گۆڕانکاریان کرد. شۆڕشەکە هەڵوەستەی نیشتیمانپەروەران، کۆمۆنیستان، یەکێتییە خوێنکارییەکان، گروپەکانی ژنانو ئەوانی دیکەش بوو، بەڵام لەلایەن توندڕەوە ئاینییەکانەوە کە خومەینییان خستە سەر دەسەڵاتو ناویان لێنا ئایەتوڵای گەورە، قۆرخکرا. سەرکردە عەرەبەکان، بەتایبەتی سەدام حسێنی دراوسێی لێرەوە ترسی بڵاوبوونەوەی ئەم شۆڕشەی لێنیشت.

ئەو ڕۆژەی جەنگ لەگەڵ ئێران دەستیپێکرد، لەتەك ئامۆزاو خاڵۆزاکانم لە چوونەدەرەوەیەکی کۆتایی هاویندا لە پارکێکی زۆر خۆشدا بووین. هەمیشە

خۆمم بەخۆشبەخت دەبینی بەهۆی ئەوەی ئامۆزاو خالۆزای هاوتەمەنم زۆر هەبوو، تەمەنی حەوتمان لەنێوان دە بۆ سیانزە ساڵاندا بوو زۆرینەش کوڕ بوون. هەندێك لە براو خوشکەکانی باوك‌و دایکم هاوشێوەی ئەمان منداڵی هەمان تەمەنیان هەبوو، هەروەها لەبەرئەوەی براکانی خۆم یەکێکیان پێنج ساڵ‌و ئەوەی تر دە ساڵ لە من منداڵتربوون، ئەم ئامۆزاو خالۆزایانە وەك خوشك‌و براو هاوڕێ تێکەڵاو دەبووین.

نەعیم کوڕی مامم بوو و لەگەڕەکی ئێمەش دەژیان. قوتابییەکی زیرەك بوو ساڵێك لە من گەورەتر بوو، لاوازو سەرەنجڕاکێش بوو، لەو جۆرە هاوڕێیانە بوو بتوانێ هەم قسەو هەم یاریشی لەگەڵدا بکەی. بیرمە پڕی جانتایەکم دەکرد لەو ئۆتۆمبێلانەی پێشبڕکێ باوکم بۆی هێنابوومەوەو لە باخچەکەمان هەندێك لیمۆی ترشم لێکردەوەو دەڕۆشتم بۆ ماڵی ئەوان، لەوێش کونمان دەکردە میوەکان‌و خوێمان تێدەکردو بەدرێژایی ڕۆژ دەمانمژی‌و خەریکی پێشبڕکێی ئۆتۆمبێلی منداڵان‌و قسەکردن دەبووین‌و متمانەمان بەیەك هەبوو.

جارێك لە خوانێکی گۆشتبرژاندندا لە ماڵی ئێمە بوو، لێم پرسی "دەتوانم نهێنییەکی گەورەت پێ بڵێم؟"

وتی "بەدڵنیاییەوە".

وتم "لەدەستشۆری سەبارەت بەخوا بیردەکەمەوە".

چپاندی بەگوێمدا "منیش! بەدەست خۆم نییە. هەموو جارێك کە دەڕۆم بۆ دەستشۆری لەبارەی ئەو ڕاستییەوە بیردەکەمەوە کە نابێت لە تەوالێتدا بیر لەخوا بکەمەوە، کەچی بیری لێدەکەمەوە".

"دەی، ئەوە خۆ حەرامە!"

حەرام وشەیەکی هەمەگیر بوو بۆ هەموو ئەو شتانە بەکاردەبرا لەلایەن ئایینەوە قەدەغەکراوە. حەرام بوو لە تەوالێتدا بیر لە خودا بکەیتەوە، چونکە پاکێتی بەشێکی سەرەکییە لە ئیسلام. هەروەها حەرامە وەك وێنەیەك بیر لە خوا بکەیتەوە. خوا لە هەموو شوێنێك بوو، لەسەر زەوی، لە ئاسمان، لە پشتمانەوە، لە هەموو شوێنێك بوو. بەڵام هێشتاش جاروبار توشی گوناهی هەوڵدان بۆ وێناکردنی خودا دەبووم.

لێم پرسی "باشە شتێك هەیە دووقات حەرام بێت؟"

وتی "نازانم".

داود، کوڕە گەورەی خاڵە عادل و گەورەترینی خاڵۆزاکانم بوو، هەمیشە گەورەکان ئەویان دەکردە لێپرسراوی ئەمانی ترمان. من کاتێکی زۆرم لەماڵەکەی ئەوان کە لەسەر دیجلە بوو بەسەردەبرد، خۆی و براکەی وەك خوشکی بچووکی خۆیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردم. چەشنی چاوی بنەماڵەی دایکم چاوەکانی خڕو گەورە بوون، روومەتیشی کەمێك خڕپن بوو و ئەمە وایلێکردبوو وەك هاوڕێ و خۆشەویست دەرکەوێت. هەمیشە کەشخەو جوانپۆشبوو، نازانم چۆن بەڵام ئەوم بەبلوزێکی رەنگاوڕەنگی خۆڵەمێشی و سەوزو مۆرەوە بیردێتەوە. وانەی عودی دەخوێند، کە ئامێرێکی دە ژێی عەرەبانە، منیش وانەی پیانۆم دەخوێند، بۆیە هەندێك جار پێکەوە مۆسیقامان دەژەند. هەمیشە لەگەڵمدا میهرەبان و لەخۆبوردو بوو، تەنانەت ئەو کاتانەش کە لە خوێندنگەی سەرەتایی بووین و قەیتانی پێڵاوەکانم شلدەبوونەوە لەگۆڕەپانەکەدا دوای دەکەوتم و پێم دەووت بۆم توندبکاتەوە. پاشان رۆژێکیان فێری کردم بۆخۆم توندیان بکەمەوە.

ئەو رۆژەی جەنگ لەگەڵ ئێران دەستیپێکرد داود سەرکردەی دەستەکەمان بوو. ئەو رۆژە تایبەت بوو چونکە بۆ یەکەمجار کاتی ئەوەمان هاتبوو، ئێمە ئامۆزاو خاڵۆزاکان ئەوەندە گەورە بووین کەم تا زۆر بتوانین خۆمان بە پارکدا بگەڕێین و تەنها یەك خانمی پێگەیشتوو وەك هاوەڵ لەتەکمان بێت. هەمووم لەبیرە، گشت گڵۆپە رووناکەکان و پێکەنین و پەشمەك و سواربوون و دابەزینەوەکانی یاری چەرخوفەلەك بەرلەوەی سواری تەکسی ببین و کۆتایی بەو رۆژە بهێنین و بچین بۆ ئایسکرێم خواردن بۆ ئەلەنسورییەی بێڤێرلی هیلسی بەغدا. کاتێکیش رۆیشتینەوە بۆ ماڵ، خەریك بوو تاریکی دادەهات و وادەردەکەوت کارەبا بڕابێت. من دەبوو یەکەم کەس دابەزم، کاتێك ئۆتۆمبێلە پڕ ژاوەژاوەکەمان گەیشتە گەڕەکی فڕۆکەوانان لەبەردەم ماڵی ئێمەدا وەستا هەموو گڵۆپەکان کوژابوونەوە. دایکیشم لە دەرگای پێشەوە چاوەڕوانی دەکردم.

پرسی " ئەرێ ئەوە لەکوێ بوون؟ مەگەر نەتانبیستووە شەڕ هەڵگیرساوە؟"

شەڕ؟ کام شەڕ؟

بەپەلە بردمییە ژوورەوەو رایکرد زەنگلێبدات، تا بە خانەوادەکانی تر بڵێت منداڵەکانیان سەلامەتن. هیچ کەس و سەدام حوسێن لەهەموو کەس کەمتر باوەڕی وابوو ئەو شەڕە ئەوەندە درێژە بخایەنێت، بەجۆرێك هەموو ئەو ئامۆزاو خاڵۆزایانەم ئەوڕۆژە لە ئۆتۆمبێلەکەدا بوون بەر لە کۆتایی جەنگ تەمەنیان چووە قۆناخی پێگەیشتن و بانگکردن بۆ سەربازی، لێرەوە کەوتنە بەر مەترسی ناردن بۆ بەرەکانی شەڕو ئەو جێیەی سەدان هەزار گەنج ژیانیان لەپێناوی هیچدا تێدا بەختکرد.

بەچەند رۆژێك پاش دەستپێکردنی شەڕەکە بوومە پانزەساڵ، زۆر لەوە گەنجتربووم بتوانم فامبکەم چی بەسەر بنەماڵەکەماندا دێت، یا لەوە بگەڕێین ئەو شەڕە چ کاریگەرییەکی لەسەر سیاسەتەکانی جیهان و رۆژهەڵاتی ناوین بەجێهێشت. کاتێك کرانەوەی خوێندنگا دواخرا، یەکسەر خەیاڵم بۆ فیلمکارتۆنی زیاترو هاوینی زیاتر چوو. یەکەمجار کە موشەکی دژەفڕۆکەم لە ئاسمانی شەودا بینی، رامکرد بۆ ناو باخچەکەمان و دەستمکرد بە هەڵقونینەوە، وامزانی هاوشێوەی چواری تەموزو سێیتڵ وەهایە. باوکم لەوکاتەی شەڕەکە تازە دەستیپێکرد لەدەرەوەی وڵات گیریخواردبوو و نەیدەتوانی تا چەند هەفتەیەك بگەڕێتەوە، بۆیە ئەرکێکی زۆر کەوتەسەر دایکم تا یارمەتیدان و بەخێوکردنی سێ منداڵەکەی لەکاتی شەڕدا بگرێتە ئەستۆ. لەسەرەتادا زۆرجار راداری هەوایی دەردەکەوتن، کاتێکیش زەنگی ئاگاداری لێدەدرا، زۆرێك لە هاوڕێکانم پێکەوە لەگەڵ دایك و باوکیان شەوانیان لەژێر پلەکانەکاندا بەسەردەبرد. دایکم نەیویست ئێمە بەو شێوەیە بژین، بۆیە ئەگەر کارەبا بکوژایەتەوە، پەردەکانی دادەدایەوەو مۆمی دادەگیرساند، هەروەها بەسێبەری دەستەکانی وێنەی بەسەر دیوارەکەوە دەکردو پیشانی دەداین، پاشانیش شەوشادی دەگوت و ماچی دەکردین، ئینجا لە جێگاکانی خۆماندا دەیخەواندین.

دەیگوت "ژیان بەردەوامە، ناشێت رایوەستێنی—تەنانەت ئەگەر شەڕیش بێت".

براکانم زۆر منداڵ بوون، بۆیە دەمزانی قسە بۆ من دەکات.

پاش ئەوەی خوێندنگا کرایەوە، موشەکێکی ئێرانی لەو خانووەدا

کەوتەخوارەوە کە هاوڕێی براکەمی تێدا دەژیا. ئەو شەوە نیوەی خێزانەکەیان مردن و نیوەکەی تریان زیندوو مان. بیرمدێت تەماشای برا حەوت ساڵانەکەمم دەکرد لەسەر جێگەی نووستنەکەی دانیشتبوو، لە ئەلبومەکەیدا بەدوای وێنەکانی هاوڕێکەیدا دەگەڕا چونکە دایکی ڕۆشتبوو بۆ خوێندنگەکەیان و وتبووی نە تەنها کوڕەکەی بەڵکو هەرچی شتێکی ئەویش هەبووە لەدەستیداوە. دواتر بیستم بومبێکی ئێرانی لە ماڵێکی تری داوەو هەموو خێزانەکەی کوشتووە. من ماڵەکەیانم هەرگیز نەبینیبوو، بەڵام دەهاتە پێش چاوم وەك ماڵی ئێمە ئەویش لەسەر سوچێکەوە هەڵکەوتبوو، هەروەها خەیاڵی ژووری نووستنی منداڵەکانیشم دەکرد هەمان چەشنی ماڵی ئێمە لە نهۆمی سەرەوە بوو.

لەوەبەدوا ژیان گەلێ ترسناك بوو. بیرمە کاتێك باوکم دەڕۆیشت بۆ سەفەرەکانی، دایکمی لە باوەش دەگرت و ماچی دەکرد وەك ئەوەی بترسێ ئیدی هەرگیز نەیبینێتەوە. نەنەو هەموو خێزانەکەی رادیەش دەهاتن لەگەڵمان دەمانەوە، ئەگەرچی تێنەدەگەشتم چۆن تفەنگەکەی باوکی رادیە لەو بۆمبهاوێژە ئێرانییانە دەمانپارێزن. شەوان لە جێگاکەمدا ئەمپرسی داخۆ ئەو فڕۆکەوانە ئێرانییانەی بۆمبارانمان دەکەن، دەزانن ئەوان منداڵانێ دەکوژن کە نایانبینن. هەندێك شەو لەدەرەوەی پەنجەرەی ژووری نووستنەکەمەوە موشەك بەئاسماندا تێدەپەڕی. دەپاڕامەوە لەسەر ماڵی ئێمە نەکەوێتە خوارەوە، کاتێك دەیدا لە زەوی و ڕوناکییەکی چڕی شێوە نیوە بازنەیی بەسەر ماڵی یەکێکی ترەوە دروستدەکرد هەستی تاوانم تێدا ئەبزوا. ئەگەر موشەکەکە لەنزیکمانەوە لە زەوی بدایە هەستم بە لەرینەوەی زەوییەکە دەکرد، بەرلەوەی شکانی شوشەکان بیتەگوێم و هۆڕینی ئەمبولانس دەستپێبکات، بێدەنگییەکی تەواو کپ باڵی بەسەر ناوچەکەدا دەکێشا. هەرگیز ئەو تەرزە خەیاڵەم نەبوو، ئاخۆ منداڵانی ئێرانیش هەمان رامانیان سەبارەت بە بۆمبهاوێژە عێراقییەکان هەیە. دەی ئاخر ئێران دوژمنمان بوو.

ڕۆژێك لەسەرەتای جەنگەکەدا شتێك ڕوویدا کە زۆر ترسناك و سەیر بوو. لەگەڵ دایکمدا بە ئۆتۆمبێل لە کۆگای سەوزەفرۆشییەکەوە بۆ ماڵ دەهاتینەوە، لەوکاتەدا لەناکاو فڕۆکەیەکی تیژڕەوی ئێرانی زۆر بەنزمی بەسەر شەقامەکەدا

تێپەڕی بەشێوەیەك بوو توانیمان فڕۆكەوانەكە ببینین. چەند ڕۆژێك پێشتر تەلەفزیۆنی عێراق ڤیدیۆی هەندێك سەربازی گیراوی ئێرانی بڵاوكردبووەوە، دایكم و هاوڕێیەكی بەچپەوە سەبارەت بە جوانی روخساری ئێرانییەكان قسەیان دەكرد. كات نەدەڕۆیشت، بیرمە لە جامی پێشەوەی فڕۆكەكەوە تەماشای فڕۆكەوانەكەم دەكرد تا بزانم راست دەڵێن. كاتێك بەسەرماندا بەنزمی تێپەڕی، روخساریم بینی و دەزانم ئەویش ئێمەی بینی. سمێڵی هەبوو، تەنها پیاوێكی سادە بوو. ئەبێ بیری لەچی كردبێتەوە كاتێك تەماشای من و دایكمی دەكرد؟ داخۆ بەنیازبوو بمانكوژێت؟ رقی لێمان بوو؟ بەمەبەست بۆ ئەم بەشەی بەغدا هاتبوو، یاخود رێگای ونكردبوو؟ لە تەلەفزیۆن دەیانگوت مەلا ئێرانییەكان ئەوەندە گەوجن فڕۆكەوانەكانیان بەبێ نەخشە دەنێرنە عێراق. باشە دەیویست بۆمبارانی ماڵێكی وەك ماڵی ئێمە بكات؟ مەگەر بەهۆی بۆمبی ئەوەوە من هاوڕێكانم لەدەست دەدا؟

عەقڵ پێم دەڵێت كات نەبوو ئەو هەمووە بیركردنەوانە لەو چركەو دووانەدا بە مێشكما گوزەر بكەن، بەڵام گشت ئەوانەو زیاتریشم بەبیردێتەوە.

ئەو پاش نیوەڕۆیە كاتێك فڕۆكەوانەكە بەسەرماندا بەنزمی تێپەڕی، دایكم شتێكی نائاسایی كرد، دەستی بەرزكردەوەو لێی راوەشاند. پاشاترو دوای ئەوەی فڕۆكەوانەكە بە سەلامەتی گەڕایەوە باوەشی ئاسمان و ئەو جێگایەی لێوەی هاتبوو، دایكم تەماشای منی كردو بەهەردوو دەستی سیمای حەپاساوی گرتم.

پرسی "چۆن بوو بەلاتەوە؟"

لەگەڵ دەسپێكی شەڕدا، دەستبەجێ بارودۆخی بەغدایش گۆڕا. لەكەشەكەیدا ئەمە ئاسان هەستكرا. ئاڵای عێراقی—سورو سپی، رەش و سێ ئەستێرەی سەوزی بەسەرەوەیە، لە هەموو شوێنێكدا هەبوو بەجۆرێك لە جۆرەكان بۆ من وەك منداڵێك پتر مایەی ترسان بوو لەوەی مایەی دڵنیایم بێت. شەقامەكان سیخناخبوون بەو خۆپیشاندەرە بەعسیانەی دروشم و هوتافی دژە ئێرانییان دەووتەوە. نووسینی دژە ئێرانی لەسەر دیوارە گشتییەكان زۆر دەبینرا. لە چاوتروكانێكدا، سەربازی چەكدارو وێنەی سەدام حسێن لە هەموو شوێنێك دەردەكەوتن. رۆژنامەی وڵاتەكەمان وێنەی سەركردە سەربازییە عێراقییەكانی

وەك جەنراڵەکان بە جلی سەربازییەوە دەکردە مانشێتی‌و تێیدا بەڕێزەوە لەسەر مێزێکی بازنەیی دانیشتبوون ئەزمونیان لە سەرۆك کۆمارەوە وەردەگرت، هاوکات ئێرانییەکانیش وەك مەلای نەزان‌و بە ڕیشی پیسەوە نیشاندەدران چۆن لەسەر کورسی وەستابوون بەسەر یەکدا هاواریان دەکردو دەیانقیژاند. ئەم توندڕەوە بێ عەقڵانە پەلاماری ئێمەیان دابوو چونکە دەیانویست شۆڕشەکەیان لە هەموو جیهانی عەرەبیدا بڵاوبکەنەوە، سەدام حسێنیش پەیمانی پێدابووین بەرگریمان لێبکات. شایانی باسە سەدام ئەم جەنگەی بە قادسیەی دووەم ناوزەد دەکرد، بەناوی جەنگی قادسیەی یەکەمەوە کە لە سەدەی حەوتەمدا بەرپابببوو بۆ فراوانکردن‌و بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە مەملەکەتی فارسەکاندا، هەروەها خۆشی بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسی جەنگاوەری مەزنی مسوڵمانان لەو جەنگەدا بەراورد دەکرد. ئەو دوژمنەکانمانی بە ئێرانییەکان ناونەدەبرد، بەڵکو دەیووت فارسە مەجوسەکان "فارسە ئاگرپەرستەکان" دواتر فامی ئەم دەستەواژەیەم کرد کە بۆ گیان بەبەرداکردنەوەی رقی رەگەزپەرستی دژی فارسەکان بەکاردەبرا، بەتایبەتیش ئەو زەردەشتییانەی ئاگر پەرستبوون‌و چەند سەدەیەك بوو هاتبوونە سەر ئاینی ئیسلام. بە زیندوکردنەوەی رق‌و دوژمنایەتی کۆن‌و بانگەشەکردنی ئەوەی ئەو عێراق لە بڵاوبوونەوەی شۆڕشی ئێرانی دەپارێزێت، توانی ئەم جەنگە وەك شەڕی بەرگریکردن بناسێنێت نەك وەك شەڕی خۆسەپاندن، هەروەك ئەمەی دواییان لە قورئاندا قەدەغەکراوە. میدیاکانمان ئەوەندە کۆنترۆڵکرابوو، تاوەکو عێراقم بەجێنەهێشت نەمزانی ئێران تەنانەت ئەو لایەنەش نەبووە کە شەڕەکەی هەڵگیرساندبوو.

لە قوتابخانە، فێربووین بەرگری لە وڵات‌و ژیانی خۆمان بکەین. راهێنانی خۆشاردنەوەمان لە هێرشی ئاسمانی لەژێر تەختەکاندا دەکرد، وانەی وەرگرتنی چارەسەری سەرەتایی فێردەبووین، هەروەها تێگەشتین لەوەی دوژمنەکانمان تەنها ئێرانییەکان نین بەڵکو ئەو عێراقیانەشن کە بەنهێنی هاوکاری ئێرانییەکان دەکەن. بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم ناپاکانەی ناو خۆمان، زانیمان کە ئاژانسێکی نهێنیی حکومی هەیە پێی دەوترێت موخابەرات، بۆمان باسکرا کە ئەوان کەسانێکن جلوبەرگی مەدەنییان لەبەردایەو بەشێنەیی کار بۆ پاراستنی ئێمە

دەکەن لە مەترسی ئەو لایەنگرە ئێرانییانەی ئەشێت گرفتبن بۆ سەر ئارامیمان. موخابەرات لە زمانی عەرەبیدا بەواتای "هەواڵگرەکان" دێت.

محەمەد وەك هەمیشە ئامادەبوو بۆ نیشاندانی زانیارییە بەنرخەکانیو گوتی "من دەزانم ئەوانە کێن—پیاوگەلێکن بەسمێڵی رەشی زلەوە".

مایەی پێکەنینە چۆن ئەو هەموو شتە لەبیردەکەیت مامۆستاکان هەوڵدەدەن فێرت بکەن، کەچی سیماو روخساری ئەوانەت بیردێتەوە کە چاودێری دەکەن. کاتێك محەمەد ئەمەی گوت، مامۆستاکەمان ڕوخساری تێکچوو. بیرمە، دوای کەمێك قسەکانی بۆ محەمەد راستکردەوە.

وتی "کەس نازانێت ئەوان شێوەیان چۆنە، چونکە ئەوان نهێنین. ئەوەش خاڵی جەوهەری بابەتەکەیە".

بەڵام محەمەد راستی گوت، تەنانەت منیش دەمزانی شێوەیان چۆنە. چونکە هەفتەی پێشوو دایکم بێزاری دەربڕیبوو سەبارەت بە کۆبوونەوەیان لەدەروبەری دوکانی ئایسکرێم فرۆشێك، گوایە پۆلێك پیاو بوون بە سمێڵی رەشی زلەوەو ئەڵێی فەرمانیان پێکرابوو لەوێدا بچەقن، وەختێکیش ئێمە لە دوکانەکە دێینە دەرو خەریکی خواردنی ئایسکرێم دەبین لە تەوقی سەرمانەوە تا پەنجەی پێمان تێمان بڕوانن.

خانەوادەکەم هیچ ئارەزوویەکیان لە سیاسەت نەبوو. باوکم کوڕی بەرپرسێکی دیاری وەزارەتی پەروەردە بوو، بەهۆی راشکاوی بۆچوونە سیاسیەکانییەوە توشی وەرسکردن ببووەوەو خۆی لە سیاسەت کەنارگیر کردبوو. تا ئەو ئەندازەیەی من تێدەگەم، زۆرێکیش لە عێراقییە روناکبیرەکان لەسەروبەندی کۆنترۆڵکردنی درەندانەی سەدام حسێن بەسەر عێراقەوە لەرێگەی حزبی بەعسی عەرەبی نیشتمانییەوە خۆیان لە سیاسەت تەرێزکرد. لەبەرئەوەی خوێندنگاکانو هێڵە ئاسمانییەکانیش خۆماڵیکرابوون، پێویستبوو دایكو باوکم وەك زۆرێك لە عێراقییەکانی تر ئەگەر بۆ بەدەستهێنانی کارو پیشەیەکیش بووە پەیوەندی بە حزبی بەعسەوە بکەن. شایستەی باسە چەند ئاستو پلەیەکی ئەندامێتی هەبوو، هەرچەندە هەموو کەسێك جیاوازی نێوان توشبوویەكو بڕواداریێکی راستیی بەباشی دەزانی. پلەی سەرەتایی موئەید یان لایەنگر، نزمترین ئاست بوو بتوانی

پێیەوە دەربازبێت. ئەگەر پارێزگاری کەمێك باشتریشت بویستایە دەبوو بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە کۆبوونەوەکاندا ئامادەبیت تا ببیتە ئەسیر یان شوێنکەوتوو. دواتریش بۆمان روونبووەوە، بۆ ئەوەی پلەت بەرزبکرێتەوە لە حزبی بەعسدا، پێویستە راپۆرت لە خەڵکی تر بدەیت، یان بە زمانێکی تر دەبوو ببیتە سیخوڕ.

دایکم قەڵسبوو کەسێك پێی بڵێت چۆن هەڵسوکەوت بکات یان جل لەبەربکات، ئەوجا ئەگەر یەکێك ئاراستەی بیرکردنەوەی دیاریکردبا دەهەری دەبوو. کاتێك بانگهێشتی ئامادەبوونی لە کۆبوونەوەیەکی حزبی بەعسدا پێگەیشت، بە قۆنەرەی پاژنە بەرزو درێسی نینا ریکسی مینکی تۆخو کاڵەوە سەردانی کرد. وەختێکیش سەرکردە وتی "یەك نەتەوەی یەکگرتووی عەرەب بە پەیامێکی شکۆمەندی یەکگرتووەوە" دایکم ئەوەندەی دەزانی بەرێکوپێکی لەگەڵ هاوڕێ مامۆستاکانی هەستێ‌و وەڵام بداتەوە "یەکێتی، ئازادی‌و سۆسیالیزم". بەڵام کاتێك جێبەجێکردنی داواکارییەکیان پێسپارد، بورایەوەو وەك مردوو کەوتە سەر زەوییەکە. خولیایەکی بورانەوەی هەبوو و من ئەمەم وەك شتێکی رۆمانتیکی تێدا دەبینی، هاوکات یەکێکیش بوو لەو هەموو شارەزاییەی ئەو، کە من هەرگیز کارامەیم تێدا پەیدانەکرد. بیرمە کاتێك ئەو شەوە چەند پوورێك هێنایانەوە بۆماڵەوە، چۆن شۆخییان پێدەکردو سەریان دەخستە سەری.

پوورە سەمەر گاڵتەی بە خوشکەکەی دەکرد "بەرگەی گەرماکە ناگری، وانییە؟" پوورە سەمەر چالاکوانێکی سیاسی بوو وەها مەزەنەی دەکرد شۆڕشی بەعس لەلایەن سەدام حسێنەوە قۆرخکراوە وەك چۆن شۆڕشی ئێرانی لەلایەن ئایەتوڵا خومەینییەوە دەستی بەسەرداگیراوە.

دایکم خۆی تێکدابوو پێداگری دەکردو دەیووت "ئەوە وانییە. ئەوە گرژییەکانی منە. من بە حزبی بەعس گرژ دەبم".

بەهۆی رامانمەوە لە رابردوو، بۆم روونبوویەوە کە کوێرباوەڕی رەگەزی سودێکی کەمی بە ژنان بەخشیوە بەسەر پیاوانەوە، لەکاتێکدا دوچاری ناکۆکی سیاسی دەبوونەوە گوتەی رەمەکی بیرلێنەکراوەیان دەکرا وەك گوزارشتێکی لێڵ‌و تەمومژاوی لێکبدرێتەوە. جارێکیان، پوورە سەمەر وەڵامی تەلەفۆنێکی دایەوە، دەنگێکی ئاشنا سڵاوی لێکردو گوتی "سڵاو سەمەر، دەنگوباسی حزبی بەعس؟

ئەمیش گاڵتەجاڕانە گوتی "ئای خوایە، کامە حزبی بەعس؟" پاشان پێکەنینی هاوەڵی سەرهێڵەکەی ناسییەوە: سەدام حسێن بوو. ئەگەر لەباتی ئەم پیاوێك ئەمەی بگوتایە هەرگیز بەبێ باجێکی سەخت قوتاری نەدەبوو. هەرزوو لەسەروەختی فەرمانڕەوایی سەدام حسێندا، ژنان بۆیان دەلوا بۆچونی هەڵاوێرد دەربڕن تا ئەوکاتەی گاڵتەیان بکردایە یان بگریانایە، یاخود وەك ساویلکە ناسراباین. پێموایە، دایکیشم لەو گەمەیە تێدەگەشتو هەندێ جار ئەسپی خۆی تێدا تاو دەدا، هەڵبەت کاتێك لەگەڵ پێویستییەکانیدا بگونجایە. دایکم بەهۆی ماوەی سکپڕییەوە لە کۆبوونەوەکانی داهاتووی حزب مۆڵەت درا، برا بچوکەکەم تازە لەدایکببوو لەوکاتەشدا نەخۆشبوو، هەرزوو پاشنەوەش وازی لە وانە وتنەوە هێنا، بەڵام وای بۆدەچم دایکم ئەمەی بەهۆی هەستیاری گرژییەوە کرد.

هاوشان لەگەڵ تەشەنەی شەڕدا، بیروباوەڕی دژە ئێرانی گەشەیسەند. بەناوی نیشتمانپەروەرییەوە، خەڵکی تەنانەت وازیان لە گوێگرتن لە مۆسیقای ئێرانیو کڕینی فستەقی ئێرانیش هێنا. بنەماڵەی ئێمە وەك زۆرینەی خەڵکی ئێرانی بەخراپ نەدەزانی، بەڵام وازمان لە هێلکە ڕەنگکردنی نەورۆزو ٢١ی ئازاری ساڵی نوێی فارسی هێنا. هەمیشە هێلکەی ڕەنگکراومان وەك روخساری دایکم، باوکمو منداڵەکان دەڕازاندەوەو لۆکەمان وەك قژ بەچەسپ لەسەریان دەدا، هەروەها ئەو هێلکە خێزانییەمان لەسەر مێزی ژووری نانخواردن لەگەڵ ماست، هێلۆ خواردنی تر نمایش دەکرد تا بۆ ساڵی نوێی هاتوو بەرەکەت بهێنن. من تێنەدەگەشتم، نەورۆز تەنها جەژنێکی فارسی نەبوو، جەژنێکی دێرین بوو هێمای بە هاتنی بەهار دەکرد. کوردەکان، کە نەتەوەیەکی نەژاد جیان لە باکورو خاوەنی زمانو کولتوری خۆیانن، هەمان جەشن ئاهەنگی نەورۆز دەگێڕن. ئیدی بۆچی ئێمەش ئاهەنگ سازنەکەین؟ دایکم نابەدڵ و ناڕوون پێیگوتم "ئێستا هەلومەرجەکە جیاوازەو چیتر ناتوانین یادی بکەینەوە".

لەبەرئەوەی حکومەتی دوژمنەکەمان لەلایەن ئایینە شیعەکانەوە بەڕێوەدەبرا، هەموو شتێکی شیعەکان گومانی لێدەکرا. کەربەلاش کەوتە ژێر گومانەوە، بۆیە دایکمو خوشكو براکانی داپیرەیان گواستەوە بۆ بەغداو منیان تێگەیاند ئەو راستییە لە مێشکمدا بسڕمەوە کە داپیرە ڕۆژێك خومەینی ناسیوە.

وەك ئـەو دزێوییـە دەردەکـەوت، لـە پـۆلی چـوارەمدا لەسـەر روخسـاری محەمـەد بینیبـووم‌و وا ئێسـتا بـە وڵاتـدا بڵاودەبـووەوە، دەڵێـی هـەموو شـیعەکان ئەسـپێ تێیـدابوون. لـە خوێندنگـە هەسـتم بـە جیـاوازی دەکـرد. لـە هـەموو رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا زەینـەب نـاوێکی بـاوە، بـەڵام عێراقییـەکان بەشـێوەیەکی کـۆن وەك نـاوێکی شـیعی بـیری لێدەکەنـەوە چـونکە نـاوی کچـی خەلیفـەی کوژراو، عەلییـە. هەموو جارێك کە مامۆسـتا بـانگی دەکـردم، هەسـتمدەکرد پـێم دەڵێت. زەینـەب - شیعە.

جارێکیـان کاتێـك دایکـم لـە خوێندنگـە هێنامییـەوە، پێمـووت "دەمـەوێت ناوەکەم بگۆڕم".

ئـەویش وتـی "بۆچـی خۆشەویسـتەکەم؟ زەینـەب نـاوێکی جوانـە. زەینـەب یەکێکە لە ئازاترین ژنەکانی ئیسلام. وامزانی تۆ شادی بە ناوەکەت".

من هەمیشە ئەو زەینەبە مێژوویەم لاپەسەند بوو، لەبەر ئەو بوو مەراسیمی عاشورامان دەگێڕا، واتە ئەو شەوەی شیعەکان یادی شـەهیدبوونی کوڕەکانی عەلی دەکەنەوەو بەرێورەسمی خەمناك‌و دڵتەنگی‌و کاری خێرخوازی جەماوەری ماتەمی کۆمەڵکوژییەکەی دەگێڕنەوە. لە هەندێك ناوچە پیاوانی شیعە لەخۆیان دەدەن لە کـەفارەتی ئـەوەی لـەو شـەوەدا باووباپیرانیـان نـەیانتوانیوە پـێش بەکوشـتنی میراتگرەکـانی پێغەمبـەر بگـرن. کاتێـك کەوتینـە شـەڕەوە تەنانـەت نمایشـە گشتییەکانی خێرخوازی عاشوراش کۆتاییان پێهات. دڵنیـانیم ئـەم رۆژە بەفـەرمی قەدەغـەکرابوو یـان تـەنها ئێمـە وامـانزانی کـە یاسـاخکراوە، هەرچـۆنێك بـوو قەدەغەبوو. ئەو ساڵە، لەبری ئەوەی بـۆ مـاڵی خاڵە عادل بـڕۆین بـۆ یادکرنـەوەی ئاسایی کە بە بەشداریکردنی سـەدان کـەس‌و لێشـاوی قـاپی خـواردن کۆتایـدەهات، لەماڵەوە ماینەوە. ئەو رۆژە، دایکم گوێی لـە رایەڵـەی وێسـتگەی رادیۆیـەکی دوور دەگرت، کە شین‌و واوەیلاو چیرۆکە نەریتییەکانی ماتـەمی باس دەکـرد، هاوزەمـان خـەریکی ئامـادەکردنی خـواردنێکی تایبـەتی بـوو لـە بـرنج بـە زەعفـەران‌و دارچینەوە.

دواتـر وەك ژنـانی ئـەوەی پـێش خـۆی، ئـەویش دەسـتی بەگێڕانـەوەی کۆمەڵکوژی کوڕەکانی عەلی‌و ئامۆزاکانی لە شەوی عاشوردا کرد، چۆن شەهیدکران.

لەو شەوەدا بەتایبەتی دەربارەی زەینەب ئەدوا، گوایە بەشداری شەڕێکی خوێناوی بووەو تێیدا هەموو براو ئامۆزاکانی سەربڕدراون. زەینەب پێشتر دایکی، واتە فاتیمەی کچی محەمەدو ژنە پاڵەوانی ئیسلامو عەلی باوکی لەدەستدابوون. پاش کۆمەڵکوژییەکە، خۆی و ژنێکی دیکەو منداڵەکانی تر لەلایەن پیاوێکەوە، کە هەڵگیرسێنەری شەڕە نەخوازراوەکە بوو خرانە زیندانەوە، زەینەب بوێری کردبوو بەتوندی لەڕووی ئەو پیاوەدا قسەبکات. ئەوەندە قسەلەڕوو و بەهێز ببوو، ئەو پیاوە لێی ترسابوو و بێچارە دووری خستبووەوە بۆ مەنفا. تەمەنی ماوەی لە بڵاوکردنەوەی مۆزیاری دەربارەی خراپیو دڵڕەقی سەرفکردبوو هانی خەڵکیشی دابوو چیرۆکەکە بگێڕنەوە تا هیچ ستەمکارێك ڕێبەخۆ نەدات نادادپەروەری لەو چەشنە دووبارە بکاتەوە.

من مەراقم لەو چیرۆکەی زەینەب بوو، بەڵام تەمەنم لە خواری سیانزەساڵەوە بوو. نەمدەویست دیاربم، حەزمدەکرد گونجاوبم. بەخۆم وت، هیچ پەیوەندییەکی بە ئایینەوە نییە، زەینەب ناوێکی ژنانەی کۆنەو تەنها دەخوازم بەناوێکی خۆشی وەك یاسەمین بانگ بکرێم.

دایکم راست بوو، ناتوانی تەنانەت بۆ شەڕیش ژیان بوەستێنی. لەساڵی دەسپێکی شەڕدا، برا بچکۆلانەکەم پێیگرت، سوڕی مانگانەی من دەستیپێکرد، هەروەها بۆمدەرکەوت دایکم نهێنیگەلێکم لێدەشارێتەوە کە لەوانەیە خۆیم لێ دووربخەنەوە.

من دوایەمینی هاوڕێکانم بووم سوڕی مانگانەم دەستپێبکات. هەموو ئەو کچانەی دەمناسین پێش من سوڕەکەیان دەستیپێکردبوو. ئەم قۆناغە لە هەموو شوێنێك گرنگە، بەتایبەتیش لە ئیسلامدا، چونکە لەوە بەدوا کچ وەك پێگەیشتوو رەفتاری لەگەڵ دەکرێتو ڕۆژوی رەمەزان دەگرێت. لە هەندێك کۆمەڵگاشدا لەچك دەپۆشێت. لەسەرەتای هەشتاکانو لە کۆمەڵگایەکی پتر ئازادی وەك بازنەکەی ئێمەدا لە بەغدا، ئەمە مانای ئەوەبوو چیتر بە تێکەڵ لەگەڵ کوڕانو کچاندا لە نادی سەید مەلە نەکەم، بەڵکو لەگەڵ پوورەکانمو لەو ڕۆژانەدا مەلە بکەم کە بۆ ژنان تەرخانکراوە، ئەوەش نیشانەی چوونەناو تەمەنی پێگەیشتن بوو. کاتێك لەگەڵ دایکم ڕۆیشتین لەدوی واسینی هاوڕێم تا ئەو شەوە

پێکەوە بەسەربەرین، سەبارەت بە تەندروستی منداڵبوون، هەڵبەت دواترو لە خوێندنگە ئەو ناوەمان بەسەردا بڕی، ئاشنایەتیم پەیداکرد. لەوکاتەدا دایکی لە لەندەن بوو، کاتێك گەشتین‌و چوومە ژوورەوەی ماڵیان بۆ ئەوەی بیهێنین، وتی شتێکی خراپی بەسەرهاتووەو خوێنی بەربووە "لەوێ لە خوارەوە". داپیرەی لەماڵەوە بوو، بەڵام ئەم پێی خۆش نەبوو سەبارەت بەو بابەتە قسەی لەگەڵدا بکات.

بەمتمانەوە پێمگوت "نیگەران مەبە. دایکم مامۆستایەو دەربارەی هەموو شتێك دەزانێت، تۆش دەتوانی پرسیاری لێبکەیت".

کاتێك ڕۆشتینە دەرەوە، من لە کوشنی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەو لەتەنیشت دایکمەوە دانیشتم، واسینیش لەدواوە سەرکەوت. رادیۆکەم پێکرد، ئینجا کە دیم واسین هیچ ناڵێت، ڕووم بەلای دایکمدا وەرچەرخاندو پێمگوت; واسین پرسیارێکی نهێنی هەیە لێتی بکات.

واسین خۆی کشان و دەستی خستە سەر کوشنی پێشەوەو بۆیڕوونکردەوە کە چی قەوماوە.

وتی "پوورە ئەمیل، نازانم چی بکەم. چیم بەسەر هاتووە؟"

دایکیشم وتی "ئازیزم، نیگەران مەبە! تۆ باشی، لە بارێکی تەواو ئاساییدایت".

کاتێك گەشتینە ماڵەوە، لەگەڵ دایکم‌و واسین لەسەر مێز لە موبەق دانیشتین، دایکم زۆر بەنیانی قسەی لەگەڵدا دەکرد، چاوی لەدوای چاوی واسین بوو، لەو ساتەدا وەك دایك بوو بۆی. ئینجا بۆی ڕوونکردەوە ئەوی ڕوویداوە شتێکی پڕبایەخەو ئەوەیە کە کچێك دەکات بەژن‌و وایلێدەکات بتوانێت منداڵی ببێت. کاتێك گوێم بۆ قوڵاخکردبوو هەستم بەشانازی دەکرد، کە دایکێکم هەیە ئەوەندە زاناو نەرم‌و لەسەرەخۆیە. بەڵام هێشتاش هەستم بەتەنیایی دەکرد. واسین پێگەیشتوو بوو ئیدی، کەچی من هەر منداڵبووم.

دواتر هاوڕێکانم گاڵتەیان پێدەکردم، گوایە من تەنها کچێکی بچکۆلانەم‌و یاری بە بووکەڵەکان دەکەم. ڕۆیشتمە ژوورەکەم‌و هەرچی بووکەڵەو بووکەشوشەم هەبوو جگە لەوەی بەسمە هەموویم خڕکردەوەو بەخشیم بە رادیە تا بیباتەوە بۆ

ماڵەوە بۆ خوشکە بچوکەکانی. پاشان قورئانەکەم لە بەرزترین رەفەی ماڵەکەمان کە دەبوو کتێبە پیرۆزەکانی تێدا دابنرێت هێنایە خوارەوەو لەسەر کۆشم دامنا. بەتەواوی بۆ ئەوە نەپارامەوە سورەکەم دەستپێبکات، تەنها هەندێك ئایەتم خوێندەوە کە لە نەنەوە یادم گرتبوون‌و هیوایەکم خواست. زۆری نەخایاند لەدوای ئەوەوە، هیواکەم ئەزمونکرد.

پێبزانم من تاکە کچ بووم ئاوەتەخوازی هاتنی سورەکەی بێت، بێشك تاکە کچیش بووم لە گەرماو بێتە دەرەوە ئاشکرای بکات‌و بەباوکی بڵێت. ئەم جۆرە کراوەییە بەس بۆ بنەماڵەکەمان بوو. لە کولتوری عەرەباندا لەشی ژن بەنهێنیی دادەنرێت‌و ناشێت لەگەڵ پیاوان‌و لەو ریزەدا لەتەك باوکانیشدا، گفتوگۆی لەبارەوە بکرێت.

باوکم دەستەواژەیەکی عەرەبی بەکارهێنا، وتی "پیرۆزباییت پێدەڵێم خۆشەویستم، ئێستا ئیدی تۆ ژنی، ئازیزم!"

دایکم مامۆستای زیندەوەرزانی بوو; نموونەی کۆرپەلەیەکی لە کەمۆڵەیەکدا لە خوێندنگە ئامادەییەکەیدا لە پۆلدا هەبوو ل ەمنداڵدانددا مردبوو. دایکم سروشتی نیگارکێش بوو. ئەو رۆژە پاش هاتنی سووری مانگانەم بردمی بۆ موبەق‌و ئەو پێنوس‌و دەفتەرە سپییەی هێنا، کە هەمیشە لای تەلەفۆنەکەوە دایدەنا. راهاتبوو کاتێك تەلەفۆنی دەکرد لەگەڵ قسەکردندا وێنەی دەکێشا. کاتێکیش کتێبی دەخوێندەوە لە پەراوێزی کتێبەکەوە هێڵکاری‌و نیگاری نەخشدەکرد. دەستەکانی هەمیشە دەجوڵان‌و سکێچیان دەکێشا. وێنەی شتی ناسك‌و روتی لەسەر دیواری گەرماوەکە دەنەخشاند، پاشان جاروبار بۆیەکەی نوێ دەکردەوەو شتی نوێی لێ زیاد دەکرد. حەیدەری فزول یاری‌و وازیچەکانی جێهێشت‌و شوێنمان کەوت بۆ مۆبەقەکە. دایکم حەیدەری دوورنەخستەوە. دەستیکرد بە دروستکردنی ئەندامەکانی جەستەی ژن‌و پیاوو روونیکردەوە چۆن کاردەکەن. هونەرو زانست پێکەوە لە وێنەکێشانە نایابەکەی‌و هەموو چەماوەکاندا خەت‌وخاڵی دابوو. شۆخوشەنگییەك لە من‌و هەموو ژنێکدا هەبوو، کە من هەرگیز بەخەیاڵمدا نەهاتبوو. دایکم بازنەیەك کە هێلکەی ژنی دەنواند‌و دروستکراوێکی بچوکیش کە وێنەی تۆوی پیاو بوو کێشا، وتی کاتێك هێلکەو تۆو

یەکدەگرن، خانەیەك دروستدەبێت. وێنەی ئەو خانانەشی کێشا کە دابەشدەبن تاوەکو لەکۆتایدا کۆرپەلەیەك دروستدەبێت.

پرسیم "بەڵام تۆو چۆن هێلکە دەدۆزێتەوە؟"

دایکم وتی "کاتێك ژنو پیاوێك یەکتریان خۆشدەوێت بەو شێوەی منو باوکت یەکترمان خۆشدەوێت، ئەوا هاوسەرگیری دەکەن، پاشان سێکس دەکەنو پیاوەکە تۆو دەکاتە لەشی ژنەکەیەوە"، ئینجا هێڵکاری ئەمەشی کێشا.

قاقا دەستم بەپێکەنین کرد. دایكو باوکم لای ئێمەدا بێپەردە باسی سێکسیان نەدەکرد، بەڵام بەشێوەیەك لە شێوەکان دەمزانی شتێکی نهێنییەو بەتایبەتی دەیکەنو هەستێکی باشیان پێدەدات، وروژانێکی خۆشی قەدەغەکراوەو کاتێك لێی تێدەگەم کە هاوسەرگیری بکەم.

وتی "زەینەب، پێویستناکات بەم شێوەیە پێبکەنی. سێکس خۆ کارێکی گەمژانە نییە، بەڵکو شتێکی جوانە. کاتێکە ژنو پیاو زۆر لەیەکتر نزیك دەبنەوەو منداڵی نازداری وەك تۆو حەیدەرو برا بچکۆلانەکەت دروستدەبن".

دواتر هێڵکاری ئەمەشی کێشا.

بیرمە حەیدەر سەری شۆڕکردبووەو دیقەتی دایکمی دەدا کە بە خامە درێژە رەشەکەی هێڵکاری دەکرد. بۆ قوتابییەکی پۆلی دووەم حەیدەر زۆر زیرەك بوو. وەك باوکم زیرەکی لە بیرکاریو زانستدا بوو. کەمدوو بوو مەگەر دەمەقاڵێی لەگەڵ مندا بکردایە دەنگی دەهات، زانیارییە نوێکانی تەنها دەرخو لەبەرنەدەکرد، بەڵکو لە مێشکیشیدا لێکیدەدایەوە تاوەکو بەتەواوی لێی تێدەگەشتو مانای لێ دەردەهێنا. هەرچی منیش بووم لەرێی بەدواداچوونو پرسینەوە تاوتوێی هەر پرسیارێکم دەکرد لە مێشکمدا گەڵاڵە دەبوو تا ئەوەی ئاسوودە دەبووم و تێی دەگەشتم.

ئەو پاش نیوەڕۆیە بەرلەوەی لە قسەکردن تەواوبین، دایکم وانە فیسیۆلۆجییەکەی خستە چوارچێوەی دەقێکی رۆحییەوە. وتی، خوا لەشی ژنو پیاوی بەشێوەیەکی دروست بۆ تەواوکردنی یەکتری رێکخستووە. ئەو خۆشییەی لە سێکسکردنەوە دێت یەکێکە لە دیارییەکانی خوای گەورە بۆ هەریەکەمان، وەك ئەو دیارییەی کە دەتوانین منداڵمان ببێت. لێی زیادکرد، ژنو پیاو لە

هاوسەرگیریدا یەکسانن و بە هاوتایی دیاری ئەو خۆشییە وەردەگرن، بەڵام پێویستە چاوەڕوان بن تا ئەوەی هاوسەرگیری دەکەن. منیش لای خۆمەوە بیرمکردەوەو گوتم، ئەمە بۆیە تەنها ژنانی شوکردوو منداڵیان دەبێت. پێش هاوسەرگیری، سێکس کردن حەرام بوو.

سێ ساڵ دوای ئەوەو کاتێك چوومە پۆلی نۆیەم، لە خوێندنگە ئەم شتانەیان فێرکردین. من تاکە کەس بووم دەستم بەرزدەکردەوە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان بەبێ شەرمکردن، تاکە کەسیش بووم کە پێنەدەکەنیم.

وتم "مایەی شەرم نییە لەبارەی سێکسەوە قسەبکەین. سێکس شتێکی سروشتییەو یەکێکە لە دیارییەکانی خوای گەورە بۆ ئێمە".

وەك هەموو منداڵێکی عێراقی فێرکرابووم گوێڕایەڵی دایك و باوکم بم، راست بڵێم، رێز لە مامۆستاو گەورەکانی تر بگرم، هەروەها شتێکیش نەکەم نابڕووی بنەماڵەکەم لەکەدار بکەم. ئەمانە چەمکگەلێکی ئاڵۆز بوون، بەڵام شکاندنی هەریەکەیان ئەنگییەکی گەورەبوو، واتە "بێ ئەدەبی" یان "بێ رەوشتی" بوو. چپەکردن لەبەردەم هەرکەسێك یان قسەبڕین بەکەسێکی گەورە یاخود پرسیارکردن سەبارەت بە ڕاوبۆچونیان عەیبە بوو. لە کولتورێکدا کە منداڵ و گەورە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە جیاکراونەتەوە، بەبێ ئەوەی بانگکرابێت رۆشتنە ژووری گەورەکان عەیبە بوو. لەو میانەدا ژنان بەتایبەتی پێویستبوو ئاگاداربن لە کارێك یان شتێکی عەیبەوە نەگلێن، چونکە هەر رەفتارێك باو نەبێت و دەرە رەوشتی بێت نەشیا نە تەنها بۆ خۆیان بەڵکو بۆ هەموو خانەوادەکەشیان شەرمهێنەر "عەیب و عار" بێت. تەنانەت لە ماڵی ئێمەدا، کە تا ئەو ئەندازەیەی من بزانم ئازادییەکی زۆر بەرقەراربوو، زۆر پرسیارکردن ئاسایی بوو، بەڵام پرسین لە ڕای گەورەکان نا. دایك و باوکم لە گشت ئەوانەی دەمناسین پتر سیکولار بوون، بەڵام بەلای ئەوانیشەوە حەرام بوو وەها رەفتار بکرێت ببیە مایەی ئاه هەڵکێشانیان، چونکە ئەوە لە قورئاندا هێمای پێکرابوو. بۆیە من پرسیارم زۆر دەکرد هەندێك جار تا رادەی بێ شەرمی دەچووم، بەڵام کاتێك هەستم دەکرد خەریکە دنیام لێ سەرونگون دەبێتەوە، نەمدەتوانی بپرسم چەوتی لەکوێدایە.

کاتێك خاڵە عادل کەوتە ئەوەی شەوانی لە ماڵی ئێمە بەسەردەبرد، سەرەتا

گوتم دەبێت لەگەڵ ژنەکەی دەمەقاڵێی بووبێت. پاشان پوورە سەمەرو خاڵە عادلو دایکو باوکم پێکەوە چوونە ژووری دانیشتنەکەو بەتوندی لەدوای خۆیانەوە دەرگاکەیان داخست تا ئێمە گوێمان لێنەبێت چی دەڵێن. تەماشایەکی دایکمم کرد بەو نیگایەی ڕوونکردنەوەیەکمان بداتێ، بەڵام تەعبیری سەر روخساری پێی وتم پرسیار نەکەم. ئاشکرا دیاربوو شتێك نیگەرانی کردبوون، هەر جارێکیش هەوڵی خۆنزیککردنەوەم لە یەکێکیان دەدا لێی دەپرسیم گوایە ئەرکی خوێندنگام راپەڕاندووە، یان پێیان دەگوتم بچمو ئاگام لە برا بچکۆلانەکەم بێت. لەوماوەیەدا هێند زۆر کاتم لەگەڵ حەسەندا بەسەردەبرد، وەختێك زمانی پژا جاروبار بە "دایـــە" بانگی دەکردم. کاردانەوەی سەرەتاییم بۆ رەتکردنەوەکانیان بە ئازار بوو. من دەبا وەك گەورەیەك مامەڵەم لەگەڵ بکرێت، کەچی ئەوان هێشتاش وەك مندالێ رەفتاریان لەگەڵدا دەکردم، یانیش وەك تارماییەك کە هەمووان سوكو ئاسان گوێیان پێنەدەدام. رۆژێکیان لەسەر قەنەفەکە پاڵکەوتبوومو بە سەرینێکی سەر قەنەفەکە سەرم داپۆشیبوو بەو هیوایەی بتوانم خۆم بکەمە لەهۆشخۆچوو و سەرنجی کەسێك بۆ خۆم کێشکەم، بەو شێوەیەی دایکم دەبورایەوەو گشت دەهاتن بەلایەوە. بەڵام کەس تێبینیشی نەکرد. ئیدی خەوم لێکەوتو دوای کاتژمێرێك خەبەرم بووەوە، ماندوو چینێك ئارەقەم کردبوویەوە. مەگەر گەورەکان درکیان نەدەکرد، منداڵێك هەیە بەردەوام تێبینی دەوروبەری دەکات بۆ ئەوەی بزانێت چی لەدەوریدا ڕودەدات؟ داخۆ دایكو باوکم تێنەدەگەشتن چ تەنهاییەکە لەناو مێشکمدابم بەو هەموو پرسیارەوە کە ناشێت لەبارەیانەوە بپرسم، لەبەرئەوەی رودارییە؟

شەوێکیان کە گوێم لێبوو دایكو باوکم لە ژووری نووستنەکەیاندا لە نهۆمی خوارەوە قسەیان دەکرد، لەسەر نوکەپێ لە ژوورەکەم هاتمە دەرەوەو لەسەر کاشی پلەکانەکە دانیشتم تا گوێشلکەمو بزانم چی دەڵێن. هەرگیز پێشتر بەدزییەوە گوێم لە کەسی تر نەگرتبوو، ئەوەش نیشانەی ئەوەبوو کە دەترسامو هەرزوو فەرامۆشمکرد، هەستمکرد باشمکردووە. بەڵام ئەو شەوە کاتێك بەپێی پەتی لە پلەکانەکان هاتمە خوارەوە شتێکی گرنگ تێگەشتم: پوورە ئیشراقی ئامۆزای دایکمو خێزانەکەی چیتر لە عێراق نەدەژیان. پوورە ئیشراق خانوویەکی گەورەی

لە ئەلەنسور هەبوو هەروەها کچی هاوتەمەنی منو کوڕی لەمن گەورەتری هەبوو کە بەجۆرێك نازو عیشوەی خۆمم بەسەرەوە تاقیدەکردەوە.

دواتر لە دایکم پرسی "دایە، بۆچی پووره ئیشراقو ئامۆزاکانم پێش ئەوەی بڕۆن خواحافیزیان لە من نەکرد؟" هەستم ئازار درابوو.

ئەویش وتی "تۆ لەکوێ ئەمە دەزانی ؟"

گوتم "دەی لەوەوە بۆم دەرکەوتووە کە هەمووان وەها دەڵێن".

بەرچاوڕوونی پێدامو گوتی " زەینەب، پێویستە ئەوە لە مێشکی خۆتدا بسڕیتەوە". دەنگی توندو روون بوو. لێرەدا هیچ بوارێکی دەربازبوون نەبوو.

دانم لێناو گوتم " دایە، دەی ئاخر ناتوانم".

پاشان گوتی "باشە، وەڵێ جارێکی تر باسی ئەم بابەتە نەکەیتەوە، تەنانەت بۆ خاڵۆزاکانیشت. دواتر لەبارەیەوە دەدوێین، نە ئێستا. نابێت سەبارەت بەمە هیچ بە کەس بڵێیت. تێگەشتی؟"

هەموو ئاماژەکانی سەر روخساری دایکم تێدەگەشتم. کاتێك تووڕەدەبوو، روخساری سوورهەڵدەگەڕاو دڵۆپە ئارەق لەسەر لێوی سەرەوەی دەردەکەوتن. کاتێکیش دەربارەی شتێك جدیو دڵنیابوایە، زەردهەڵدەگەڕاو دەموچاوی گرژ دەبوو لێوەکانی کرژو وشك دەبوون. ئەو رۆژە توشی سەرسوڕمانم کردو دیم ترسا. شتێك سەبارەت بە ڕۆیشتنی پووره ئیشراق ترساندبووی. ئەوی منیش لەوبارەیەوە دەمزانی ترسەکەی پتر کردبوو، بەم هۆیەوە من نە تەنها هەست بەتاوان بەڵکو دڵتەنگیش بووم. دایکم زۆر خۆشدەویست، بۆیە هەرگیز نەمدەویست ببمە هۆی ئازاردانی.

کاتێك باوکم لێی پرسیم داخۆ دەخوازم لەگەڵی بڕۆم بۆ ماڵی خاڵە عادل، کەشو هەوای بەغدا ساردو باراناوی بوو. بەدەگمەن تەنها پێکەوە لەگەڵ باوکم کاتمان بەسەردەبرد، بۆیە ئەو هەلەم قۆستەوە. ئەوەندە باران باریبوو ڕێڕەوەکە پڕببوو لە ئاو. باوکیشم هەمیشە ناڕەزایی دەردەبڕی کاتێك شتی لەمجۆره رویدەدا، چونکە حکومەت پەیمانی دابوو ئاوەڕۆکەی چاکبکات، بەڵام من حەزم لێی بوو. ئەگەر رێکبکەوتایە باوکم لەماڵ بوایە کاتێك ئەم گۆماوە لە حەوشەی پێشەوەماندا دروستدەبوو، لە کاغەزی رۆژنامە بەلەمی دروستدەکردو منو

براكانم دەمانخستە ناو ئاوەكەوە. بەلام كاتێك سەركەوتینە سەر ئۆتۆمبێلەكە بۆئەوەی بڕۆین بۆ مالی خالە عادل، ئەمەی لەیادكردبوو. كاسێتێكی عەبدول حەلیم حافزی گۆرانیبێژی میسری خستە سەرو هەولیدا لەكاتی ڕۆیشتنماندا بمدوێنێت. بیرم نییە باسی چی دەكرد، تەنها ئەو هەستەم لەبیرە هەولیدەدا شتێكی تایبەت بكات بۆئەوەی پەیوەندی لەگەلم خۆشبێت، هەلبەت ئارەزوشی نەدەكرد وەك دایكم قسەم لەگەلدا بكات. لەخۆوە گفتوگۆی ئاسایی دەستپێدەكرد. كاتێكیش لە گەشتێكی درێژخایەنەوە بۆ مال دەگەڕایەوە، بەپەلە جانتاكەیمان دەكردەوە تا بزانین چی بۆ هێنابووین، خۆمان دەدا بەسەریداو لە باوەشمان دەگرت، پاشان وازمان لێدەهێنا. كاتێك جۆشوخرۆشی تێدەكەوت كەمێك لە پشیلە دەچوو. پێویستی بە پانتایی خۆی هەبوو.

ئەو شەقامە كورتەی بۆ مالی خالە عادل دەڕۆیشت قوڕاوی‌و چۆل‌و پیس بوو. تێبینی ژمارەیەكی زۆر سەبەتەی نیمچە داپۆشراو بە نایلۆنی شینم لەبەردەمی مالی یەكێك لە دراوسێكانیاندا كرد. سەرم سوڕما كە بینیم هێشتا لەوێدا بوون. تەنها چوار مال لەو شەقامەدا بوون، ئەو دراوسێیانەم باش دەناسی‌و دەمزانی ئەو سەبەتانە ئامێرو كەلوپەلی بەنرخی كارگەی تێدابوو.

لەباوكم پرسی "بۆچی ئەو كەرەستانەیان لەدەرەوە بەجێهێشتووە؟ لەبەر باراندا ژەنگ هەلدێنن".

تاوەكو ئۆتۆمبێلەكەی لەبەردەم مالی خالمدا نەوەستاند، وەلامی نەدایەوە. پاشان رووی تێكردم، هەستمكرد ئەم هاتنەی بە ئامانجێكەوە ئەنجامداوە. هەولیدەدا وشەی دروست بدۆزێتەوە، بەلام دەمبینی ئاسان بۆی نایەت بەدەستەوە. لەیادمە سەرم بۆ خوارەوە نەویكردو بریمكردەوە من هێشتا گەورە نەبووم، چونكە نەمدەتوانی شۆفێری بكەم. پێیەكانم ئەوەندە درێژ نەبوون بگەنە پێدەلەكان[٥].

گوتی "دراوسێكان وەدەرنراون بۆ ئێران. هەمان شتیش بەسەر پوورە نیشراق‌و خێزانەكەیدا هاتووە، زەینەب. ئەوی بەبێ خواحافیزیش ڕۆیشتن، لەبەرئەوە بوو كاتی مالئاوایی كردنیان نەبوو".

---

[٥] مەبەست لە پێدەل كلاج‌و نیستۆپە. و.ك.

بابەتەکەی بەشێوەیەك بۆ روونکردمەوە، هەموو ئەوەی دەیگووت—فاکت و راستی بوون. حکومەت ئەو عێراقییانەی "لە بنەچەدا ئێرانی بوون" دیپۆرت دەکردەوە. کەس نەیدەزانی ژمارەی ئەوانەی دیپۆرتکرابوونەوە چەند بوون، یان لەڕاستیدا چی بەسەر ئەوانەدا هاتبوو کە رۆیشتبوون. خاڵە عادل لە ماڵی ئێمە دەمایەوە بۆ ئەوەی ئەویش دەرنەکەن. کاتێك درکمکرد دایكو باوکم دەبێت پێکەوە پێشتر پلانیان بۆ ئەم گفتوگۆیە دانابێت، بەترسێکی گەورەبوو و سەرلێشێوانەوە گوێم شلکرد. دەی بۆچی دایکم خۆی پێی نەگوتم؟ بۆچی باوکم دەبێت تاکە کەس بێت ئەم شتانەم لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا لەبەر باران لەدەرەوەی ماڵی خاڵە عادلدا پێبلێت؟

پاشان هەواڵە چاوەڕواننەکراوەکەی راگەیاند.

وتی "زەینەب، ئەگەری ئەوەش هەیە دایکت بەهەمان شێوە وڵات بەجێبهێڵێت. حکومەت دوو هەزار دینار (شەش هەزار دۆلار) دەبەخشێ بەو عێراقییانەی لە ژنەکانیان جیادەبنەوە بەمەرجێك ژنەکانیان لەبنەڕەتدا ئێرانی بن".

تا ئەوکاتە دانیشتبووم و بەبێدەنگی سەرم شۆڕکردبووەو لە پێیەکانم دەڕوانی.

بەدەنگێکی توندو تۆمەتبارکردنەوە وتم "بەنیازنیت لە دایکم جیاببیتەوە، وانییە؟" لەمیانی گشت ئەو قسانەی کران، ئەمە لە هەموویان پتر منیان ترساند.

بەئەسپایی و لەسەرەخۆ وتی" نا، نا. تۆ ئێستا گەورەی، بۆیە منیش هەستدەکەم، پێویستە لەو هەلومەرجە تێبگەی ئێستا لەگۆڕێیە".

پاشان دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی کردەوەو دابەزی. کاتێك لەگەڵ دایکم قسەم دەکرد ئاسایی دەمتوانی پرسیاری لێبکەم، تەنانەت ئەگەر وەڵامیشم دەستنەکەوتایە، بەڵام لەگەڵ باوکم ئەوە مەحاڵ بوو. منیش دابەزیم و بە سەرێکەوە کە پڕی پرسیاربوو بەدوایدا رۆیشتم. ئاخۆ دایکم لەدەست دەدەم؟ ئەگەر باوکم نەیدەویست لە دایکم جیاببێتەوە، کەواتە بۆچی ئەمەی گوت؟ ئەسڵەن بۆچی بیری لە جیابوونەوە لە دایکم دەکردەوە؟ مەگەر چیتر خۆشینەدەویست؟ باشە ئەگەر دایکم دەڕوات، من چیم بەسەر دێت؟ ئاخۆ

دەتوانم لەگەڵیدا بڕۆم؟ ئەی براکانم؟ ئەوان چییان بەسەردێت؟

کاتێك پوورە ئەجوە دەرگاکەی کردەوە، خەریکبوو نەیناسمەوە. ئەو ژنە باڵا بەرزە جوانە کە یەکێك لە کارگەکانی خاڵە عادلی بەڕێوەدەبردو هەمیشە قژی لە سالۆن چاك دەکرد، بێتاقەتو لاواز بوو. میکیاژی نەکردبوو جلی رێکوپێکی کاری لەبەردا نەبوو. ئەو پوورەی من دەمناسی کە تاڕادەیەك لوت بەرز بوو گۆڕابووە سەر ژنێکی ترساو و زوو زوو دەستی بەقژیدا دەهێنا. بێ ئەوەی سڵاو بکات، بەپەلە لەگەڵ باوکم دەستیکرد بەقسەکردن. خاڵۆزاکانم لە ژووری دانیشتنەکەدا دۆزییەوە، زەردهەڵگەڕاوو ترساوو پشتگوێخراو بوون وەك چۆن منیش بۆ ماوەی هەفتەیەك چەشتبووم. گوتیان ماوەی چەند رۆژێکە باوکمان نەبینیوە.

داود وتی "دوو کاتژمێر پێشتر دوو کارمەندی موخابەرات هاتن داوای ناسنامەکانیان لێکردین تا بۆیان ساخبێتەوە کە ئێرانی نین. دایکیشم پێی گوتن ناسنامەکان لای باوکمن‌و ئەویش لەدەرەوەی شارە".

منیش وتم "باشە ئێوە کە هەرگیز لە ئێران نەبوون، چۆن دەبێت ئێرانی بن!! ئێوە عێراقین‌و دایك‌و باوکیشتان عێراقین!".

خاڵۆزا هەرە بچکۆلانەکەم کە خەریکبوو دەستی بەگریان دەکرد، وتی "دراوسێکانیشمان هەموویان عێراقین، کەچی رۆژێك لەخەو هەستاین‌و دیمان رۆیشتبوون. هەنووکە ئێمە دوا ماڵین لە شەقامەکەدا ماوینەتەوە!"

بۆچی ئەمە روویدەدا؟ بۆچی موخابەرات دەهاتن بۆ ماڵی ئەوان و نەدەهاتن بۆ ماڵی ئێمە؟ بۆچی دایکم‌و خانەوادەی ئەوان لەمەترسیدا بوون، بەلام باوکم باکی نەبوو؟ ئەی من‌و براکانم چی؟ ئاخۆ دەیانویست ئێمەش وەدەرنێن؟

پێمڕاگەیاندن "لاوینە، ئەگەر دایکم‌و ئێوە دیپۆرت بکرێن، حەتم من لەگەڵ ئێوەدا دێم".

داود پێی وتم "نازانم رێگە بەتۆ دەدەن یان نا".

بەڵێنم پێدان‌و گوتم "ئەگەر کەسێك هەوڵبدات لێکمان جیابکاتەوە، رێگەنادەم دابڕێین، دەبێت منیش لەگەڵ ئێوە ببەن".

ماوەیەکی زۆر لەوێ دانیشتین‌و گوێمان لەو قسانەی باوك‌و دایکمان گرتبوو کە لە ژوورەکەی تەنیشتمانەوە بەکەمی دەهاتە بەرگوێمان. ئەوە یەکەمجار نەبوو

موخابەرات هاتبێت، بەڵکە دووەم جار بوو، پوورە نەجوە گوتی، پێیان وتووم دووبارەش دێنەوە. بەدەوری مێزی گەورەی ناو ژووری نانخواردنەکەیاندا چاوم دەگێڕا، تەختەی یاری تاوڵە، وێنەی ئەڵقەگۆڕینەوە، وێنەی منداڵەکان، وێنەی ئێمە لەناو بەلەمەکەی ئەواندا لەدوا هاویندا دانرابوون. دڵنیام هەموومان بیرمان لای هەمان شت بوو. تۆ بڵێی پۆلیسی نهێنی هەموو ئەمانەیان لێ دوور بخاتەوە؟ داخۆ دەتوانین جارێکی تر پێکەوە لەمماڵەدا یاری بکەین؟ لەترسا هەستم بەهێڵنجدانێکی زۆرو تێکچوونی گەدەم دەکرد.

کاتێك باوکم هاتو پێی وتم کاتی رۆیشتن هاتووە، پوورە نەجوە شانی گرتو لێی پاڕایەوە.

وتی "باسل، تکا ئەکەم کارێك بکە! نازانم چەندە کاتی ترمان بەدەستەوە ماوە. بەڵام ئەگەر نەتوانی شتێکمان بۆ بکەی، حەتم دەمانبەن".

خاڵۆزاکانم هەموویان ئاوڕیاندایەوەو چاویان بڕیبووە من.

باوکم؟ مەگەر باوکم چی لەدەست دەهات؟

ئەو چەند رۆژەی دواترم بیرنەماوە. بیرم نایەت کە گەیشتینە ماڵەوە چۆن رامکردبوو بۆ لای دایکم، چوون خەیاڵم جەمە کە ڕامکردووە، وەختێ گەشتوینەتەوە ماڵەوە. هەموو ئەو شتانەی بیرم دێتەوە لەوانەیە چەند رۆژێك یان چەند هەفتەیەکی کەم دواتر بێت، کە لەگەڵ دایکم بە ئۆتۆمبێل رۆیشتین بۆ گەڕەکێکی کۆنی بەغدا. راوەستا بۆ ئەوەی ماسی بکڕێت بۆ خوانی ئێوارەو لەگەڵ ماسی فرۆشەکە کەمێك قسەی کرد. نیگەرانی رەوابویەوەو دووبارە وەك خۆی دەنواند، منیش هەستمکرد قەیرانەکە ئیدی رابردووەو چارەی گرفتەکە کراوە. شەقامەکانی ئەو گەڕەکە لەوە تەسکتر بوون بە ئۆتۆمبێل گوزەری پێدا بکەیت، بۆیە دایکم پێشنیاری کرد دابەزینو بەپێ بەتەنیشت رووبارەکەدا رۆیشتین تاوەکو لەبەردەم خانوویەکی زۆر کۆندا ئیستێکمان کرد. دەربارەی ئەو خانووە بیستبووم بەڵام هەرگیز نەمبینیبوو: ئەو خانووە بوو کە دایکمی تێدا گەورەببوو تاوەکو تەمەنی چواردە ساڵی، لەدوای ئەوەی نەنەشم بەجێیهێشتبوو، درابوو بەدیدەوانی کوڕان، کلینیکە تەندروستییەکان، خێزانی پیاوێکی چاودێر، بەڵام هەنوکە چۆڵی چۆڵ بوو. دایکم چووە سەرەوەو دەرگا مۆدێل کۆنەکەی کردەوەو

ڕۆیشتینە ژوورەوە، دەتووت خانووی سەردەمێکی ترە. لەناوەوە حەوشەیەکی هەبوو بەهۆی ئەو گورزە تیشکانەی خۆرەوە روناکبووبووەوە کە لەسەرەوە دەهاتن و بڵاودەبوونەوەو هەستێکی پیرۆزیی بە هەموو شوێنەکە بەخشیبوو. لەسەری سەرەوە، پێکەوە بەستنێك لە نهۆمەکانی دووەم و سێیەمدا هەبوو، مەمەڕو ڕێڕەوەکان لەگەڵ لاوانەو پەرژینی ئاسنی بۆ ژوورەکانی دواوە دەڕۆیشتن. لەئاکامی چۆڵ بوونی کاشیو دیکۆرەکانی لە ڕیقنەی کۆترو تەپوتۆزدا دیارنەبوو. دایکم وتی کە منداڵ بوون لەگەڵ پوورە سەمەر ئەو شوێنەیان بۆ یاریو وازی کەڵك لێوەرگرتووە.

کاتێك لەیەکێك لە پلەکانەکانەوە بۆ سەرەوە پێشم کەوت، شەقەی فڕینی باڵی مەلێك هاتە بەر گوێم. کاتێك دەچووە هەر ژوورێك دەستی بە دیوارە کۆنەکاندا دەهێناو چیرۆکەکانی دەگێڕانەوە، یادەوەری خزمەتکارە فارسەکان، باوکی کە پیاوسالارێکی بەهێز بووە، برا کۆچکردووەکەی، هەروەها خاڵە عادلی برا گەورەی، کە نزیکەی پانزەساڵ لەم بەتەمەنتر بوو هەمیشە چاودێری کردبوو. دواجار گەیشتینە نهۆمی سێیەم، پاشان بۆ ناو ژوورێکی بردم کە ئوتاقی خۆیو پوورە سەمەر ببوو بەسەر رووبارەکەشدا دەیڕوانی. بەناو ژوورە تۆزاوییەکەدا بەرەو پەنجەرە کۆنە بەرزە چوارچێوە دارینەکە ڕۆیشت و ئاوەڵای کرد، لەوێشەوە چووینە ناو بالکۆنێکی لە تەختە سازکراو. لەبەردەماندا رووباری دیجلەو ئاسۆو ئەو مەنارەو گومەزە دێرینانە هەڵکەوتبوون کە چەندەها سەدە تەمەنیان بوو. ماوەیەك لەوێدا وەستاین و تەماشای دێرینیو ئەو بەلەمەوانانەمان دەکرد کە سەرنشینەکانیان بەناو رووبارەکەدا بۆ سەرەوەو بۆ خوارەوە دەهێناو دەبرد. سەرم سوڕمابوو لەوەی، ئەبێت چەند نەوەی عێراقی لەسەر ئەم زەوییەی بەسەریەوە وەستاوین هەبووبن و تیاچووبن، چەندە گەلو میللەت لەلایەن فەرمانڕەوای جیاوازەوە حوکمکراون و بەسەر ئەم شوێنەدا ڕاگوزەشتوون، چییان پۆشیووە، باوەڕیان بە چی هەبووە، خوێنی چەندەیان ئێستا لە لەشی منا ئەگەڕێ و چەند شێوەیان لە من جیاواز بووە.

دایکم وتی "خۆشەویستم، سەرەتا دەمەوێت پێت بڵێم بنەماڵەکەمان لە ئاسایشدایەو سەلامەتە. دەمەوێت بزانیت کە کەس دیپۆرت ناکرێت".

گوتم "واتە دوورت ناخەنەوە".

"نا ئەزیزم، کەس نایەوێت من، خاڵە عادل یان خاڵۆزاکانت دووربخاتەوە".

ئیدی باوەشم پێداکردو خەریکبوو بگریم.

"زەندەقم چووبوو، دایە!"

"دەزانم، منو باوکت ویستمان بەبێ ئەوەی تۆ نیگەران بکەین ئەمە چارەسەر بکەین، بەڵام گەشتینە ئەوەی ...بەهەرحاڵ، پێمانوابوو بەوجۆرە تۆ پتر ئامادە دەبیت لەبارێکدا ئەگەر نەمانتوانی هیچ شتێك بکەین".

"کەواتە هەرگیز کەس تۆ لە من دوورناخاتەوە؟"

"نا گیانەکەم. هیچ کەس من بۆ هیچ کوێ نابات. هەموو شتێك باش دەبێت، ئەوە تەنها بۆ ماوەیەك شتەکان ئاڵۆزییان تێکەوتبوو".

خۆر بە گەرمییەکی کەمەوە لە ڕوومەتمانی دەداو شنەبایەکی بوژێنەرەوەش دەهات. دایکم دەستەکانی لە گیرفانی کۆتەکەیدابوو وەختێك تەماشای رووبارەکەی دەکرد، پاشان روویکردە منو قژە رەشە درێژەکەی بەسەر روویدا پەرێشانبووەوەو دراوە عەباسییەکەی ملی دەدرەوشایەوە. چاوە گەورە قاوەییەکانیشی، کە بە کل رشتبوونی، پڕبوون لە هەستی غەریبی.

وتی "بیرمە لەسەر ئەم بالکۆنە وەستابووم چاوەڕوانی گەڕانەوەی باوکمم بۆ نانی ئێوارە دەکرد "لەوکاتەدا تەماشای رێگای تەسکی رووبارەکەی دەکرد کە ژنو پیاوو منداڵ ئاسایی ڕەوتی رۆژانەیان بەسەردا دەکرد. "هەموو پاش نیوەڕۆیەك کاتێك لەم شەقامەوە بۆ نانی ئێوارە دەهاتەوە کەسێکی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە، لە بەلەمەوانێکەوە تا شوفێرێك یان هەرکەسێکی تر کە لەدەرەوە توشی هاتبوو. من بەو کارەی قەڵس بووم! بۆچی دەبوو کەسێکی تەواو نامۆ بهێنێتەوەو لەگەڵ خانەوادەکەماندا نانبخوات؟ ئەمە خێزانەکەمان بوو. ئەویش بۆی رونکردمەوەو گوتی خێرو چاکە لە ئیسلامدا پێویستییەکە هەر دەبێت بکرێت".

ئینجا باسی داپیرەی کرد کە چۆن راهاتووە ئامادەسازی چەندین مەنجەڵو تەشت فیسنجونو دورشانی بۆ رەمەزان بکات، هەروەها دەرگای ماڵەکەیان بەڕووی هەژاراندا کردووەتەوە، ئەوانیش لەهەموو گەڕەکەکانی شارەوە هاتونو لەگەڵ خۆیاندا قاپیان هێناوە تا پڕی بکەنو بۆ خێزانەکانیانی ببەنەوە.

"جارێکیان ئا لێرە لەم بالکۆنەدا وەستابووم پیاوێکم بینی بەمشت برنجی دەئاخنییە گیرفانییەوە ئەو کاتە منداڵێکی بچکۆلانە بووم، هەستم بەخۆشبەختییەکی زۆر دەکرد زەینەب، بۆ ئەو بەرەکەتەی رژابوو بەسەرماندا. ئەو رۆژانە گەلێ خۆش بوون. چەندە خەمناکە خۆشەویستم، کە ئێستا ناتوانین تەنانەت لەعاشوراشدا خواردن ببەخشینەوە تا ژیانی منداڵەکانمان نەخەینە مەترسییەوە".

زۆرێك لە دایك و باوکەکان ئازادن میراتی لەمێژینەی باوباپیرانیان بەبێ ترس وەچە بە وەچە بگوازنەوە، بەڵام ئەو پاش نیوەڕۆیە کاتێك دایکم باسی مێژووی بنەماڵەکەمانی بۆ دەکردم و متمانەی گێڕانەوەی چیرۆکی خانەوادەکەمانی پێبەخشیم، دەبوو زۆر لەنزیکییەوە بوەستم.

وتی "هەموو شتەکان لەگەڵ باپیرمدا دەستیپێکرد، سەرچاوەی سامان و کێشەکانیشمان بوو. ئەو لەساڵی ١٨٦٥دا لە بەغدا لەدایکبووە، تەنانەت بالگەنامەی لەدایکبوونەکەشی ماوەو عێراقییە! نازانم چۆن ئەشیا کەسێك وەها بیربکاتەوە کە ئەو ئێرانییە!"

بەڵام باپیری دایکم لەکاتێکدا لەدایکبووە کە عێراق شوێنی شەڕی نێوان ئیمپراتۆریەتی سەفەوی ئێرانی شیعەو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سونیی بەڕێوەبەری عێراق و فەرمانڕەوای هەموو ناوچەی دەریای ناوەڕاست بوو. ئەم باپیری سێیەمم بوو و بەعەرەبی پێمان دەووت جەد، ئەم پیاوە لەگەڵ ژنێکی سەرمایەداردا هاوسەرگیری کردبوو کارو بازرگانییەکی سەرکەوتووی لەبواری کارگەی چنیندا—حەبل و گوێنی و بەن و دەزوو بنیادنابوو. خۆی ڕێگا بازرگانییە دێرینەکانی تەیدەکرد، لەکاتێکدا ژنەکەی سەرپەرشتی باری دارایی بەڕێوەدەبردو منداڵەکان و لەنێویشیاندا باوکی دایکمی پێدەگەیاند، پیاوێك بووە پێنج زمانی بەتەواوی زانیوەو دواتریش کارەکەی فراوانکردبوو بۆ بازرگانی قوماش. ئەوەندەی من دەربارەی بیستبێتم ئەم ژنەی ژنسالار بووە.

دایکم وتی "داپیرەم ژنێکی بەهێز بوو. من و پوورەکانت وەك ئەو نابین، بەڵام هەوڵدەدەین لەبەهێزیدا لەو بچین. زۆر شایستە، زۆر فەرماندەئاسا بووە. ئەو ئازادییەکی کەمی دابووە دایکم! بۆیە من هەندێك جار پێم سەیربوو بۆچی

دایکم ئەوەندە زۆر ڕێگای بە ئێمە دەدا".

دایکم ئەوەشی ڕوونکردەوە، کە ئەشێت لەسەدەی نۆزدەیەمدا نازناوی بنەڕەتی بنەماڵەکەمان بزربووبێت. پیاوان زۆرجار کە هاوسەرگیریان لەگەڵ بنەماڵەی سەرمایەداردا گرێدەدا دەبوونە هەڵگری ناوی بنەماڵەیی ژنەکانیان، هەندێك جاریش ناوە نراوەکان ناوی پیشەیی شوێنی پێلێژدەکردن. بۆ ئەو زەمەنەی دایکم لەدایکبووە، نازناوی بنەماڵەکە بۆتە "دەزوو چن"و وای لە بنەماڵەکەمان کردووە سەخت بێت مێژووی پێشتری ون نەکات. لێی زیادکرد، ئەگەری ئەوە هەیە کە باپیری باپیرم لە ئێران لەدایکبووبێت. نەنە یادەوەرییەکی کرچوکاڵی لەمەڕ سەردانی تاران، وەختێك زۆر منداڵ بووەو بەهاوەڵی پاسەوانەکانی، هەیە، هەروەها گوتی گوایە داپیرە پێی وابووە خزمو خوێشمان لەوێ هەبێت.

پێیگوتم " کاتێك لە تەمەنی تۆدا بوم، جارێك سەفەرم بۆ تاران کرد. شارێکی جوان بوو. بەردەوام بیرم لەوە کردووەتەوە کە ئەشێت لەوێ ئامۆزام هەبێتو هەمیشە دەمویست ڕۆژێك بێتو بیاندۆزمەوە. بەڵام ئەوە چۆن دەگونجێ؟ ئێستا کە پێکەوە شەڕمانەو نیشان لەیەکتری دەگرین".

وەك ئەو ڕۆژە دایکم بۆی باسکردم نامۆیی بابەتەکە لەوەدابوو کە دیپۆرتکردنەکە لەسەر بنەمای ڕەچەڵەك نەبوو. عێراق دەشتێکی فراوانە لەگەڵ دوو ڕووباری مەزنو خاکێکی بەپیتو فەڕیش لە نێوانیانەوە، لەماوەی ئەو چەند سەدەیەدا چەندین جار داگیرکرابوو، ئەنە خۆی لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، داگیرکاری بەریتانی، ڕژێمی پاشایەتی عێراق، حکومەتێکی کۆمۆنیستەکان، هەروەها چەند ڕژێمێکی بەعسیشدا ژیابوو. لەسەرەتای سەدەی بیستەمو کۆتایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا، سەرژمێرییەك ئەنجامدرا تێیدا پرسیار لە سەرۆك خێزانەکان کرا داخۆ لەبنەچەدا عوسمانین یان ئێرانین. وەك دەردەکەوت ئەم پرسیارە بێ زیان نەبوو. لەترسی لەخشتەبردنو بردن بۆ ناو ڕیزی سوپای عوسمانیو هوشیاری گرنگی ڕێکخستنی بەڵگەنامەی گەشتکردن بۆ ئەنجامدانی کاری بازرگانی لەڕێگای سنوورەوە بۆ ئێران، باپیرە گەورەمو زۆرێك لە پیاوە شیعەکانی تر خۆیان وەك "ئەسڵی ئێرانی" تۆمارکردبوو. هەموو

ناسنامەیەکی هاووڵاتیبوونی عێراقی ئێستاشی لەسەر بێت کە ئێمەی بەو شێوەیە بەشدەکرد، لەسەر بنەمای تۆماری ئەو بەڵگەنامە شومە بوو.

بەڵام من هێشتاش تێنەگەشتم بۆچی دایکم لە مەترسی دیپۆرتکردندا بوو و باوکم ئەو مەترسییەی نەبوو. ئەوان ئامۆزای پلەیەك بوون، لە ئیسلامیشدا هاوسەرگیری لەنێوان ئامۆزادا ڕێگەپێدراوە چونکە میراتی خێزان پارێزراوەو باوەڕیش وایە کە مێردێك ئامۆزا بێت لە کەسێکی ئامۆ باشترە. بەڵام بنەچەی نەتەوەیی لەسەر پشتی باوك دەڕوات، ئەوانیش باپیرەی دایکیان هاوبەش بوو لەنێوانیاندا. باپیرەی باوکم لەسەری باوکییەوە وەك ئەسڵ عوسمانی تۆمارکرابوو، لەکاتێکدا باپیرەی دایکم، واتە ئەو کەسەی کە کارگەی ڕستنی دروستکرد، وەك ئەسڵ ئێرانی خۆی ناونوس کردبوو. بۆیە لەبەرئەوەی باوکم وەك ئەسڵزایەی عوسمانیو خاڵە عادلیش وەك ئەسڵزایەی ئێرانی ئەهاتنە ئەژمار، منو براکانم لە دیپۆرتکردن پارێزراو بووینو خاڵۆزاکانم نەبوون.

دایکم گوتی "سەرەتا خەڵکە هەرەدەوڵەمەندەکان دەنێرنەوە، بەم پێودانگە ئێمە وا مەزەنە دەکەین پوورە ئیشراقو خێزانەکەی لەنێو یەکەمینەکاندا بوون. وا هەستدەکەم تەنها دەیانەوێت ماڵو سامانەکەمان بدزن. تۆ بڵێی ئەم گەندەڵییە هەرگیز کۆتایی نەیەت؟ ئەوانە مافی وەها کارێکیان نییە! داخۆ تا ئێستا چەند کەس ئاوارەبوون؟ هەزارانو ڕەنگبێ دەیان هەزاریش. ئێمە هەموو عێراقیینو خانوویەکی زۆری چۆڵیش لەسەرانسەری بەغدادا دەبینرێت".

ئیدی کوا لە ئاسایشو ئارامیدا بووین؟

پێیگوتم "قسەمان لەگەڵ سەرۆك کۆمار کرد. زۆری نەویست تا گەیشتینە لای، بەڵام کاتێك لەگەڵیدا دانیشتین، سەبارەت بەو بابەتە هەڵوێستی باش بوو. بەڵگەنامەی لەدایکبوونی باپیرمان پیشاندا—ئەو دانەیان نە کە بایەخی زۆر بوو، بەڵام ئەمەش شتێکی کەم نەبوو. بۆیە "فایلێکی تایبەتی" بۆ کردینەوە.

فایلێکی تایبەت. ئەم دەستەواژەیەم لە مێشکما شەنو کەو دەکرد، خاترجەم نەبووم لەوەی باشە یاخود خراپ.

دایکم گوتی "نیگەران مەبە، ئازیزەکەم. عێراق هەمیشە ماڵی خۆمان دەبێت".

ئەو پاشنیوەڕۆیە ماوەیەکی زۆر لەو بالکۆنەکەدا وەستاین. دایکم رایکێشامە ژێر کۆتەکەیەوە بۆ ئەوەی گەرمم بکاتەوە، لەوکاتەدا چاوم بە نووسراوی سەر دراوە زێڕەکە کەوت کە شوێن دانێکی لەسەر بوو. وەك هەمیشە ئەو پرسیارەم بەبیردا هات کاتێك تەماشای ئەو شوێن ددانەم دەکرد، دەبێت چ هێزێك ئەوەندە بەگوڕبووبێت ئەمە پاشهاتەکەی بێت.

بەهۆی فایلە تایبەتەکەمانەوە، سەرەنجام پوورە ئیشراق و خێزانەکەی رێگەیان پێدرا بگەڕێنەوە بۆ ولات. هەمووان خواردنییان هێنا بۆماڵەکەیان و سەیرانێکمان لەسەر زەوییەکە رێکخست، چونکە مێزی تێدا نەبوو. هەموو شتەکانی ماڵەکەیان هەر لە کەلوپەلەوە بگرە تا قاپ و دەوری، بووکەشوشە و یارییەکان و تەنانەت کتێبەکانی خوێندنگەشیان برابوو. ماڵەکەیان چۆڵ بوو. لەبارەی ئەوەی لەماوەی رۆشتنیاندا چییان بەسەرهاتبوو، باسی هیچیان نەکرد.

بوونی "فایلی تایبەت" بەدرێژایی ژیانمان هەڕەشەیەك بوو بەسەر هەموو بنەماڵەکەمانەوە. لەکات و ناکاتدا هەر کارمەندێکی حکومی دەیتوانی داوای ناسنامەی هاوولاتیبوونمان لێبکات، چونکە شوناسنامەکان لەلایەن کاربەدەستێکی ناسراوی موخابەراتەوە واژۆکرابوو، هەرکەسێك بیبینیایە دەستبەجێ دەیزانی هاوولاتیبوونی "عێراقی" بنەماڵەی دایکم گومانی تێدایە و پرسیاری لەسەرەو ئەمەیان وەك هۆکارێك بۆ ترساندن و تۆقاندن بەکاردەهێنا. وارێکەوت ئەو شەوە لە ماڵی خالە عادل بووم کاتێك کوڕە بچکۆلانەکەی حوسام تازە دەچووە بەرخوێندن، بەئەندازەیەك ماتومەلول دیاربوو ناچار لێمپرسی کێشەی چییە. دەرکەوت خالە عادل ئەوەندە ترسابوو لە ناردنی حوسام بۆ خوێندنگە بە بەڵگەنامەی "فایلە تایبەت"-ەکەیەوە، پێی گوتبوو بە مامۆستا بڵێت ناسنامەکەی لەبیرچووە. ئینجا مامۆستاکەی ناردبووی بۆ لای بەڕێوەبەر، بەپێی رێنماییەکانی خالە عادل، حوسام بە بەڕێوەبەرەکەی گوتبوو گوایە دایك و باوکی لەدەرەوەی شارن، بەڵام هاوڕێیەکی گەورەی هەیە دەتوانێت بانگی بکات، ئەو دێت و ئۆبالی ئەم لەئەستۆ دەگرێت. حوسام کاتژمێرێك لە ژووری بەڕێوەبەر دادەنیشێت تاوەکو هاوڕێکەی، بەرپرسێکی پلەبەرزی بەعسی دەگات و ناوی تۆماردەکات. حوسام سەری داخستبوو پێیگوتم "وەها هەستم دەکرد دەڵێی هەموو خوێندنگاکە

تەماشای منیان دەکرد. مەگەر چی شتێکی هەڵەمان کردووە؟ بۆچی بەوجۆرە ڕەفتارمان لەگەڵدا دەکرێت؟" تا ئەوڕۆکەش، چاوەکانی حوسام فرمێسکی تێدەزێت کاتێك ئەو شەرمەزاریو ترسە وەبیردێنێتەوە. دوای بیست ساڵو کاتێك ویستی کوڕەکەی خۆی لە خوێندنگا تۆمار بکات، پێی وترابوو "ئەها، بەڵگەنامەی تۆ لەم ئۆفیسەدا نییە، پێویستە بڕۆی بۆ ئۆفیسی فایلی تایبەت" ئەو دێوەزمەیە دیسانەوە بەرۆکی بە ئەوەی داهاتوش گرتبوو.

تەنها یەك یادەوەریم هەیە کە بەڕاستی خۆزگە ئەخوازم بمتوانیبا بیسڕمەوە، ئەویش دەروەستە بە دایکمەوە.

چەند مانگێك پاشئەوەی "فایلی تایبەت"مان بەدەستهێنا، من لە نهۆمی سەرەوەو لە ژوورەکەی خۆمدا خەریکی شیکارکردنو ئەنجامدانی ئەرکی خوێندنگە بووم. کات درەنگ بوو، براکانم قەیرێك بوو نووستبوون، باوکم لە نهۆمی خوارەوە تەماشای تەلەفزیۆنی دەکرد، بانگیکردم تا بچم سۆراخێکی دایکم بکەم. ڕۆیشتم بۆ لای ژووری نووستنەکەیانو بینیم دەرگاکەی کلۆمدراوە. لە دەرگام دا، پاشان دووبارە لێمدایەوە، بەڵام وەڵامی نەدایەوە. دواجار چوومە ژوورەوە هاڵاوی هەوایەکی گەرم بەڕوومدا هات. هیتەرەکەی لەسەر پلەیەکی بەرز بوو. هەموو گڵۆپەکان پێبوونو ئەوەندە ڕوناك بوو دەبریسکایەوە. ئەوکاتە ژوورەکە سەرلەبەری سپی بوو، شتومەكو ڕاخەرو دیوارەکانیشی هەموو سپی بوون. جێگاکەیان چۆڵ بوو، نارێكو شپرزە بوو، وەك ئەوەبوو لە ماندوویەتیدا خەوی لێکەوتبێتو وەخەبەرهاتبێت تا گەرماوێك بکات. وەڵامی بانگردنەکەمی نەدایەوە. پاشان دیقەتم داو دیم لەو دیوی جێگای نووستنەکەوە بەسەر زەوییەکەوە کەوتبوو. بەپێخەوە سپییەکەیەوە لەسەر فەرشێکی ئێرانی هەڵژابوو دەستو قاچی بەملاولادا کەوتبوونو قژی پەرێشانو بڵاببووەوە. لەدەورو پشتیدا حەبی پەمەییو شین، سپی، زەردو بووتڵی پلاستیکیی بەتاڵ لەسەر فەرشە شەرابییەکە کەوتبوون.

زەندەقم چوو. ڕامکرد بۆ لایو ڕامکێشایە سەر دەستم. هێشتا هەناسەی دەدا، بەڵام کاتێك هەوڵمدا هەڵیبگرم لەشی قورس ببوو. "دایە، دایە! هەستە، دایە! گوێت لێمە، دایکە؟ دیم هەوڵی دەدا چاوەکانی بکاتەوە، بەڵام سەرنجی

لەسەر هیچ بۆ ڕانەدەگیرا. روخسارە جوانەکەی هەڵبڕسکابوو. سیمای ببووە بەفرو هەرگیز ئەوەندە سپی نەمدیبوو. داخۆ لەگیانەڵادا بوو؟ هاوارمکرد "باوکە"، وەڵامی نەدایەوە، بۆیە رامکرد تا بیهێنم. تەواو تاریك بوو و گشت گڵۆپەکان خامۆشکرابوون. هەموو ئەوی دەمبینی تەنها روناکی شینی تەلەفزیۆنەکە بوو دەنگی تەلەفزیۆنەکەش لە هۆڵەکەمانەوە دەهات. باوکم دۆزییەوە لەسەر قەنەفەیەکی شین دانیشتبوو گڵاسێك ویسکی لەتەنیشت خۆیەوە دانابوو. رامکرد بۆ لای، بەڵام بەدمەستی بەهۆی ویسکییەوە بەئەندازەی بێهۆشی دایکم بوو بەهۆی حەبەوە. دواجار لەگەڵمدا هات، گێژبوو کاتێك تەماشای دایکمی کرد لەسەر زەوییەکە کەوتبوو. ناردم زەنگ بداتو داوای یارمەتی بکات خۆشم لای دایکم مامەوە. لای دانیشتبوومو سەریم لەسەر رانم دانابوو بەردەوام بەئاگام دەهێنایەوەو رومەتیم بە خاولی تەڕ فێنك دەکردەوە، قژە درێژەکەیم شانەدەکرد، پێم دەگوت، دایە تکا ئەکەم مەمرە، توبی خودا مەمرە.

خاڵە عادل گەیشتو پێکەوە توانیمان دایکم بخەینە ناو ئۆتۆمبێلەکەی. باوکم لەماڵەوە مایەوە. کاتێك گەیشتینە ماڵی خاڵە عادل، ڕەتم کردەوە دایکم لەباوەشم دەرکێشن. ڕێگەنادەم، ڕێگەنادەم، ڕێگەنادەم لێم دووربکەویتەوە. بردمانە گەرماوەکەیانەوە، پاشان خاڵە عادل شیری بۆ هێناو زۆری لێکرد تا بیخواتەوە بۆ ئەوەی حەبەکان هەڵبێنێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی قوتی بدات، بۆیە پوورە نەجوە لە چێشتخانەکە رەحەتییەکی هێنا، خاڵە عادل لەوکاتەی فرمێسك بەرومەتیا دەهاتنە خوارەوە خوشکە بچوکەکەی گرتبوو، منیش شیرم دەکرد بەقوڕگیدا. من چیتر وازم لە گریان هێنابوو. بەتەواوی جەختم لەسەر قوتدانی شیرەکە دەکردەوە. ئەرکم رزگارکردنی ژیانی بوو. پشتەملیم گرتبوو بەوچەشنەی ئەو هەی منی دەگرت کاتێك نەخۆش دەبووم، ئاخری حەبە ترسناکەکانی هەڵهێنایەوە.

تا ئەوەی پزیشکەکە گەیشت، منو پوورە نەجوە شۆردبوومانو جلەکانیمان گۆڕیبوو لەسەر جێگایەك خەواندبوومان. پاشان پوورە نەجوە پێخەوێکی پاکی پێدامو منیش لەبەرمکردو لەسەر جێگاکە لەتەنیشتی دایکمەوە راکشام. دەستمکردە ملیو بەدرێژیی شەو لەباوەشم گرتبوو وەك دایکێك چۆن منداڵە

نەخۆشەکەی لەباوەش دەگرێت، گوێم لە هەناسەی دەگرت دەترسام ئەگەر خەو بمباتەوە لەدەستی بدەم. دایکم هەوڵیدابوو خۆی بکوژێت. بەڵام بۆ دایە، بۆ؟ مەگەر نازانی منو حەیدەرو حەسەن چەندە پێویستمان پێتە؟ مەگەر نازانی چەندەم خۆشدەویی؟ تا کاتێك خەوم لێکەوت، هەستمدەکرد هەموو منداڵیم لێدابڕاوە. گۆشەیەکی قۆناخی پێگەیشتوویيم بینی کە ئامادە نەبووم بۆی، شتێك بوو بۆنی شیرو ویسکیو ئازاری لێدەهات، بەڵام من چ وەڵامێکم لانەبوو، لەڕاستیدا کەسیش پێی روونناکرێتەوە چی ئەو هەموو ﺑﺎﺭﻭﺩۆخەی بەسەر یەکدا کەڵەکە کردبوو.

دایکم ماوەیەکی درێژ نووستو کاتێك بەئاگا هاتەوە بەهۆی ئەو ئازارەوە لاوازو کەنەفت ببوو. ویستم پرسیاری لێبکەم کێشەکە چی بووە، بەڵام ئەو شەرمەزارو پێکەنیناوی دەردەکەوت.

بەردەوام دەیگوت "ببوورە، زەنوبە. ببوورە، ئازیزەکەم. ببوورە". دەستی بەقژمدا دەهێنا. پاشان شتێکی وت کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە:

"هەسدەکەم وەك باڵندەیەك لە قەفەسدام. زەینەب، هەرگیز مەهێڵە وەك باڵندە بیتو لە قەفەسدا. پەیمانم بدەرێ ئازیزم، کە هەمیشە گیانێکی ئازادبیت".

وتم "بەڵێنت پێدەدەم دایە".

سەیربوو تێنەگەیشتم. دایکم پێی دەگوتم وەك ئەو نەبم، بەڵام تا ئەو شەوەش هەرگیز نەمویستبوو جگە لەو هیچ شتێکی تر بم.

# لەیادەوەرییەکانی عالیاوە

شەوێك ناردی بەشوێنمانداو لەنزیك رووباری دیجلەوە ئاهەنگمان دەگێڕا. ئەو شەوە تەنها هەندێکمان لەدەوریدا بووین، سەدام وەك ئاو ویسکی دەخواردەوە. لەهەر کاتژمێرێکدا یەکێك لە پاسەوانەکانی دەهاتو قسەیەکی دەچرپاند بەگوێیدا. لەنیوەشەودا، پاش ئەوەی نزیکەی سێ چارەکی بتڵێك ویسکی خواردەوە، بەدەنگی بەرز وەڵامی پاسەوانێکی دایەوە "لێیاندەو با یارییەکە دەست پێبکات، لێگەڕێ بەر نەفرەتی خوا بکەون!". نەمانزانی باسی چی دەڵێت، سبەی رۆژ تێگەیشتین کە کەشتییەکانی ناردووە بۆ شەتلعەرەب (ئەو ئاوەی کە لەنزیك کەنداوی فارسەوە عێراقو ئێران لەیەکتر جیادەکاتەوە) بەم شێوەیە جەنگی ئێرانو عێراق ئیدی دەستیپێکرد.

چەند مانگی یەکەمی جەنگەکە زۆر خۆشحاڵ بوو. لەڕاستیدا، بەو شادییەی ئەو چەند مانگەی سەرەتاوە پێشتر هەرگیز نەمانبینیبوو. نزیکەی هەموو شەوێك ئاهەنگی دەگێڕا. ئەو شەوانە پڕبوون لە ژنی لادێیی، سەمایان بۆ دەکردو گۆرانیان بۆ دەووت. زۆرجار لەو ئاهەنگانەدا دەستەیەك نمایشیان پێشکەش دەکرد کە بەدەستەی زوباب ناسراوبوون. گۆرانیبێژی سەرەکییان ژنێك بوو ناوی ئەنیسە بوو، بەردەوام لای پێی سەدامەوە دادەنیشتو گۆرانی خەمناکی کۆنی ناوچە لادێ نشینەکانی دەووتەوە ئەمەش هەستی سەدامی دەخرۆشاندو رابردووی بیردەخستەوە. بەردەوام لە ئاهەنگەکەدا نزیکەی ۲ هەزار دیناری بەسەر هاوڕێکانیدا دابەش دەکرد بۆ ئەوەی ئەو پارەیە بەسەر سەماکەرەکانو گۆرانیبێژەکەدا هەڵبدەن. لەو ئاهەنگانەدا لە هەموو شوێنێك پارە کەوتبوو، بەسەر سەماکەرەکاندا دەکەوتە سەر زەوییەکەو پەرش دەبوویەوە.

ئێمە ئەو ئاهەنگانەمان بەهۆی میوزیکی عەرەبە دەشتەکییەکانەوە(کۆچەری) و قسەکانییەوە سەبارەت بە شەڕ هەمیشە بەژانەسەرەوە بەجێدەهێشت، بەڵام هیچ چارەیەکی ترمان جگە لە ئامادەبوون

نـەبوو. لـەو ڕۆژانـەدا سـەدام دەیویسـت هـەمووان لەدەوروپشـتی بـن، بۆیـە ئاهەنگەکانیش هەمووکات گەورەو نمایشی بوون. هەنـدێك جار لـەم ئاهەنگانـەدا باسی پیلانە سەربازییەکانی دەکردو شانازیشی بەو شەڕە جیاوازانـەوە دەکرد کـە خۆی نەخشەی بۆ کێشابوون. چـێژی لـە دووبارە بینینـەوەی مەشـهەدەکانی ئـەم شـەڕانە دەبـرد، فەرمانیشـی بـە تەلـەفزیۆن دابـوو جاروبـار بـۆ مـاوەی چـەند کاتـژمێرێك پەخشـیان بکات تا بتوانێت تەماشـایان بکات. مـن‌و باوکت تەنانـەت نەیشماندەتوانی تەماشای ئەو دیمەنانە بکەین چونکە تژەبوو(پڕبوو) لـە وێنـەی سـەربازی کوژراوی ئێرانـی. کەچی ئـەو لای خۆیـەوە وەها باسـی ئـەو دیمەنانـەی دەکرد گوایە ئیشتهای بۆ خواردن زیاد دەکەن.

# پاش دورگەی بەراز

ساڵێك پاش دەسپێکردنی جەنگ، چوومە قۆناخی ناوەندی. لە عێراقدا، کوڕو کچ لە قۆناخی سەرەتاییدا پێکەوە لەیەك خوێندنگەدا دەیانخوێند، بەڵام لە ناوەندیو ئامادەییدا جیادەکرانەوە. بڕیارمدا لەگەڵ هاوڕێکانم، کە گیانی بەگیانی بووین، نەچمە خوێندنگای کچانی نموونەیی، داوامکرد بڕۆم بۆ ئەلشامیلە، کە خوێندنگەیەکی ئەزموونی گشتگیرو مۆدێلێکی ناوەندی-ئامادەیی بوو. یەکێك لە مامۆستاکانی ئەو خوێندنگایەش هاوڕێی دایکم بوو، ئەو هاوڕێیەی دایکم سەرنجی سەبارەت بە پرۆگرامی ناوازەی خوێندنی ئەوێ ڕاکێشام، بەوەی وانەکانیان ماڵداریشی تێدابوو: لەناویاندا ڕێکخستنی خەرجی، کارەبایی، دارتاشیو کاری کانزایی بەدیدەکرا. هەروەها وانەی زیادەی وەك مۆسیقاو گڵسازیو بابەتی تری جۆراوجۆر دەخوێندراو خوێندنگاکانی تر لەمەیان کەمبوو.

لە خوێندنگە نوێیەکەمدا کەسم نەدەناسی، لێرەوە خۆگونجاندن قورس لەسەرم وەستا. خوێندنگاکە لە ماڵمانەوە زۆر دوور نەبوو، بەڵام لە گەڕەکێکی پەراوێزخراودا هەڵکەوتبوو و بەشێك بوو لە جیهانێك سەراپا جیاواز لەو دنیایەی من تێیدا ژیابووم. یەکەم ڕۆژی خوێندنگەو کاتێك دایکم لە ئۆتۆمبێلە تویۆتاکەمان دایبەزاندم، وا هەستمکرد هەموو گۆڕەپانی خوێندنگەکە چاویان لەسەر منە. هەرگیز خێزانەکەم منیان بە پاس نەدەنارد، چونکە سوار ڕەوە گشتییەکان تەنها لەلایەن ئەو خەڵکانەوە بەکاردەهێنران کە ئۆتۆمبێلیان نەبوو. لێرەش، هەموو بە پێ یان بە پاس دەهاتن. دەرکەوت من تەنها منداڵی دەوڵەمەندی ئەو خوێندنگایە بووم کە پڕبوو لە منداڵی خێزانە هەژارو کرێکارەکان.

ژمارەیەکی بەرچاو لە خوێندکاران لە تەمەنی چواردە یان پانزە ساڵییەوە بۆ شوکردن وازیان لە خوێندن دەهێنا. هەموومان هەمان جلوبەرگی یەکچێنمان لەبەردابوو، بەڵام جلەکانی من لە ئەڵمانیا یان ئینگلتەراوە هێنرابوو لەحاڵێکدا

هاوپۆلییەکانم خۆیان جلیان بۆخۆ دوریبوو. من دەمتوانی برۆمەوە بۆ ماڵەوەو دووشێك بكەمو بۆ رۆژی دواتر بۆنی کیوی یان گوڵە خەزێمی بۆنخۆشم لێبێت، لەکاتێکدا هەندێك لەوان دەبوو برۆنەوە بۆ ماڵ بۆ ناو خانەوادەی توندمامەڵەو ئازاردەر. ئەوێکات بۆ یەکەمجار دەربارەی توندوتیژی خێزانی بیستمو تێگەیشتم لە بەهای ئەوەی هاوپۆلییەکانم دەیانبەخشی بۆ ئەوە کەمدەرامەتو نەخوێندەوارەکان. بیرمە کچێك بۆی گێرامەوە کە چۆن زرباوکەکەی لێی دەدا، لەماڵ دەیکاتە دەرەوەو بەتەنها جێی دێڵێ تا شەو لەبەردەرگا بکاتەوە. نەمدەزانی چی قسەیەك گونجاوە لە وەڵامدا پێی بڵێم، دەی ئاخر هیچ قسەیەك نەبوو. شتێك نەبوو شایانی وتنی هەبێت. ژیانی زۆر دژوار بوو. چ کارێکی هەڵەی ئەنجام نەدابوو، بەدەر لەوەی لە خێزانێکی هەڵەدا لەدایکببوو، منیش گەڵ خۆشبەخت بووم بەوەی لە خێزانێکی گونجاوو دروستدا لەدایکببووم.

هەموو شتێکم دەکرد بۆ ئەوەی بتوانم لە خوێندنگە بیسەلمێنم کە منداڵێکی دەوڵەمەندی دەبەنگو نەزان نیم. پەیوەندیم بە دیدەوانی کچانی عێراقییەوە کرد. بەشداری چالاکییەکانی دوای خوێندنگەم دەکرد. ئەگەر شوفێرەکەمان درەنگ بهاتایە بەشوێنمدا، دواکەوتنەکەیم وەك بیانویەك بەکاردەهێناو لە پاس سەردەکەوتم، بێگوێدان بەوەی کتومت وەك منداڵێکی سەرەڕۆ رەفتارم دەکرد چون چاوەڕوان دەمهێشتەوەو دەترسا لەوەی شتێکم بەسەرهاتبێت. جارێکیان بینی من لە پاس سەرکەوتم بە هەموو وێستگەکاندا بەدوای پاسەکەدا هات. دواجارو کاتێکیش کە بینیم، پێویستبوو لە پاسەکە دابەزمو لە ئۆتۆمبێلەکە سەرکەوم، لەوکاتەدا هەموو هەوڵێکم دەدا وا بکەم لە پەنجەرەکانەوە سەیرم بکەن. دەمویست خۆ بگونجێنم، هاورێتی دروستبکەم، بەڵام من دنیای سیکولار کە تیای گۆشبووم وێڵکردبوو وابەستەی جیهانی مسوڵمانە کردارییەکان ببووم، هەم سونیو هەم شیعی. نوێژخوێندن بەشێك بوو لە ژیانی رۆژانەی زۆرینەی هاوپۆلییەکانم. رۆژێك، بێدەنگو برێك گێلانە لەگەڵ کۆمەڵێك کچ وەستابووم، باسی نوێژیان دەکرد.

گوتم "منیش نوێژ دەخوێنم".

کچێك وتی "بەراست! من کە باوەرت پێناکەم. ئادەی پێمان بڵێ لەکاتی

نوێژدا چی دەخوێنی—ئەگەر بەڕاستی دەیزانیت".

بە شایەتومان دەستمپێکرد، واتە ئەو دەستەواژەیەی مسوڵمانان دەکاتە مسوڵمان: "گەواهی دەدەم کە هیچ خواوەندێك جگە لەخودای گەورە بوونی نییە، هاوکات شایەتی دەدەم کە موحەمەد پێغەمبەری ئەو خودایەیە". لە کۆتاییەکەیەوە شڵەژام، ئەو بەشەم بەجێهێشت کە دەربارەی عەلییە. پاشان بەشەکانی تری نوێژو ئایەتەکانی قورئانم گوت.

کچەکە پێیگوتم "باشە، بەردەوامبە".

ڕێگەیاندام لە قسەکردن بەردەوامبم، تاقیاندەکردمەوە، لەکۆتاییشدا هەموویان دایانە پێکەنین.

کچێك گوتی "تۆ ئەسڵەن نازانی چۆن نوێژبخوێنی، کچە دەوڵەمەندی ئیدی! تۆ لەچینی ئووللای!".

کاتێك زەنگ لێیداو گەڕاینەوە هۆبەکانمان، هەوڵمدا بابەتەکە ئاسایی بکەمەوە. بەڵام هەستم بەئازارو بێزاری کرد، بیرم لەوە دەکردەوە کە لەسەر بنەمای ئەوە هەڵسەنگێنرام چۆن نوێژ دەکەم یان نایکەم، هەروەها هەستم بەتوڕەیی کرد لەئاست دایكو باوکم بەهۆی ئەوەی فێری نوێژیان نەکردبووم لەلایەكو خۆیشیان نوێژیان نەدەکرد لەلایەکی ترەوە. کاتێك داپیرەم هات بۆ ماڵمان، داوام لێکرد پیشانم بدات چۆن نوێژ دەکرێت، پاشان بەرماڵەکەم دەرهێناو بەئەنقەست لەبەردەم خێزانەکەمدا دەستمکرد بەنوێژ. پوورە سەمەر هاتبووە دیدەنیمان. تەلەفزیۆنەکە پێبوو. دایکان پێدەکەنینو قاوەی تورکییان دەخواردەوە. براو خاڵۆزاو پوورزاکانم هەموویان لەدەوروبەرمەوە یارییان دەکرد.

نەنەم گوتی "کارێکی باشە، زەنوبە، بەڵام جاری ئاییندە هەوڵبدە لەکاتی نوێژکردنەکەدا تەلەفزیۆنەکە خامۆشکەیت، یان چ باشتر ئەگەر بەتەنها لە ژوورەکەی خۆت بیت، ئەگەر باش خەیاڵت جەم بکەیتەوە چاتر هەستدەکەیت".

بۆ ماوەیەك بەشێوەیەکی بەرپرسیارانە نوێژی بەیانیو ئێوارەم دەکردو شەوانی پێش تاقیکردنەوە پتر ئاییینی دەمنواند.

ڕۆژێك لە ململانێم لەگەڵ شەرمنیمدا، پێم بەجەرگی خۆمدا ناو لە پشووی نابەین وانەکاندا بەشداریم لە گێمێکی یاری باسکەدا کرد. لەگەڵ خاڵۆزاو

نامۆزاکانم لەکۆڵانەکەماندا یاریم کردبوو، هەروەها لەیەکێك لە هاوینەکاندا لە سێیتڵو ئەوکاتەی دایکم بە حەسەنەوە سکی پڕبوو یاریم کردبوو، سکی بەقەدەر تۆپەکە گەورە بوو، بەپێکەنینەوە بەدەوری گۆڕەپانەکەدا رایدەکردو راهێنەرایەتی دەکردو بە ئەکسێنتێکی تێکەڵ لە عەرەبی بەغدای و هەندێك جاریش بەئینگلیزی دەیووت "برۆ، برۆ، برۆ". لەدوای پشووەکە یەکێك لە یاریزانەکان هاتە لام و سەبارەت بە یاریکردنەکەم ستایشی کردم. کەوتینە قسەکردن لەگەڵی. هەردووکمان حەزمان لە هاوڕێیەتی یەکتری بوو ژمارە تەلەفۆنمان گۆڕییەوە.

لەسەر نانخواردنی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە رامگەیاند "هاوڕێیەکی نوێم پەیداکردووە!"

دایکم وتی "ئەوە شتێکی باشە، ئازیزم".

باوکم پرسی "لەکوێ دەژی؟"

وەڵاممدایەوە "لە گەڕەکی ئیسکانی نزیك خوێندنگا". ئیسکان گەڕەکێك بوو بەپرۆژە خزمەتگوزارییەکانی نیشتەجێبوون بۆ خێزانە هەژارەکان بەناوبانگ بوو.

باوکم دیسانەوە پرسی "باوکی چ کارەیە؟"

وتم "نازانم، باوکە. ئەم پرسیوە. مەگەر دەبا پرسم؟"

بەتوندی گوتی "پێویستە بزانم. ژمارە تەلەفۆنی خۆتت پێدا؟"

وتم "بەڵێ. ئێمە هاوڕێین، باوکە".

وتی "پێویستە لێی وەرگریتەوە".

منیش بەنابەدڵییەوە گوتم "بۆچی، باوکە؟" من لەتەواوی ئەو گفتوگۆیە تێنەگەشتم. تازە هاوڕێیەکم دۆزیبوویەوەو بابم هەوڵیدەدا لێم دووربخاتەوە.

وتی "لەبەرئەوەی من پێت دەڵێم".

وتم "بەڵام باوکە، من ئەو کچەم خۆشەوێت! بۆچی داوای ئەوەم لێدەکەی؟ تۆ من دەخەیتە هەڵوێستێکی شەرمەزارییەوە لەگەڵ کچێك کە تازەکی چاوم پێی کەوتووە. شەرم ناتگرێ".

"تۆ ئەوە بکە، زەینەب. من هۆکاری خۆم هەیە. وابکە، باشە؟ گفتوگۆی

زیاتری ناوێت".

تەماشایەکی دایکم کرد بۆ ئەوەی یامەتیم بدات.

ئەویش وتی "باوکت دەزانێت چی دەکات، شیرینەکەم. هەرچی دەڵێت بیکە. متمانەی پێبکە، ئەو خۆ باوکی تۆیە".

بەشەرمەزاریو بێزارییەوە، رۆژی دواتر رۆیشتم بۆلای ئەو کچەی ویستم ببێتە هاوڕێم، دەشمزانی وا خەریکە کارێك دەکەم دەبێتە مایەی ئازاری هەردووکمان.

پێم گوت "تکا دەکەم بمبەخشیت، بەلاّم باوکم وتی ناشێت ژمارە تەلەفۆنەکەم بە تۆ بدەم".

سەیری ناوچاوی کردمو دەفتەرو پێنوسێکی دەرهێنا. ژمارەکەی منی لەسەر بەرگی دەفتەرەکەی نوسیبوو، تەماشام دەکرد کاتێك بەتوندی پێنوسەکەی بەسەر ناوەکەمدا دەهێنا، ئەوەندەی بەسەردا هێنا تا وەك یەك هێڵی کاربۆنی رەشی تۆخی لێهات.

وتی "تەنها بۆئەوەی نیشانت بدەم کە هەرگیزاو هەرگیز ناتوانم جارێکی تر ژمارەکەت ببینم". پاشان لێیداو رۆیشت.

من تەنانەت روونکردنەوەیەکیشم نەبوو بۆی. نەمدەزانی کە باوکم بەهۆی سەدام حسێنەوە ژمارە تەلەفۆنەکەی پێ وەرگرتمەوە. لەوکاتەدا تێنەدەگەشتم کە دایكو باوکم تا چ ئەندازەیەك من دەناسن. بۆ من، ئەو تەنها دەموچاوێك بوو لە تەلەفزیۆندا، پیاوێك بوو فێرکرابووین گۆرانی بۆ بڵێین، بە بەردەمیدا مارشبکەینو بۆ تەندروستی بپاڕێینەوە: سەرۆك کۆماری عێراق بوو.

هەموو منالاّنی عێراق فێرکرابوون پێی بڵێن "عەمو سەدام" کە بەمانای "مامە سەدام" دێت. (ئەوەش فۆرمێکی کۆنی نازناوە، منداڵانی عێراق بۆ بانگکردنی نێرینەی پێگەیشتوو بەکاری دێنن؛ بۆ نموونە هاوڕێکانم باوکمیان بەکاك یان بەڕێز سالبی بانگ نەدەکرد، بەڵکە پێیان دەووت عەمو سالبی) دڵسۆزی بۆ عەمو سەدام لە خوێندنگا بەشێوەیەك لەهەموو قوتابییەکدا چێدەکرا، ببووە ڕەهەندێکی جیانەکراوە لە دڵسۆزی بۆ خێزانو ولاّتی عێراق خۆشی. کوڕانو کچان بەشداریيان لە دیدەوانی سەربازی (تەلایع)دا دەکردو

وەختێك لە خوێندنگا نمایش‌و گۆرانی وەك "عەمو سەدام ددانی خومەینی ترسەنۆك دەشكێنێ!"پێشكەشدەكرا، پۆشاكی یەكچینی هاوشێوەی سەربازی شین‌و سپییان لەبەردەكردو كڵاوی وەك یەكیان لەسەر دەنا. نەوجەوانان فێردەكران وەك گەورەكان ناوی بە ئەلسەید یان ئەلرەئیس بهێنن، واتە گەورە یان سەرۆك، هەروەها لەگەڵ یەكتریدا پێشبڕكێمان دەكرد بۆ دەربڕینی خۆشەویستیمان بۆی، ئەوەش لەرێگەی پێشبڕكێی هۆنراوەو كاری هونەری‌و نمایشی بێكۆتاوە بەوجود دەهات. من دیاریكرام بۆ بەرزكردنەوەی ئاڵا لەكاتی ئەو مەراسیمەدا كە هەموو پێنج شەممەیەك، واتە كۆتا رۆژی كاركردنی هەفتە لە رژێمێری ئیسلامیدا، ئەنجامدەدرا. ئەوە شەرەفێكی گەورە بوو، لەبیرمە چۆن بەسەربەرزی لەبەردەم پۆلەكەدا بەیەكچینی تەڵایعی كچانەوە دەوەستام بۆ: بەرزكردنەوەی ئاڵاكە بەرێكوپێكی، بەستن‌و گرێدانی‌و سڵاوكردن لە ئاڵاكە. پاشنەوە سرودی نیشتمانیمان دەوتەوە—هەڵبەت ئەو گۆڕیبووی بە سرودێكی نوێ، كە بۆ من زیاتر لە مارشێكی سەربازی دەچوو—پێویستبوو بوەستاینایەو بەوپەڕی سەرەنجەوە گوێمان بۆ وتەكانی بەڕێوەبەری خوێندنگەو هۆنراوەی قوتابیان‌و گۆرانی دەستەی خوێندنگا رابگرتایە، هەموو كەسێك فیدای سەرۆك‌و وڵات بوو.

بۆ پیشاندانی نیشتمانپەروەری، هەموو كەسێك چاوەڕوانی لێدەكرا لەچالاكییەكدا لەدەرەوەی پرۆگرامی خوێندندا بەشداری بكات. من پەیوەندیم بە گروپی مارشی خوێندنگاوە كرد. كاتژمێر لەدوای كاتژمێر، لەچوار ریزی رێكدا راهێنانمان دەكردو ئاڵایەك یان وێنەیەكی سەدام حسێن مان بەدەستەوە بوو هاوارمان دەكرد"خوا سەرۆك بپارێزێت! خوا تەمەنی درێژ بكات!" فێركرابووین نەتەنها ئەوەی چۆن پێمان بجوڵێنین بەڵكو چۆن بڕوانین—تیژسەرنج و جەسورانە—هاوكات چۆنای دەنگ دەركەین—بەرزو توند. بۆ هەموو فەرمانێكی مامۆستا وەڵامی "یەس، یەم"مان دەدایەوە. وەها مەزەنە دەكرێت "یەس" لەو رۆژگارەوە ماوەتەوە كە بەشێك بووین لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی. بەڵام نازانم "یەم" واتای چی بوو، كەس باسی ئەمەیانی نەكردووە. یەكشێوەیی‌و دووبارەیی هەنێ شتی لێ دارنیبووین، دواتر دەركم كرد ئەو شتە سەربەخۆیی تاكێتیمان بوو.

پاش ماوەیەك گوێم لە هیچ دەنگێکی تەنها نەبوو تەنانەت دەنگی خۆیشم. منیش ببووم بە بەشێك لە یەکەیەکی تەواو، ئەوەم ئەنجاندەدا سەرکردەکەمان دەیخواست بیکەین: مارش و هاوارکردن. مێشکم لەکارخستبوو، خۆم دابوویە دەست شەپۆلی هاتوو و یەك لە هەزاران هەزاری ئەو عێراقییە لاوانە بووم مارشیان بۆ سەدام حسێن دەکردو سروودیان بۆ دەکوت. هەندێك جار تەواوی خوێندنگاکەمان چۆڵ دەکردو لەگەڵ ئەوانی تر بەشداری خۆپیشاندانە جەماوەرییەکانمان بەناو شەقامەکانی بەغدادا دەکرد، لەو سەرلێشێواوان و دیارنەمانەشدا خۆم دەدزییەوە. هەرگیز وەك زۆرێکی تر نەبووم هەڵبەرزو دابەرز بکەم و دروشمەکان بەدەنگی بەرز بڵێمەوە "بەخوێن، بەگیان، دەتپارێزین ئەی سەدام" هەرچەندە یارمەتی دایکمی دابوو بە "فایلە تایبەتەکەمان" بەڵام ئەوەندە تەمەنم هەبوو تێبگەم، ئەو بەرپرسیاری یەکەمی ئەو سیستەمەیە کە دەستی بەدیپۆرتکردن کردو خاڵۆزاکانمی توشی کێشەو چەرمەسەری کرد.

لەسەر تەلەفزیۆن سەدام وەك پیاوێکی کەشخەو دۆستپەروەر دەردەکەوت، گوایە حەز بەسەردانی ماڵی هاووڵاتی ئاسایی دەکات بۆ چا خواردنەوە. ژنی خاوەنماڵ دەرگای بۆ دەکردەوەو توشی شۆك و سەرسوڕمان دەهات لەوەی لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە هەڵبژێردراوە بۆ یەکێك لەو سەردانانەی جاروبار دەیکرد بۆ ماڵان، ئینجا ژنەکە پێشوازی لێدەکرد بۆ ژوورەوە. ماڵپەروەرو بەرێز دەهاتە پێشچاو کاتێك کامێراکە بۆ ژوورەوە دوای دەکەوت. پاشان پرسیاری دەکرد "هاوسەرەکەت چۆنە؟ کاری منداڵەکانت چۆنە؟ خواردنتان باشە؟ هەروەها دوای ژنەکە دەکەوت بۆ ناو چێشتخانەکەی، سەیرێکی دەکرد بۆ ئەوەی بزانێت لەسەر ئاگرەکە چی لێناوەو بەفرگرەکەشی دەکردەوە. بیرمە تەماشای زۆرێك لە بەفرگرەکانی دەکرد، هەمیشە قسەی لەسەر ئەوە دەکرد کە چەن بەباشی و رێکوپێکی شتیان تێدا داناوە—من دڵنیام هەندێك لەو ژنانە تەنها لەوکاتەدا بەفرگرەکانیان رێکدەخست کە ئەو سەردانی دەکردن. لەهەموو سەردانە پەخشکراوەکاندا خێزانەکان خۆشحاڵ و سوپاسگوزاربوون بەدیتنی، بەڵام دواتر پوورە سەمەر بۆی گێرامەوە لەکۆی ئەو ماڵانەی سەردانی کردبوون، تەنها یەك ژن هەبووە کاتێك سەدام لێی پرسیوە هیچ شتێك هەیە بتوانێت بۆی بکات،

پێگوتووە "بەڵێ: سەبارەت بە تاقە کوڕەکەم نیگەرانم، دەتوانی لە جەنگەوە بۆم بهێنیتەوە بۆ ماڵ؟" ئەو بەشە هەرگیز لە تەلەفزیۆنەوە پەخشنەکرا، ئەو ژنە سۆراخی پوورە سەمەری کردبوو دواتر، بەو هیوایەی هەرچۆنێك بووە بتوانێت پۆزشەکەی بگەیەنێت، نەکاو کوڕەکەی باجی ئەو هەڵەیەی دایکی بدات.

ڕۆژی لەدایکبوونی سەدام حسێن پشویەکی نەتەوەیی بوو. شەقامەکان دادەخران، شانۆی نمایش دادەمەزران، گروپەکان نواندنیان بۆ دەکردو خەڵك لەشەقامەکاندا سەماو شادییان بۆ دەگێڕا. ئێواریش هەمووان لەدەوری تەلەفزیۆن کۆدەبوونەوەو تەماشای ئەویان دەکرد بەسەر مێزە درێژەکانی نانخواردندا دەگەڕاو سەرژمێری ئامادەبووەکانی دەکرد. هەریەکەو کارتێکی پێبوو ناوی ئەو کەسەی لەسەر بوو کە پێی دابوو و کامێرا پیشانیدەدا، هەمووانیش چاوەڕوانی ئەوەبوون بزانن کێ چی پێدراوەو وەڵامی عەمو چی دەبێ. من هەمیشە گومانم هەبوو لەو ڕۆژە ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوونی دەگێڕدرا، واتە ٢٨ی نیسان، کە لەڕاستیدا ڕۆژی لەدایکبوونی بێت. چوون زۆرێك لەو خەڵکانەی هاوتەمەنی بوون و لەناوچە لادێیەکان گەورە ببوون دایك و باوکیان نەخوێندەوار بوون یان گوێیان بە مێژووی لەدایکبوونی منداڵەکانیان نەدابوو، لەئاکامدا بەرواری ١ی تەموزیان وەك ڕۆژی لەدایکبوون بۆ دیاریکرابوو. بیرمە باوکم سەربوردێکی پێکەنیناوی بۆ گێڕاینەوە; گوایە جارێك لەگەڵ گروپەکەی لە ١ی تەموز لە بانکۆك دەنیشنەوە، بەڕێوەبەری ئەو ئوتێلەی تیای دەمێننەوە، بەو ڕاستییە سەرسام دەبێت کە زۆرینەیان لەو ڕۆژەدا لەدایکبوون، بۆیە بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی خنجیلانەی لەدایکبوونیان بۆ سازدەکات.

خوێندن لە خوێندنگەکانمان بەخۆڕایی بوو—دەفتەر، کتێب، پێنوسی ڕەنگاوڕەنگ و هەموو پێداویستییەکانی تری خوێندنمان بێبەرانبەر پێدەدرا— بەڵام چاوەڕێمان لێدەکرا بە نیشتمانپەروەری قەرەبووی بکەینەوە، بەوەی لە کڕینی کێکێك بۆ جەژنی لەدایکبوونی سەرۆك کۆمار لە ٢٨ی نیساندا بەشداریمان بکردایە. بیرمە خوێندکارەکان بەکۆمەڵ دەهاتن و پارەیان دەدا، بەڵام هەرگیز پرسیاریان نەدەکرد بۆچی؟ ئەگەرچی دەبوایە ئەوانیش وەك من پرسیاریان بکردایە، بۆچی دەبوو براو خوشکە بچوکەکانیشمان پارە بۆ کێکەکانی جەژنی

نەدایکبوون بدەن. مەگەر ئەو دەیتوانی چەند کێک بخوات؟ ئەسڵەن چۆن بەدەستی دەگەشت؟ ڕۆژێک دوای دەوامی خوێندنگا، دیم مامۆستاکان لە گردبوونەوەیەکدا کە لە کۆبوونەوەی حزبی بەعس دەچوو کێکەکەیان دەخوارد، دووڕووییان تەواو پەستی کردم. ئەو شەوە واهەڵکەوت لەگەڵ دایکم ڕۆیشتین بۆ سەردانی ئەو مامۆستایەی هاوڕێی پێشووی، کاتێک ڕۆیشتینە ماڵەوە چاومان بە وێنەیەکی سەدام حسێن کەوت بە تیپ لکاندبووی بە پەنجەرەی پێشەوەو دوو مۆمیشی لەسەر هەیوانەکەیان داگیرساندبوو. ئەو نیگایەم لەبیرە کە دایکم و ئەو مامۆستایە گۆڕییانەوە. باوەڕناکەم هیچ وشەیەك لەنێوانیاندا تێپەڕبووبێت، بەڵام ئەمە ئەو گفتوگۆیە بوو کە من بیرم ماوە، توانییان لەڕێگەی چاوەکانیان و هێماوە لەیەك تێبگەن، زۆر مەترسیدار بوو ئەو شتانە بەدەگی بەرز بووترێت:

دایکم: "باشە، خۆ تۆ بەڕاستی وازت لەم شتانەی حزبی بەعس نەهێناوە، خوبوب. هەستناکەی بەم مۆمانە کەمێك زیادەڕۆیت کردووە؟"

پوورە خوبوب: "ئێی عالیا، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خراپتر دەبێت. شەرمەزارکەرە، بەڵام مرۆڤ ناچارە ئەوی لەسەریەتی ئەنجامی بدات. نەختێك پێشتر ئەندامانی حزبی بەعس لەنزیك ماڵەکەمانەوە وەستابوون. ئەگەر سەبارەت بە ناهەنگگێڕانی جەژنی لەدایکبوونی سەدام خۆشحاڵ نەبیت، وا هەستدەکەن سەرۆك کۆمارت خۆشناوێت".

دایکم: "ببورە، بەڵام پێموایە من خۆشبەختم بەوەی، ئەوکاتەی بڕیارمدا وازم لە وانەوتنەوە هێنا، وێڕای ئەوەش کەسمان ناتوانین لەو ڕۆژانەدا زۆر بەئاگابین. کێکی جەژنی لەدایکبوونت لەلا هەیە؟"

پاشان لەگەڵیا ڕۆیشتینە ژوورەوە بۆ خواردنی کێك. دایکم پێشتر دەیزانی من لەچی تێدەگەم. داگیرساندنی ئەو مۆمانە بۆ گێڕانی ئاهەنگی لەدایکبوونی عەمو سەدام بوو، تەنانەت خواردنی ئەو کێکەش پارێزەرێك بوو ئێمە بۆ بەرگرتن بەمەترسی بەکارمان دەهێنا، ئینجا ئەوانەی پتر هەستیاربوون زیاتر پێویستیان پێی هەبوو. پێویستبوو هەمووان دڵسۆزی خۆیان بسەلمێنن، ئەگەر بۆ ڕوپایش با. ئەو شەوە کاتێك گەیشتینەوە ماڵەوە، دایکم پێی وتم "زەینەب ئازیزم، بڕۆ هەندێ مۆم بهێنە. هەستدەکەم دەبێت ئێمەش لەڕووی پێشەوەی

ماڵەکەماندا دایبنێین. پوورە خوبوب بێمەڵامەت ئەو کارە ناکات".

شەوێك تازە چاوم چووبووە خەو گوێم لە ئەوایەکی نامۆی دەنگی دایك‌و باوکم بوو لە نهۆمی خوارەوە مشتومڕیان بوو. کاتێك زۆر منداڵ بووم، زیاتر گوێم لە پیاهەڵشاخانیان دەبوو بەزۆریش لەسەر شتی بچوك‌و سادە بوو، پتر ئەو گفتوگۆیانەشیان بەزمانی ئینگلیزی دەکرد بۆ ئەوەی پێیان وابوو کە ئێمە تێی ناگەین. ئەمجارەیان تەواو جیاواز بوو. دایك‌و باوکم شەڕیانبوو، گوێم لە باوکم بوو دەنگی بەرزدەکردەوە. زۆر نیگەران‌و بێزار بوو. لە جێگاکەم هاتمە دەرەوەو لەسەر پلەکانەکە دانیشتم. باوکم توڕە بوو، دایکیشم هەوڵیدەدا ژیرانە گوزارشتی خۆی بدات.

"هەواست لەکوێیە، عالیا؟"

"تۆ تەنها کەس نیت. زۆرێك لە پیاوەکان خۆبەخش کاردەکەن، ناشێت تۆش هەمان ئەو کارە بکەیت".

"مەگەرچیتر خۆشتناوێم؟ ئەکا دەتەوێت بەکوشتم بدەی؟"

"بێشك خۆشمدەوێی. بەدڵنیاییەوە ناشمەوێت بەکوشتت بدەم".

"ناتوانم باوەڕ بکەم کە هاوسەری خۆم ئەمەم پێ دەڵێت! ژنانی تر هەوڵدەدەن یارمەتی مێردەکانیان بدەن لەسەربازی دەریانبهێنن، کەچی تۆ بەمن دەڵێیت پێویستە بڕۆم بۆ بەرەکانی جەنگ؟"

"ئەو شەوە بینیت. راستەوخۆ تەماشای تۆی دەکرد کاتێك وتی پیاوانی شار گرگن بوونە. هەموو ئەو قسانە دەربارەی ئەوەیە کە تۆ نازانی چەندە ئەستەمەو چ مانایەکی هەیە بەپێی پەتی گەورە ببیت، پیاوانی بەغدا پێویستە بەهێزبن‌و ئەم جەنگە وەها وانەیەکیان فێردەکات. دەزانیت باسل، عەمو چاوەڕوانی ئەوەت لێدەکات بڕۆیت".

"کە چی؟ ئەگەر کوژرام چی؟ مەگەر خۆبەکوشتدان تاکە پێوەرە تا بیسەلمێنم بەهێزم؟"

گوێم لێبوو باوکم هەستاو دەرگای پێشەوەی کردەوەو پاشان بەو شەوە رۆیشتە دەرەوە. من هەر بە بیجامەوەو بەوجۆرەی کە دەبوو بێدەنگ بم لەوێدا دانیشتبووم. ترسام. داخۆ مەترسی ئەوە هەبوو باوکم لەدەستبدەم؟ بۆچی دایکم

دەبوو بیر لە شتی لەوشێوەیە بکاتەوە؟ مەگەر هەوڵی دەدا ببێتە یەکێك لە "ژنانی شکۆمەندی عێراقی" کە بەردەوام لەسەر تەلەفزیۆن قسەیان دەکردو شانازییان بەوەوە دەکرد، مێردو کوڕەکانیان بۆ شەڕ ناردووە؟ بۆ ساتێك دۆشدامام، پاشان ڕۆیشتمە خوارەوە بۆ لای دایکم. پێویستم بەڕوونکردنەوە هەبوو.

کاتێك بینی دەچوومە ژوورەوە سەری بەرزکردەوەو لێی پرسیم "گوێت لە دەمەقاڵێکەمان بوو؟ ببوورە ئازیزم مەبەستم نەبوو لەخەوت کەم".

"دایە هەر بەڕاستی باوکم پێویستە بڕوات بۆ بەرەی شەڕ؟ ئەگەر شتێکی بەسەرهات چی؟"

"چ شتێکی بەسەرنایەت ئازیزم، بۆ شوێنی مەترسیداری نانێرن. تەنها ماوەیەك دوور دەکەوێتەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی نیشتیمانی خۆی، پاشان دەگەڕێتەوە ماڵەوە. لای خۆم وەهام مەزەندەدەکرد بۆ گەشتێکی درێژخایەن دووربکەوێتەوە".

وایلێکرد زیاتر وەك کارێکی روتینی دەرکەوێت. وادیاربوو هەستی دەکرد باوکم بۆ شوێنێکی سەلامەت دەنێردرێت، تاوەکو دڵسۆزی خۆی بسەلمێنێت، پاشانیش لەماوەی چەند مانگێکدا دەگەڕێتەوە—دەرچوو روداوەکان کتومت بەو چەشنە هاتنە پێش. دواتر تێگەشتم کە سەدام حسێن بانگی کردبوو بگەڕێتەوەو بەتایبەتیش بەهۆی ئازایەتییەکەیەوە ستایشی باوکمی کردبوو. بەڵام بۆ یەکەم جار کەلێنێکم لە هاوسەرگیریی دایكو باوکمدا بەدیکرد. کاتێك باوکم گەڕایەوە جگە لەوەی کە پێی وابوو عێراق جەنگەکە دەباتەوە چونکە سوپاکەمان لە سوپای ئێران بەهێزتر بوو، شتێکی وام بیرنایەت وتبێتی. ئەوەم لەیادە کاتێك گەڕایەوە، پۆستاڵەکانی قوڕی بەسەر پلەکانەکەوە جێهێشتبوو، تەماشای دایکیشمی نەدەکرد، بۆیە دایکم هەموو کۆششێکی ئەکرد تا ئاسودەی بکات. باوکم دایکمی خۆشدەویستو من لەوە دڵنیام، بەڵام پێم وانییە هەرگیز ئەو نەفرەتەی دایکم بەخستنە مەترسی ژیانی بۆ خۆنمایشکردن لەیادبکات.

لەکاتێکدا پیاوان لەژێر فشاردا بوون بە بەخشینی کاتو ژیانی خۆیان بۆ تێکۆشان لە شەڕەکە، ژنانیش داوای بەخشینی زێڕیان لێدەکرا. ئەندامانی حزبی

بەعس دەرگا بە دەرگای گەڕەکەکانی شار دەگەڕانو داوایان لە ژنان دەکرد زێڕو خشڵیان پێببەخشن، تەنانەت هەندێکیان ئەوەندە دەکەوتنە ژێر فشارەوە ئەڵقەی هاوسەرگیرییان بەناوی پشتگیری لە هێزەکانی سوپاوە دەبەخشی. لە جیهانی عەرەبیدا، زۆرجار سەرمایەی ژنان لەناو خەڵکدا بەزێڕەکانیاندا دەردەکەوێت. لەژێر حوکمی شەریعەتو یاسای ئیسلامیدا، پیاوان دوو ئەوەندەی ژنان میراتییان لەدایكو باوكیانەوە بۆدەمێنێتەوە چونکە ئەوان بەرپرسیارن لەدابینکردنی بژێویو خەرجییەکانی خێزان. هەرچەندە پشکی ژن لە میراتەکەی بەتەنها بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، ئەوەندەی من بزانم باوکم هەرگیز سەبارەت بە میراتییەکەی داوای لە دایکم نەکرد; لەبەرئەوەی مۆڵکی دایکم بوو. سەرباری شتومەكو مافەکانی تر کاتێك ژنێك هاوسەرگیری دەکات، هاوڕێو خزمەکانی ملوانکەو مستیلەی عەیار بیستوچوار دەکەنە ملو پەنجەکانیو تا ئێوارەی ئەو ڕۆژە بە خشڵ دەیڕازێننەوە، هەروەها هەموو ئەمانە بۆ ئەو ژنە دەمێننەوە تا هەڵیان بگرێت بۆ حاڵێك، ئەگەر هاوسەرگیرییەکەی بەجیابوونەوە کۆتایی هات.

کاتێك تەمەنم ١٢ ساڵان بوو و لەوکاتەی لە تەواوکردنی پۆلی حەوتەمدا بووم، بانگهێشت نامەیەکمان پێگەیشت بۆ بەخشینی زێڕ لە مەراسیمێکی تەلەفزیۆنیدا. دایکم حەزی بە بیرۆکەی دەرکەوتن لەسەر تەلەفزیۆن نەبوو، لای خۆیەوە شەرمی لەوجۆرە دەرکەوتنە دەکردەوە. پێموایە بەلایەوە تەواو کارێکی ناشایستە بوو، لەولاشەوە بەشداریکردن بەویستی خۆت نەبوو و ناچاری بوو، بۆیە دایكوباوکم داوایان لێکردم من لەباتی ئەوان بڕۆم. کاتێك گەیشتم، تەماشام کرد ژنان بۆ بەخشینی پشکەکانیان لەبەردەم کامێرادا ریزیان بەستبوو. لام وابێت تەنها من منداڵ بووم. ناوی خۆم بەڕوونی وتو پاشان جانتا خشڵو زێڕەکەم پێدان کە دایکم پێی دابووم ئەوانیش کێشایانو کێشە ڕاستییەکەیان لەسەر تەلەفزیۆن ڕاگەیاند. بیرم نییە کێشی چەند بوو، بەڵام مەبەستەکە ئەوە بوو کە هەموو کەس لەوڵاتدا بزانێت ئەوانی تر چەندیان داوە، خەڵکی بەئەسپاییو لەسەرەخۆ سکاڵایان بوو، ئەوانیش لەنێو خەڵکدا پێشبڕکێیان دروستدەکرد تا بزانن کێ زۆرتر دەبەخشێ. چەند مانگێکی کەم دواتر لە مەراسیمێکی تایبەتدا سەرۆك کۆمار نیشانەیەکی زیوی وەك بەخشەرێك بەیەخەمدا کرد. بۆ ماوەیەکی

درێژ قسەی کرد، هەم ستایش‌و هەم رەخنەی ناراستەی چەند خانەوادەیەکی دیاریکراو کرد. بەتەواوی دەیزانی هەر خێزانێك چەندەیان بەخشیوە. باسی "چاوچنۆك"ی خێزانێکی کرد، ناوی هێنان‌و گوتی ئەوان سەگەکانیان لە وڵاتەکەیان زیاتر خۆشدەوێت. دواتر دەرکەوت دەست بەسەر سامانەکەیاندا گیرابوو، خێزانێکی بێمنداڵ بوون، خۆشیان لە کونجی زیندان توندکرابوون.

ئەو هاوینە پێش ئەوەی بچمە پۆلی هەشتەم، کۆمەڵێکی زۆر مارسیدسی رەش‌و ئۆتۆمبێلی پۆلیس بەگرمەگرم هاتنە ناو گەڕەکی فرۆکەوانان‌و لەژێر بۆردی یاری باسکەکەدا لەکۆڵانەکەماندا راوەستان، ئەگەرچی ئەو رۆژە هەینی بوو کە رۆژی پشوی مسوڵمانانە.

لە بەغدا، خەڵکی زۆرجار درەنگ‌و پاش نیوەڕوانێ دەڕۆنە سەردانی بۆ چاو قاوە خواردنەوە—بەڵام دوای کاتژمێر چوار، چونکە کاتژمێر یەك تا چوار کاتی نانخواردن‌و سەرخەو شکاندنە. ئەمە داکەوتەی ئەو جۆرە نەریتە بوو کە سەرۆك کۆمار بڕیاریدابوو بێت بۆ سەردانی کتوپڕو لەناکاو بۆ ماڵی ئێمە. لەوکاتەدا دایك‌و باوکم یاری تاوڵەیان دەکرد، هەرکە دەنگە دەنگەکەیان بیست لەدەرەوە دەستبەجێ هەستان. ئەو رۆژە پشوی رادیە بوو، بۆیە لەوکاتەدا خۆی‌و باوکم وەڵامیان دایەوەو پێشوازییان لەسەرۆك کۆمار کرد بۆ ژووری میوان، دایکم گورج پێیگوتم بڕۆم بۆ مۆبەق‌و قاوەیەك سازکەم. لەکاتی کوڵانی ئاوەکەدا بەنهێنی لە باکێشی پەنجەرەی چێشتخانەکەوە سەیرێکی دەرەوەم کردو بینیم هێزێکی سەربازی زۆر رژابوونە شوێنەکەو کۆڵانەکە بە ئۆتۆمبێل‌و سەربازو چەکداری سمێڵی رەش سەرشار ببوو.

ئەو قۆرییەی کە تایبەت بوو بۆ قاوەی تورکی لەگەڵ سێتە سێ کوپیە ئاڵتونییە بچوکەکەو ژێرپیاڵەکانم دەرهێناو لەسەر ئەو سینییە زیوینەی داپیرەم لە ئێرانەوە هێنابووی دانا، دوای ساڵێك‌و دووان بوو کە زانیم چ هەڵەیەکی سیاسیم کردووە. شانازیم بەخۆمەوە دەکرد کە دەمزانی قاوەی تورکی دروستبکەم هەرچەندە تەمەنیشم زۆر لەوە منداڵتر بوو، خۆم بیخۆمەوە. بەوریاییەوە هەموو وردەکارییەکانم لەبەرچاوگرت‌و دڵنیابووم لەوەی لەکاتی خۆیداو تاوێك کەف دروستدەکات لەسەر ئاگرەکە لایبەم. ئەگەر کەفی نەبا، مانای وابوو قاوەکە

نەباشەو نەخراپو کابانەکەش کەمتەرخەمە.

پاشان بەوریاییەوە سینییەکەم هەڵگرتو بەرەو ژووری میوانم برد. دایکو باوکم لەسەر قەنەفەیەکی بچووك دانیشتبوون. سەدام حسێنیش بەتەنها لەسەر قەنەفەیەکی گەورە دانیشتبوو، قۆڵێکی خستبووە سەر بەشی دواوەی قەنەفەکەو ئەوەی تریشی لەنزیك دەمانچەکەی کەمەرییەوە بەردابووەوە. دەستبەجێ بەقسەکانیاندا زانیم ئەوان پتر لە ناشنایەكو باش یەکتری دەناسن. لەماڵی ئێمەدا زیاتر وا هەستیدەکرد لەماڵی خۆی بێت، تەنانەت لەوساتەدا زیاتر لە باوکیشم ئەم هەستەی هەبوو. باوکم خەندە لەسەر لێوی بوو و هەوڵیدەدا مورتاح دەرکەوێت، بەڵام من ئەوەم بۆ دەخوێندرایەوە کە ئەو نائارام بوو. زۆر بەدیقەتەوە سینییەکەم دانا، سەرنجم لەسەر کوپەکان بوو بۆ ئەوەی دڵنیابم لێیان نەڕژێ.

باوکم وتی "ئەمەش زەینەبمانە" کاتێك چوومە ژوورەوە روخساری گەشایەوە. خۆشەویستی باوکم بۆ من وەك تیشکی رۆژ هەستی پێدەکرا. بیرمە ئەو رۆژە بەتایبەت هەستم پێدەکرد. دەمبینی چەندە شانازی دەکرد کاتێك کچەکەی لەپێش سەرۆك کۆماری عێراقدا دەناساند.

سەرۆك کۆمار وتی "ئەها، کەواتە ئەمە زینەبە!" دەتووت ساڵانێك بوو ناوی منی بیستبوو.

وەها ناسێنرام بە عەمو بانگی بکەم، تەنها عەموو بەهەمان شێوەی دایكو باوکم. پاشان پێیان وتم ئەمە نازناوێکەو داوای لەدۆستو هاوڕێکانی کردووە بەمە بانگی بکەن.

بەئەدەبەوە گوتم "نیوەڕۆت باش، عەمو". خەندەیەکم کردو چەمیمەوەو سێ ماچم کرد، وەك چۆن عێراقییەکان لەیەکتر بینیندا دەیکەن، یەکەمجار لەسەر گۆنایەکی، پاشان لەسەر گۆناکەی تری، دوبارەش لەسەر گۆنای یەکەمی. روومەتی تا ئەندازەی سەرسوڕمان نەرم بوو، دیاربوو تازە ریشی تاشیبوو، بۆنێکی خۆشی لێدەهات. خەندەیەکی جوانی بۆ کردمەوە، خەندەیەکی فراوانو دانە سپییە رێکەکانی بەدەرکەوتن. کاتێك کوپەکەی بەرزکردەوە خاڵێکی بچووکی خێڵەکیم بەسەر دەستییەوە بەدیکرد.

پاش پێشکەشکردنی قاوەکە، خەندەیەکم کردو بەرێزەوە وەك لێم چاوەڕوان دەکرا ژوورەکەم جێهێشت. پاشان گەڕامەوە بۆ مۆبەق بۆئەوەی لەپەنجەرەکەوە تەماشابکەم‌و ژمارەی ئەو هەموو کەسە بزانم کە ڕژابوونە کۆڵانەکەو دەبوو قاوەیان بۆ دروستبکەم، دەیان پاسەوانم ژمارد لەکۆڵانەکەدا وەستابوون. یەکێکیانم ناسییەوە. مامە ئەرشەدی مێردی پوورە ئەوال بوو، پوورە ئەوالیش خوشکی عەمو بوو. من ئەوانم دەناسی. تەنانەت چەند جارێکیش ڕۆیشتبووم بۆماڵیان. ئاخۆ چۆن دایك‌و باوکم عەمویان ناسیبوو، بۆچی پێشتر دەربارەی ئەو هەرگیز قسەیان نەکردبوو؟ گەورەترین سینی کە پێم هەڵبگیرێت پڕکرد لە کوپی قاوەو بردم بۆ دەرەوە بۆ پاسەوانەکان، سودی تەنها ئەوەبوو تێبگەم کە پاسەوانەکان ناتوانن هیچ بخۆنەوە کاتێك لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانیاندان. لەکۆتایی کۆڵانەکەوە دیقەتمدا دەروازەی گەڕەکەکەمان داخرابوو، هەروەها جۆرێکیش لە بێزارکردن باڵیکێشابوو. دەرکەوت وەك پێوەرێکی ئەمنی بۆ ئەم سەردانە تەواوی گەڕەکەکە بەسەرباز کۆنترۆڵکراوە، لەوکاتەدا جەوانێکی دراوسێمان ئاگای لە داخرانی کۆڵانەکە نەبوو گیرابوو، چونکە دوای ئەوەی هاتوچۆ قەدەغەکرابوو ویستبووی بۆ ماڵی خۆی بڕواتەوە. دواتر دایکم بۆی گێڕامەوە کە چی ڕوویدابوو دوای ئەوەی پاسەوانێك هاتبووە ژوورەوە تا لەبارەی ئەو کوڕە بەسەرۆك کۆمار بڵێت.

پاسەوانەکە پرسیبووی"دەخوازیت چی لێبکەین، گەورەم؟"

باوکم وتبووی "ئەو تەنها منداڵێکە، لەو شەقامەی خوارەوەمان دەژین، مایەی بایەخپێدان نییە".

پاسەوانەکە پێداگیری کردبوو "پێویست دەکات بیخەینە زیندان تا چاوترسێنی بکەین؟ چونکە دەمەدەمی لەگەڵدا کردین".

عەمو بڕیاریدا بەپێشنیارەکەی باوکم قایلبێت‌و ڕێگا بەکوڕەکە بدەن بڕوات، بەوەش خۆی‌و خانەوادەکەی لە مەترسی خستنە زیندان ڕزگارکرد. لەبەرئەوەی باوکم دۆستی عەمو بوو، ڕێگای پێدرا دەستتێوەردان بکات بۆ یارمەتیدانی کوڕەکە. بەدڵنیاییەوە ئەگەر باوکم هاوڕێ‌و دۆستی عەمو نەبوایە، هەر لەسەرەتاوە کوڕەکە نەدەکەوتە مەترسی دەستگیرکردنەوە. هاوڕێیەتی‌و ترس

شان بەشانی یەکتر ڕەوتیان دەکرد.

پاش ڕۆیشتنی عەمو، چووم بۆ ژووری میوان بۆ ئەوەی قاپەکان پاکبکەمەوە. خۆم بەتەنها بووم، کوپەکەی سەدام حسێن—کوپەکەی عەموم—دۆزییەوە لەوێدا دانرابوو. دایکم و پوورە شەیمام بیرکەوتەوە کاتێک خوێندنەوەیان بۆ خڵتەی قاوەی خەست دەکرد، منیش ڕۆیشتم و کوپەکەی عەموم هەڵگرت و ئەو تۆزە قاوەی لەبنەکەیدا مابووەوە خولاندمەوە وەك چۆن ئەوان دەیانکرد. پاشان لەسەر ژێرپیاڵەکە سەرەونخون دامنا بۆ ئەوەی بزانم هیچ وێنەیەك لەقاوەکەدا دروستدەبێت پێشبینی داهاتووم بۆ بکات; باڵندە مانای وابوو کەسێك هەواڵێکت بۆ دێنێ. ماسیش بەو مانایە بوو کە پارەت دەستدەکەوێت. بەڵام ئەوەی لەژێرپیاڵەکەی عەمودا بینیم شێوەی بازنەیی خڵتە بوو.

# لەیادەوەرییەکانی عالیاوە

لەیادتە، کاتێك منداڵێکی بچووك بوویت ئەم چیرۆکەم بۆ گێڕایتەوە؟

یەکەمجار لەساڵی ۱۹۷۲ چاومان پێکەوت. ئێمە کۆمەڵێك هاوڕێ و برادەر بووین، زۆرینەمان جووتە هاوسەری لاو بووین، لەسەر رووباری دیجلە شەوە ئاهەنگێکمان هەبوو. بەکرێ بەلەمێکی گەورەو گروپێکی مۆسیقامان گرتبوو تەواوی ئەو شەوەمان بەسەماو پێکەنینەوە بەسەربرد. جگە لە بەسەربردنی کاتێکی خۆش هیچ شتێك لە زیهنماندا بوونی نەبوو. لەناکاو یەکێك لە هاوڕێکانمان فەرمانی بە رانەندەی بەلەمەکە کرد لەو دورگەیە لابدات کە بەدورگەی بەراز ناسرابوو. بەخەیاڵی خۆمان دامان نابوو لەو هەوا کراوەیەدا دەستدەکەین بەگۆشت برژاندن و بەردەوام دەبین لە سەماکردن.

بەڵام کاتێك لای لەکەوە لەنگەرمان گرت، سەرمان سوڕما، بینیمان پیاوێکی لاو لەوێدا چاوەڕێی دەکرد پێشوازیمان بکات. جلێکی سپی لەبەردا بوو. بلوزەکەی، پێڵاوەکانی، هەمووی سپی بوو. راستی لەژێر روناکایی مانگدا دەدرەوشایەوە. سەیرێکی یەکمان کردو کەوتینە پرس وجۆ. ئەم پیاوە کێیە؟ بۆچی لێرەیە؟ دوو کەس لەپشتییەوە بوون وتیان ئەم پیاوە سەدام حسێنە. سەدام حسێن؟ سەدام حسێن کێیە؟ دووبارە تەماشای یەکترمان کردەوە، بەڵام کەسمان نەیدەناسی. دواجار من ئەو کەسە بووم کە بەدەنگی بەرز پرسیم "سەدام حسێن کێیە؟" یەکێك لەدوو پیاوەکەی پشتەوەی وەڵامی دایەوە جێگری سەرۆکی عێراقە، بەڵام ئێمە ئەومان نەدەناسی چونکە هیچ ئارەزوویەکمان لە سیاسەت نەبوو.

یەك بەیەك دەستیکرد بەتەوقەکردن لەگەڵماندا و بانگهێشتی کردین بۆ خواردنەوە، فەرمانی کردو لەچەند چرکەیەکدا لەو بەلەمانەوە کە بەدەورمانەوە بوون لەدورگەکەدا خواردنەوەیان هێنا. کەسایەتییەکی زۆر سەرنجڕاکێشی هەبوو و کاریگەری لەسەر هەرکەسێك چاوی پێی بکەوتایە دروستدەکرد. ئەو شەوەمان بە بەسەربردنی کاتێکی خۆش کۆتایی پێهات. بەدرێژایی ئەوکاتە بەدڵنیاییەوە

هەندێ وەختی لەگەڵ هەر جووتەیەکدا بەسەربرد بۆ ئەوەی بۆخۆی بەباشی بیانناسێتو بەشێکیش لە ستراتیژەکەی زیاتر گرنگیدان بوو بەتایبەت بەو جووتانەی ژنەکانیان جوان بوون. لەگەڵ هەموو قژزەردەکانی گروپەکەدا سەمای کرد. زۆری خواردەوەو شوێنەکە پڕبوو لە بتڵی شەمپانیا.

ڕۆژی دواتر پەیوەندی تەلەفۆنی لەنێوان هاوڕێکانماندا دەستیپێکرد. هەمووان سەبارەت بە سەدام پرسیارمان دەکرد، کێ بانگهێشتی کرد، چۆن دەربارەی ئێمە زانی، چی دەویست و هتد. دەرکەوت مەحمود، یەکێك لەو هاوڕێیانەی ئەو شەوە لەبەلەمەکەدا لەگەڵماندا بوو دۆستی نزیکی ئەو بوو. هاتنی سەدام بۆ ئاهەنگەکەمان ئاشکرا لەسەر داواکارییەکی سەدام بوو لە مەحمود کە پێیگوتبوو: تکام وایە بەنوخبەی لاوی دەوڵەمەندی کۆمەڵگام بناسێنی؟

# کچی فڕۆکەوانەکە

باوکم کاپتنی بۆینگی ٧٤٧ بوو، کە ئەوکات لەجیهاندا گەورەترین هێڵی نەفەربەری ئاسمانی بوو. ئەو فڕۆکانەی کە ئەو فڕۆکەوانی دەکرد زۆر گەورە بوون‌و بەڕەنگی سەوزو سپی لە لاکانیەوە لەسەریان نووسرابوو " Iraqi Airlines" واتە هێڵی ئاسمانی عێراقی. کاتێك منداڵ بووم‌و لەگەڵیدا سەفەرمان دەکرد، ستافی فرینەکە وەك شازادە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردم. بەپلەکانەکەدا سەردەکەوتم بۆ ژووری پشوودان لە نهۆمی سەرەوەی فڕۆکەکە، کچە خزمەتکارێك فانتایەکی بۆ دەهێنام‌و پێیدەگوتم چەندە خۆشبەختم کە باوکێکی وەك کاپتن باسلم هەیە. دەمزانی تەنها هەوڵی ئەوەیان نەدەدا روخۆشبن، بەڵکو خۆشیشیاندەویست، رێزو ئەرزشی بێپایانیان بۆی هەبوو، دڵنیابووم هەموویان دەیانزانی کە ئەو باشترین فڕۆکەوانی هێڵی ئاسمانییە لە عێراقدا.

کاتێك رێگەم پێدرا بچمە ناو شوێنی فڕۆکەوان، توانیم سەرنجی جیهان بدەم وەك چۆن ئەو دەیبینی، هەروەها لەوەش تێگەیشتم کە بۆچی هەستدەکات ناچارە زۆرجار بەجێمان بهێڵێت. لێرەو لەبەرزییەکی دوور بەسەر زەوییەوە، ئاسمان خۆیشی خڕ بوو، رەنگیشی وەك رەنگی ناو یاقوت شین بوو. نە شەقام هەبوو نە سنوور، نەتەوایەتیش بوونی نەبوو. لەناو بۆشاییەکی ئازاددا بووین لەنێوان زەوی‌و ئاسمانا. کاتێك روخساری باوکم لەکاتی فڕۆکەوانیدا بینی، زانیم ئەمە ئەو شوێنەیە کە ئەو هۆگری بوو. لەدەوروپشتی سەدان دوگمەو سویچ‌و گڵۆپ‌و نیشانە هەبوو کە زۆر کەس لێی دەترسا، کەچی ئەو بەتەواوی ئارام بوو، شارەزایی ئەم گەردونە بێئەندازە ئاڵۆزە بوو. کاتێك دەنگی ئەوم لە سیستەمی بڵندگۆکەوە بیست بەخێرهاتنی سەرنشینەکانی بۆ ناو فڕۆکەکە دەکرد، دەمزانی سەدان کەس ژیانیان دەدەنە دەستی‌و متمانەی پێدەکەن.

جارێك لە کورسییە بچووکەکەی پشتییەوە واتە شوێنی یاریدەدەر

دانیشتبووم پێمگوت "باوکە، دەمەوێت کاتێک گەورەبووم وەک تۆ ببمە فڕۆکەوان".

ئەویش وتی "کەواتە دەبێت رۆژێک فێری فڕۆکەوانیت بکەم" ئینجا کڵاوی کاپتنییەکەی لەسەر لابرد کە بە خەڵاتی بەخشراو پێی رازابوویەوە، ناوڕی دایەوەو کردییە سەری من.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٢دا، جارێکی تر لەماڵەکەماندا هەستم بە بەرزبوونەوەی کێشەو تەنگەژە کرد چونکە دەنگو نەوای خانەوادەکەمان گۆڕا. دایکم چیتر گۆرانی نەدەچڕی، دەنگی زاری تاوڵەش نەدەهات—بەبۆچوونی دایکم تاوڵەکردن یەکێک بوو لەنهێنییەکانی هاوسەرگیریی ناسودە—هەروەها قسەکردنی دەمارگیرانەو ورتەورت دەستیان پێکردەوە. کاتێک باوکم و دایکم باسی کۆبوونەوەی خێزانییان کرد، دەترسام پێمانبڵێن شەپۆلێکی تری وەدەرنان بەڕێوەیە. لەبری ئەوە، رایاندەگەیاند کە باوکم پلەی بەرزبووەتەوە: باوکم دەکرا بە فڕۆکەوانی سەرۆک کۆماری عێراق. بەڵام سەبارەت بەم بابەتە خۆشحاڵ نەبوو.

باوکم بە مرچو مۆنی گوتی "ئەمە شتێک نییە بشێت لەدەرەوەی خێزان باسبکرێت. شتێکیش نییە پێویست بێت لای هاوڕێکانتان خۆتانی پێوەهەڵکێشن. ئەمە شتێک نییە لەمێشکتاندا بیهێڵنەوە".

دایک و باوکم هەمیشە پێیان دەگوتین نەهێڵین شتەکان بچنە مێشکمانەوە، سوپاسگوزار بین بۆ ئەوەی کە هەمانبوو، بەڵام خۆمانی پێوە هەڵنەکێشین و دەرنەخەین.

باشترین لایەنی کارە نوێکەی باوکم بۆ هەمووومان لەوەدا بوو، ئەو هاوینە دەڕۆیشتین بۆ سیێتڵ بۆ هێنانی فڕۆکەیەکی نوێ بۆ سەرۆک کۆمار. حەزمان لە سیێتڵ بوو. کاتێک باوکم لەوێ وانەکانی مەشقی فڕۆکەوانی دەخوێند، چەند هاوینێکمان لەوێ بەسەربردبوو بەڵام ساڵی پێشووتر نەمانتوانیبوو بڕۆین چونکە لەئاکامی جەنگ لەگەڵ ئێراندا گەشتی دەرەوە قەدەغەکرابوو. ئەو هاوینەی ساڵی ١٩٨٢ دواجار بوو پێکەوە وەک خێزانێک رۆیشتین—وەک دەرکەوت—باشترینیش بوو بۆ هەمووومان. باوکم رێگەی پێدرابوو گرووپی گەشتی فڕینی سەرۆکایەتی هەڵبژێرێت، هەندێکیش لەوانە خێزانەکانیان دەهێنا، واتە گرووپێکی نزیک بە

پانزە کەسی بووین‌و بەباشی یەکترمان دەناسی. پێکەوە سەیران‌و گۆشت برژاندنمان لە هەوای کراوەدا سازدەکردو لەپشتمانەوە ئاوابوونی خۆر بەسەر "پوجیت ساون[٦]" دا دەدرەوشایەوە تا ونده‌بوو. گەورەکانیش گۆرانی سەرگەرمانەو هەستبزوێنیان دەگوتەوەو وایلێدەکردن پتر پێبکەنن.

رۆژەکانمان بە سەیران یان رۆیشتن بۆ کەنار دەریا یانیش بە شتکڕینەوە بەسەربرد. هەمیشە سودمان لە پشوەکانی هاوین بۆ جل کڕین وەردەگرت‌و هەرچییەکی تریشمان بۆ داهاتوی پێشبینیکراو پێویستبا دەمانکڕی، چونکە لە عێراق هەڵبژاردنی پێداویستی سنوردار بوو. دایکم ئۆتۆمبێلێکی بەکرێ گرت‌و پێکەوە لەگەڵ من‌و ئەمەل، واتە ژنی ئەندازیاری فڕینەکە، رۆیشتین بۆ شمەك کڕین. ئەمەل قژی زەردو چاوی شین بوو و چەشنی منداڵ قسەی دەکرد، من حەوسەڵەیم نەبوو ئەگەرچی دواتر وەك گەورەش قسەی دەکرد. بەڵام پیاوەکەی، مامە قوسەی، بەلای منەوە یەکێك بوو لە کەسە باشەکانی گەشتەکە. سمێڵێکی گەورەی هەبوو لەو جۆرە پیاوانە بوو کە دڵی لەسەر دەستی بوو، شێتانە ژنەکەی‌و کچەکەیانی خۆشدەویست‌و هیچکاتیش ئەمەی نەدەشاردەوە. کاتێك لە قۆناخی ئامادەیی ببوون یەکیان بینیبوو، باسی ئەوەی دەکرد چۆن چەند ساڵێك شەرمی کردووە لێی نزیکببێتەوە. لە خێزانێکی چینی ناوەندی بوون‌و پێکەوە تێکۆشابوون بۆ بنیادنانی ژیانیان. ئەم پلەبەرزبوونەوەشی هەنگاوێکی مەزن بوو لەبەرەوپێش چوونیان، هەروەها دەرکم پێدەکرد مامە قوسەی خۆی زۆر بە قەرزارباری باوکم دەزانی بۆ ئەوەی ئەم کارەی پێداوە.

ئەمەل شوفێری نەدەزانی‌و پێشتر هەرگیز لەدەرەوەی وڵات نەببوو، بۆیە دایکم میهرەبانانە لەگەڵ خۆیدا بۆ زۆرێك بازاڕکردن‌و شمەك کڕین دەیهێنا، وەرگێڕانی بۆ دەکردو شتومەکی ئەمریکی پێدەناساند. دەگەڕاین بەناو بازاڕەکان‌و کۆگا ئەمەریکاییەکاندا، جلوبەرگی زۆرمان بۆ من کڕی، زیاتر لەوەی بیرم لێکردبێتەوە بتوانم بیانپۆشم، ماکیاژمان بۆ ئەمەل هەڵدەگرت‌و هەروەها جلوبەرگمان بۆ براکانم دەکڕی. کاتێکی زۆرمان لە بازاڕێکی جلوبەرگی ژێرەوەی

[٦] کەناراوێکی دەریاییە لە ئەمەریکاو لە نزیك واشنتۆن، سیێتڵ لە رۆژهەڵاتیەوە هەڵکەوتووە. (و.ك)

ژنان بەسەربرد، لەوێ ئەمەل جلی ژێرەوەی ژنانی زۆری کڕی تا وەك دیاری بۆ خوشکەکەی بهێنێتەوە، لەوکاتەدا من دەستی حەسەنم گرتبوو سۆراخی جلوبەرگی ژێرەوەی دەڵبی خانمانی پیرم دەکرد، چوون جگە لە بۆنی گوڵی چا ئەوە تەنها شت بوو نەنەم داوای لێکردین کە گەڕاینەوە بۆی بهێنین. ڕۆژێك ڕۆیشتین بۆ کۆگای "نیسان نالین" بۆ کڕینی مۆبیلو ڕاخەری نوێ بۆ ژووری دانیشتنو میوانەکەمان، خانمە فرۆشیارەکە پرسیاری کرد چۆن دەیبەینەوە بۆ عێراق.

دایکم وەڵامیدایەوە "سەبارەت بەبردنەوەی نیگەران مەبە، فڕۆکەمان پێیە". هەوڵیدەدا نەرمو بەئەدەب دەرکەوێت، بەڵام نەیدەتوانی بەتەواوی سەرکەوتوو بێت. ڕوویکردە منو لە سەرسامیدا دەستیکرد بەپێکەنینو چەپڵەلێدان.

تەنها فڕۆکەیەکمان پێنەبوو، بەڵکو فڕۆکەیەکی نوێی زۆر گەورەی ٧٤٧ مان پێبوو. کاتێك گەڕاینەوە بۆ عێراق تەنها چوار خێزانی تێدابوو. پێش ئەوەی بنیشینەوە باوکم گەشتێکی خێرای پێکردین. ناوەوەی زۆر سەرنجڕاکێش بوو. ئەو نهۆمە بەفەرشی سەوزو سپیی هێمای سەرۆکایەتی نەخشابوو. چەند ژووری جیاجیای تێدابوو، هەموویان بەتاقمو ڕاخەری تەواو مۆدێرن ڕێکخرابوون: ژووری نووستن بەشوێن خەوێکی زۆر گەورەوە، ژوورو نۆفیسی کۆنفرانس، گەرماو بەدوشەوە لە بەشی دواوە. هەرگیز پێشتر فڕۆکەی لەو جۆرەم نەبینیبوو. کاتێك ویستمان لە بەغدا بنیشینەوە چاومان بەفڕۆکەخانەیەکی زۆر گەورەی نوێ کەوت کە یەکێك لە مۆدێرنترین بیناکان بوو لە عێراقدا، لەسەرەوە دیکۆرێکی کەوانەیی سپی هەبوو دەمزانی لەناوەوەش هەزاران مۆمی بۆ ڕوناکی پیادا هەڵواسرابوو. لەسەرانسەری وڵاتدا، بیناو دامەزراوەکان بەناوی سەدام حسێنەوە ناودەنرانەوە—نەخۆشخانەی منداڵانی سەدام، شانۆی سەدام، قوتابخانەی سەرەتایی سەدام، خوێندنگای ئامادەیی سەدام، تەنانەت شاری سەدام. فڕۆکەخانەش چیتر ناوی بەغدای نێودەوڵەتی نەبوو، بەڵکو ببووە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی سەدام، سەدام حسێنیش لەوێ بوو بۆ ئەوەی کاتێك نیشتینەوە چاوی پێمان بکەوێت.

ئەگەر ئاماژە بەو ساتەوەختە بدەم کە ئازادیمان تێدا لەدەستدا، ئەشێت بڵێم ئەوکاتە بوو کە دەرگا قورسەکەی فڕۆکەکە کرایەوەو هەوای گەرمی بیابانی عێراق هروژمی هێنایە ژووری بۆ ناو ساڵۆنی فڕۆکەکە. دیقەتی باوکمم دەدا کاتێك لە پلەکانەکە دادەبەزییە خوارەوەو بینیم روخساری گۆڕا کاتێك پاسەوانە ئەمنییەکان بەسیمای توندو سمێڵی رەش‌و جلی خاکی‌و بێری‌و چەکەوە هاتنە ژوور. ئەو روخسارە خۆشبەخت‌و ئارامەی لە سیێتلْ پێی راهاتبووم بەسەرچوو و گۆڕا بەروخساری هەستیارو زرت. سەدام حسێن هات بۆ پشکنینی فڕۆکەکە، هەڵبەت باوکم یارمەتی دیزاینکردنی، مامەڵەی کڕینەکەی، تاقیکردنەوەی دابوو و رەزامەندی لەسەر گەیشتنی ئەو فڕۆکەیە دەربڕیبوو کە هێنایەوە بۆ وڵات. بەئێمەیان وت لە کورسییەکانماندا بمێنینەوە کاتێك باوکم گەشتێکی بە عەمو کرد بەو موڵکەی ناوی نابوو ئەلقادسیە، بەناوی پەسەندترین جەنگی ئەوەوە لەدژی فارسەکان. کاتێك باوکم لەنێوان ریزی کورسییەکانەوە پێشی سەدام کەوت تا گروپەکەو دەستەی فڕۆکەوانی، واتە ئەو کەسانەشی پێناساند کە هێشتا چاوی پێیان نەکەوتبوو، سەدام وەستاو قژی بژکردمەوەو بەگەرمی وتی "زەنوبە چۆنی!" دەتووت بەڕاستی دەیناسیم، پاشان تەماشای ریزی دواتری کردو باوکم ئەمەلی پێناساند.

وتی "ئێستا ئەمە ئیدی جوانی راستەقینەیە، مەگەر وانییە؟"، سەرنجی ئەویداو پاشان بۆ دڵنیابوون لە ئەوانی تریشمانی روانی.

عەمو ئاسودەبوو بە فڕۆکەکە.

لەپاش ئەو ساڵە من‌و براکانم گرفتاری ژیانی عەمو بووین، کتومت چەشنی دایك‌و باوکم کە ببوونە لقەکانی دارە زەقنەبووتەکەی ئەو: گەورە بووین، بەڵام هەمیشە ترسێك لەپەیوەندیەکەدا هەبوو. بەئاسماندا دەڕۆیشتین، بەتێڕوانینی هەڵەمان، بۆ کەمێك ئازادی. ئینجا ئەوە روویدا، کە دەبێت سەر شۆڕکەین‌و لەبیرمان بێت ئەوە تەنها خەیاڵێکە، گەرنا ئێمە هەرگیزو تەنانەت بۆ ساتێکیش ئازاد نەبووین. دایك‌و باوکم هەموو ئەو ماوەیە ئەمانەیان دەزانی، هەر لەبەر ئەمەش بوو باوکم هەرگیز نەیدەویست ببێت بە فڕۆکەوانی سەرۆك کۆمار.

عەمو دەیویست ئێمە بگوازێتەوە بۆ خانوویەکی ناو زەوییەکانی کۆشك،

دایکم وتی بەڵام باوکم دووری لە خوێندنگەکەی منەوە وەك هۆکارێك بەکارهێناوە بۆ ئەوەی لە ماڵەکەی خۆماندا بمێنینەوە. کەسمان نەماندەویست بگوازینەوە، بۆیە لەباتیا عەمو خانوویەکی لە مەزرا بۆ پشووەکانی هەفتە پێداین. دیکۆری ناوەوەی بە یەکێك لە بەهرەکانی دایکم رێکخرابوو، بۆخۆی ئەو کارەی بەمەبەستی سەرسامکردنی ئێمە ئەنجامدابوو. باوکم زۆرجار لەگەڵ خۆی لە گەشتەکانییەوە تۆپە قوماشی بۆ دەهێنایەوە، ئەویش هەموو ماڵەکەی بەشێوازی جیاوازو پێشکەوتو پێ دادەپۆشی. هەمیشە بەرگی دەدروو یان شتێکی دەرست یاخود بەرگی قەنەفەکانی نوێدەکردەوە. بەبێ ئەوەی هیچ نموونەیەکی لەبەردەست بێت، قوماشێکی شیاو بۆ قەنەفە یان کورسی دیاریدەکردو دەستی بە برینی دەکرد. یان قوماشێکی بەقەدی منەوە ئەگرتو لایدەبرد، پاشان لە ئەندێشەی خۆیا شکڵێکی بۆ من سازدەکرد بەو بەرگەوە. ئەوە بەشێك بوو لە جادوی ئەو. پاشان کتێبێکی دەخستە سەر سەرمو فێری دەکردم وەك مۆدێلێك قنجو قیت بەو پۆشاکە نوێیەوە رەوت بکەم. دەیگوت "هەمیشە بە بەرزی راوەستەو با سەرت بڵند بێت. شەرمنو لاواز مەبە. من رقم لە ژنی لاوازە. پێویستە بەهێز بیتو متمانەت بەخۆت هەبێت".

پێش ئەوەی بۆ یەکەمجار برۆین بۆ خانووەکەی ناو مەزرا، دایكو باوکم کۆبوونەوەیەکی خێزانییان بەهەرسێکمان کرد.

باوکم وتی "کاتێك لە مەزرا دەبین رەنگە جارجار سەرۆك کۆمار ببینین. ئەگەر بینیتان بە عەمو بانگی بکەن، وەك چۆن ئێمە ناوی دەبەین، هەروەها بەشێوەیەکی بەرێزانەو ئاسایی خۆتان هەڵسوکەوت بکەن. بەڵام نابێت هەرگیز وشەیەك لەبارەی ئەوەوە بەکەسی دی بڵێن. ئەگەر روویدا بینیمان هەرگیز لەبارەی ئەوەوە کە چەندجار دەیبینن قسە بۆ هیچ کەسێك ناکەن تەنانەت بۆ ئامۆزاو خاڵۆزاکانیشتان".

منو حەیدەر بە پەشۆکاوی لە یەکترمان دەڕوانیو پێمان سەیربوو بۆچی دەبێت وابین.

"تێگەشتن".

تەماشای هەریەکەمانی کرد. هەریەکەشمان بەدڵپەسێوی گفتمان پێدا ئەوەی

ئەو داوامان لێدەکات وەها بکەین، ئەویش ئاسوودەبوو بەوەی کە ئێمە لە جدییەتی ئەرکی ئەستۆمان تێدەگەشتین. ئەوە تەنها پەیمانێك نەبوو بە باوکم، بەڵکو پەیمانیش بوو لەنێو خۆماندا. من هەرگیز ئەو پەیمانەم نەشکاند تا ئەو ئەندازەی بزانم، هیچ کەسێکی تریش نەیشکاند—بە حەسەنی گچکەشەوە کە ئەوکات لەسەر رانم دانیشتبوو و تەنها سێ ساڵی بوو. حەسەن تازە زمانی گرتبوو، کەچی هەندێك شت هەبوو پێیوترابوو، کە نەیانڵێت.

دایکم خۆشحاڵ بوو کاتێك بۆ یەکەمجار بردینی بۆ خانووەکەی ناو مەزرا، باشترینی یادەوەرییەکانیشمە بەماوەیەکی کورت پێش ئەوەی ببمە چواردە ساڵان. ئەو شوێنە لەسەر رێگای فڕۆکەخانەکە بوو، بۆ گەشتن بەوێ پێویستبوو بەتەنیشت پەسەندترین پەیکەری لای من لە بەغدا، واتە پەیکەری عەباسی کوڕی فیرناس، ئیکاروسی یۆنانیی ئێمەدا تێپەڕین، لەبارەیەوە دایکم ئەیگوت ئەو بیرۆکەی فڕینی بەمرۆڤ بەخشیوە. عەباسی کوڕی فیرناس بەندکراوێك بووە لەپشت دیواری بەرزەوە زیندان کراوە، دیوارەکانی دەوری ئەوەندە بەرز بوون هیچ رێگایەکی بۆ دەربازبوون نەبووە، ئارەزووی کردووە باڵندەیەك بایە تا بتوانێت بەسەریاندا بفڕێتو لە زیندانەکەی هەڵبێت، بۆیە دەستی کردووە بەگردکردنەوەی ئەو پەڕە باڵندانەی لەسەریەوە کەوتوونەخوار، دواجار ئەوەندەی کۆکردونەتەوە تا بەشیکردووە باڵیان بۆ خۆی پێبچنێت. بەڵام لە هەوڵی فڕینیدا ئەوەندە بەرزنەبۆتەوە شوراکەی دەوری تێپەڕێنێتو لە زیندان هەڵێت، کەوتۆتەخوارەوەو بە مەرگی دوایی هاتووە. هەمووجارێك کە بەلایدا تێدەپەڕین، تەماشای ئەو پەیکەرەم دەکردو هەوڵمدەدا وێنای ئەوە بکەم ئەبێت چ هەستێك بێت وەك باڵندە باڵم هەبن‌و بەئەسپایی‌و دڵنیایی بەدەوری خۆدا لە شەقەی باڵ بدەم و ژێر باڵەکانم پڕبن لە هەواو سروە.

دیوارێك بەدرێژایی رێگای فڕۆکەخانەکەدا دروستکرابوو پێشتر هەرگیز ئەوەندە بیرم لێنەکردبوویەوە. خانووە گەورەکەی حەوانەوەی عەمو لەودیوی ئەو دیوارەوە بوو. پێچمانکردەوە بۆ دەروازەی ئەمنی نێو شوراکەو لێیەوە تێپەڕین. بە ئۆتۆمبێل ماوەیەکی کورتمان بڕی‌و لەبەردەم یەکێك لەو سێ ماڵەدا وەستاین کە لەسەر گۆڕەپانێکی فراوان بەتاك‌و جیاجیا دروستکرابوون‌و بەردەمیشیان

دەشتێکی مەزنی چۆڵبوو داری زۆر بچووک‌و بنەبنچکەی تێدابوو، جۆگەلەیەکی ئاودێریش بەناویدا ڕێچکەی گرتبوو. من پێشبینی خانووی مەزرام وەك خانۆچکەیەکی بچکۆلانەی گوندئاسا دەکرد کە ئاژەڵی تێدا بێت بتوانین سواری ببین. خانووەکەی خاڵە عادل ئاسك‌و باڵندەو مەڕو گاو تەنانەت مەیموونیشی تێدابوو. جیاواز لەوەی ئێمە، کە لەڕاستیدا خانووی مەزرایی نەبوو، کاتێك ئۆتۆمبێلەکەمان پارککرد، هەستمکرد ماڵێکی ئاساییەو تەنها بەدیوار دەورە دراوە. کاتێك بەجانتاکانمانەوە ڕۆیشتینە ژوورەوە، بیرمە زۆر هەوڵمدا لەبەرخاتری دایکم خۆشحاڵ بم، بەڵام بەدەست خۆم نەبوو ڕقم لەو شوێنە بوو. دایکم زۆر هەوڵیدابوو بۆ ئەوەی وا لە شتەکان بکات ڕێکوپێك‌و سەرنجڕاکێش دەرکەون. لەناو شار ڕاخەری نوێ‌و جوانی کڕیبوو بەباشی ڕایخستبوو. هەروەها قاپ‌و دەوری نوێ، سێتی تەلەفزیۆنی نوێ، چەرچەفی سوپەرمانی بۆ ژووری براکانم‌و دانەیەکی گوڵداریشی بۆ ژوورەکەی من کڕیبوو. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو شتانە، شوێنەکە ناکام‌و مات‌و مردوو دەردەکەوت، زیاتر لە ماڵێکی دەستکرد دەچوو نیشان بەکرێیار بدرێت. جانتاکەم لەناو بۆفی ژووری نووستنە نوێکەم دانا، بینیم پێشتر دایکم هەندێك لەو جلانەی لە سێیتڵ کڕیبووم هەڵواسیبوو. داخۆ لەکوێی ئەم مەزرادا ئەشیا ئەم بەرگانە لەبەربکەم؟ بەتەمابووین تەواوی ئەو دوو ڕۆژە چی بکەین؟ دایکم هاتە ژوورەوەو بەشادییەوە پێیگوتم جلەکانم بگۆڕم چونکە بەنیازین بۆ سەردانی دراوسێ نوێکانمان بڕۆین. ئەوەی داوای لێکردم جێبەجێم کردو بەجل‌و پێڵاوی نوێ‌و سەرنجڕاکێشەوە چوومە دەرەوە. تەنها دوو هاوسێ هەبوو سەردانیان بکەین.

دەیان ڕەنگبێ سەدان پشووی هەبێنیم لەو ماڵەدا بەسەربردبێت، بەڵام بەتەواوی نایەتەوە بیرم لەدەرەوە شێوەی چۆن بوو. تەنها دەزانم بەراورد بە خانووی هاوسێکان هیچ نەبوو. دوو خانووەکەی تر بە باخچە دەورەدرابوون‌و بەڕوونی‌و شارەزایانە نەخشەیان کێشرابوو و دڵگیربوون. ئەوانە ماڵی گرنگ‌و گەشتیاری لە خشتی سوور دروستکراوبوون، وادەردەکەوتن بۆ نەخشەکانیان کەڵکیان لە گۆڤارە هاوینەهەوارییە بیانییەکان یاخود شێوازی شاری وەرگرتبێت. لەلایەن تەلارسازی کۆشکەکانەوە دروستکرابوون‌و دیکۆریستەکان بە کەرەستەی

نیتـالی رازاندبوویانــەوە. مارسیدســی رەشــی بریقــەداریش لــەدەرەوەی هــەردوو ماڵەکەوە راگیرابوون.

جوتێکیـان ناویـان پـوورە نـەداو مامـە قـەیس بـوو و نـەختێك زیـاتر لـە دوو ماڵەکـەی ترمـان خۆشـگوزەرانییان بـۆ فەراهـەم کرابـوو. مامـە قـەیس ئەنـدامێکی چـالاکی حزبـی بـەعس بـوو، پیاوێـك بـوو دەیتـوانی کاریگـەری لەسـەر بەرامبـەر دروست بکات، لانـی کـەم بـۆ مـن وەك کەسـێکی زۆر تونـدو ناکۆمەڵایـەتی ئەهاتـە پێشچاو. ژنەکەی شیکپۆش‌و نازدار بوو، لەو جۆرە ژنانە بوو کە نەتەنها ئەتیکێتی هەبوو بەڵکو باوەڕی تەواویشی پێ هەبوو. جوتەکەی تر، پوورە لەیلاو مامە مازن، بەبڕوای من پتر شارەزاو کراوە بـوون، کەمتریش نارەزوویـان لـە سیاسـەت هـەبوو. پێشتر پوورە لەیلام بینیبوو، بەڵام باش نەمدەناسی. ژنێکی بەژن بڵندو بـەمروەت بوو، لە پوورە نەدا لێبووردەتر بوو، لەوەش بترازێ روون دیاربوو کە لەگەڵ دایکم لێك نێزیك بوون. کاتێك ئەو سێ ژنەم پێکەوە دەبینی، سەرسام دەمامەوە لەوەی چەندە هەر سێکیان پێکەوە زەریف بوون. پـوورە نـەداو پـوورە لـەیلا قژیان کاڵ‌و چاویان گەش بوو، دایکیشم پرچی ڕەش‌و هەندێ کەس لە وەسفیدا ئەیان گوت بە سـۆفیا لـۆرێن[٧] دەچێت. هاوکـات مـن بـەو راسـتییەش کاریگـەربووم کـە هەرسـێك فرەخاس یەکیان دەناسی.

پوورە نەداو پوورە لەیلا سێ کچیان لـە تەمـەنی منـدا هـەبوو، ئەمانـە هاوڕێ دیاریکراوە نوێکانم بوون. هەموویان جوان بوون‌و لەسەر مۆدێل جلیـان دەپۆشـی. لومـا گـەورەترینیان بـوو، بـۆ تەمـەنی ١٦ سـاڵان کچێکی بێخـەوش بـوو، بەتـەواوی چـووبوویەوە سـەر دایکـی، واتــە پـوورە نـەدا. پرچـە خورماییەکـەی بـەجوانی داهێنرابوو ماکیاژ کرابوو. کاتێك خەندەی دەکرد، لێوە ئەنکەکانی لێکدەنا. لەسەر رێچکەی دایکی دەست‌و پەنجەکانی هەمیشە بۆیەو رەنگدەکردو کاتێـك ئـەدوا زۆر وریـایی ئـەکردو جوڵـەو ئامـاژەی تـەواو خانمانـە بـوو. لەسـەر رێـڕەوو شـوێنپێی باوکیشی، خۆی توند دەگرت‌و لە قوتابیانی حزبـی بەعسـدا چـالاك بـوو. بەتەمەن مـن لـەنێوان لومـاو سـارای خوشـکە بچـووکیدا بـووم. سـارا زۆر جـوان بـوو و دەیشیزانی کە وایە. قژێکی رەنـگ ئاڵتونی مەیلەو قاوەیی، چاوی گەورەو بادەمی،

---

[٧] کچە ئەکتەرێکی ئیتالیاییە.

لوتی بچووك‌و دەمولێوێکی جوانی هەبوو. بەوپێیەی لوما رێکوپێك‌و سەلار بوو، سارا لاوترو وەك خوشکی نازپەروەر دەردەکەوت‌و لە ناخیا دەیویست تەنورە کورتەکانی لەبەر بکات‌و بەدرێژایی شەو سەما بکات. ئەویش هەمان چەشن بەعسییەکی تۆخ بوو و ئەمە روون بوو، بەلام وادەردەکەوت خاوەنی هۆشی خۆی بێت. لەوانیش شۆخوشەنگتر تەمارەی کچی پوورە لەیلا بوو، من‌و دایکم پێمانوابوو لە "بروك شیلدس"[٨] دەچێت، بەژن بەرزو پێستی ناسك‌و بەهەڵسوکەوت ئەوروپییانە بوو، بۆ ماوەیەك لە ئینگلتەرا لەگەڵ پوورێکیدا ژیابوو، وشەی عەرەبییەکانی ئەکسێنتی ئینگلیزی بەسەرەوە هەستدەکرا. لەهەمووان زیاتر بایەخی بە مۆد دەداو سەرەنجی بەلای خۆیدا کێشدەکرد. بەرگی دوراوی دەست دیزاینەرە بەناوبانگەکانی دەپۆشی، گرنگی بەوە دەدا چ پۆشاکێ سەردەمییە نەوەك چ بەرگێك گونجاوە، پتر مەیلی بۆ بەرگی ئەوروپایی دەچوو نەوەك بۆ عێراقی. تەمارە تەنها لە نازناوێکی کەم بوو بەسەر دوو کچەکەی ترەوە. بەلام وادیاربوو ئەمەی زۆر بەهەند وەرنەدەگرت.

ئەبێ چۆن باسی منیان کردبێت؟ رەنگبێ وەك کچێکی هێمن‌و قژلول وەك هی دایکی، کەسێك کە بایەخی تەواو بەڕوخساری نادات، کەسێك کە دەگونجێت لەگەڵیدا هەڵسوکەوت بکرێت، بەلام سەر بەچینی ئەوان نییە. ئەوان لە بازنەی دروستی خۆیاندا دەردەکەوتن، بەلام من نا. ئەوان لەکۆشکدا دەژیان، من وانەبووم. لوماو سارا هاورێی نزیکی کچەکانی عەمو بوون، تەمارەش دەیناسین، بەلام من تەنانەت کچەکانی عەموم نەدیبوو. جیاوازیی پێگەمان ئاشکرا بوو. هەرچی ئەو وشانەی دەیانگوت، وەك دایك‌و باوکم‌و وەك خانووەکەشمان لە مەزرا من سێیەم کەس بووم، واتە لەدوای دواوە بووم. ماوەیەك دوای ئەوە تێگەیشتم ئەو شتەی کۆیکردوینەتەوە کتومت ئەو شتەشە کە جیامان دەکاتەوە: دایك‌و باوکمان هەمان شەو لەو شوێنەی کە پێی دەوترا دوورگەی بەراز چاویان بە عەمو کەوتبوو، وەلێ دایك‌و باوکی ئەوان پێشوازییان لە هاورێیەتی عەمو کردبوو لەکاتێکدا دایك‌و باوکی من رێگرییان لەو هاورێیەتییە کردبوو.

سەختە پشوی هەینی یەکەم لەوانی دواتری جیابکەمەوە—هەموویان زۆر

---

[٨] کچە ئەکتەرێکی ئەمەریکاییە.

لەیەکدەچوون. بەتەواوی بیرم نایەتەوە داخۆ یەکەمجار کە رۆیشتین عەموم بینی یان نا. ئەو ئاسایی بۆ سەردانی کورتی پاشنیوەڕوانی درەنگ دەهات بۆ خواردنەوە لەگەڵ گەورەکان لەیەکێك لەدوو ماڵەکەی تردا. هەندێك جار کۆتایی هەفتە هەروا دەڕۆیشت و ئێمە هەموومان جلوبەرگی تایبەتمان دەپۆشی و چاوەڕوانی ئەومان دەکرد، کەچی چاویشمان پێی نەدەکەوت. ڕێنمایی دەکراین لەژوورێکدا دانیشین بەدەنگی نزم قسەبکەین تاوەکو ئەگەر ویستیان بانگمان دەکەن. پاشان دەڕۆشتینە ژوورەوەو بەخێرهاتنمان دەکردو بەپەرۆشەوە ماچمان دەکردو سڵاومان لێدەکرد، هەروەها خۆمان بەدەوریدا ریزدەکرد وەك ئەوەی لای خۆمان وەك "کۆبوونەوەی خێزانی" پێی ئاشنابووین، سەرباری ئەوەی کەسمان بەشێك نەبووین لە خێزانی ئەوو ئەندامانی خێزانی ئەو هەرگیز تێکەڵ بەئێمە نەدەبوون.

عەمو بەئێمەی منالانی دەگوت "چۆنن جوانکیلەکان" حەسەن یان یەکێکی تر لە منداڵە بچووکەکانی دەخستە سەر کۆشی و دەیگوت "چۆنن منداڵە جوانەکان؟"

ئێمەش بەکۆرس دەمانگوت "زۆرباشین عەمو، ئێمە فرە باشین!"

چەند هەنگاوێك لەدوایەوە هەمیشە عابیدی پاسەوانی دەوەستا، ئەو پیاوەی کە بەتەواوی چاوی زرت بوو و لەژێر سمێڵە درێژەکەیەوە دەمی توند دادەخست، لەگەڵ عەمودا بۆ هەموو شوێنێك دەڕۆشت. هەموو ئەوکاتەی بەئامادەیی ئەو بەسەرمبرد، بیرمنایە بۆ تەنیا جارێکیش گوێم لە پێکەنینی عابید بووبێت یان هەر قسەشی کردبێت، جگە لەو چپانەی بەگوێی عەمویدا دەچرپاند. هەرگیز نەمبینی بێرییەکەی لەسەری لابات—قەدەغەبوو سەربازە عێراقییەکان بێرییەکانیان بکەن بەسەر شانیانەوە چونکە سەربازە ئیسرایلییەکان بەو شێوەیە دایان دەنا— کاتێك لە۲۰۰۳دا عابید لەسەر تاوانی جەنگ دەستگیرکرا، سەرمسوڕما دیم بەشێکی سەری روتابووەوە.

لە "کۆبوونەوەی خێزانی"ماندا کە دادەنیشتین و قسەمان دەکرد، هیچ شتێکی سروشتی نەبوو. ئێمە بەتەواوی بێدەنگ بووین، ئەکتەرەکانی نمایشەکەش گەرچی من هەر ئەوکاتیش تێگەشتم لەبارەی خێزانی نموونەیی

عـەمووە بـوو، گوایـە هـەرگیز لـە لادێکـانی تکریـت گـەورە نـەببوون. پاشـتر مێژوونووسـەکان ئـەو راسـتیانەیان تـاوتوێکرد، بـەڵام وێنـەی سـەدام حسـێن وەك ئـەوەی باوکێك کە لەژیانیدا ئـەماوەو دایکێك کـە هاوسـەرگیری لەگـەڵ پیاوێکدا کردووەو بەخراپی مامەڵەی لەگەڵدا کـردووەو مامێك کـە پـڕی کـردووە لەخـەونی شکۆمەندی سەربازی دەردەکەوێت. تەنانەت برا بچکۆلانەکەشم، کە هەمیشـە پـڕ گوڕو وزە بوو، باش دەیزانی شەرم بکاتو هاوبەشی نـەکات کاتێك لەگـەڵ عـەمودا بووین. کچەکانی ترو من وێنەی بێخەوشی ژنانی لاوی عێراق بووین، بەمانای وشە بـەڕێز بـووین، پاکوخـاوێن جلمـان پۆشـیبوو، هـەروەها ئاگامـان لـە یـەك بەیـەکی وشەکانی بوو. بەتەواوی ئاگادار کرابووین ئەگەر هـەر هەڵەیـەك بکـەین، تەنانـەت ئەگەر بە ئەواو ئاوازێکی چەوت وشەیەك دەربڕین، یان هەر شتێکی تـری عەیبـە، راستەو ڕاست شوێنەوار بەسەر دایكو باوکمانەوە دادەنێت.

عەمو تاکە کەس بوو کە ئارامو ئاسودە دەردەکەوت. بەتەواوی ئاگای لەهەموو کەسێكو هـەر جوڵەیـەکی دەوروبـەری بـوو، کەسایەتییەکی زۆر کـاریزمی هـەبوو، بەجۆرێك گوزارشت لێکردنی زەحمەتە ئەگـەر بەتایبـەتو لەنزیکەوە چـاوت پێـی نەکـەوتبێت. هـیچ وەسـفێکی پڕاوپـڕم لەبارەیـەوە بـۆ یاداشـت ناکرێـت. لـەم هەلومەرجانەدا ناچاری دەکـردی نـەك تـەنها خۆشـحاڵ بـی، بـەڵکو پـتر شـاد بیـت، ئاسوودەی ئاسوودە بیت. وەك سیاسییە هەرە باشەکان، لەوانەیـە ئـەو بەهرەیـەی بـۆ کۆکردنـەوەی خـەڵكو لەناویشـیاندا منـداڵانی هـەبووبێت، وایـان لێبکـات هەستبکەن سەرنجیان بۆ شتێکی تەواو گرنگ راکێشراوە. کاتێك سەرنجی دەدایـت، وەك ئـەوە بـوو بەڕاسـتی گوێبگرێـت. فەترەیـەکی ویسـت تـا دەرکمکـرد کاتێـك خۆشەویسـتی خـۆی دەردەبڕێـتو خەندەیـەکی بەسـۆز دەکـات، ئەمکاتـەی بـۆ پشکنینی ئەوەیە پشتەوەی قسەو سیمات بخوێنێتەوە.

یەکەم شـارەزایی هێڵەرەوەم شـێوازی هەڵسوکەوتم بـوو، هەرچیم نـەدەزانی بـەوەرگرتنی ئامـاژە لەدایکمـەوە فێرببـووم. کاتێـك لەگـەڵ عـەمو دەبوویـت، دەبـا هەمیشە نەرمو خۆشحاڵ بنوێنیت. هیچ هەڵبژاردنێکی تـر یـان خۆپەسـەندییەکت نـەبوو مەگـەر لەتـەك ئەوانـەی ویـدا تـەبا بهاتنایەتـەوە. هـیچ کارێـك نـەبوو حەزبکـەیت ئـەنجامی بـدەیت بەئەرزشـتربێت لـەکات بەسـەربردن لەگـەڵ ئـەودا.

هەمیشە بەسەرنجێکی تەواو گوێت بۆ دەگرت. لەکۆڕی ئەودا ئەگەر منداڵ بوویتایە، هەرگیز قسەت نەدەکرد مەگەر پرسیارێکی راستەوخۆی لێبکردیتایە، تۆش لەبەرابەردا هەمیشە روخسارت بەشێوەیەك بوو کە بەخۆشەویستییەوە تەماشای دەکەیت. ئەگەر شتێکی نوێی پیشان بدایتایەو بیپرسیایە "مەگەر جوان نییە؟" دەبوو لەوەڵامدا بیژیت "بەڵێ، زۆۆۆر جوانە، عەمو".

هەمیشەو هەردەم دەبا خەندە لەسەر لێوت بێت. دایکم تەنها کەس بوو دەمتوانی لەگەڵیدا تا ئەندازەیەك راستگۆیانە قسە لەبارەی عەمووەوە بکەم، من ئەوەم "بەپێکەنینی دەستکرد" ناودەبرد. بەبێ بیرخستنەوە بەردەوامەکانی دایکم، ئەرخەیان نیم، دەمتوانی بەوشێوە بم کە بووم یان نا. ئەوڕۆکە هەندێکجار کە لەناو جەماوەردا قسەدەکەم، خەڵکی ستایشی جوانی خەندەکانم دەکەن، خاترجەم نیم لەوەی چەندی ئەو خەندەیە بەڕاستی هی خۆمە. شتێکی تایبەت هەیە لەو ماسولکانەدا بەدەوری دەممەوەن هەندێکجار لەبەردەمی ئامادەبواندا کە پێدەکەنم دەمگێڕنەوە بۆ ئەوکاتەی لەخانووی ناو مەزراکەدا بووین‌و دەمزانی تەنها خەندەو بزەی سەرلێو بەس نییە، بەڵکو دەبێت دەمم بۆ پێکەنین تەواو بکەمەوە.

کۆتایی هەفتەکان پشوی فەرمی عەمو بوون، ئێمەش بۆ کاتخۆشکردنی ئەو تەرخانکرابووین. بەشێکی کارەکەمان ئەوەبوو لەکاتی پێویستدا خۆشحاڵی بکەین‌و بیهێنینە پێکەنین. ئێستاش پێمدەکرێت لاسایی پێکەنینی عەمو بکەمەوە. لەسەرەخۆ چەنەی شۆڕدەکردەوەو لەقوڵاییەوە پێکەنینێکی دەهێنایە دەرەوە، هێ هێ هێ. ئەگەر ئەختێك کەمتر سەدای بڵند بوایە یان خۆڕسك بوایە، ئەشیا ناوی بنێیت پێکەنین، بەڵام ئەوای تۆنێکی تاوانبارانەی تیابوو لەهی ئەو کارەکتەرە خراپانە ئەچوو هەمیشە لە فیلم کارتۆندا شوێن کارەکتەرە باشەکان دەکەون. کاتێك پێدەکەنی، ئێمەش پێدەکەنین، هەمیشە من‌و کچەکانی تریش، بەتایبەتی سارا، ئەو هەستەمان هەبوو کە بەنهێنی بەپێکەنینەکەی ئەو پێدەکەنین. هەرگیز ئازادی ئەوەم نەبوو سەبارەت بەم بابەتە قسەیان لەگەڵدا بکەم، بەڵام دەزانم ئەوانیش دەزانن من ئێستا مەبەستمە چی بڵێم.

ئەوی زیاتر لەو کۆبوونەوانەوە بیرم دێتەوە، لەڕاستیدا روخساری دایك‌و

باوکمە. هەردوکیانم شڵەژاوو بێپاڵپشت دەبینی، بەکراست تێگەیشتم بۆچی ئەوەندە سوربوون لەسەر ئەوەی هەرگیز ناوی عەمو نەهێنین‌و وەك هاوڕێی ئەو باسی خۆمان نەکەین. هەموو ئەم بەتەمەنانە "هاوڕێ" بوون، بەڵام دەمزانی ئەمە ئەو شێوازە نەبوو کە لەگەڵ هاوڕێ راستەقینەکانیدا هەڵسوکەوتیان پێوەدەکرد. بیرمە زیاد لە هەرکەسێکی تر لەنزیکییەوە دانیشتبێت ئەوان تەماشای عەمویان دەکرد، زۆرجار لە نابەین ئەو کەسانەی دەوروبەریدا بەرێکەوتن‌و لەبەر خاتری عەمو گاڵتەیان بەیەکتری دەکرد. کاتێك من فامی ئەمەم کرد، هەریەك لەو کەسانە رۆڵی دیاریکراوی خۆیان کایەدەکرد. باوکم پیاوێکی سادە بوو، مامە مازن گاڵتەچی‌و مامە قەیسیش پارلەمانتار بوو. پوورە لەیلا کەسێك بوو لەخۆوە رەفتاری لەناکاوی دەکرد، پوورە نەدا کەسێکی رێکوپێك بوو، دایکیشم پڕ جۆش‌وخرۆش بوو بەردەوامی دەدا بە چالاکییەکەو کاری ئەوەبوو بەپێکەنین ئەم دانیشتنانە خۆشبکات. دایکم کاتێك بەراستی پێدەکەنی چاوەکانی پڕ دەبوون لە ئاو، کاتێکیش زۆری بۆدەهێنرا ماسولکەکانی سەر روخساری گرژ دەبوون. زۆرجار لەم کۆبوونەوانەدا ئەوە لە شێوازی دووەمدا نمایشدەکرا، بەڵام هەندێك جاریش تەنها پێدەکەنی چونکە ئەمەیان ئیدی بە ویستی خۆی نەبوو، بەرزتریش لەوە پێدەکەنی کە کولتور بۆ ژنانی دیاریکردبوو. مامە قەیسیش بەسەرزەنشتەوە بەدایکمی دەگوت "مەحسی رەزای خوا، ئافرەت هۆشت لای خۆ بێت". بەڵام دەمزانی عەمو حەزی بەپێکەنینەکەی دایکم بوو هاوکات رەخنەکەی مامە قەیسیشی پێخۆشبوو، دەرهێنەر دەیتوانی ئاسودە بێت چونکە هەریەکە لە نەکتەرەکانی رۆڵی خۆی زۆر باش وازیدەکرد.

ئاسایی هەندێك جار رادەمام ئاخۆ عەمو گروپی هاوڕێی تری هەبوو وەك ئەم گروپە یان نا، ساڵانێك کۆیکردبنەوەو بەگروپ وەك عادەتی ئاسایی خۆی کاتیان لەتەکەوە بەسەرببات. تەنها ئەو هۆکاری راستەقینەی پەیوەندیی لەگەڵ دایك‌و باوکم دەزانی. دەزانم ئەو دەیویست ببێتە سەرکردەیەکی جیهانی، بەڕوونی ئەمە پلانی بوو و هیوای بۆ دەخواست. لەکاتێکدا ئەو هێشتا پیاوێکی خێڵەکی بوو لەسەر رێی سیاسی—سەربازیدا، پێویستی بەدانپیانان‌و رای رۆشنبیرانی شەقامی بەغدا هەبوو، لەناویشیاندا خەڵکی سەرمایەدارو کاریگەری کۆمەڵایەتی. بەدەر

لەوەش پێویستی بە تێگەشتن هەبوو لە کولتوری رۆژاوا، چوون سروشتی دووەم بوو بۆ دایكو باوكمو ئەو دەستەیە لە هاوڕێیانی. لە بەغدادا خەڵکی دەوڵەمەندترو بەدەسەڵاتر هەبوون، بەڵام من گومانم لە زۆرێك لەو خەڵکانە هەبوو—بۆ نموونە باوكی بەسمە—كە رای سیاسیو خواستی خۆیان هەبوو و هەڕەشە بوون بۆ سەر دەسەڵاتی عەمو. دایكو باوكم لەمڕووەوە ساویلکە بوونو سیاسەتیان پشتگوێ خستبوو، ئەوەش وانەیەك بوو لەمەترسی بێباکی، هەروەها نەیاندەتوانی هیچ ململانێیەك لەئاست پیشەكەی بهێننە گۆڕێو هیچ مەترسییەكی ئاسایش لەسەر ژیانی دروستبکەن. بەڵام بەهەر هۆكارێكی تریش ئەو سۆراخی هاوڕێكانی نەكردبێت، من پێموایە ئەو باسلو عالیای خۆشەویست، وەك چۆن خەڵكانێكی زۆر خۆشیاندەویستن. گەرنا لەدەوروپشتی خۆی گلی نەدەدانەوە. مەبەستمە بڵێم بۆی نەدەلوا نەهێڵێت بڕین.

هەڵدەكەوت لە دانیشتنەكانماندا عەمو زۆر هەڵچوو دەردەكەوت، كاتێك فرمێسكمان لە چاوەكانیدا دەبینی چاوەڕواندەكرا ئێمە هاوخەمی خۆمان بۆ ماتەمیەكەی دەربڕین. زۆرجار ئەمە رویدەدا كاتێك سەبارەت بەخۆشەویستی خۆی بۆ عێراق ئەدوا. راهێنانی بەم قسانەوە لەسەر دایكو باوكمو گەورەكانی تر دەكردەوە، كاتێكیش لەڕاگەیاندنەوە بڵاودەكرایەوە، دایكم لەسەر ستاندی كاركردنی یان بەرگدورینەوە تەماشای تەلەفزیۆنی دەكردو دەیگوت "ئێرەیە، ئێستا ئەو بەشەیە كە تێیدا خەریكە دەگری".

من دایكمم خۆشدەویست. بریا ئێستا دەمتوانی قسەی لەگەڵدا بكەم.

هەتاوەكو پلانی شتێكی ترمان بۆ دانەنرایە یان هۆكارێكی باش نەبوایە—وەك تەواوكردنی خوێندن، رێوڕەسمی بەخاكسپاردن، یان گەشتێك لەدەرەوەی بەغدا—بەگشتی چاوەڕوان دەكرا دوا هەفتەكانی مێردمنداڵیم كە نزیكەی شەش ساڵ بوو، لەو خانووەی ناو مەزرادا بەسەربەرم. جگە لە قسەكردن لەگەڵ كچەكانی تردا كە زیاتر لەبارەی مۆدەوە بوو، هیچ شتێكی تر نەبوو بیكەمو هیچ شوێنێكیش نەبوو بۆی بڕۆم. دوو كەناڵی تەلەفزیۆنی لە بەغدا هەبوو، یەكێكیان كەناڵێكی فارسی زمان بوو لەلایەن ئێرانییە ڕێپێدراوەكانی سەر بەحكومەتەوە بەڕێوەدەبرا. هەرچی كەناڵە عەرەبییەكەش بوو تەنها فیلم كارتۆنی ژاپۆنی،

زنجیرەو فیلمی میسری، دیناستی پەخشدەکردەوە، زۆرینەی کاتەکانیش وتەکانی عەموی پیشادەدا کە پێش ئەنجومەنی شۆڕش یان لە ژیانی رۆژانەی یانیش لە رووداوەکانی تردا پێشکەشی کردبوون. پاش نیوەڕۆیەك، لەخانووی مەزراکەدا لە تەلەفزیۆنەوە تەماشای فیلمێکی میسریمان دەکردو لەناکاو کەناڵەکە بڕا، پاشان گۆڕا بۆ نمایشێکی ترو کەوتە سەر دیمەنێکی ماچکردن. دەرکەوت کاتێك ئەو فیلمەی کەوتوەتە سەر باوکم لەگەڵ عەمودا بووە، ئیتر عەمو بانگی بەڕێوەبەری کەناڵە عێراقییەکەی کردبوو، فەرمانی پێکردبوو ببوەستێنێت چونکە لاوانی عێراق بەرەو هەڵدێر دەبات. ئامۆزاو خالۆزاکانم پێکەنینیان بە چیرۆکی لەم چەشنە دەهات، بەڵام هەرگیز هەڵنەدەکەوت بۆیان باسبکەم. تاسەی یەك بەیەکی ئامۆزاو خالۆزاکانم دەکرد، مەراقمبوو لەئامێزیان بگرم، هەستم ئاسایی بێت. حەیدەر هیچ هاوڕێیەکی نەبوو، بۆیە لە ژوورەکەی خۆیدا دەرگای لەسەر خۆی کلۆمدەکردو بە یارییە ڤیدیۆییەکان کایەی دەکرد، جگە لە باوکم کە من پێمواییە لە بارودۆخەکە تێدەگەشت، خۆی لەهەمووان تەریز نەکرد. خانووەکەی مەزرام وەك زیندانێك دەهاتە بەرچاو، هەڵاتنم لێی تەنها خوێندنەوە بوو. لە درێژترین کتێب کە دۆزیمەوە دەستمپێکرد، کتێبی (Gone With the Wind) "با بردووان"[1]، بەردەوام بووم لە خوێندنەوەو بەناو گشت مەشهەدو بیرۆکە ناشناکانیدا گوزەرمکرد: شەڕی نێوان ئامۆزاکانو یەکتر کوشتنیان، ناچارکردنی بێوەژنەکان بە بەخشینی ئەڵقەی هاوسەرگیرییان، چارەنووسی رەشپێستەکان بە بەسەربردنی ژیان بەهەژاریو لەبەرابەریشدا خۆشگوزەرانی سپی پێستەکان بەسەماکردنو چاوداخستنیان لەو بارودۆخە.

گەورەو بەتەمەنەکانو بەتایبەتی پیاوان، کاتێکی زیاتریان لەگەڵ عەمودا بەسەردەبرد نەوەك لەتەك ئێمە. وێنەیەکی ئامۆم هەیە باوکمو پیاوەکانی تر بە کڵاوی خوریو بەسواری پاسکیل بەدوای عەمووەوە لە شوێنێکن، پاسەوانەکانیش بە ریزو بە پاسکیلەوە لەدوایانەوەن. عەمو هەمیشە جلەکانی دەگونجاند لەگەڵ ئەو چالاکییەی پلانی بۆ دادەنا ئەنجامی بدات. لە خانووەکەی مەزرا پێی خۆشبوو

---

[1] تاقە رۆمانی مارگرێت میچێل ساڵی ١٩٣٦ نووسیویە، سەبارەت بەشەڕی ناوەخۆی ئەمەریکا لە شاری زێدی نووسەر خۆی. و.ك.

جلوبەرگ‌و بەدلەی یەکپارچەی شین‌و کراسی سورو سپی لەبەربکات‌و دەستەسڕێکیش بەدەوری ملیەوە ببەستێت، هەروەها کڵاوێکی کاوبۆیی لەسەر بنێت. باوکانی ئێمە وەك جوتیار پێشبینی دەکران‌و هەریەکەیان لەبەردەم خانووەکەی خۆیدا پاچە زەوییەکی هەبوو، بۆ ئەوکاتەشی ئێمە هاتینە مەزراکە، مامە قەیس‌و مامە مازن داری زەیتونیان تێدا ناشتبوو، پێموایە لە بەشی دواوەی ماڵەکانیانەوە کارمەندی تایبەت کاریان لەسەر دەکرد. باوکیشم دوو جوتیارو تراکتۆرێکی بچووکی بەکرێ گرت، پێکەوە ئەو زەوییە بیابانییە بەتاڵەیان کێڵاو ریز لەدوای ریز درەختی زەیتونیان بەبەرزی ئەژنۆیەك تێدا ناشت. هەردەم حەزی لە باخداری بوو، ڕاستی پێش چەند ساڵێك کێڵگەیەکی بچووکی کڕیبوو وەك دیارییەك بەناوی منیەوە کردبوو. وەلێ کاتێك خانووی مەزراکەمان وەرگرت دەستیان لە کێڵگە راستییەکە شۆردو پێشتگوێخرا. لەچەند ساڵی کەمی دواتردا، بینیم دار زەیتونەکانی باوکم وردە وردە وشکدەبوون‌و دەمردن. تەواو نازانم چی روویدا، رەنگە بەهۆی کەم ئاوییەوە بووبێت، ئاوی تەواویان پێ نەگەیشتبێت تا وشکنەبن. لەوانەشە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە زۆرجار دوور بوو لێیانەوە تاوەکو خزمەتیان بکات—یان هەر خۆی وازی هێنابێ لە خزمەتکردنیان. سەبارەت بەو بابەتە دڵنیانیم. پاش ماوەیەك، ئیتر نەمدەتوانی جیاوازی بکەم لەنێوان ئەو کەسانەی کە بەڕاستی دایك‌و باوکم بوون‌و ئەو کەسانەی عەمو ناچاری کردبوون بەوشێوەیە خۆیان دەربخەن.

نزیکەی بەنیو کیلۆمەتر لەدووری ئەو سێ خانووەی ئێمەوە، دیوارێك کرابوو بەدەوری خانووەکەی عەمودا شاردبوویەوەو دەیپاراست. لەناو ئەو دیوارەدا سەرچاوەیەك هەبوو ئاوی روون. زۆرجار پیاوەکان بۆ ئەوێ دەڕۆیشتن، هەندێك جاریش هەرسێ ژنەکە دەڕۆیشتن. هەڵبەت ئەمە پێش سێساڵ لەوەی کە من بۆم روونبویەوە شتێکی وەها لەوشوێنەدا هەیە. وێنەیەکم هەیە لە خانووی مەزراکەوە گیراوە، هەرخۆمم بەتەنها، لەو وێنەدا من بەشۆرت‌و کراسەوە لەسەر بۆرییەکی ئاوی گواستنەوەی جۆگەی ئاودێرییەکەوە بەهاوسەنگی وەستاوم. لەوشوێنەدا چەندین کاتژمێرم بەسەربرد، ئێستاش دەتوانم چاوی ئەندێشەم وەك کامێرایەکی کۆنترۆڵ بەکاربەرم‌و هەموو ئاراستەکانی ئەوێی پێ ببینم.

لەخواری پێمەوە مراوی سپی هەبوون پەڕۆشی مەلەی ناوی ژێر لولەکە بوون. لەپێشمەوە لەپانتاییەکی بچووکی بیابانە چۆڵەکەدا، دیوارێکی بەرزی تێپەڕنەکراو هەبوو دەوری خانووەکەی عەموی دابوو. لەپشتمەوە، دیواری دەرەوەی کۆشکەکەی بوو و لەبەرامبەر خانووەکەی ئێمەوە بوو. ئەو دوو دیوارە ئەو ناوچەیەی دیاری دەکرد ئێمە تێیدا ڕێگەمان پێدرابوو هاتوچۆ بکەین و بژین. ماوەی دە خولەك ڕێکردن هەبوو لەنێوان ئەو کۆمەڵە پاسەوانەی کە دەیانپاراستم لەگەڵ ئەو کۆمەڵە پاسەوانەی مەترسیدار بوون ئەگەر لێیان نزیکببامەوە دەشیا بمکەنە دەرەوە. لەکەناری جۆگەکەدا دادەنیشتم و گوێم لە مراوییەکان دەگرت و فێرببووم لەگەڵیاندا غاك غاك بخوێنم. ئەوانم وەك هاودەمی بێدەنگی خۆم وێنا دەکردن، کە دەمتوانی لەکنیان دەردی دڵی خۆم بەیانکەم و هەرگیز ڕاپۆرتم لێنەدەن. دەمووت، غاك، غاك، غاك و ئەوانیش دەیان خوێندەوە.

بەیانییەك تێبینمکرد سکە عەباسییەکەی دایکم لەملیدا نەمابوو. لێمپرسی کوا لەکوێیە.

وتی "بەخشیم بە عەمو".

حەپەسام.

لێمپرسییەوە "دەی بۆچی دایە، بۆچی؟"

هەرگیز بۆم نەڕەخسابوو پێیبڵێم ئەو دراوە بۆ من چەندە مانا و بەهای هەیە. ئەوە یەکەم یادەوەریی ئەو بوو بۆ من، لای خۆمەوە وامدانابوو کە گەورە بووم منیش لەملی دەکەم و بەوەش هەندێ لە جوانی و میهری دایکم دەبنە هی منیش، هەروەك ئەوە بەشێك بوو لەو.

سەری داخست و گوتی "ڕۆژی لەدایکبوونی بوو. پێویستبوو شتێکی گرنگی پێ ببەخشم".

گرنگ؟ مەگەر چۆن دەبوو دراوەکەی دایکم گرنگ بووبێت بۆ عەمو؟ ئەو هەر شتێکی بویستایە هەیبوو. خەڵکی بەڕیز دەوەستان تا دیاری پێببەخشن و هەرگیزیش بەکارینەدەهێنان، ئەوجا بابوەستێ ئەسڵەن سوپاسی لێدەکردن یان نا. دەیتوانی هەر بەئاماژەیەك هەر شتێك لەسەر ئەم زەوییە حەزی لێیەتی بهێنرێتە بەردەستی. بۆچی دەبێت ئەو پێویستی بەشتێکی ماددی هەبێت کە

بەلای منەوە زۆر گرنگ بوو—جەوهەری دایکم بوو؟ بۆچی دایکم ئەوەی پێدابووم؟

لێمپرسی "بەڵام، بۆچی دراوە عەباسییەکە، دایە؟"

بەپەشۆکاوییەوە وتی "چونکە دەمویست شتێکی تایبەتی پێببەخشم، ئەوەش تایبەترین شتێك بوو بەبیرمدا هات. من هەر ئەوەم کرد، کە پێویستبوو بیکەم".

هێشتم ئەو سکەیە بڕوات. سیمای شەرمەزاری دایکمم بەیاد دەهێنایەوە کاتێك لەگەڵ عەمودا بوو، ئەوی زیاتر بێزاری دەکردم کە وەها بێپاڵپشت دەمبینی، شەرمکردنەوەی بوو لەبەردەمی مندا.

کاتێك ئەو شەوە تەلەفزیۆن راستەخۆ جەژنی لەدایکبوونی عەموی پەخشکردەوە، لەماڵەوە تەماشامان دەکرد بەسەدان منداڵ گۆرانیان بۆ دەووت. لەپڕ هەستمکرد ئەمە گەوجیو گەمژەییە. سەرۆك کۆمار دەرکەوت جلەکانی سپی بوون، تەنانەت گۆرەویو پێڵاوەکانیشی سپی بوون، لەسەر قەنەفەیەکی ئالتونی وەك کورسی پاشا دانیشتبوو بەخەندەیەکی فراوانەوە چاوەڕوانی کوژاندنەوەی مۆمەکانی دەکرد.

وتم "زۆر منداڵ ئەنوێنێ! پتر وەك منداڵێك رەفتار دەکات نە وەك گەورەیەك".

ئەمەم بەبێ بیرکردنەوە وت.

باوکم سەرزەنشتی کردمو وتی "هەرگیز شتی وا نەڵێی! هەرگیز پرکێشی ئەوەنەکەیت جارێکی تر شتی لەو شێوە بڵێی!"

دەنگی باوکم بەرزو توند بوو، سیمای لەپڕ گۆڕا، وەك فرۆکەوانێك ئاگاداری فریاکەوتن هەڵبکات. رانەهاتبووم بەو شێوەیە قسەم لەگەڵدا بکات، بۆیە ئازاری دام، بەڵام پەیامەکەیم وەرگرت: نەدەبوو هەرگیزو تەنانەت لەماڵی خۆیشماندا رەخنە لە عەمو بگرم، نەشدەبوو هەرگیز پرسیار لەبارەی شتێکەوە بکەم کە ئەو دەیووت یان دەیکرد.

دواتر دایکم هاتە لامو ئەو هەستە ئازاربەخشەی رەواندمەوە.

دڵی دامەوەو گوتی "پێویستە وریا بیت، ئازدارەکەم. دیوارەکانیش ئەبیستن.

ئەگەر بەڕاستی پێویستبوو شتێکی هەستیار بڵێی، باشتر وایە بڕۆی بۆ ناو باخچەکە".

وای لێکردم خەیاڵی رادیەو ئەبو ترەیب بکەمەوە، ئەو وێنەیەم لەچاوی هزرو هۆشمدا چەسپاند کە دیوارەکانی دەوروبەرم گوێی مرۆییان هەیە. لەدوای ئەو رۆژەوە، هەر کاتێك هەڵەیەکم بکردایەو لەبیرم نەبوایە، تەماشای دارو درەختەکانی دەوروبەرم یان وێنەی سەر دیوارەکە یان تەماشای راخەرەکانی دایکمم دەکردو هیوام دەخواست گوێیان لێ نەبووبێت. وەهای لێهاتبوو هەرچی شتێك لە ماڵەکەماندا هەبوو لەیادی بوو کە عەمو لێرە بووە. من تەنها یەکجار لە ماڵی خۆمان بینیبووم، بەڵام توانایەکی تایبەتی هەبوو وەك هیچ کەسێکی تر نەبوو، هەمیشە لەدوای خۆی هەستمدەکرد شتێکی لەو شوێنەدا ماوەتەوە کە بەجێیهێشتووە. لە رۆژانی ئاساییشدا ئەو هەستەم هەبووە، لەسەر ئەو قەنەفەیەی لە ژووری میوانەکەمان لەسەری دانیشتبوو، لە بۆنی قاوەی پاش نیوەڕواندا، تەنانەت لەو نیگایەشدا دراوسێکانمان دیقەتی دەدایەن. لەناو ماڵەکەماندا جێگەی خۆی داگیرکردبوو، تەنها دواتر توانیم پەی بەوە ببەم کە ئەوە تەنها ترس بووەو هیچی تر.

جارێك زانیم "خانووی مەزرا قەرەباڵغە" کاتێك بیرم لەوان دەکردەوە، جارنەجار لەگەڵ دایکم دەرۆیشتم بۆ سەردانی پوورە نەدا یان پوورە لەیلا لە ماڵەکانی خۆیان لە کۆشکی گەورە لە بەغدا. ئێوارەیەك لەنهۆمی سەرەوە لەژوورەکەی تەمارە بووم، لەسەر زەوییەکە دانیشتبووین‌و جلوبەرگمان بەدەورماندا پەرش‌و بڵاوکردبوویەوەو خەریکی هەڵبژاردن‌و پێکەوە گونجانی جلەکان بووین، لەو کاتەدا لە نهۆمی خوارەوە دەنگی عەمومان بیست، ئێمە نەمانزانیبوو ئەو لەوێیە. پوورە لەیلاو پوورە نەداش لە نهۆمی خوارەوە بوون، پێموایە ئەوانیشی توشی سەرسوڕمان کرد. عەمو بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد، بەجۆرێك پێشتر هەرگیز سەدایم بەو بەرزییە بەرگوێ نەکەوتبوو. زۆر تورە بوو، بەتەواوی هەستم بە بێدەنگیی دەوری دەکرد، لەبەرئەوەی تورەییەکەی زۆر بەهێزو بێئەندازە بوو. من‌و تەمارە دەمانزانی کە بۆ ئێمە قەدەغەیە گوێ لە شتێکی لەو شێوەیە بگرین، ئەم بابەتە لەو جۆرانە بوو کە دەبوو لەم گوێمانەوە

بڕوات لەوی ترمانەوە دەربچێت. دەستمان کردەوە بە بژارکردنی جلەکانو خۆمان وادەرخست کە بەڕاستی گوێمان لەو شتانە نییە لە نهۆمی خوارەوە روویانەدەدا، یان پێمانوابوو ئەگەر لە قسەکردنی خۆمان بەردەوامبین ئیتر شتەکە کۆتایی پێدێتو لەسەر ئێمە ناکەوێت.

بەلام دەگی عەمو بەرزتر بووەوە. گوێم لێبوو ناوێکی هێنا، سەمیرە، تۆنی دەنگیشی وەك ساتوری قەسابان تیژ بوو.

هاواری دەکرد "جوربە" سەدای لەناو ماڵەکەدا دەنگی دەدایەوە. ئەوە وشەیەکی ناشیرینو بازاڕیو خراپ بوو بۆ سەرزەنشتکردی بێگانە بەکاردەهات، بەمانای رەشو پیسو ناشیرین دێت. بۆ ژنان بەکاردەهێنرا، لەناکاو زانیم بەسەر دایکمدا دەقیژێنێت. تەمارەش زانی. وازی لەخۆگێلکردن هێناو روویکردە من. هەرگیز ئەو نیگایەی تەمارەم بیرناچێت کە لەسەر روخساری بوو، ترسەکەی ئەو منیشی دلنیاکردەوە. پاشان لەناکاو دەنگەدەنگەکە نەماو بێدەنگییەکی ترسناك باڵی کێشا. ئێمە بەبێدەنگیو لەسەر نوکی پێ هاتینە سەر لێواری پلەکانەکە، کاتێك دەنگی دایکمم بیست، دووبارە هەناسەیەکم دایەوە. عەمو رۆیشتبوو، بەلام هێشتا هەستم بە ترسێکی سارد دەکرد لەدوای خۆیەوە بەجێی هێشتبوو. لە ڕێڕەوی پلەکانەکەوە تەماشای خوارەوەم کرد، بینیم پوورە لەیلا دەستی خستوەتە سەر ملی دایکمو دەیەوێت هێوری بکاتەوە. ئەوان ئێمەیان نەبینی.

پوورە نەدا بانگی کردینو دەیویست خۆی وادەربخات کە دەنگی ئاساییە "زەینەب، تکایە وەرە خوارەوە، دایکت بەنیازە بڕوات".

لەگەڵ تەمارە بەپلەکانەکەدا هاتینە خوارەوەو هەوڵماندا واخۆمان نیشان بدەین کە گوێمان لەهیچ نەبووە. روخساری دایکم تەواو سورهەڵگەڕابوو، چاوەکانیشی پڕببوون لە فرمێسك. نەیتوانی بیشارێتەوە چەندە نیگەرانە، بەلام بێدەنگ مایەوە تا لە خاڵی پشکنینی کۆشکەکەوە رەتبووین. پاشان دەستیکرد بە گریانو هەناسە هەڵکێشان، لەوکاتەدا سوکانەکەی توند گرتبوو، من لە کوشنی پێشەوەدا دانیشتبووم هەوڵمدەدا هێوری بکەمەوە. باوکم لەماڵ نەبوو، دایکیشم ئەوەندە نیگەرانو بێزار بوو هەستمدەکرد خۆی بۆ نەدەگیرا. وەختێ من مێشکم سەرقاڵ کردبوو بەوەی بەجۆرێك حاڵی بم چی گوزەراوە، دایکم پێیگووتم، بەهۆی

سەمیرەوە عەمو زۆر تورە بووە لێی. خوشکەکەی ئەمەل؟ ئەوەی دایکم لە سیێتلێ جلی ژێرەوەی بۆ کڕیبوو؟

دایکم وتی ئێستا سەمیرە دۆستی عەموە، عەمو دەیەوێت ئێمە هەمومان ببین بەهاوڕێی، بەڵام دایكو باوكم لە سەمیرە بێزار بوون. ئەو لە خوشكەكەی جیاواز بوو ئەمانیش نەیاندەویست ببیینن. سەمیرە شتێكی زۆر خراپی بەباوكم وتبوو. بەوپێودانگەی دایكم ئامادەنەبوو پێم بڵێ، حەتم شتێكی زۆر خراپ بووە چونكە عەمو سەمیرەی ناردبوو بۆ ماڵی ئێمە تا داوای لێبوردن لە باوكم بكات. دایكم پێی وتم، باوكم ئەوەندە سەرسەخت بووە نەچۆتە بەر دەرگاو رەتیكردۆتەوە رێگە بە سەمیرە بدات پێبخاتە ناو ماڵەكەمانەوە، ئیدی دایكم لەبەر هەیوانەكەدا دەسەوسان بووە كارێك بۆ هاتنە ژوورەوەی دۆستەكەی عەمو بكات. نەهێشتن یان رێگەنەدان بەمیوان بێتە ژوورەوە یەكێكە لە خراپترین نموونەكانی عەیب بۆ عێراقییەكان، چونكە ئەوان بەهۆی میواندۆستییەوە شانازی بەخۆیانەوە دەكەن، ئەم بابەتە مەڵامەتی ئەوەبوو عەمو تا بەو چەشنە لە دایكم تورە ببێت. بۆیە دایكم لەبری باوكم رووبەڕووی سەرزەنشتو سوكایەتی بووەوە. ئەگەر عەمو بەوشێوەیە بەسەر دایكمدا بقیژێنێ، دەبێت بەپیاوێك چی بكردایە؟ ئێستاش پێم سەیرە، مەگەر باوكم نەیدەتوانی شانازی بخاتە لاوەو پۆزشەكە قبوڵبكاتو یاری مەترسیدار بە ژیانی دایكمو وەدەرنانی نەكات؟

ئەو شەوە وەك باشترین هاوڕێی پێویستی گوێم بۆ دایكم گرت. من سوپاسگوزار بووم كە دایكم زیندوو بوو من هێورم دەكردەوەو گەیشتینەوە ماڵەوە، ماچم كردو شەو شادم لێكرد. بەڵام هەستەكانم هەموو شێوابوون. من زیاتر هەستم دەكرد دایكی بم نەوەك منداڵی ئەو، هاوكات دەنگێكی نزمیش لەناووەمرا دەیگووت هێشتا ئامادەیم بۆ ئەمە نییە. دەمویست كەسێكی پێگەیشتوو بم بۆیە تێدەگەشتم چی دەگوزەرێت، وەلێ كاتێكیش خەریكبوو تێدەگەشتم، بەشێك لەمن دەیویست بگەڕێمەوە دواوە. بۆ دایكم باش نەبوو پێم بڵێت كە چی هەیە دەربارەی باوكم. هەروەك ئەو باوكی منو من منداڵی ئەو بووم.

هەرگیز جارێكی تر سەبارەت بەو شەوە لەگەڵ دایكم قسەم نەكرد، هەروەها

لەگەڵ باوکیشم باسی ئەو بابەتەم بەهیچ کلوجێك نەکرد. تەنها لە شوێنێکی قوڵی مێشکما ناشتم.

رۆژێك خەریکی خۆئامادەکردن بووین بۆ خوێندنگا بڕۆین، تەلەفۆنەکە زەنگی لێدا. لەو کاتەدا لە چێشتخانەکە بووین، دایکم و رادیە خەریکی دروستکردنی لەفە بوون بۆ ژەمی خوێندنگامان. باوکم وەڵامی تەلەفۆنەکەی دایەوە، کە دیم دەیگوت "نا، نا، نا!" سەرێکم هەڵبڕی، هەمووومان وەستابووین تەماشای ئەومان دەکرد. کاتێك تەلەفۆنەکەی داخستەوە، فرمێسك بەڕومەتیدا ڕێچکەی بەست.

سەیری دایکمی کردو گوتی "قوسەی مردووە".

دایکم پرسی "چی قەوماوە؟"

گوتی "کاتێك لە فڕۆکەخانەوە بۆماڵەوە گەڕاوەتەوە توشی رووداوی هاتوچۆ بووە. دەڵێن لەوانەیە شەو نەخەوتبێت و بەسەر سوکانەکەوە خەو بردبێتیەوە".

دایکم تەماشای باوکمی کردو رەنگی زەردهەڵگەڕا، لە نیگایەکی پڕمانای نێوانیان تێگەیشتم.

باوکم وتی "دەگوترێ بارهەڵگرێك خۆی پێداکێشاوە. لێیداوەو ڕۆشتووە. تەنها لاشەکەیان دۆزیوەتەوە. دەڵێن هیچکات نازانین کێ ئەو کارەی کردووە".

ئیدی باوکم موبەقەکەی جێهێشت. قەت باوکمان نەبینیبوو بگری، من هەستم بەو خەمبارییە دەکرد سەر روخساری گرتبوو. مامە قوسەی نەك تەنها ئەندامێکی گروپەکە بوو، بەڵکو هاوڕێشی بوو.

ئەو رۆژە نەمتوانی بەباشی بیرم لای خوێندنگا بێت. بەردەوام ئەو گفتوگۆیەم لە مێشکمی خۆما لێکدەدایەوە، هەموو ئەوەشی دەمتوانی بیکەم ڕاگرتنی فرمێسکەکانم بوو. عەمو قوسەی و ئەمەلم بیردەهاتەوە لە سیێتڵ چەندە خۆشحاڵ بوون. چۆن دەبێت لەسەر ڕێگایەك بەو ئاسانیە توشی رووداوی هاتوچۆ بێت و بمرێت لەکاتێکدا بەباشی شارەزای بووبێت؟ باوکم وتبوی، دەڵێن رووداوێکی ڕێکەوت بووە. دەڵێن بارهەڵگرێك لێیداوە. باوکم باوەڕی نەدەکرد ئەوە بەهەڵکەوت بووبێت، هەروەها لەڕێگەی ئەو ترسەی سەر روخسارییەوە پێموانەبوو دایکیشم باوەڕبکات. داوای ئیزنم کردو چووم بۆ تەوالێت، من رکم لە

مەبالی ئەم خوێندەگەیە بوو و خۆم لێدەبوارد. هەمیشە پیس بوو، بەڵام تەنیا شوێنێك بوو ئەمتوانی تێیدا تەنها بم، چوومە ژوورو گریام، زۆر گریام، چاوم بڕیبووە دیوارە چڵکنە بێناوێنەکەی. بەڕاستی چی بەسەر عەمو قوسەیدا هات؟ ئاخۆ کوژرا؟ داخۆ ڕووداوێکی لەو شێوەیە لە بەغدا دووبارە دەبووەوە؟

ئەو ڕۆژە کە ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە، داوام لە دایکم کرد لەگەڵم بێتە دەرەوە بۆ ناو باخچەکە.

پرسیارم لێکرد "باوکم چۆنە؟"

وتی "ئەو باش نەبێت. دەڕوات بۆ مەراسیمی بەخاك سپاردنەکەی. منیش دەڕۆم بۆ لای ئەمەل بۆ ئەوەی سەرەخۆشی لێبکەم. ئەڵێن زۆر خەفەتبارو بێهیوایە. بیستومە لەژوورێکدا دەرگای لەسەر خۆی کڵمکردووەو قسە لەگەڵ کەسدا ناکات".

"دایکە، باشە عەمو قوسەی کوژرا یان بەڕاستی ڕووداوی هاتوچۆ بوو؟"

تەماشایەکی کردم، وەك ئەوەی هەڵیسەنگێنێ کە دەبێت چیم پێبڵێت.

بەنەرمی وتی "ئێمە ئەشێت هەرگیز نەزانین، ئازیزەکەم. عەمو دەیویست ببن بەهاوڕێ، بەڵام وا هەستەکەم قوسەی نەیدەویست ببن بەهاوڕێ".

"ئیدی ئەمە بویە مایەی کوژرانی؟"

وتی "زەینەب، نازانم. هەندێك جار ناتوانین هیچ بکەین، بۆیە باشترە سەبارەت بەو بابەتە بیرنەکەینەوە. هەوڵبدە ئەمە لەبیربکەیت، باشە؟ ئەوە پەیوەندی بەتۆوە نییە".

بەدڵنیاییەوە ئەوە خەمی من بوو. مەگەر هەر لەبەر ئەمە نەبوو دایكو باوکم ئەوەندە پەشۆکاو و وریا بوون لەگەڵ عەمودا؟ چوون لەوانەبوو ڕووبەڕووی کوشتن ببنەوە ئەگەر نەیانویستایە چیتر دۆستو هاوڕێی بن؟

# لەبیرەوەرییەکانی عالیاوە

لەو ساڵانەی سەرەتای پێش بوونە سەرۆك کۆماریدا، جاروبار بانگهێشتی دەکردین بۆ رەیسین کڵەب، ئاسایی ساجدەی هاوسەریشی بۆ ئەوێ دەهێنا، ئەم هاوسەرەی کەسێکی کۆمەڵایەتی نەبوو. بەڵام زۆربەی کاتەکان عەمومان بەتەنیا یان هەندێك جار لەگەڵ خانمێکدا دەبینی.

پێش سەمیرە، "حەننا"ی هەبوو. زۆرجار باسی هەنناى دەکرد. ئەو تەنها هاوڕێی نەبوو، بەڵکو کەسێك بوو وەك خۆی دەیگووت هەموو ئارەزوو خەیاڵەکانی بوو. لەیەکێك لەو ئێوارانەی لەگەڵیدا بەسەرمان برد، پێی وتین چۆن کوشتویەتی. ئەو لەگەڵ پیاوێکی تردا یەکیان بینیبوو، سەدامیش بەڕاستی ئێرەیی پێبردبوو. بۆیە ڕۆشتبوو بۆ ماڵەکەی‌و خۆی‌و دایکی لەوکاتەی لەجێگەکەیاندا نوستبوون کوشتبوو. بەدەستی خۆی بەدەمانچەکەی کوشتبوونی، کچە سێ ساڵانەکەی حەنناشی، بەگریەو زاری‌و قیژانی ئەوەی عەمو دایکمی کوشت، بەجێهێشتبوو. لەدوای ئەو رووداوە بۆ ماوەیەکی درێژ ئەو کچە هیچ قسیەکی نەکرد. لەولاشەوە دۆسیەکەیان بەبێ هیچ بەدواداچوونێك داخرا.

هاورێیەتی عەمو سادەو ئاسان نەبوو. هەمیشە دڵنیای دەکردەوە، هەم بەحیا قسە لەگەڵ هەر هاوڕێیەکیدا بکات هەم بشبێتە هاوڕێی هاوسەرەکەی. هەرگیز متمانەی بەهیچ پیاوێك نەدەکرد تاوەکو متمانەی بەژنەکەی نەکردایە. پاشان، لەبارەی هاوڕێکانی تریەوە بەبێ ئامادەبوونی خۆیان قسەی دەکرد. لەڕێی دابەشکردن‌و ململانێوە، دڵنیابوو لەوەی هەموو برادەرانی بەدگومانن لەیەك، هاوزەمان هەریەکەشیان پێیانوابوو ئەو باشترین هاوڕێیانە. ئەو گەمانەی لەنێو هاوڕێکانیدا سازی دەکرد بۆ بڵاوکردنەوەی ترس‌و گومان بوو بەناو هەمووماندا، سەردانەکانی شەوانی، نزیکبوونەوەی لە ژنەکان، نەتوانینی رەتکردنەوەی هەر داوایەکی چونکە ئەشیا نرخەکەی ژیانی کەسەکە بێت، هەروەها چەندین شتی تریش هەبوون، بەهۆیانەوە هەندێ کەس وڵاتیان بەجێدەهێشت. یەکەم هاوڕێمان

کە وڵاتی بەجێهێشت مەحمود بوو، ئەو کەسەی یەکەمجار ئێمەی بەو ناساندبوو. مەحمود پیاوێکی سەرمایەدار بوو، بەڵام بۆ ئێمە ئاسان نەبوو وڵات جێبێڵین. بەردەوام وابیرمان دەکردەوە کە دەتوانین لەسەر ئەو پەیوەندییە تا ئەو جێیەی وریا بین بەردەوامبین.

لەیەکێك لەئێوارەنەکانماندا لەگەڵیدا، دەربارەی ناپلیۆن پرسیاری لە ڕای باهیر کرد، باهیر یەکێك بوو لە هاوڕێکانمان و کەسێکی ڕۆشنبیرو خوێنەرێکی باش بوو. باهیر بێگوناهانە بە وتەیەك وەڵامیدایەوە کە ڕێیخۆشکردبوو بۆ کۆتایی هاتنی ناپلیۆن، ئەو هیچ ئامرازێکی نەبوو بۆ جڵەوکردنی ئازایەتیی بەبزاوتی. وەها وەسفی ناپلیۆنی کرد کە هەرگیز ڕای ئەوانی تری وەرنەگرتووەو کاری لەسەر بۆچوونی خۆی کردووە بەبێ ئەوەی بیر لەکاردانەوەکان بکاتەوە. سەدام بەتوڕەیی سەیری باهیری کردو بەدەنگێکی توند وتی "مەبەستت چییە، باهیر؟ دەربارەی ناپلیۆن قسەدەکەی یان کەسێکی تر؟" باهیر زۆر شەرمەزار بوو ئارەقەی کردەوە، ئینجا دەستیکرد بەسوێنخواردن لەسەرئەوەی تەنها لەبارەی ناپلیۆن قسەی کردووە.

ڕووداوی لەوجۆرە نابێت بەسوك دابنرێت. لەوساتەدا هەموومان لەخەمی باهیردا بووین. هیچ یاساو ڕێسایەك نەبوو بۆ پەیوەندی لەگەڵ سەدامدا جگە لەوەی کە هەمیشە پێویستبوو دڵخۆشی بکەین.

# فێربوونی هاوارکردن لەگەڵ مراوییەکاندا

هەوڵمداوە ئەو ساتەوەختە دیاریبکەم، تێیدا بۆ یەکەمجار هەستمکرد پیاوێك کە سڵاوم لێکردووەو ماچی چاڵی سەر رومەتیم کردووە بکوژ بووە، بەڵام هەستناکەم ئەو ساتە بوونی هەبووبێت. چوون کاتێك لاو بووم، دایكو باوکم هەوڵیاندەدا لەزانینی هەندێك تاوانی تایبەتی ئەو بەدوورمبگرن، بەتایبەتیش لەکاتی مردنەکەی عەمو قوسەیدا، دەی بەدەگمەن بەڵگەش هەبوون. میدیاکانمان بەئەندازەیەك کۆنترۆڵکرابوو کە لەستراتیژی هەڵمەتەکانی جینۆسایدی مەزهەبیو نەژادی تێنەگەشتم تاوەکو عێراقم بەجێهێشت، لەبەرئەوەی هەموو عێراقییەك دەیانزانی چەندە مەترسیداربوو، ئیدی هەرگیز مشتومڕی لەبارەوە نەدەکرا. ترسم وەك یەکەم ژانی دەروونی بیرنایەتەوە، بەڵام هەر لەو رۆژەوەی چاوم بەو پیاوە کەوت، بەئاشکرا لەسەر روخساری دایكو باکم بەدیدەکرا. ئەو هەستەی من ئەزموونم دەکرد هەستێکی قوڵی چەسپاوی برینداربوونم بوو. چەندان هەفتە بەبێ رووداو تێدەپەڕین. هەندێجار، ئەو کاتانەی دایکم ئاسایی بە"ساتە میهرەبانەکان" ناوی دەبردن، ئەو دیاری بەسەرماندا ئەبەخشییەوە; بەنموونە ڕێگەی پێدەداین بە گەشتکردن بۆ دەرەوە. بەڵام دەشمزانی ئەم ساتانەدا چەندین مانگ لە ئازاردانو سەرئێشەو سزادانیان بەدوادا دێت.

کەواتە بۆچی مابوونەوە؟ ئەم پرسیارە دێتەڕێی تەواوی ئەو نەوانە لە خەڵك لەسەرانسەری جیهاندا کە دایكو باوکیان بەدەست سەرهەڵدانی دیکتاتۆریەتەوە ئازاریان چەشتووە. ئێستاو لەکۆتایدا کە دەتوانم رووبەڕووی ترسو تۆقانی ئەو ساڵانە ببمەوە لەگەڵ عەموّ بەسەرم بردوون، ژیرانەترین وەڵامێك بتوانم بیری لێبکەمەوە بۆ دۆخەکەمان ئەوە بوو کە دایكو باوکم فریوی پەیوەندییەکی هەڵەو دزێویان خواردووە. هەگیز نەمدەتوانی سەبارەت بەمە لەگەڵیان بدوێم، بەڵام من کاتێکی بێشومارم بەسەرنجدانیانەوە بەسەربرد کاتێك ململانێیان لەگەڵ ئەو پەیوەندییەدا دەکرد، بەشێوەیەك لە شێوەکان هەوڵی

پاراستنی هەندێك لە شكۆمەندیو هەستی خودێتی خۆیان دەدا ئەگەرچی تووشی شارەزایەكی دزێوی هەتاهەتایی هاتبوون. لەئاكامی ترسان لە ستەمكارییەكەی ئەگەر تاكە هەنگاوێكی هەڵەیان بناباو، بگرە ترسانی زیاتر لە تووڕەییەكەی ئەگەر هەڵبهاتنایە، ناچار وەك هاوسەری خراپو بەد رەفتاریان دەكرد. واتە پەتی پەیوەندییان زۆر باریكبوو بۆیە هەموو هەوڵێكیان بۆ رزگاربوونو مانەوەیان لەژیان بوو.

دایكوباوكم دەربارەی هەڵاتن لە عێراق قسەیان دەكرد، بەتایبەتی كاتێك من لەسەرەتای لاویدا بووم. راهاتبووم شەوانە درەنگ لەسەر پلەكانەكە دانیشتمو تەماشای رەنگە سەرسامكەرەكانی مۆزایكی رەشو سپیم بكەمو هەوڵبدەم لەو گفتوگۆ بەئازارو چپەچپە نزمانە سەردەركەم كە هەندێك ناوی تێدەكەوت نەمبیستبوون، لە داهاتووش كە دەیترساندمو گرنگ نەبوو بڕیاری چی لەسەر دەدەن. دایكم دەیگوت "هەستدەكەم باڵندەیەكم لەقەفەسدا. با دووربكەوینەوە، وەرە بڕۆین بۆ ئەمەریكا! مەحمود كە رۆیشت، ئیدی ئێمە بۆچی ناتوانین؟" پاشان باوكم بەدەنگێكی ژیرانە شتێكی لەم جۆرەی دەووت "تۆ دەزانیت ئێمە ناتوانین وا بەئاسانی ئێرە جێبهێڵین، عالیا. ئەمە وڵاتی خۆمانە. چی بكەین؟ لەكوێ بژین؟ پێتوایە بتوانین هەمان ئەم شێوازە ژیانە بژین گەر ئێرە جێبێڵین؟ دەتەوێت من بەیەكجاری بفڕمو لێرە بڕۆم؟ كەمێك واقیع بین بە، عالیا! تۆ رازیت لە ئەپارتمانێكی بچووكدا بژینو بە مەمرەو مەژی گوزەران بكەین؟ ئەی بنەماڵەكەمان چی؟ وادەزانی چییان بەسەردێت ئەگەر خۆمان بڕۆین؟ تۆ دەزانی چۆن ئەندامی خێزانەكان رووبەڕووی سزادان دەبنەوە گەر كەسێكیان ئێرە جێبهێڵێت. بەراستی دەخوازیت دەست بۆ ئەو مەترسییە بەریت؟ ئەوان چاودێری هەموو كەسێك دەكەن، بەتایبەتیش من. بەڕاستی باوەڕت وایە بهێڵن من بڕۆم؟".

لەوە دەترسام دایكم وەك باڵندەیەك لەقەفەسدا گوزارشتی لەخۆی دەكرد، بەڵام عێراق وڵاتی من بوو. بەغدام خۆشدەویست. دەنگی بانگوێژو ئەورەسەكانی رووبارو هەموو شوێنە ئاشناكانی منداڵیم خۆشەویست. نەمدەتوانی وێنای جێهێشتنی ئامۆزاو خاڵۆزاو هەموو خزمانو هاوڕێكانم بكەم. بەدەر لە عەمو، یاداوەری جوانی زۆرم هەبوون. مەگەر شەڕمان نەكردبوو بۆ ئەوەی رێگەمان

پێبدرێت بمێنینەوە؟ داخۆ دەبوو ئێمە وازبهێنینو وڵاتەکەمانی بۆ بەجێبهێڵین؟ ئەگەر جێمانبهێشتایە چیمان بەسەردەهات؟ باشە دەبوو لەدوای خۆمان ماڵەکەمان بەجێبێڵینو هەموو دارونەدارمان لەلایەن موخابەراتەوە ببرێت؟ ئەی بۆ کوێ بڕۆیشتمایە بۆ خوێندنگا؟

بیرمە دایکو باوکم کاتی گفتوگۆیان دەڵێی لەنێوان هەڵاتنو مانەوەی سەلامەتو زۆرەملێدا دەخولانەوەو هاتوچۆیان دەکرد. هیچ بڕیارێکی فەرمی مانەوەم بەیادنایەتەوە، بەس نەشدەڕۆیشتین. باوکم دەفڕی بۆ دەرەوەو منیش دەمامەوە بۆ چاودێریکردنی لێدانی باڵەکانی دایکم دژی بەربەستەکانی دەوری، جارجارێك هەوڵی هەڵاتنی لە قەفەسەکەی دەداو دەیویست لانەکەی جێبێڵێت. چەند جارێك دەستیم گرتووە کاتێك لە کابینە پزیشکییەکەی چێشتخانەکەماندا پەلاماری حەبەکانی داوە. پێم دەگوت "بوەستە، دایکە. ناتوانی ئەوە بکەی، دایکە. پێویستە ئەو کارە بوەستێنی". ئینجا هەوڵی تەواوم دەدا بۆ ئەوەی نەهێڵم براکانم لەو کاتانەدا دایکم ببینن. دەمبرد بۆ ژووری نووستنەکەی خۆیو یەکترمان لەئامێز دەگرت تا پێکەوە خەومان لێدەکەوت. دەمزانی چۆن خۆم بکەمە خەو. نووستن رێگایەکی ئاسان بوو بۆ دەربازبوون، هەمیشەش هیوایەکم هەبوو کاتێك بەئاگادێمەوە شتەکان گۆڕابن.

کاتێك چوومە قۆناخی ئامادەییو باوکیشم پێی دەنایە سێیەمساڵی وەك فڕۆکەوانی عەمو، باوکم لەگەڵ گروپێکی فڕۆکەوانیدا توانیان ریکۆردی فڕین لەجیهاندا تۆماربکەن. من ئێستاش کۆپییەکی کۆنی زەردی رۆژنامەی بۆینگم ماوە کە لەسەردێڕی هەواڵێکیدا نووسیویەتی: "لەوانەیە هێڵی ئاسمانی عێراقی 6Ø ٧٤٧ لە ئایارد# نزیك ببێتەوە لە ریکۆردی ΣAA". ئەمە هەواڵەکەیە:

گواستنەوەکانی بۆینگێکی ΣΠ٧٤٧ بۆ هێڵەکانی ئەفریکای باشوور لە مانگی نیسانی ١٩٧٦ تا ئێستا درێژترین گەشتە بێوەستانە ئەنجامدرابێت بە فڕۆکەی ئەفەربەری خێرا، بەڵام لە ٢٠ی ئایار ΣΠ٧٤٧ هێڵی ئاسمانی عێراقی لە گەشتێکی تایبەتدا لەو ریکۆردە نزیکدەبێتەوە. فڕۆکە عێراقییەکە لە تونسەوە فڕیوە بۆ تۆکیۆ لە ٢١٦½ کاژێردا ٩,٦٧٦ میلی بڕیوەو ئێستا پێگەی دووەمی هەیە. گەشتی فڕۆکەی ΣΣA، ١٧ کاژێرو ٢٢ خولەك درێژەی هەبووەو ١٠,٢٥٩ میلی لە سیێتڵ بۆ

کەپیتاون لە باشووری ئەفریکا بڕیوە. فڕۆکە عێراقییەکە لەژێر جڵەوی ...

ئەوان نەتەنها فڕینەکەیان بەبێ بەنزین تێکردنەوە ئەنجامدەدا بەڵکو کە دەنیشتنەوە هێشتا بەشی یەک کاتژمێر فڕین سوتەمەنییان پێدەما. ئەوە شتێک بوو بەهۆیەوە ڕێزی باوکمی لای فڕۆکەوانەکانی تر زیادکرد. کەچی هێشتا نیگەران دەردەکەوت کاتێک گەڕایەوە. ئەڕۆیشت بۆ کارو لەماڵەوە مایەوە بەو پاساوەی خێرابوونی لێدانی دڵی توشهاتووە. فڕۆکەوانەکان و ئەندامانی گروپەکە لەژووری میوانەکەمان کۆدەبوونەوە، بەدەنگی نزم لەگەڵ یەکتر قسەیان دەکرد، کۆبوونەوە خێزانییەکانی بیردەخستمەوە کە پێشتر دایکم و خێزانەکەی دەیانکرد کاتێک دەترسان لەوەی دیپۆرت بکرێن. ئاخۆ منیش لەمەترسی لەدەسدانی باوکمدا بووم؟ دەمویست لێی بپرسم کێشەکە چییە، بەڵام باوکم وەک دایکم بواری لێ نزیکبوونەوەی نەبوو. ئەمەش بەڕاستی بۆ کارەکەی پێویست بوو، هەرگیز سەبارەت بە عەمو قسەی لەگەڵدا نەدەکردم. دایکم بەردەوام خۆی لە پرسیارەکانم دەدزییەوە تا ڕۆژێک جڵەوی لەدەستداو پێیگوتم کە بابەت چییە: باوکم لەژێر چاودێریدا بوو بەهۆی ئەوەی ئاو لە تەوالێتی فڕۆکەکەدا نەمابوو.

"ئەو هیچ و پوچ و زۆڵانە!" لەیەکێک لەو ساتانەدا بەڕوونی بیرمدێت دایکم ئەمەی گوت چونکە زوو هەڵدەچوو، لێی زیادکرد "پێیان وابوو کەمتەرخەمی کردووە تا ڕادێتەرەکە ئاوی تێدا نەمێنێ، بۆیەش بەردەوام چاودێرییان دەکەن، گوایە سەلامەتی فڕۆکەکەی خستۆتە مەترسییەوە!"

ئەو زۆڵانە، داکیم مەبەستی پیاوە خێڵەکییە تکریتییەکانی عەموو ئەوانی تری وەک ئەوان بوو کە عەمو کارو پۆستی حکومی بەرزی پێدابوون. ئەمانە پیاوانی سمێڵ ڕەشی هاوشێوە بوون، وەک پۆلیسی نهێنی لەگەڵ هەموو گەشتەکانی باوکمدا بۆ چاودێریکردنی خۆی و گروپەکە دەنێردران، هەروەها چاودێری ئێمەشیان دەکرد کاتێک لەدەوروبەری عەمودا بووین. من لەم پیاوانە دەترسام، دایکیشم بەچاوی سوک تەماشای دەکردن، هەم لەبەر ستەمکارییان هەم لەبەر چینی نوخبەیی بازنەی دایکم. باوکم لەلایەن حسێن کامیلەوە، یەکێک لە ئامۆزاکانی عەمو، ڕووبەڕووی لێکۆڵینەوەیەک بوویەوە. عەمو یەکێک لە بەمتمانەترین ڕاوێژکارەکانی، ئاسایی خزمێکی خۆی، دادەنا بۆ چاودێری هاوڕێ و

دۆستە نزیکەکانی، وارێکەوت کامیل بۆ چاودێریکردنی باوکم دانرا. ئەو تەنانەت بڕوانامەی شەشی ئامادەیی نەبوو، کەچی عەمو کردبووی بەلێپرسراوی پرۆگرامی چەك و دروستکردنی کەلوپەلی سەربازی. دواتر و کاتێك لەساڵی ١٩٩٥ بەکۆمەڵێك فایلی ئاشکراکردنی پرۆگرامی چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی و ناوکییەوە کە خۆی سەرپەرشتی کردبوون بەرەو ئوردون وڵاتی جێهێشت، کامیل ناوبانگی سڕایەوە. من ئەوکات تەنها بەهۆی ستەمکارییەکەیەوە کامیلم ناسی: بەوە ناسراو بوو بەقامچییەوە دەڕۆیشت بۆ ئۆفیسەکەی، بەو قامچییەوە ئەکەوتە وێزەی ئەو ئەندازیار و دوکتۆرانەی سەرپەرشتی دەکردن.

جارێکیان، لەسەرەتای کارەکەیدا وەك فرۆکەوانی عەمو، عەمو راپۆرتێکی فەرمی بەباوکم دابوو کە لەلایەن حسێن کامیلەوە واژۆکرابوو، لەکاتێکدا لە دەریاچەیەکی ناو سنووری خانووەکانی مەزرا خەریکی راوەماسی ببوون پێی گوتبوو بەدەنگی بەرز بیخوێنێتەوە. راپۆرتەکە باوکمی بە "هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی" تۆمەتبارکردبوو، چونکە لەلایەك لە عەموەوە نزیك بوو هەم بەردەوامیش گەشتی بۆ دەرەوەی وڵات دەکرد.

دایکم وتی باوکم بە عەموی گوتووە "دەزانم من لەژێر بەزەیی تۆدام. دەتوانیت لەملم بدەیت ئەگەر بتەوێت. بەڵام تۆ دەزانیت من هەرگیز هیچ شتێك ناکەم زیان بە وڵاتەکەم بگەیەنێ".

عەمو پێکەنیبوو.

گوتبووی "بێخەمبە. دەزانم تۆ هیچ کارێکی هەڵەت ئەنجامنەداوە".

عەمو پۆلیسێکی باش بوو، بەڵام کامیل پۆلیسێکی خراپ بوو. مەبەستیان ئەوە بوو هەمووان بترسن و هەمیشە لەدڵەڕاوکێدا بن. کامیل بەوە ناسراو بوو نەتەنها ستەمکار بوو بەڵکو ئیرەییشی بەوانە دەبرد کە لە عەموەوە نزیك بوون. ئیتر عەمو پێشنیاری ئەوەی کردبوو کامیل بەدواداچوون بکات بۆ تۆمەتی ئەو شکانە بێ بایەخەی لە تەوالێتەکەدا کەوتبوویەوە، منیش لای خۆمەوە هەستم بەو ترسە دەکرد سەراپای ماڵەکەمانی داگیرکردبوو. تەنانەت هاوڕێکانی باوکیشم تۆقابوون کاتێك دەهاتن بۆ سەردانی. دواجار عەمو ناردی بەشوێن دایك و باوکمدا بۆ ئامادەبوون لە کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتیدا، بیرمە چەند گرژ بوون کاتێك

لەگەڵ یەکتردا چیەیان دەکردو خۆیان ئامادە دەکرد. دواتر دایکم پێی وتم، کاتێك عەمو لە باوکمی پرسی مەسەلەکە چی بووە، باوکم زمانی هەڵنەهات بدوێ.

وتی بەهەڵچوویی بە عەموی گوت "من هیچ ئارەزوم لە سیاسەت نییە. ناتوانم کاری سیاسی بکەم. هیچ کارێکی هەڵەشم نەکردووە، کەچی ئەوان دەیانەوێت بۆ بابەتێکی تەکنیکی چاودێری من بکەن کە هیچ پەیوەندییەکی بەسیاسەتو ئاسایشی نیشتمانییەوە نییە. دەزانم چۆن بەباشی کاری خۆم ئەنجامبدەم. من فڕۆکەوانم گەورەم، تەنها دەمەوێت بتوانم کارەکەم بەجێبگەیەنم".

عەمو گووتی "تۆ هەڵبژاردنت لەبەردەمدایە. دەتوانیت یان هاوڕێیەتی من هەڵبژێری یان ئەوە هەڵبژێریت کە فڕۆکەوانی من بیت. ئەگەر وەك فڕۆکەوانی من دەمێنیتەوە، پێویستە لەژێر لێکۆڵینەوەی کامیل پاك بێیتە دەرێ".

باوکمم دەهاتە پێش چاو، کاپتنی فەخری فڕۆکەیەکی ٧٤٧، وەستاوە لەتەنیشتی عەموەوە، زەندەقی چووبوو و خەریکبوو دەگریا، بەتەواوی لەژێر بەزەیی ئەودا بوو. باوکم، کە جگە لە فڕین هیچی تری نەدەویست، هاوڕێیەتی هەڵبژاردو مایەوە لەژیاندا. وەك کاپتنێك گەڕایەوە سەر کارەکەی‌و دواجاریش وەك سەرۆکی فڕۆکەوانی مەدەنی عێراقی دەستنیشانکرا. هەڵبژاردنەکەی راست بوو، بەڵام ئەوە کردەوەیەکی ئەهریمەنانە بوو. ئەگەر بیگوتایە دەیەوێت وەك فڕۆکەوانی ئەو بمێنێتەوە، عەمو رێگەی بە کامیل دەدا لە چاودێریکردنەکەی بەردەوامبێت، ئەوکات باوکم دەکەوتە ژێر بەزەیی شێتێکی رقلەدڵ کە عەمو بەئاسانی قسەکانی پشتگوێ نەدەخست. لەولاشەوە، کە هاوڕێیەتی هەڵبژارد، عەمو بەئاسانی دەیتوانی لەگەڵی باش بێت‌و پێی بڵێت، لەچی دەترسی، باسل؟ دەتەوێت کەڵك لە هاوڕێیەتی من بۆ هەڵاتن لە کردارە هەڵەکانت وەرگری؟ ج وەڵامێکی راست لەگۆڕێ نەبوو، تەنها بڕیارە پڕئازارەکانی سەراوژێرکردنی ژیان نەبێت کە هەر کەسێك پێشبینی دەکرد، چونکە لەڕاستیدا ئەو بڕیارانە هەرشتێك بوون لەو ساتەدا عەمو بیویستایەو بەخەیاڵیدا بهاتنایە.

هەموو پیاوەکان چاودێری یەکتریان دەکردو لەلایەن کامیل یان یەکێك لە کەسە بەمتمانەکانی عەموشەوە چاودێری دەکران. تووڕەیی عەموو چەشنی باوکم

ئەو پیاوانەشی دەگرتەوەو دەریکردن، لەهەرکوێ بان بۆ چەند مانگێکی کەم ژیانیان دەکەوتە مەترسییەوە پێش ئەوەی بگەڕێنرێنەوە بۆ بازنەی سەلامەتیو بکەونەوە ژێر بەزەیی عەمو، هاوکات سوپاسگوزاریش بوون لەوەی زیندوو مابوون. خاڵی جەوهەری ئەمە بوو: کەس لە مەترسی دوور نەبوو. هەرگیز. دەرئەنجام تەنانەت حسێن کامیل، راوێژکارەکەی، ئامۆزاکەی، زاواکەی، باوکی نەوەکانی، هەموو کوشتن.

لەکاتێکدا باوکم رووبەڕووی چاودێریکردن بووەوە لەلایەن حسێن کامیلەوە، من ئامادەی ئەو ئاهەنگانە دەبووم کە لەلایەن رەغەدی دەزگیرانی کامیلو کچی عەمووەوە رێکدەخرا. عەمو بڕیاریدابوو بیدات بە کامیل بەپاساوی سیاسیو خێڵایەتی، هەرچەندە رەغەد تەنها شانزە یان حەڤدە ساڵان بوو. کاتێک هاوسەرگیرییان کرد، رەغەد لەکۆشك خانووی خۆی هەبوو و من بانگهێشت دەکرام بۆ ئاهەنگو بۆنەکانی بەهەمان شێوەی دایکم، کە بانگهێشت دەکرا بۆ ئەو بۆنانەی لەلایەن دایکییەوە، واتە ساجیدەی هاوسەری عەمووەوە رێکدەخرا. ساجیدە لەگەڵ عەمو لەهەمان ئەو خانووەدا گەورە ببوون، هەروەك پوورە ساجیدە ئامۆزای عەموو کچی ئەو مامەیەی بوو کە هانیدابوو بۆ کاری سیاسیو خوێندنی بۆ فەراهەم کردبوو. ئەویش وەك دایکم مامۆستا بوو، ژنێکی بەهێزو بەتوانا بوو، بۆ ئەوکاتەی من دیم دوور لە مێردەکەی دەژیا. هەرگیز پێکەوە لەگەڵ عەمو نەمبینین، ئاسایی لە کۆشك بەجیا دەژیان.

رەغەد لەنێو سێ کچەکەی عەمودا گەورەترینیان بوو، نزیکەی ساڵێك لەمن گەورەتر بوو، ژنێکی لاوی دامەزراوی ژیر بوو، ئایدیۆلۆجی بەعسی لە قوتابخانەی کۆشك خوێندبوو. رەنا دوو ساڵ لەمن لاوتر بوو، خوشکە بەڕێزە ناوەندییەکەیان بوو. حەلا حەوت بۆ هەشت ساڵ لاوتر بوو، منداڵە لاسارەکە بوو هەمووان دەیانزانی عەمو زۆری خۆشدەوێت. لەگەڵ هاوڕێکانی، تەمارەو ساراو لوماو کچەکانی خێزانە دیارەکان، لەناویشیاندا ئەندامانی تیرەی عەمو لە تکریت، لە خوێندنگایەکی تایبەتی سەر بەکۆشك دەیانخوێند. نەدەبوو کچە تکریتییەکان لەگەڵ ئەوانەی دەرەوەی کۆشك تێکەڵ ببن، هەروەها لقێکی جیای زانکۆیی دامەزرا تا زەمانێك تەمەنیان گەورە بوو تیای بخوێنن. بیرمە رەغەد دەهاتە

خوارەوە بۆ ناو هۆڵە گەورەکان، بۆچوونی دەسەڵاتداریتی دەردەبڕی لەسەر ئەو شتانەی بەلای منەوە بەزۆری بێمانا بوون، وەك مۆدە. منو کچەکانی تر دوای دەکەوتین، کتومت دەتووت ئەو عەموەو ئێمەش پاسەوانەکانی بووین. راستی زمانی ئاماژەشی وەك هی باوکی بوو.

جگە لە قسەو قسەلۆك، مۆدە تاکە بابەتی گفتوگۆ بوو. بەوپێیەی هەرگیز رێگەیان پێنەدەدرا وڵات بەجێبهێڵن، کچەکانی هیچکات چانسی ئەوەیان نەبوو لە بۆتیکەکانی لەندەنو پاریس یان لە مۆڵەکانی ئەمەریکا کەلوپەل بکرن. بەڵام کەتەلۆگی هەموو مۆدەیەکی ئەم سەر زەوییەیان لەبەردەستدابوو، ئەمە ئەگەر باسی ئەوە نەکەین کە دەسەڵاتیان هەبوو بەئاسانی ئاماژە بۆ هەرشتێك بکەن کەسێك پۆشیویەتیو بڵێن "حەزم لەوەیە" ئیتر دەبوو جلپۆشەکە ئەو بەرگەی پێ ببەخشینایە. تەمارە وەك مۆدەترین کچی لاو لە گروپەکەدا، زۆرجار جلەکانی دەخوازران، هەندێك جار دەگەڕێنرانەوە هەندێك جاریش نا. پاش ئەوەی یەکێك لە جلەکانی لەلایەن بەرگدورێکەوە برابوو لەسەری دروستبکەنەوە، چیتر ئەو جلەی لەبەرنەکردەوە. داواکارییەکانی ساجیدە بۆ جلوبەرگ زۆرجار لەسەر دایکم یان ئەو ژنانە بوو کە دەیانتوانی گەشت بۆ دەرەوە بکەن، هەرچەندە وەك بیستبووم ساجیدە هەمیشە لەبیری دەکرد هەقی ئەو کەسە بگێڕێتەوە شتەکەی بۆ کڕیوە. لەژیانی عەمودا هەموو شتێك بۆ جوانترکردنی منداڵیی بوو، بەزێڕ، جلوبەرگ، کۆشكو تەلار. من تاڕادەیەك لەوە تێدەگەشتم. بەڵام چۆن ئەوە دەبووە پاساو تا کچەکانی هەمان رەفتار بکەن لەحاڵێکدا جگە لەخۆشگوزەرانی لەگەڵ هیچی تردا گەورە نەببوون.

هەر سەردانێك بۆ کۆشك وەك نمایشێکی مۆدە هەستی پێدەکراو ئێمە تێیدا پێشبڕکێمان دەکرد. ریسوایی بوو ئەگەر پۆشاکێکت دووجار لەبەربکردایە، هەروەها گاڵتەم لەگەڵ دایکم دەکردو دەمگوت، هەستدەکەم دەبێت بۆ هەموو سەردانێك ژێرکراسی نوێ لەبەربکەم نەوەك کەسێك لێم بپرسێت لەژێرەوە چیم لەبەردایە. لەیەکێك لەساتە پڕمیهرەبانەکانیدا، عەمو رێگەیدا بەدایکم بۆ سەردانێکی پزیشکی بچێتە دەرەوە، پوورە نەداو پوورە لەیلاش بەلایانەوە زۆر خۆشبوو کە رێگەی بەهەر سێکیانو منداڵەکانیشیان داوە سەفەربکەن. بڕی ١٠

هەزار دۆلاری بەهەریەکە لە ژنەکانو ئەندامانی خێزانەکانیان بەخشیو پێی وتن، شتی پێ بکڕنو بۆ خۆیان بەخۆشی کات بەسەربەرن.

مـن بەشـەوقەوە چـاوەڕوانی کڕینـی کـابۆو تیشـێتو هەنـدێك جلوبـەرگی گەنجانەی ترم دەکرد. لەبری ئەوانە، دایکم جلوبـەرگی فـەرمی خوێنـدنگاو جلی نووستنی مۆندیو ئیسـکاداو دیزاینـەرەکانی تـری بـۆ کـڕیم، لەناو ئـەو جلانەشـدا کۆتێکی لە کریستیان دوار بۆ کڕیم کە چەند ساڵێك لای خۆم پاراستم.

پـارەی دابینکـراو زۆر بـوو، بـەڵام نـرخ لێپرسـینەوەی لـەدوا نـەبوو. هـەموو ساڵێك، ئۆتۆمبێلێکی نوێی تیۆتا بۆ ئێمەو مارسیدسـی نـوێی بـۆ هەریەکە لـە دوو خێزانەکەی تر دەنارد. تامی هەناری داری هاوڕێیەکی کردبوو باسـیکردبوو چـەند باش بووە، ئەو هاوڕێیەی دوو سندوق هەناری بۆ ناردبوو، دواتر عـەمو گلـەیی کـرد گوایە بەشی نەکردووە، ئیـدی دارەکـان گشـت بـەرەکـەیان رامالـدران. عـەمو گلـەیی کرد بەخشینی بڕە زێڕەکەی خاڵە عادل بۆ هاوکاری جەنگ کەم بـووە، بۆیـە خاڵـە عـادل زیـاتری بەخشـی. دوای ئـەوەش عـەمو وتـی، پیـاوی دەوڵەمەنـد دەتوانێـت زیاتریش ببەخشێت. لەکۆتایدا خاڵە عادل ناچاربوو شتومەك بفرۆشێت بۆ ئـەوەی "بەخشـینەکەی" بەباشـی جێبـەجێ بکات. ئێمـە بـەردەوام دیـاری بـەنرخمان بـە عـەمو دەبەخشـی، بـەڵام هـەرگیز نـەمان بینـی هـیچ شـتێك لـەو دیاریانـەی ئێمـە بەکاربهێنێت جگـە لـە قـولاپی ماسـی گـرتن. هاوزەمـان، هـەر چـەند مـانگ جارێـك کۆشـکی نوێی بنیاد دەنـا. بینـای کۆشـکی گـەورە لـە بەغـدا باڵەخانەیـەکی شـێوەی ئوتێلی گرانو رازاوە بوو دواتر لەلایەن ئەمەریکاییەکانەوە وەك "ناوچەی سـەوز" داگیرکرا. خانووەکانی گەورە بوون، هـەروەها هۆڵەکانیشـی زۆر فـراوانو پـڕ چلچرا بوون. کەلوپەلو دۆڵابی چوارچێوە بەزێڕ روپۆشکراو لەهەموو شوێنێکیدا هـەبوو. فەرشـی ئێرانـی لەهـەموو هـۆڵو داڵانەکانـدا راخرابـوو، مێـزی قاوەخوارنـەوەو گوڵدانی کریستاڵ لەهەموو جێیەك دانرابوون. هـەموو شـتێکی زیـاد لـە پێویسـتی کەسێك ئامادەکرابوون.

پـوورە سـاجیدە دەسـەڵاتێکی فـەرمی بەسـەر رووداوەکـانی کۆشـکدا هـەبوو. ئــەبرۆکانی وەك خەنجــەری رەش لەناوچــەوانیدا کشــابوونو لەگــەڵ پرچــە زەردەکەیدا تەبا نەدەهاتنەوە. میوانەکان بـۆ لای ئـەو دەڕۆیشـتن، ئـەویش سـەری

قایلبوونی بەبێباکی بۆ دەلەقاندن ئەوانیش خەندەیان بۆ دەکردەوە. زۆرجار گۆرانیبێژی گاس دەکرد، بیرمە یەکێکیان ناوی سوعاد عەبدوڵا بوو گۆرانی نیشتمانی دەگوت و ژنی وەزیرەکانی دەوڵەت لەگەڵ کچە پێگەیشتووەکانیاندا لەدەوری ساجیدە سەمایان دەکرد، نمایشیان دەکرد بەو هیوایەی سەرنجی خۆی یان عودەی و قوسەیی کوڕی راکێشن، کە لەبازنەی کۆشکدا وەك شیاوترین لاوی زگورتی بەغدا دەبینران. کاتێك ژنە گەورەکان بەدەوری ساجیدەدا سەمایان دەکرد، کچەکانیشیان بەدەوری رەغەدو رەنادا سەمایان دەکرد، هەروەها کچە هاوڕێ بچکۆلانەکانی حەلاش بەدەوری ئەودا سەمایان دەکرد.

لەگەڵ دایکم دەبوو بەدەمەقاڵێمان و زۆرجاریش تا ئاستی گریان سەری دەکێشا، پێم دەووت، "بۆچی دەبێت من بڕۆم؟ رقم لێیە! من ئەوانم خۆشناوێت و ئەوانیش منیان خۆشناوێت".

دایکیشم پێی دەگوتم "بڕوانە زەینەب. من پێویستە خۆ بگۆڕم، پێبکەنم. پێویستە بڕۆم. مەگەر جگە لەوە دەتوانم چی بکەم؟ ژنانی تر هەمویان کچەکانیان لەگەڵ خۆیان دێنن و شانازییان پێوە دەکەن. کاتێك تۆ نایەیت، بۆ من زۆر ناشیرینە کە تاکە دایك دەبم بەبێ کچەکەی. ئەوە پرسیار دەهوروژێنێ. کچەکەم کێشەی چییە؟ کام جۆری دایکم کە کچەکەمم لەگەڵدا نەبێت؟ دەبێت بێیت، زەینەب. پێویستە خۆت بگۆڕیت و هەندێك مکیاژیش بکەیت. زۆرجار رەنگ زەرد دەردەکەویت".

ئیدی دەڕۆشتم، کچەکەی دایکم، بەخۆشییەوە ئەملاولای کچەکانیم ماچ دەکرد، وەك ئەوەی بەڕیکەوت لەشەقامێکدا یەکتریمان بینیبێت، دەمووت "چۆنی، رەنا؟ یان ئۆو رەغەد، چ جلێکی جوانت پۆشیوە ئەم شەو!" بەڵام نارەزایی خۆم بەڕێگایەکی تر دەردەبڕی. لەبری شێوازی رازاوەی هەشتاکان و وەك کچەکانی تر جلێکی خۆڵەمێشی یان سپیم دەپۆشی. رەتم دەکردەوە مکیاژ بکەم یان کات بەخاوکردنەوەی قژە لولەکەمەوە بەفیڕۆ بدەم. زۆرینەی کات، لەلایەکەوە کورسییەکم دەدۆزییەوە و بۆ چەند کاتژمێر تەماشام دەکرد، کەسێکی جیاواز بووم، پێم سەیر بوو بۆچی بانگهێشتکراوم، هەروەها هیوام دەخواست ئەوەندەی لەناخما نیگەرانم بەسیمامەوە دیارنەبێت. ژنەکان پێکەوە سەمایان دەکرد وەك

چۆن راهاتبوون لە ئاهەنگەکانی باخچەکەی دایکمدا خۆیان بادەدا، بەردەوام دایکم هەوڵیدەدا وەك ساراو لوماو تەمارە، بەشداری بەمنیش بکات. جارێك هات بۆ لام و پێیگوتم پێبکەنم و چەپڵە لێبدەم کاتێك سرودی نیشتیمانی دەوترێ.

خەندەیەکی گەورەی دەسکردم بۆ کردو پێموت "من خۆ پێدەکەنیم، دایکە!"

ئەویش وتی "تۆ زیاتر وادەردەکەویت وەك بۆنی شتێکی پیس بکەیت. پێبکەنە وەك ئەوەی مەبەستت بێت پێبکەنی، زەینەب".

وتم "باشە، دایکە". هەستام و سەمامکردو چەپڵەشم لێدا.

لەنێوان خانووی مەزراکەو کۆشکدا، هەستم دەکرد نمایشکارێکی جلوبەرگ بم بۆ وێنەی یەك لەدوای یەك دەوەستام بۆ سەر بەرگی هەندێك گۆڤاری مۆدە، هەموو جارێك خۆم دەگۆڕی و بەردەوام خەندە لەسەر لێوم بوو، بەڵام بەتەواوی بێدەنگ بووم. لەمێشکمدا، زیندەگی خۆمانم وەك "ئەم ژیانە دەسکردە" وێنا دەکردەوە.

پوورە ساجیدەو کچەکانی تەنها یەکجار هاتن بۆ سەردانی ئێمە. ئەو جارەش لە خانووی مەزراکە بوو. دایکم تەواوی ئەو رۆژە بەدروستکردنی خواردن و خۆش دەرکەوتنی ماڵەکەمانەوە بەهەموو توانایەکییەوە خەریکبوو. چێشتلێنەرێکی زۆر باش بوو ئەگەر کاتی بۆ تەرخانبکردایە، ئەو رۆژە سەبەزی نەنەی دروستکرد، کە چێشتێکی تایبەت بوو داپیرەم خۆشی سازدەکرد. برنج بنچینەی هەموو خواردنە عێراقییەکان بوو، زۆرجاریش شلەیەکی سەوزەو گۆشت لەگەڵ بەهارات، جۆرەها گیای تر یان لیمۆی ترشی وشك، یانیش وەك سەبەزی سپێناخی تێدەکرا. ئەو شەوە، کاتێك لەدەوری مێزی خواردن دانیشتبووین، دایکم خەریکی دانانی خوانی نێوارە بوو بۆ پوورە ساجیدە وەك میوانێکی بەڕێز، پوورە ساجیدەش تەماشای دایکمی بەدیقەتێکی رقناسای کەسێکەوە دەکرد، دەزانێ ناکرێت پرسیاری لێ بکرێت.

تێبینی ئەوەی کرد "ئۆۆ، عالیا، سەبەزیت بەشێوەی ئێرانی سازکردووە".

دڵۆپەی بچووکی ئارەقم لەسەر لێوی سەرەوەی دایکم دەبینی، هەمیشە کاتێك دروست دەبوو کە شڵەژاو یان شەرمەزار دەبوو. دایکم هەڵەی کردبوو.

دایکم وەك بەردەوامبوو لە خزمەتکردنو قاپ دانان بۆ رەناو رەغەدو پوورە نەداو خێزانەکەی، بەدەمارگرژییەوە وتی "نا، لەڕاستیدا نەخێر. تەنها لەگەڵ سپێناخەکەدا هەندێك سەوزەی ترم بۆ زیادکردووە".

من لەو نیگا رەتکەرەوە بەدەسەڵاتەی پوورە ساجیدە تێگەشتم. زانی ئەوەی وتوویەتی بەسە بۆ ترساندنی دایکم. ئەوەی ئەو دەبوو بیکات بیرخستنەوەی دایکم بوو کە "فایلێکی تایبەت"ە. زکم بۆ دایکم دەسوتا. پاش ئەو هەموو کارەی، لەناکاو ئێوارەکەی لێدزرا. دەمزانی کە نابێت ئێمە گوێ لە مۆسیقای فارسی بگرین یان بستەو فستەقی ئێرانی بە پەسەند بگرین. باشە دەی تەنانەت سەبەزییە بەتامەکەی دایکیشم هەر قەدەغەبوو؟

بەڵێ، بەم شێوەیە حەزم لێیەتی، پوورە ساجیدە! من بەبێ دەنگی لەناو سەری خۆما دژی دەوەستامەوە، بەو شێوەیەی لەگەڵ محەمەد کردم کاتێك بەهۆی شیعە بوونمەوە سوکایەتی پێکردم. ئەوە لەهەموو ئەو شتانە خۆشترە کە تۆ لە کۆشك پێشکەشی دەکەیت!

رۆژێکی تەواو خۆشبوو لەملاو ئەولامانەوە: منو رەغەدو رەنا ئەوەندە پەرۆشی یەکتر نەبووین تا بۆخۆمان پێکەوە کات بەسەربەرین، بۆیە لەگەڵ دایکماندا دانیشتبووین. پوورە ساجیدە دایکمی لەکەدار کردبوو. حەلاش فەرمانی بەپاسەوانە تایبەتەکانی کردبوو وەك تۆپێکی یاریکردن لەبرا بچوکەکەم بدەنو هەڵیبدەن لەبەرچاوی منداڵەکانی تردا، لەترسی ئەوەی دۆخەکە خراپتر نەبێت دەستم نەخستە ئەو بابەتەوە. پاش ئەوەی ساجیدەو دەستوپێوەندەکەی رۆیشتن، تەماشامکرد حەسەن لەژوورەکەیدا دەگری. لەوکاتەدا تەمەنی تەنها پێنج یان شەش ساڵ بوو، بەڵام دەیزانی نابێت بێتە ناو هۆڵەکەوە کاتێك هەمووان لەوێ دەبوون، بۆیە لەژوورەکەی خۆیدا دەرگای لەخۆی داخستبوو دەگریا. کاتێك بەسەرهاتەکەی بۆگێڕامەوە، ئەوەندە تورە بووم ویستم شتێك بکەم بۆ ئەوەی وانەیەك فێری حەلا بکەم، بەڵام دەمزانی ناتوانم. ئەو کچی سەرۆك کۆمار بوو هەمووان بەهەمان شێوەی براکانیو خوشکەکانیو دایكو باوکی لەویش دەترسان.

عەمو لە خواردنی هەرشتێك لەلایەن کەسی ترەوە ئامادەبکرایە پارێزی دەکردو متمانەی نەبوو، بەڵام بۆ خواردنی گۆشت بەرخی ئامادەکراوی دەستاوی

ـ یکم جیاکاری دەکرد. جارێك لەسەر داوای ئەو دایکم هەموو خواردنی ئێوارەی ڕەمەزانی سازکرد، ئێمەش هەموومان لە خانووی مەزراکە چاوەڕوانی ئەومان ـدەکرد لەو سات‌وکاتەدا هەواڵی نارد کە ناتوانێت ئامادەبێت، بەڵام داوای لە دایکم کرد داخۆ دەتوانێت گۆشت بەرخی لێنراوی بۆ بنێرێت؟ دایکیشم گۆشتەکەی گشت بۆ ناردو ئەو ئێوارەیە بە زەڵاتەو خواردنی لاوەکی ڕۆژوومان شکاند. زۆر حەزی لە گۆشت بوو، ڕۆژانە مەڕی نوێی بۆ سەردەبڕرا. کاتێك لەیەکێك لە خانووە مەزراییەکانمان بۆ خوانی ئێوارە بەشداری لەگەڵدا کردین، چێشتلێنەرەکانی خۆی، خواردن، قاپو دەوری، مێز، چێشت تامکەری تایبەتی خۆی حەننا، ستافی چێشتخانە، کە زۆرینەیان مەسیحی بوون لەگەڵ خۆی هێنا. وەك زۆرێك لە سەرکردەکان بەدرێژایی مێژوو، متمانەی بە کەمینەیەك هەبوو هەروەها تێبینی تایبەتی خۆشی لەسەر بوو چونکە ئەوانە ئەگەری ئەوەیان نەبوو لەگەڵ دانیشتوانی زۆرینە پیلان بگێڕن بۆ خیانەت لێکردنی.

ئێوارەیەك پاش ئەوەی عەمو بۆ نانی ئێوارە لە خانووی مەزرا لەگەڵمان ئامادەبوو، دایکم لەگەڵ ئەوەی خەندەیەکی گەشی بچووك لەسەر ڕوخساری بوو، چرپاندی بەگوێمدا "سەیرکە چیم دۆزییەوە!" بەپەلە چەتاڵەکەی عەموی هەڵگرت. شتومەك‌و قاپی نانخواردنەکەی سێ بەقەدەر قەبارەی ئاسایی گەورەتر بوون‌و سەری هەڵۆیەکی عێراقی لەسەر دەسکەکەی بوو. ئەم چەتاڵە نزیکەی قەبارەی کەوگیرێکی هەبوو کە بۆ برژاندنی خواردن‌و پاچەی گەورە بەکاردەهێنرێت. هێشتا ئەو چەتاڵەم هەڵگرتووە، تەنها بەڵگەی یادگاریی پشووە بێکۆتاکانی هەینیی ئەو خانووەی مەزرایەو لە چەکمەجی چێشتخانەکەمدایە.

خواردن زۆرجار بابەتی مشتومڕ بوو لەبری ئەوەی بۆ ئاسودەیی بێت. لە کۆبوونەوەیەکی خێزانی لەگەڵ عەمودا، پوورە لەیلا خۆشحاڵ بوو کاتێك بینی ترێ لەسەر مێزەکە پێشکەشکرابوو. وتی "ماوەیەکی درێژە ترێم نەبینیوە. ئەو ڕۆژانەم بیردەخاتەوە کە لە ئینگلتەرا بووم!"

عەمو بە توڕەییەکی بێڕەحمانەوە تەماشایەکی کرد.

بێشك نەیدەزانی زۆرینەی عێراقییەکان حەزیان لەو جۆرە تام‌و چێژو خۆشگوزەرانییە نییە، وتی "مەبەستت چییە ترێی وات نەبینیوە؟ ئەوە ترێی

بازاڕی عێراقە. هەموو عێراقییەك بەئاسانی دەستی دەکەوێت".

غەمزەیەکی شیرین کەوتە سەر روخسارە جوانەکەی. پوورە لەیلا بەهۆی ئەو ترێوە رووبەڕووی ترس بووەوە.

من دڵنیام ئەگەر تێبگەشتیتایە لەو شێوازەی پێشبڕکێی لەنێوان "کەسە خۆشەویستەکان"ی وەگەڕیخستبوو، تێدەگەشتیت چۆن بۆ ماوەی سیو پێنج ساڵ لەدەسەڵاتدا مایەوە سەرباری ئەوەی ملیۆنان لە خەڵکەکەی رقیان لێی بوو و پیلانی ناوخۆییو نێودەوڵەتیش بۆ کوشتنی لەئارادابوو. "کۆبوونەوە خێزانییەکان"مان مشتێك بوو لە خەرواری ئەوەی چۆن عەمو ترسو تۆقانی لەناو حزبی بەعسو پاسەوانی کۆماریو تەنانەت پۆلەکانی ئێمەشدا لە خوێندنگا بڵاودەکردەوە. چێژی لە بەگژیەکدادانی خەڵك وەردەگرت—ژنو مێرد دژی ژنو مێرد، هاوسەر دژی هاوسەر، منداڵ دژی منداڵ. ئەگەر بتویستایە لەیارییەکەدا بمێنیتەوە—لەمەدا دایكو باوکم هیچ هەڵبژاردنێکیان نەبوو—پێویستبوو پێشبڕکێ بکەیتو لەبەر خواستی ئەو بەوشێوەیە بمێنیتەوە—باوکەکان بەگوێڕایەڵییانو "بەڵێ گەورەم"، دایکەکان بەنازکردنیان، منداڵانیش بەخەندەی خۆشەویستییانەوە بەردەوامبن. ئەمە جگە لەوەی بە بەردەوامی چاودێریکردنو لەسەر یەکتر کوتانیشی تێدابوو. بە تێپەڕینی زەمەن من ئەو سێ کچەی ترم خۆشویست، بەڵام هەر بەتەنها مامەوە چونکە ئەو ڕەهەندە گرنگەی لەهاوڕێیەتییەکەماندا نەبوو متمانە بوو.

تەنانەت منداڵانیش هاندەدران تا لەسەر یەکتر شتی خراپ بڵێن. پاشنیوەڕۆیەك لەخانووی مەزراکە سەروەختێك حەسەن پێنج تا شەش ساڵ زیاتر نەدەبوو، لەناکاو وتی "لا الە الا اللە، محمد رسول اللە وعلی ولی اللە" یەکسەر خوشکە بچوکەکەی سارا رایکرد بۆ لای دایکی، واتە پوورە نەدا، سونە بوو بۆیە منداڵەکانی فێرکردبوو کە ئەو بەشەی دەربارەی عەلییە قەدەغەیە بگوترێت.

کچە بچوکەکە بەدایکی وت "دایکە، ئەو شایەتومانەکەی هەڵە وت".

حەسەن سەیری دایکمی کرد، پەشۆکابوو.

پرسیاریکرد "راست وتم، مەگەر وانییە دایە؟"

جۆرێك لەباری نائاسایی دەروونی لەموبەقەکەماندا لەنێوان دایکمو پوورە

نەدادا هاتەکایەوە، ئیدی دایکم نەیتوانی ئەو دڵنیاییە بە حەسەن بدات. پاشان هەریەکە لە دایکەکان بە منداڵەکانیان وت دواتر روونیدەکەنەوە، هەروەها پوورە نەدا بەرێزەوە داوای لێبوردنیکردو منداڵەکانی بردەوە بۆ خانووەکەی خۆی لە مەزراکە. من رامکرد بۆ لای حەسەن بۆ ئەوەی لەئامێزی بگرمو دڵنیای بکەمەوە کە ئەو شتێکی راستی وتووەو لەکۆتاییدا سونەو شیعە هەموو هەر مسوڵمانن، تەنها جیاواز گوزارشت لە رای خۆمان دەکەین. من خۆم بە پارێزەری دەبینی. نەمویست ئازاربخوات بەو چەشنەی من لەلایەن محەمەدەوە ئازاردرابووم.

دایکمو پوورە لەیلا زۆر لەیەکەوە نزیك بوون، پوورە لەیلا پێی وتبوو کە یەکێکی تر لە پوورەکانم، ئەو ژنەی کە دایکم زۆر خۆشیدەویست، شتێکی خراپی بە عەمو وتبوو سەبارەت بەدایکم. ئەو رۆژە دایکم بەگریانەوە هاتەوە بۆ ماڵ، چیتر متمانەی بەخەڵك زۆر کەمبوو. من حەزم نەدەکرد بەوشێوەیە بیبینم، بەڵام ئەو کێشەیەش وەك هەمان کێشەکانی تر وەهابوو، دواتر لە هۆکارەکانی دایکم تێگەشتم.

پاشنیوەڕۆیەك کاتێك دایکم لەماڵی پوورە نەدا گەڕایەوە پرسیارێکی لێکردم "باوەڕدەکەیت ئەمڕۆ باوکت چی کردووە؟ ئێمە لەدەوری عەمو دانیشتبووین ئەویش بەدەوری بازنەکەدا هاتو پرسیاری لە هەریکەمان کرد خۆشەویستترین کەسمان کێیە، باوکت وتی تۆ! باوەڕ دەکەیت! تۆ بوویت! کچەکەی! نە من بووم، نە دۆستەکەشی!"

دەبوو چی بکەم؟ هاوخەمی بم چونکە باوکم وتبووی منی خۆشدەوێت؟ من نەمدەزانی ئاخۆ ئەوە میهرەبانی راستی تایبەتی عەمو بووە یان بەگژدادان یان پرسیارێکی تەواو دڵپاکانە بووە لەنێوان هاوڕێکاندا. تەنها ئەوەندەم دەزانی هەرچی بکات کێشەیەك دەخاتە ناو هاوسەرگیرییەکەی دایكو باوکمەوە کە پێشتر تێیدا نەبووە. هەرچەندە هیچ کەسێك نەیدەتوانی رەخنەی لێ بگرێت، بەڵام ئەو دەیتوانی رۆڵی کەسێکی باشیش وازی بکات: وەك ناوەندگیرو ئاشتیگێڕ. دواتر دایکم دەستەواژەیەکی پێگووتم کە بۆ ئەو ستراتیژەی عەمو بەبیریدا هاتبوو ئەویش "لێکتەرێزکردن و سەروەریکردنیان" بوو. بەڵام ئەگەر ئەو بەباشی لەوە تێگەشتبوو، من پرسیار لەخۆم دەکەم کاتێك دەمەوێت سوود لە ڕابردوو بەرم،

دەی کەواتە بۆچی دایکم بەو شێوەیە کەوتە داوەکەوە؟

پاش ئەوەی فشار خرایە سەر باوکم بۆ هەڵبژاردنی هاورێیەتی عەمو لەبری فرۆکەوان بوونی، پێویستبوو فرینەکانی کەمبکاتەوە چونکە لێی چاوەڕواندەکرا بۆ بۆنە گشتییەکان هاورێیەتی عەمو بکات، هاوکات لە وێنە رۆژنامەیی و کامێرا تەلەفزیۆنییەکانیشەوە دەردەکەوت وەك چۆن پیاوەکانی تر نیشاندەدران. رێدەکەوت کاتێك من بەتەلەفۆن لەگەڵ هاورێکانم قسەم دەکرد، دەنگێك لە کۆشکەوە دەهاتنە سەر خەتەکەو فەرمانی پێدەکردم دایخەمەوە چونکە سەرۆك کۆمار دەیویست قسە لەگەڵ باوکمدا بکات. یان تەلەفۆنەکە لەکاتی نانی نیوەڕۆدا زەنگی لێدەدا، باوکیشم پێداویستیو شتومەکی بۆ گەشتێکی خێزانی ئامادە دەکرد. دەنگەکە دەیووت "لەماوەی چارەکێکدا ئامادەبە، جانتای سێ رۆژ ئامادەکە" ئێمەش بەپەلە شتەکانمان کۆدەکردەوەو خۆمان ئامادە دەکرد. مارسیدسێکی رەشی جامتاریك دەهاتە کۆڵانەکەمانەوە، ئێمەش سەردەکەوتین و پەیوەندیمان بە کەژاوەیەکی ئۆتۆمبێلی مارسیدسی رەشەوە دەکرد کە لەسەر رێگای گشتی بەخێرایی زیاتر لە ١٢٠ میل لەکاتژمێرێکدا دەڕۆیشتن. من پێشتر هەرگیز لەژیامندا ئەوەندە خێرا لێخوڕینم نەکردبوو. لەبەر هۆکاری ئەمنی، هەرگیز پێمان نەدەوترا بۆ کوێ دەڕۆین. زۆربەی جار من ناوی شوێنەکانیشم نەدەزانی، هەندێکیان تازە کۆشکی ناوەدانو هەندێکی تر چۆڵکراوبوون، هەنێکیان بەرفراوانو وەك خانووی ئاسایی بوون، هەریەکەیان بەشێوازو ستایلی جیاواز دیکۆریان بۆ کرابوو عەمو هەرگیز لە نیشاندانیان ماندوو نەدەبوو.

لەیەکێك لە کۆشکەکان، چاوم بەکڵاوی ئاسنی دیکۆریی کەوت لەسەر دەرگاکان کە مۆنۆمێنتێکی زۆر گەورەی هونەری دەستی لە بەغدا بیردەخستمەوە لەسەر دەستی عەمو بنیادنرابوو، تۆڕێکی پڕ لەخودەی سەربازە ئێرانییە کوژراوەکانی لەخۆگرتبوو. ئەم دیکۆرانە بەڕیزی سیانی وەك گێلاس لەسەر دەرگاکان هەڵواسرابوون، هەمان قەبارەی ئاساییان هەبوو لە زێڕیش دروستکرابوون. کاتێك تەماشام دەکردن، لەپڕ کەوتمە بیری ئەوەی ئەو زێڕانەی بەخشیمان توێنراونەتەوە بۆ دروستکردنی ئەمانە، من دڵنیابووم لەوە. تێگەشتم کە ئەو پارچە زێڕانە بۆ کەمکردنەوەی ئازاری خەڵکی عێراق کۆکرابوونەوە.

مەگەر نازانی خەڵك لەم جەنگەدا ئازار دەچێژن و دەمرن؟ خۆم لە هەلۆیستێکدا بینییەوە لەمێشکمدا پرسیارم لە عەمو دەکرد. چۆن دەتوانی بەخشینەکانمان لەم شتانەدا بەکاربهێنی؟ دراوە کانزا عەباسییەکەی ملی دایکم لێکەیتەوە کە باپیری پێی بەخشیبوو نیشانەی مێژووی لەخۆگرتبوو؟ یان ئەڵقەی هاوسەرگیری بتوێنیتەوە کە ژنان بە قوربانییان کردبوو بۆ یارمەتیدانی سەربازەکانمان؟

دواجار تێگەیشتم کە ئەو شتەی لە ئێمەی وەردەگرت ئەوەندە بەنرخ بوو، لەڕووی دەروونییەوە ئازاری دەداین. نەك تەنها دراوە عەباسییەکە، کە هیچ ئەرزشێکی نەبوو بەلایەوە، بەڵکو ئەو بەهایەی لە ئێمە دابوو و دەیووت زۆر بەنرخن: پێکەنینەکەی دایکم، باڵەکانی باوکم، هەروەها ئەوەی کە دایکم هەندێك جار عەموی بە "گیانەکەم" ناودەبرد بەهەند نەدەگرت. لەبەرامبەریشدا، ئەو دیاری گەلێکی پێشکەش دەکردین کە تەنها سامانەکەی و کۆنترۆڵی خەزێنەی نیشتیمانی دەردەخست. باوکم دۆلابێکی پڕ لەچەکی هەبوو تەنها کاتێك بەکاریدەهێنا کە لەگەڵ عەمودا راویدەکرد. دایکیشم سێتێك خشڵی ئیتالی جوانی هەبوو، بەڵام من ئامادەبووم هەمووی ببەخشم تەنها لەپێناو ئەوەی جارێکی تر دراوە عەباسییەکە لە ملی دایکمدا ببینمەوە.

ئەو سەرکردایەتی وڵاتێك، جەنگێك، سوپایەك، حزبێکی سیاسی و یەکێك لە گەورەترین ئابوورییە ئەوتییەکانی جیهانی دەکرد، کەچی کاتی دەدۆزییەوە بۆ بەوردی لەبەرچاوگرتنی ئەو ئەرکانەی دەیدا بەسەرماندا. بیرمە گەشتێکمان بۆ شاری کۆنی موسڵ کرد، کە دەروازە بوو بۆ کوردستان لە باکوور، لەوکاتەدا تەمەنم حەڤدە یان هەژدە ساڵان بوو. بەئۆتۆمبێل لەرێگایەکی شاخاوییەوە رۆیشتین بۆ خانوویەکی مۆدێرنی سەر شاخێك دیمەنێکی زۆر جوان، کە دەیڕوانی بەسەر شارەکەدا لەبەردەمیدا ئاوەڵا بوو. بیرمە قاپێك ویسکی شیفاس ریگاڵ لەناوەڕاستی مێزێکدا لەبەرهەیوانێکی مۆدێرنی فراواندا دانرابوو، ئەو شەوە کە گەیشتینە ئەوێ گەورەکان زۆریان خواردەوە. کاتێك عەمو دەیخواردەوە، فشار دەخرایە سەر ئەوانی تریش تا بخۆنەوە. دایکم حەزی لەخواردنەوە نەبوو تا سەرمەست دەبێت و وادەردەکەوت وەك ئەوەی بیەوێت بگری، ئەمەش ئەوەی نیشاندەدا کە چۆن هەمیشە کەول کاری تێدەکرد. لەگەڵ تێپەڕینی کات، باوکم

دەیویست واز لەخواردنەوە بهێنێت بۆیە لەهەمووکات گرژترو جدیتر دەردەکەوت. ئەوانی تریش بەدەنگی بەرزو تێکەڵ قسەیان دەکرد، پیاوەکان وەك عەمو فستەقیان دەخواردو بەئێمەیان دەووت منداڵەکان بۆ دەرەوە. بەچاوتێبڕین ئێمە گەورەکان هەوڵماندەدا منالەکان وەدەرنێین تا دایكو باوکمان بەو شێوەیە نەبینن.

عەمو تا زیاتری بخواردایەتەوە زیاتر شادمان دەبوو. قەت نەمبینی رەفتارێکی سەرخۆشانە بکات. وادەردەکەوت خواردنەوە زیاتر دەیگەشێنێتەوەو شەوق‌وزەوقی پێدەدا. هەندێك جار ساتە میهرەبانەکانی ئەوکاتانە بوون کە دەیخواردەوە، هەروەها کەمترین دەرفەت هەبوو بۆ ئەوەی راستگۆیانە شتێکی پێ بڵێی. جارێکیان، کاتێك باسی ئەوەی دەکرد کە چەندە ناسودەیی لە بەرنامەی "رۆژانەی گەل" وەردەگرێت، ئەو رۆژانەی یارمەتی چارەسەری کێشەکانی هاووڵاتی ناسایی دەدا، وەك ئەو ژنانەی کێشەی دژواری جیابوونەوەو میراتگریان هەبووە، پوورە لەیلا هاتە دەنگو پرسی بۆچی لەباتی ئەوە یاساکان ناگۆڕێت تا ژنان پارێزراوبن. وادیاربوو تەواو گوێی گرتبێت، ئەو رۆژە پوورە لەیلا ویستی هەلەکە بقۆزێتەوە بەئاراستەی باشترکردنی بارودۆخی ژنان لەیاسای باری کەسێتی لەهەشتاکاندا، هەرچەندە ئەو کوشتنی بەناوی شەرەفەوە لەنەوەدەکاندا بەیاسایی کرد، کە رێگەی بەپیاوان دەدا بە کوشتنی مێینەکانی خێزانەکانیان لەحاڵێکدا ببنە مایەی لەکەدارکردنی ناوی خانەوادەکەیان.

پاش ئەوەی لەدەرەوە بۆ ماوەیەکی درێژ سەرقاڵی خواردنەوە بوون، عەمو هەستایە سەر پێو ئاماژەی کرد پێویستە برۆینە ژوورەوە. کەس پرسیاری نەکرد بۆچی. "بڕیاردان‌و ئەنجامدان، پاشان تاوتوێکردن" دواجار ئەمە دروشمی بەعسییەکان بوو. هەرئەوەندەی لەدوو ژووری نووستنی تەنیشت یەکدا دانیشتین، پێی راگەیاندین بەنیازە ئاهەنگێکی پیانۆ لێدانی خێزانی بگێڕین. یەکەمجار بانگی منی کردو پاڵی دایەوە بحەسێتەوە، ئامادەبوو خۆشحاڵبکرێت لەلایەن خۆشەویستەکانییەوە. بلو دانیوب والتزم لەیادبوو، بۆیە ئەوشەوە ئەو مۆسیقایەم ژەند. بەپانزە بۆ بیست ئەندامی ئەم خێزانە دروستکراوە دەوورەدرابووم، شڵەژا بووم، بەڵام ژەنینەکەم بەبێ هەڵە ئەنجامدا. کاتێك تەواومکرد، عەمو تەنها

چەپڵەی لێنەدا—نازانم بۆ بەڵام بەڕوونی لەیادمە—بەهێواشی چەپڵەی لێداو وەستانی ڕیزی لەنێوان هەر چەپڵەیەکدا دەکرد: چەپ ... چەپ ... چەپ. کاتێك شتێکت دەکردو دەبووە هۆی سەرسوڕمانی عەمو، چاوەکانی دەدرەوشایەوە بۆت. هەموومان دەمانزانی نیگای چاوە گەشاوەو تەماشاکردنی تایبەتی خۆی بۆ خۆی خەڵات بوو، وەك ئەو پارەیەبوو لەترسی لەناوچوون دەیخەیتە بانکەوە. ئەو شەوە من ئەوەم بەدەستهێنا، واتە باشترین نیگای خۆشەویستی ئەو تا ئەوکات بینیبێتم. پاش ئەوەی تەواوبووم، بانگی لوماو تەمارەی کردو ستایشی ئەوانیشی کرد. پاشان هەستایە سەر پێ، ئاماژەی کرد کە ئامادەیە بۆ نانی ئێوارەو ئاهەنگەکە کۆتایی هات.

بەڵام پیانۆژەنەکەی تر کە سارا بوو لەپشت قەنەفەکەوە بەجێما. وابزانم عەمو زلەیەکی لێدابوو. بۆچی لەخۆوە سەرزەنشتی کردبوو؟ سارا لەگەڵ عەمو گەورە ببوو. ئەو وەك مامی ڕاستەقینەی بوو، من هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە سارا بەڕاستی ئەوی خۆشدەویست. بەپەرۆشێکی زیاد لەهەریەکە لە منداڵەکانی تر پێشبڕکێی بۆ خۆشەویستبوونی لای عەمو دەکرد، لەڕادەبەدەر گوێڕایەڵ‌و ئامادەبوو. ئەو سەرکەوتنانەی لەپێشبڕکێکاندا من بەدەستم هێنابوون لە پەنجەکانی دەستێك تێنەدەپەڕی. گرنگترین سەرکەوتنم لەژێر بەخشینەکەدا بوو کاتێك تەمەنم شانزە ساڵ بوو. سارا تەواوی ئەو شەوە نەخەوتبوو و هۆنراوەیەکی ڕەسەنی لەبەرکردبوو کە باوکی بۆی نووسیبوو بەشێوەیەکی تەواو بۆ کامێراکانی ناردبوو. خەندە پلاستیکییەکەم فڕێدا، بەڕوونی ناوی "سالبی"م بۆ مایکرۆفۆن بۆ بەدەستهێنانی ئابڕومەندییەکی باش بۆ خێزانەکەم ئاشکراکرد، هەروەها لەخۆوە کەمێك لەهەستی پەرۆشی تایبەتی دڵم بۆ وڵات‌و سەربازەکانمان لەبەرەی جەنگ‌و عەموش دەربڕی. پاشان عەمو بە سارای وت کە ئەو "باش"ە، بەڵام بەهەمان دەنگی هێواش‌و سەنگین بەمنی وت "زۆر ... زۆر ... باش بوویت".

تەنها یەکجار بینیبووم سارا هەڵەی کردبێت، ئەوەش کاتێك بوو چەند مانگێك پێشتر پێکەوە بووین. باوکی بەئاشکرا لەڕۆژنامەدا ڕەخنەی لێگیرابوو، ساراش تێنەدەگەشت کە هیچ شتێك لە ڕۆژنامە بڵاونابێتەوە بەبێ ڕەزامەندی عەمو، بۆیە سارا پیشانیدابوو هەستی چۆنە بەتەوقە لەگەڵدا کردنی لەبری

ماچکردنی. لێرەوە ئەوەم بۆ روونبوووەوە کە عەمو ئەم ئاهەنگەی بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو سوکایەتییە رێکخستبوو. هەندێك جار لەرێی خودی خۆمەوە پەیم بەهەندێك شت دەبرد، تەنانەت پیاهەڵدانەکەی بۆ ژەنینی والتزەکەم راستەوخۆ بۆ من نەبوو، بەڵکو دژی سارای هەژار بوو. ئەمە ئەو بوو سەرۆك کۆماری وڵاتێکی هەژدە ملیۆن کەسی، ساراش کچێکی تەمەن پانزە ساڵ بوو! بیرمکردەوە، چەند ستەمکارانەیە فەرمانڕەوایەکی رەها پاوانی منداڵێك بکات، منداڵێك کە ئەشێت زۆرترین بایەخیشی پێدابێت.

کاتێك هەمووان بۆ نانخواردن بەرەو ژووری دانیشتن رۆیشتن، من رۆیشتم بۆ ئەوەی بەدوای سارادا بگەڕێم، دۆزیمەوەو دیم لەدەرەوە بوو لەبالکۆنەکەدا دەگریا. هەمووان بەشەرمەزاری بینیبوویان، بەڵام ئەو تەنیای تەنیا بوو. دایکی لەکوێ بوو؟ بەڵام من دەمزانی گەورەکان ناتوانن بەبێ رێپێدانی عەمو دەوروبەری جێیبهێڵن، سارا و لوماش پێشبڕێکی خۆیان هەبوو بۆ بایەخپێدانی عەمو. کاتێك رۆیشتمە دەرەوە، بینیم کە سەربازێکی زۆر لەو نزیکانەدا بوون، بۆیە ترسام بەو شێوەیە سارا ببینن و هەڵسوکەوتەکەی بۆ عەمو بگێڕنەوە.

بۆ تەنها جارێك، ویستم ئەم ئازارە کۆتایی بێت. ویستم شتێك راستەقینە بێت. رۆیشتم بۆ لای و دەستم خستە سەر شانی سارا، هەوڵمدا ئاسودەو هێوری بکەمەوە وەك چۆن پوورە لەیلا دایکمی هێوریکردەوە کاتێك عەمو قیژاندی بەسەریدا. بۆ چەند خولەکێکی کەم و تاوەکو هەنسکدانی کۆتاییهات لەباوەشم گرت.

کاتێك گریانەکەی وەستان، وتی "دادپەروەرانە نییە". پاش ئەوەی زانی سنورمان دیاریکراوە خەمەکەی بۆ سکاڵایەکی لاوانەی گونجاو گۆڕی و لێی زیادکرد: "ناتوانم چاوەڕوان بم تاوەکو پیر دەبم تا منیش بتوانم بخۆمەوە".

بیرم نایەت هەر لەو گەشتەدا بوو یان لەسەردانێکی دواتردا بوو لەهەمان شوێن کە سارا توشی سەرسوڕمانی کردم بەوەی بەدەنگی بەرز تۆمەتباری کردم بەوەی قومم لەچاکەم داوە پێش ئەوەی عەمو تامی ئەوەی خۆی بکات. عەمو تەنها خەندەیەکی بۆ کردو وتی زەینەب ئەندامی خێزانە، مەگەر جوان نەبوو هەست بەئاسودەیی تەواو بکەم و چاکەم بخۆمەوە لەکاتێکدا حەزم لێبوو؟ ئەگەر

ئێمە هەموومان ئەسپ بووینایە لە تەویلەکەی ئەودا، کە بەڕاستی پێکچواندنێکی خراپ نییە، پێموایە دەیتوانی وەسفی من وەك ماینێك بە پەتێکی بەرەڵاوە بکات. واچاوەڕوان دەکرا من هەندێك جار هەڵبچەمو چوارچێوەی خۆ ببەزێنم. ئەفسوس سارا خۆی وەك کەسێکی جێگیری گوێڕایەڵ دانابوو. بۆیە ئەگەر تەراتێنی بکردایە، پشتی دەیدا لە زەوی.

ئەو پشووەی هەینی یەکێك بوو لەو جارە دەگمەنانەی کە من کاتم لەگەڵ خاتو سەمیرەی دۆستی عەمودا بەسەربرد. پاش نانی ئێوارە کورسییەکانمان لەشێوەیەی بازنەیەکی گەورەدا لەسەر چیمەنەکە بۆ ڕێکخرابوونو هەریەکە خزمەتکارێك بەجلی تەواوی سەربازییەوە لەپشتمانەوە وەستابوون بۆ بارێك ئەگەر پێویستمان بەشتێك هەبێت. ئەو شەوە عەمو لە کەشێکی شادماندا بوو سەمیرەش لەتەنیشتییەوە بوو. سەمیرە پێدەکەنیو نازی بۆ دەکرد، پەیوەندییەکەی لەگەڵ عەمودا بەپێچەوانەی دایكو باوکمەوە پیشاندەدا. لەپشت روخسارە روخۆشەکەیانەوە، من هەستم بەقێزەونی بەسیمای هەموو گەورەکانەوە دەکرد. سەمیرە بێ کۆتایی گاڵتەی لەگەڵ دەکردو ئێمەش تەماشامان دەکرد، باڵادەستی خۆی بەسەر ئەم بازنە نوخبەدا پیشاندەدا کاتێك دەیچرپاند بەگوێیداو پەنجەی بەسەر رانیدا دەخشاند. ناچاری دەکردی تێبینی ئەم دەسبازییە سێکسییە بکەی، بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت هەستی کوڕەکانی چۆن بن کە لەوێ بوونو تەماشای هەموو ئەو شتانەیان دەکرد. نە دەمانتوانی هەستین، نە دەمانتوانی قسەبکەین، هەریەکەو لە زیندانی بێدەنگی خۆماندا دانیشتبووین. لەناوەوە، هەستم بەقیزەیەك دەکرد ببووە خۆرەی لەشم. دەمویست بەرزببمەوەو بقیژێنمو رابکەم بۆ چیاکانی دەوروبەرمان کە بۆنی کێویبوونو باو جاتری لێدەهات. بەڵام تەواو بەخامۆشی دانیشتبوومو لەسەر رانم دەستەکانم بەنوقاوی دانابوو، ئەپاڕامەوە پاڵەوانێك بەئەسپێکی سپییەوە بەغار بێتو هەڵمگرێتو بمبات.

لەهەندێك لە گەشتەکانی کۆتایی هەفتەدا کە لەگەڵ عەمو دەمانکرد، بەختی ئەوەم هەبوو جوانی سروشتی عێراقو هەندێك لە گرنگترین دروستکراوە سەرسامکەرەکان ببینم کە هەردەم زانیبێتم. یام خۆشدەوێت، بەتایبەتی لەو

رۆژانــەدا کــە هەســتمدەکرد هــەرگیز هــەوای تــەواوم دەســت ناکــەوێ بــۆ نەفــەس هەڵمـژین، چـەند جـارێکی کـەم هـەبوون، هەسـتمکرد بـا لـەرووم دەدات‌و شـتێك لەناخمـدا دەبوژێنێتـەوە. دایکـم شـێوەیەکی جیـای روو وەرگێڕانـی بـۆ بـا هـەبوو، چاوی دادەخست‌و قژە درێژەکەی بەدەوریدا پێچی دەخوارد، بیرمە دایکم چەندە جوان بوو ئەو شەوە پڕ لە ئەستێرە درەوشاوە، ئـەوجا چـەندە خـۆش دەبـوو ئـەو شەوە ئەگەر عەموی تێدا نەبووایە.

ئەو شەوە هەمومان راوەماسیمان کرد. عەمو حەزی لە ماسی گـرتن بـوو. لـەو زەوییەدا کە ئاو لـە نـەوت بـەنرخترە، ئـاوی لەڕووبارەکانـەوە دەگـرت‌و دەیڕژانـدە دەیـان دەریاچـەی تایبـەتی بیابانـەوەو ئەوەنـدە پڕبـوون جاروبـار لەتـەك دایکـم شـۆخیمان دەکـردو دەمـانگوت لەژێرئاوەکـەدا مەلـەوانی بـە بوتڵـە ئۆکسـجینەوە داناوەو ماسی دەکەن بە قولاپەکانمانـەوە. "گەشـتێکی خێزانـی ماسـی گـرتن" مـان هەبوو، لەو گەشتەدا رایگەیاند دیاری هەزار دینار کە نزیکەی سێ هەزار دۆلار بوو دەبەخشـێت بـەو کەسـەی گـەورەترین ماسـی دەگرێـت. ئێمـەش هـەمووومان بـەڕیز بەقولاپی ماسیگرتنەوە لەسەر کورسییەکانمان لەتەنیشت یەکێك لە دەریاچەکانی دانیشتبووین. لوماو سارا لەتەنیشتی منەوە دانیشتبوون. بیرمە لوما بەقـژە تـەواو لولەکەی‌و نینۆکە درێژەکانیەوە قـولاپی ماسـیگرتنەکەی بەشـێوە ژنانەکـەی خـۆی دەگرت، هەروەها ساراش لەتەنیشتییەوە ئاسودە بوو، دیاربوو رۆڵەکەی بـۆ خۆشـی وەرگرتنی خۆی بوو. شەوێکی جوانی مانگەشەو بوو وێنەی مـانگ لەسـەر روکـاری ئاوەکە پەرچ دەبوویەوە، کاتێك بەسەر دەریاچەکەدا دەمڕوانی هـەموو شـتێك زۆر ئـارام‌و ئاسـودە هەسـتی پێـدەکرا. بـەڵام ئەگـەر بـۆ دواوە ئـاوڕم بدایەتـەوە، رووبـەڕووی پیاوێـك دەبوومـەوە بـەجلی سـەربازی‌و سمێڵێکـی رەشـی گـەورەوە تەماشام دەکات‌و یەکێکی تر ئامادەبوو بـۆ ئـەوەی بێـت بـۆ لام تـا بزانێـت تینومـە یان نا. لەپشت ئەوانیشەوە کۆمـەڵێك سـەربازو خزمـەتکارو چێشـتلێنەر هـەبوون، هـەمویان لەوێـدا چاودێری‌و پاسـەوانیی ئێمـەیان دەکـرد. لـەناکاو سـیمەکەی مـن لەناو ئاوەکـەدا دەسـتی بەجوڵانـەوە کـرد، دەسـکی قولاپەکـە زۆر تونـد بـوو هێـزی ئەوەم نەبوو رایکێشم.

قیژاندم‌و وتم "ماسییەکم گرت. یارمەتیم بدەن! قورسە!"

یەکسەر سێ پیاو لەسەرم ئامادەبوون، هەمویان جلی سەربازییان لەبەردا بوو، پارمەتییان دام رایکێشمەوە. ماسییەکە مەترێك درێژتر بوو ئەوەندە گەورە بوو دەستم بە بەرزبوونەوەو دابەزین کردو قیژاندم "ماسییەکم گرت! ماسییەکم گرت!" ئەوەندە خۆشحاڵ بووم، بیرمچوو لەبەردەمی عەمو، خێزانەکان، پاسەوانەکان، خزمەتکارەکان‌و هەموو ئەوانی تردا بووم. خەندەو دانە درەوشاوەکانی عەموم بیرە کاتێك تەماشای کردم. بەتەواوی خۆشحاڵ بوو پێم. دواترو هەر لەوشەوەدا رایگەیاند، "زینەب بردییەوە!"

پاش نیوەڕۆیەك من‌و لوماو سارا لەبەردەمی خانووە کێڵگەییەکەی پوورە نەدا دانیشتبووین، لەوکاتەدا عەمو بە ئۆتۆمبێلێکی بچووکی سوری وەرزشییەوە هات. جگە دیقەتدان نەتدەتوانی هیچ بکەی، کڵاوێکی پێشبڕکێی لەسەردابوو. کاتێك زانی کە دایك‌و باوکمان سەرخەوێکی پاشنیوەڕۆ دەشکێنن، پرسیاری لێکردین دەمانەوێت لەگەڵیدا بڕۆینە پیاسە. تەمەنم نزیکەی شانزە ساڵ بوو.

هەمومان وتمان، بەڵێ عەمو زۆرمان پێخۆشە!

"کەواتە، کچینە، لەگەڵم وەرن بۆ گەشتێکی تایبەتی کۆشکە تایبەتەکەم".

خۆمان هەڵدایە ناو ئۆتۆمبێلەکە، ئەویش دەنگی رادیۆکەی تەواو بەرزکردەوە، بەخێرایی بەرێگایەکی تەختی بیابانەکەدا لەڕووی ناوەوەی ئەو دیوارەوە بەرەو ناو جیهانێکی جوان‌و نایاب لە چیمەن‌و گژوگیای سەوزو ژمارەیەك ئۆتۆمبێلی درەوشاوەو دەریاچەی تایبەت رۆیشتین. پاسەوانی ئاسایش لەهەموو شوێنێك هەبوون، بەڵام بەدوامانـدا نەدەسوڕانەوە، هەستم بەئازادی دەکرد. زۆر ئاسودە دەردەکەوت کاتێك ئێمە لەگەڵی بووین‌و ئەو لێخوڕینی دەکردو چێژی لە مۆسیقاو هەتاوی ئەو پاشنیوەڕۆیە وەردەگرت. خۆش بوو لەگەڵیدا پیاسە بکەی.

یەکەم وەستانمان لەماڵی ماسیگرتنەکە بوو، ئەگەر ئەوە دەستەواژەیەکی راست بێت بۆی، چونکە بەسەر یەکێك لە دەریاچە گەورەکانەوە بنیادنرابوو. ئۆتۆمبێلەکەی وەستاندو بەپێ رێگایەکی درێژمان بەسەر رێڕەوە دروستکراوەکەی سەر ئاوەکەدا بڕی تا گەیشتینە ژوورێکی بازنەیی زۆر گەورە لەسەر دەریاچەکە. لەناوەوە، کورسی گەلێك لەشێوەی نیمچە بازنەییدا

لەبەردەمی پەنجەرەکانـدا ڕێکخرابوون، بۆیە بەئاسانی خۆیو میوانەکانی دەیانتوانی لەناوەوە دانیشنو قولاپی ماسیگرتنەکانیان لەپەنجەرەکانەوە بخەنە دەرەوەو بەئاسودەیی ماسی بگرن. لەتەنیشت هەر کورسییەکەوە مێزێکی بچووك بۆ خواردنو خواردنەوە هەبوو. وتی "من حەز ئەکەم لێرەدا ڕاهێنان بکەم، منیش بۆ ساتێك داچڵەکیمو گەڕامەوە بۆ ناو هەقیقەت. ئاخۆ لێرەو لەم شوێنەدا بوو، عەمو باوکمی ناچارکرد ئەو ڕاپۆرتەی بخوێنێتەوە کە حسێن کامیل لەسەری نووسیبووی؟

عەمو بەڕێزو دۆستانە بوو، ئەو میوانداره تەواوە بوو کە ئەو ڕۆژە گرنگییەکی زۆری بەو سێ نەوجەوانە داو وەك گەورەکان قسەی لەگەڵدا کردین. ئەو ڕۆژە عەموی تەواو بوو، نەك کەسێکی گرژبێت لەدەورت، تەنها کەسێکی ئاسایی بوو کە سەروەتو سامانێکی بێئەنازی هەبوو حەزی لە نیشاندانی بوو. پێی وتین ئەو پارمەتی نەخشەکێشانی زۆرێك لە بیناکانی داوەو مایەی شانازین نیشانیان بدات. یەکێك لەو بینایانەی بردینی بۆ ناوی وەك کوخێکی یەك نهۆم بوو. پاشان بردینیە نهۆمی خوارەوە، چاومان بەژێرزەمینێك کەوت پێکهاتبوو لە شوێنی نیشتەجێبوون لەگەڵ بوونی گەرماو، ژووری دانیشتنو چێشتخانەیەکی بچووکیش.

ڕوونیکردەوە "ئەمە شوێنی خۆحەشاردانە بۆ کاتی پێویست. دەتوانم لێرە خۆم حەشار بدەم ئەگەر پێویستم پێی هەبێت. بەشی چەندین هەفتە خواردنی تێدایە".

ڕۆیشتە ناو چێشتخانەکەو دەستیکرد بەپیشاندانی خواردنەکەی، دەرگای هەر کابینەیەکی دەکردەوە، خواردنە هەڵگیراوەکانی هەر لە فستەقو پەتاتەی برژاوەوە تاوەکو ویسکی پێشاندا‌ین. پاشان بەفرگرەکەی کردەوە، پڕکرابوو لە سۆداو شەربەت، هەروەها هەریەکەو لەفەو ساردی پێشکەش کردین. خزمەتکاری تێدا نەبوو، بەدەستی خۆی قوتوی سۆداکەی بۆ کردینەوە. نزیکەی دوو کاتژمێرمان لەگەڵیدا بەو گەشتو کات بەسەربردنە گوزەراند. دەریاچەکانی پڕبوون لە بەلەم، هەروەها سواری یەکێك لە گەورەترینیانی کردین، یاختێکی زۆریشیان تێدابوو ڕازابوونەوەو لە قاتی خوارەوە شوێن خەوی سەرنجڕاکێشو

باشیان تێدابوو.

تەماشای کردین‌و وتی "کچینە، کاتێك هاوسەرگیریتان کرد ئەمەتان بیربێتەوە. دەتوانن لەکاتی مانگی هەنگوینیتاندا بەکاریبهێنن".

هیچ پرسیارێك لەمێشکمدا نەبوو کە لەپشت هەڵواسراوەکانی سەر دیواری ناو ماڵەکەوە کامێرا هەبێت. کاتێك بەرەو خانووەکانی مەزراکە گەڕاینەوە، بیرم لەخۆم دەکردەوە کە چەندە خۆشیم لە هاوڕێیەتی عەمو وەرگرت. نزیکەی کاتژمێر پێنجی پاشنیوەڕۆ بوو کاتێك گەشتینەوە ماڵ. بەهەمووی چەند کاژێرێك بوو رۆشتبووین، کەچی دایك‌و باوکی هەمووومان لەبەردەم خانووەکەی پوورە نەدا وەستابوون‌و نیگەرانبوون سەبارەت بە ئێمە. ئاخۆ ئێمە کارێکی هەڵەمان کردبوو؟ نەدەبوو لەگەڵ عەمودا بڕۆشتینایە؟ سوپاسمان کردو لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزین‌و رامانکرد بۆ ئەوەی بەدایك‌و باوکمان بڵێین کە چەند خۆشبووە لەگەڵ عەمو ئەو سەرکەشییەمان کردووە.

لەگەشتێکدا بەکۆپتەری تایبەتی عەمو رۆیشتینە دەرەوە، کۆپتەرەکە سیکۆرسکی‌و زۆر گەورە بوو، ژووری جیا جیای هەبوو. لانی کەم بۆ منداڵان شتێکی نوێ بوو: سێتی تەلەفزیۆن، نیمچەبارێك، گەرماو، خزمەتکاریشی تێدابوو. دوای کەمتر لەکاتژمێرێك لەشوێنێکی کراوەدا نیشتینەوە کە وەك شوێنی راوکردن چادری تێدا هەڵدرابوو. سارا سەرگێژخوارن‌و دڵتێکچوونی ناو فڕۆکەی گرتبوو، بۆیە هەرکە نیشتینەوە رشایەوە، بەڵام توانی خۆی بگرێتەوە، دەمی سڕی‌و خەندەیەکی گەورەی بۆ عەمو کرد، ئەویش سڵاوی لێکردین. بە ژن‌و منداڵەکانی وت بۆ دۆمەڵان بگەڕێن‌و چێژ لە ڕاوکردن وەربگرن، پاشان هەریەکە لە سێ هاورێکەی‌و حەیدەری برامی نارد بۆ سیکۆرسکییەکی جیاواز. پەروانەکان لەگەڵ گرمەگرمێکی بەهێز دەستیان بەخولانەوە کرد. من دارێکم پێبوو بەوردی بەدوای بەزربوونەوەیەك لە زەویدا بەمەبەستی دۆزینەوەی دۆمەڵانێك بەقەبارەی گوێزێك دەگەڕام‌و لەوکاتەدا قیژەیەکی ترسناکم لە سەرو دەنگی سیکۆرسکییەکەوە بیست. سەرم بەرزکردەوە گەلێك مراوی کێویم بینی بەبازنەیەکی گەورەی کۆپتەر دەورەدرابوو. باڵندەکان لەناوەڕاستەوە کەوتنە ناو داوەوەو ئەفامانە لێیان دەدرا، بەیەك جار بەشێوەیەکی سەرلێشێواو بەهەموو

لایەکدا دەستیان بەفڕین کرد. عەموم بینی لە دەرگایەکی کراوەی کۆپتەرەکەیەوە پێدەکەنی کاتێك چەکەکەی بەرزکردەوەو دەستی بە تەقەکردن کرد، پیاوەکانی تریش هەمان شێوە دەستیان پێکرد.

تەماشای ئاسمانم کردو بەنیوە قیژاندنێك وتم "ئەمە کۆمەڵکوژییە! ئەمە شتێك نییە مایەی پێبکەنین بێت! ئەمە کۆمەڵکوژییە!"

مراوییەکان غاکەغاك و هاواریان دەکرد. لەیادمە بیرمدەکردەوە، ئەوان لەناخەوە هاوار دەکەن و عەموش پێکەنینی پێیان دەهات. نەك تەنها راوکردن، بەڵکو پێکەنینیش! ئەوە دڕەندانەترین شت بوو کە بینیبێتم. دەستمکرد بەهەنسکدان. دەمزانی ئەوە چەندە ترسناك و گەمژانە بوو، بەڵام هیچ شتێکیشم لەدەست نەدەهات. دایکم گوێی لێمبوو رایکرد بۆ لام و بەزۆر سەرمی خستە سەر سنگی بۆ ئەوەی بێدەنگم بکات چونکە نەیدەویست پاسەوانەکانی ئاسایش گوێیان لێم بێت.

کاتێك دەگریام دایکم سەری کردمە خوارو وتی "شش، زەینەب، شش. تکایە مەگری، ئازیزم. لەبەر خاتری من بەهێز بە! لەبەر من ئەوە بکە تکایە، زەنوبە؟ تکایە، لەبیرت بێت لەکوێی!"

لەدەوروبەری ئێمەدا مراوی بریندار دەکەوتنە سەر زەوی. بەڵام منیش وەك سارا توانیم فرمێسکەکانم بسڕم و دەم‌وچاوم بشۆم و خەندەیەك بۆ عەمو بکەم کاتێك راوچییەکان گەڕانەوە.

# لەبیرەوەرییەکانی عالیاوە

زۆرجار پێی دەووتین، تفەنگ نزیکترین شتە لەدڵی پیاوی عەرەبەوە. پاش ئەو ژنەکەی دێتو ئینجا ئەسپەکەی.

کاتێك وڵاتەکەی پڕچەك دەکرد، هەموو جۆرە دەمانچەو تفەنگو چەقۆو هتد.ی دەکڕی. کۆکراوەکانی پیشان دەدایەو شانازی بەخۆشەویستی خۆیەوە دەکرد بۆیان. هەروەها ئەو خولیایەی خۆی لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەناردنی چەکی جۆراوجۆر بۆیان بەشدەکرد. پێموایە ئێمە لەماڵەکەماندا نزیکەی دە چەکمان هەبوو، هەریەکەش لەجۆرێکی جیاواز بوو، هەروەها جۆرەها چەقۆو دەمانچەشمان هەبوو. نە هەرگیز بەکارمان هێنان نە حەزیشمان لەبەکارهێنانیان بوو. بۆ ناردنی ئەو دیارییانە سوپاسمان دەکردو لەکۆگاکەدا هەڵمان دەگرتن. دەمانزانی ئەو کۆکراوانە چەندە بەلایەوە گرنگ بوون.

خولیای زۆری هەبوو. ماوەیەك کەڵکەڵەی چێشتلێنان کەوتبووە سەری. بۆ خواردنی جیاوازو تایبەتو بەزۆری بۆ خواردنە نەریتییەکان بانگهێشتی دەکردین. چاوەڕوانی ستایشی زۆری دەکرد بۆ ئەو خواردنانەی بۆ کۆشکەکانی دروستدەکرد. ئەگەر بەخۆبەخشی بەدەستی نەگەشتایە، داوای دەکرد، ئێمەش هەموومان بەخۆشییەوە دڵنیامان دەکردەوە فرە حەزمان لەو شتانە کردووە کە بینیومانن‌و تامانکردوون. بەڵام هیچ شتێك بەراورد نەدەکرا بە هۆگری بۆ مۆدە. ڕۆژێك بانگهێشتی کردین بۆ موسڵ بۆ ئەوەی لەگەڵیدا لەیەکێك لەکۆشکەکانی بمێنینەوە. تێبینی ئەوەمان کرد کە هەندێك جانتا بەدوایەوە بوو، لەکاتی گواستنەوەی ئەو جانتایانەدا، یەکێکیان کەوتو کرایەوە. ئەو ڕۆژە ڕەشەبای هەبوو، بۆ سەرسوڕمانی ئێمە دەیان تەقلەو کڵاوی جۆربەجۆر کەوتنە خوارو بەسەر ڕێگاکەدا بڵاوبوونەوە.

بینەری تێپەڕینی بووین بەگەڵ قۆناخی جیاجیادا. ماوەیەك لەناو بواری تەلارسازی‌و دەروونناسیدا قاڵبوو. ماوەیەك داڕێژەری ستراتیژی سەربازی بوو،

چەند کاتژمێری بەباسکردنی ستراتیژەکەیەوە بۆمان بەسەردەبرد، هاوکات باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن جەنراڵەکانی کوشتووە کاتێك پێشنیاری ستراتیژی جیاواز لەوەی خۆییان بۆ کردووە یاخود سەرنجیان هەبووە لەسەر ستراتیژەکەی، بەوبیانووەی دەبێتەهۆی لەناوچوونی چەندین کەس. پاش ئەوەی سەردانی وڵاتێکی جیاوازی عەرەبی دەکرد، لەو گەشتە دەهاتەوەو سروشی بنیادنانی کۆشکێکی باشتر لەوەی بینیبووی لەلا گەڵاڵە دەبوو. حەزی لەڕازاندنەوەی ژووری خەوەکانی بوو و هەریەکەی بەڕەنگو دیزاینێکی جیاواز دەنەخشاند. بەملیۆنی لە مۆبیلو دۆلابی ئیتالیدا خەرجدەکرد.

# سندوقەکان

من هەرگیز ئەو شتانەم بەچاوی خۆم نەبینی کە بەخەڵکی دەکرد. پێویست نەبوو پارچەکانی لەشی یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەم کۆبکەمەوە وەك کەرتەکانی یاری پەزڵ دوای ئەوەی وردوخاش کرابوون. هەرگیز پێویست نەبوو ساڵانێك بەهاتوچۆکردن لەم زیندانەوە بۆ ئەو زیندان بەسەرببەم بەهیوای دۆزینەوەی کوڕێکمان کە بەزیندووی لەلایەن موخابەراتەوە لەسەر سفرەی خوانی ئێوارانمان دەستگیرکرابوو و برابوو. من یەکێك لە کەسە خۆشبەختەکان، یەکێك لە "کەسە خۆشەویستەکان"ی بووم. لەلایەن ئەو پاسەوانە تایبەتانەوە پاسەوانی دەکرامو دەپارێزرام کە عەمو بۆ تیرۆرکردنی کەسانی تر بەکاری دەهێنان. زۆرجار ناتوانم لەهەناسە هەڵکێشانو گرین راوەستم لە حەسرەتی ئەو تاوانانەی ئەو دەرهەق بەخەڵکی عێراق ئەنجامی دان. بەڵام ئەوکات نەمدەتوانی بگریەم. نەمدەتوانی تەنانەت ئەندێشەی ئەوەش بکەم بتوانم بیروڕایەك سەبارەت بەنادادپەروەری دەربڕم. ئەو چیرۆکە قێزەونانەم تەنها وەك زانیاری وەردەگرتن. دەوروپشتمان پڕبوو لە چیرۆکی ئەو کەسانەی دەبران بۆ زیندان بەهۆی وتنی نوکتەیەکی سادەوە دەربارەی یەکێك لەبنەماڵەی عەمو یان بەهۆی رەخنەگرتن لەتاقە شتێك کە ئەو ئەنجامی دابوو.

هەر کۆمەڵگایەك دەس لەپرسینەوەی سەرکردەکانی هەڵگرێت بەرەو دیکتاتۆرییەت ملنەنێت، عەموش دابو نەریتەکانی خۆمانی لەدژی خۆمان بەکاردەبرد بۆ چاندنو بڵاوەپێکردنی ترس. بۆ تەنیشت چەمکی نەریتیی عەیب، کە واتای ئەو شتانە بوو لەلایەن دابی کولتورییەوە قەدەغەکرابوون، هەروەها حەرام، کە واتای ئەو شتانە بوو لەلایەن ئاینەوە قەدەغەکرابوون، عەمو سێیەمی زیادکرد کە مەمنوع بوو و تەنها بەمانای قەدەغەکراو دەهات. قەدەغەکراو لەلایەن حکومەتەوە؟ قەدەغەکراو لەلایەن سەدام حسێنەوە؟ قەدەغەکراو لەلایەن یاساوە؟ ئەوەیان ئیدی گرفتێك نەبوو. ئێمە نەماندەتوانی جیاوازی بکەین. لەترسدا دەژیاین. ترس لەسەرانسەری کۆمەڵگاکەماندا بەچەشنی بڵاوبوونەوەی

رەنگ، کاتێك دڵۆپەیەك بۆیە دەتکێنیتە ناو ئاو بۆ رەنگکردنی هێلکە بۆ نەورۆز یان—هەر خوازەیەکی باشتر—بڵاوەی کردبوو، یاخود بەشێوەی دڵۆپێك خوێن کاتێك لەپەنجەمانەوە دەکەوێتە ناو تەشتێکەوەو بڵاودەبێتەوە.

رۆژێکی تەواو بێ هەوری زستانم بیردێتەوە لەخوێندنگا لەگۆڕەپانەکەدا لەگەڵ چوار کچی تردا لەبەر هەتاوەکە بەرامبەری سەبەتەی باسکەکە دانیشتبووین، یەکێك لە کچەکان بەچاوێکی ئەبڵەقەوە چیرۆکێکی بۆ باسکردین، ئەگەر ئێمە بمانگێڕایەتەوە خۆی‌و خێزانەکەشی دەخستە مەترسییەوە. لەبارەی پیاوێکەوە بوو شەوی پێشوو لەسەر کوچەی گەڕەکێکی هەژارنشیندا کوژرابوو. بازنەیەك لە پیاو بەچەکەوە لەدەوری کۆببوونەوە، بەجۆرێك لەلایەن کەسێکی ترەوە هاندرابوون، دەستیان بەتەقەکردن کردبوو لەپیاوەکەو ئەوەندە گوللەیان پێوەنابوو تاوەکو هەموو خوێنی لەشی وەك فوارە هەڵپرژابوو. من دەمزانی ناتوانم بەزەیی بۆ ئەو کەسە پیشانبدەم کە کوژرابوو چونکە دەیکردمە هاوبەشی ئەو کارەی لەسەری کوژرابوو. لەیادمە لەبەر ئەو هۆکارە تەنها گوێم دەگرت بەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەو هاوخەمییەك لەسەر روخسارم دەرکەوێت، بێباك لەوکاتەدا وێنەی ترسناکی رژانی خوێنی پیاوێکی زیندووم دەهاتە پێشچاو کە بەهەموو لایەکدا دەپرژا. لەگەڵ گەورە بوونمدا چیرۆکی زیاترم دەبیستن. بیرمە شتێکم دەربارەی بازرگانێك بیست بەهۆی بەرزکردنەوەی نرخ‌و پێشێلکردنی یاساوە کوژرابوو، چ یاسایەك کەس تێنەدەگەشت. ئەوی مایەی سەراسیمە بوون بوو کوشتنەکەی نەبوو، بەڵکو ئەو راستییەبوو کە دواتر موخابەرات پۆزشیان بۆ خێزانەکەی هێنایەوە، گوایە بەهەڵەداچوون‌و ئەو بەهیچ کلۆجێك یاسای پێشێل نەکردبوو. ئەمەش مافی ئەوەی بەخێزانەکە بەخشی بتوانن پرسەی بۆ بگێڕن‌و مەراسیمێکی بەخاکسپاردنی ئاشکرای رێکوپێکی بۆ سازبکەن، چونکە خێزانی کوژراوەکان بەسادەیی رێگەی شین‌ورۆیان پێنەدەدرا.

دۆزەخی تایبەتی من‌و خێزانەکەم ئەوە بوو کە کاتێکی زۆرمان لەگەڵ سەدام حسێن خۆیدا بەسەردەبرد. هەرگیز نە عەمو نە کچەکانی‌و تەنانەت نە ئەو کچانەشی لەخانووی مەزراکە هاوڕێم بوون نەیاندەزانی من ئەو شتانە دەبیستم. هەرگیز ئاگایان لە هونەری دروستکردنی ئەو جۆرە خەیاڵانە نەبوو کە بەمێشکی

مندا گوزەریان دەکرد، چونکە دایکم فێریکردبووم‌و دەمزانی بیانشارمەوە. هەر جارێك چیرۆکێکی ترسناك بهاتایە، دەمخستە ناو سندوقێك‌و کلیلم دەدا، ئەو سنوقانەش لە مێشکمدا بوون—گوێم لەچرکەی سندوقەکە بوو کاتێك دامدەخست. شتە باشەکانی "عەمو"م لەبەشی پێشەوەی مێشکم دانابوو چونکە پێویستبوو بەکاریان بهێنم. شتە خراپەکانی "سەدام حسێن"م لەقوڵایی ئەو سندوقانە لەبەشی دواوەی مێشکم‌و لەپشت دیوارێکی هێند ئەستورەوە دەناشت کە عەمو نەیدەتوانی پەییان پێبەرێت.

هونەری دایکم بۆ زیندوومانەوە لەژێر چاوەدێری ئەو پیاوەی دەبووە هۆی ئەو هەموو تۆقاندنانە داخستنی مێشکی بوو، منیش ئەمەی لێوە فێربووم. بیرکردنەوە مەترسیدا بوو، بۆیە دەمزانی نابێت بیربکەمەوە یان راوبۆچون گەڵاڵە بکەم. فێربووم خۆم لەگەڵ رۆمانەکاندا گێل بکەم‌و بەزۆر خۆم بخەوێنم‌و گزی لەخۆم بکەم. سۆزەکانیشم وەك هەموو شتەکانی تر خستبووە گەنجینەوە، پێویستبوو نرخەکەی بدەم تا دواتر بیانهێنمەوە سەرسیمام. بەڵام هەمیشەو بەردەوام، ئەو سندوقانە دەهاتنە سەرەوەو دەکرانەوەو پرژانی خوێنی ئەو پیاوەم بەسەر دیواری گەرەکێکەوە دەبینی. یان لاشەی مێردی هاوڕێیەکی دایکم کە لەبەردەم دەرگاکەیاندا فرێدرابوو پاش ئەوەی داوای لە عەمو کردبوو لە زیندان ئازادی بکات، ئەویش پەیمانی پێدابوو رۆژی دواتر لەماڵی خۆی دەبێت. هەوڵمدەدا ئەم بیرانە بگەڕێنمە دواوە بۆ ناو مێشکم، تەنها هەندێك جار لەوێدا نەدەمانەوەو منیش خۆم پێنەدەگیراو دەچوومە ناو ژوورێك لە ڕووناکی سپییەوە کە ئەوەندە بەشەوق بوو بینایی نەدەهێشت، وەك ئەوە بوو راستەوخۆ بچیتە ناو یەکێك لەو گولۆپانەی لەسەر کورسی دانسازێك بەسەر سەرتەوەن‌و بەچاوی تەواوکراوەوە تێیان دەڕوانی. دواجاریش چیتر نەمدەتوانی هیچ ببینم.

بۆ دایکم زۆر سەخت بوو هەستەکانی بشارێتەوە، عەمو ماوەیەکی درێژ بوو دەیناسی، چاوە گەورەو پرسۆزە سەرنجراکێشەکانی‌و زمانە میهرەبانەکەی دەیانپاراست. کاتێك بەردەوام پوورە سەمەر چیرۆکە ترسناکەکانی عەموی بۆ دایکم دەگێڕایەوەو سکاڵای دەکرد سەبارەت بەوەی کە تکریتییەکان دەست بەسەر بەغدادا دەگرن، دایکم پێویستبوو پەننا بۆ داپیرە بەرێت تا خۆ لە

بابەتەکە هەڵقورتێنێت. بیرمە ڕۆیشتم بۆ ئەپارتمانەکەی نەنەو بینیم دایکم سەری خستبووە سەر رانی دایکی، ئەو کچە ئازادیخوازە لە ژنێکی پیردا بەدوای ئاسودەیدا دەگەڕا کە بۆنی عەتری گوڵی چای لێدەهات.

دایکم داوای لە دایکی دەکرد "تکایە پێی بڵێ بەسە، دایکە، هەموومان بەکوشت دەدات! تێناگات کە عەمو بەهەموو مانایەك شەیتانە. عەمو سەرنجی خەڵك رادەکێشی، فریویان دەدات، پاشانیش ئازاریان دەدات".

داپیرەم تەنها گوێی دەگرت. منیش هەروەها.

دایکم وتی "سەمەر تێناگا. عەمو شارەزایە چۆن چاوەکان بخوێنێتەوە!".

عەمو ئەوەندە بەسەرنجەوە تەماشای دەکردی، تەنانەت لەو کاتەنەشدا خەندە لەسەر لێوی بوو، من بە وارِسك خویەکم هەبوو هەر زوو چاوم دادەخست، دەمزانی ئەو ئاماژەیەم وەك شەرمنی کچێکی لاو چاویلێدەکرێت. ئەو رۆژە پاش تەماشاکردنی لەگەڵ نەنەم، پتر پارێزگاریم لەدایکم دەکرد. من هێشتاش ئەو پرسیارانەم لەدایکم دەکرد کە دەرەنجامی کۆبوونەوە خێزانییەکانمان بوون. ("دایکە، بۆچی گوێی عەمو ئەوەندە هەستیارە؟" "چونکە لەناو تیرەکەیدا یەکەم جار کوران خۆشەویستن و هەندێك جاریش وەك کچان دەگۆڕێن لەسەرەتای منداڵیدا بۆ پاراستنیان لەچاوی بەدکار".) ئێمە باشترین هاوڕێی یەك بووین و هەندێك جاریش تەنها یەکتریمان هەبوو تا قسەی لەگەڵ بکەین. بەڵام ئەو چیرۆکە ترسناکانەی جاربەجار لە خوێندنگا بەرگوێم دەکەوتن لێدەشاردەوە چونکە دەمزانی ئەویش چیرۆکەکانی خۆی لەمن شاردبووەوە.

لەساڵی ١٩٨٦دا داپیرە سەری نایەوە، زۆری نەخایاند لەدوای ئەو پاشنیوەڕۆیە، کاتێك بوو تەمەنم حەڤدەی تەواو نەکردبوو. بەیارمەتی ژنێك لە گۆڕستان کە پیشەی ئەوە بوو، سێ کچەکەی لاشەکەیان شۆردو بەپێی نەریتی ئیسلام خامێکی سپیان بە بەردا کردو لەدەرەوەی شوێنی تایبەتی بنەماڵەکەمان لە گۆڕستانە پان و بەرینەکەی نەجەف بەخاکمان سپارد. بیرمە گەلێ کێلی گۆڕی تێدابوو، زۆرێك لەو خەڵکانە گۆڕی نوێیان بۆ ئەو سەربازە لاوانە هەڵدەکەند کە لەجەنگدا کوژرابوون. هەزاران کێلی گۆڕ لەناو لمەکەدا چەقێنرابوون، وادەردەکەوت پێویستبێت هەتاهەتایە بەناو ئەو بیابانە سوتێنەرەدا برۆین تا دەگەینە ئارامگای

ئەندامانی بنەماڵەکەمان کە ساڵانێك بوو لەوێ نێژرا بوون. لەکۆتاییدا گوڵومان بەسەر گۆڕەکەی ئەنەدا پرژاند. لەکاتێکدا دەگریاین و گوێمان لە قورئان دەگرت مۆمەکانیش داگیرسابوون و دەگران. کاتێك کە لەژێر خێوەتەکەدا بووین بیرم لەوە دەکردەوە، داپیرەم چەترێك بوو بۆ ئێمە ببووە پەناگەو ئێستاش کۆچی کردووە.

مردنی داپیرە پوورە سەمەری گۆڕی. دەستبەرداری سکاڵاکردن بوو لە عەمو، دەستیشی بەنوێژخوێندن کرد.

بەغدا هەردەم شارێکی پڕ کێشمەکێشی سیاسی و ستراتیژی بازرگانی بووە، ساڵەهاش سوپای ئەتنی شەڕی تێدا کردووە. عەمو ئەم کێشمەکێشمە کۆنانەی گرێدەدایەوە، بەمەش هاوسەنگییەکی بێوێنەی لەنابەین کوردە پەرۆشەکانی خودموختاری لە باکوور بە کولتورو زمانی خۆیانەوە، شیعە ترساوەکان لە باشوور کە دڵسۆزییان هەمیشە نیشانەی پرسیاری لەسەر بوو لەگەڵ ناوچە خێڵ نشینەکانی باکووری بەغدایش کە دواتر ئەمەریکاییەکان کەمیان کردەوە بۆ "سێگۆشەی سونەنشین" ڕاگرتبوو. لەکۆتایی هەشتاکاندا تەواوی بارودۆخی بەغدا گۆڕابوو. لەکاتێکدا کۆشکە کۆنکریتییەکانی عەمو بەدرێژایی کەنارەکانی ڕووبارەکەمان درێژببوونەوە، هاوکات کاری بە تکریتییەکان دەداو ئەپارتمانی لەدەوری کۆشکەکانیدا وەك جۆرێك لە شوراو پارێزەری خێڵەکی دروستدەکرد. لە حەفتاکانا بەغدا وەك شارێکی کەنار ڕووبارو پارك دادەنرا، خێزانەکەی ئێمەش واڕاهاتبووین بەدرێژایی ڕێگای سەر ڕووبارەکە پیاسەمان دەکردو ماسی برژاوی دیجلەمان دەخوارد، منداڵانیش یاریان دەکردو ژنانی عەباپۆش ئاسودە لەتەنیشت ژنانی تەنورەی کورت لەبەرەوە دادەنیشتن. بەڵام عەمووو پیاوە خێڵەکییەکانی ئەو کافتریایانەی کەنار ڕووبارەکەیان گۆڕی بەبارێ مەینۆشیی پیاوان. دورگەی بەراز، لەکوێ ئێمە سەیرانی گۆشت برژاندنی خانەوادەییمان دەکرد چیتر بارێکی هێمن نەبوو، گازینۆی گەشتیاری تێدا بوو ناونرابوو "دورگەی بوك" هاوکات کابینەو ڕیزەخانووی مانگی هەنگوینی تێدابوو بۆ ئەوانەی گەشتکردنی دەرەوەیان لێقەدەغەبوو.

لەیادمە لە تەمەنی جەحێڵیمدا جارێك یاری قومارمان دەکرد. قومارکردن و جگەرەکێشان و خواردنەوە بەناوی مۆدێرنبوون و نوێگەرییەوە خەڵکی بۆ

هاندەدرا. پاشترو کاتێك رۆشتم بۆ ئەمەریکا، تێگەیشتم کە بەڕاستی عەمو بەم گۆڕانکارییانە لە ڕۆژاوا ئمتیازاتو گرەوی بردبوویەوە. هێزی ئەمەریکای شانبەشانی ئەوەی ژنان وەك ئەوان بەرگیان دەپۆشی ئەمەریکاییەکانی فریودەدا واهەستبکەن ژنانی عێراقی بەوپێیەی زیاتر لەوان دەچن، کەواتە ئازادی زیاتریشیان هەیە. لەپشت ئەم دەمامکەوە ئازادی گەشتکردن، قسەکردن یان نوێژکردن نەبوو، هاوزەمان چ لێبووردەییەك نەبوو بۆ هیچ بیروباوەڕێکی ئاشکراو گشتی کە ئاوەژووی بیروبۆچوونەکانی سەدام حسێن بێت. هەواڵدەرەکان لەهەموو شوێنێك هەبوون. وەك دەگوترا ژنان لەلایەن موخابەراتەوە لاقەدەکرانو بەڤیدۆ تۆماردەکرا، ئینجا پۆلیس هەڕەشەی بڵاوکردنەوەیانی ئەکرد بۆ چەواشەکردنی ژنان تا سیخوڕی بەسەر ئەندامانی خانەوادەکەیانەوە بکەن. دراوسێکان بەسەر دراوسێکانەوە هەواڵگرییان دەکرد. منداڵەکان بەسەر دایكو باوکیانەوە کاتێك بێئاگایانە وەڵامی مامۆستایان دەدایەوە لەهەمبەر پرسیاری "باوکت چی دەڵێت دەربارەی مامە سەدام؟".

جەنگ لایەنێکی ناچیزو نەخوازراوی ژیانمان بوو. کاتێك لەشاردا هاتوچۆم دەکرد لەنێوان کۆشكو خوێندنگادا، سامانی بەهەدەردراو، ترسی چینی هێزی کارو شەقامەکانی بەغدا ڕەنگدانەوەی بەسەربازگەکردنی عێراق بوون. لەهەموو شوێنێ پیاوانی چەکدار بەبەرگی سەربازییەوە هەبوون، ئەندامانی حزبی بەعسو سەربازەکانو لاوانی بەرگی مەدەنی بوون لە "بەرگری" ڕاهێنانیان پێکرابوو چەکی کلاشینکۆفیان پێدرابوو. تەلەفزیۆنی عێراق سیخناخکرابوو بەوێنەی سەربازی کوژراوی ئێرانی، هەموو شەقامەکانی بەغدا پڕببوون لە پارچە لافیتەی ڕەش کە خێزانەکان هەڵیاندەواسی بۆ ئاماژەدان بە کوژراوانی جەنگی عێراق، هاوکات ژنانیش ڕەشیان دەپۆشی، ئەمەیان نەریتێکی کۆنەو بۆ ماوەی چل ڕۆژ یان ساڵێك بەهۆی مردنی ئەندامێکی خێزانەوە ماتەمی دەگێڕدرێت. خاوەن پرسەکان ئاسایی تابوتەکانیان دەخستە سەر چەمچەی ئۆتۆمبێل، ڕۆژێك خۆمان لەترافیکێکدا لەناو ئاپۆرەی پرسەیەکدا بینییەوە لەدوای ئۆتۆمبێلێکەوە وەستابووین تابوتێکی دارینی داپۆشراو بەئاڵای عێراقی بەسەرەوە بوو. بەڵام تابوتەکە بەتەواوی ڕۆپۆش نەکرابوو، کاتێك زانیم ئەو شتە شینباوە پیسەی

شۆڕببووەوە پێ بوو، قیژاندم. دایکم وتی "ئارامبە، ئازیزم" هەرچەندە خۆیشی بەهۆی ئەو دیمەنەوە توشی شۆك ببوو، ئیتر یەکسەر دەستیکرد بەخوێندنی دۆعاو ئایەتی قورئانو داوای لەخوا دەکرد رەحمو بەزەیی خۆی بەگیانی ئەو مردووە ببەخشێ، ئەوە نەریتمان بوو کاتێك بەتەنیشت کەسێکی مردوودا تێدەپەڕین.

جەنگەکە بۆ ئەو کچانەی من لەگەڵیان بۆ خوێندنگا دەڕۆیشتم، زۆر تایبەتو پەیوەندیدار بوو. زۆرێکیان باوكو براکانیان بۆ بەرەکانی شەڕ نێردرابوون. بەتایبەت لەیادمە کاتێك کچێکی باڵا بەرز کە زۆر میهرەبان بوو لەتەکم هات بۆ خوێندنگە جلی رەشی لەبەردابوو، پێیگوتم برا گەورەکەی لەبەرەی جەنگ کوژراوەو دایکی بەردەوام دەگریو خۆی پێناگیرێ. هەستم بە تایبەتێتی خۆم کرد کاتێك تێبینیمکرد هیچ ئەندامێکی خێزانەکەم لە شەڕەکەدا نین. ئامۆزاو خاڵۆزا هەرزەکارەکانم توانیبوویان خۆیان لەو جەنگە لابدەن، بەڵام نرخی ئەو نەڕۆشتن بۆ جەنگەیان لەلایەکی ترەوە دابوو. داودی کوڕە گەورەی خاڵە عادل بۆ خوێندن نێردرابوو بۆ ئینگلتەرا. بۆ ماوەی ساڵانێك لەهەموو ئەو کەسانە کە دەیناسینو خۆشیدەویستن دابڕا، چونکە رێگە بەخێزانەکەی نەدەدرا گەشت بۆ دەرەوەی وڵات بکەن، هەروەها ئەگەر بشهاتەیەتەوە بۆ وڵات دەنێردرا بۆ جەنگ. خێزانەکەی من توانیمان جارێك چاومان پێ بکەوێت کاتێك لەدەرەوە بووین، پەستیکردم کاتێك دەربارەی هەندێك شتی سادە پرسیاری لێکردم: ئاخۆ شێوەو روخساری خوشکەکەی چی بەسەر هاتووە، یاخود برا بچوکەکەی خۆشەویستی کچی هەیە، یان ژیانی رۆژانەی خێزانەکەی چۆنە.

بەدڵنیاییەوە، زۆرینەی خێزانە عێراقییەکان هەلی لەم چەشنەیان لەبەردەستدا نەبوو. پەنجە رەشهەڵگەڕاوەکانی دەستی دایکی رادیەم لەیادە، کە خۆر سوتاندبوونی، ئەو رۆژەی گرتبووی بەشوشەی پەنجەرەی ئۆتۆمبێلەکەمانەوە کاتێك رادیەمان هەڵگرت بۆ سەر کارو دایکی بەهەنسکەوە لە دایکم دەپاڕایەوە کۆڕەکەی رزگاربکات. کوڕە گەورەکەی برابوو بۆ سەربازی، ئەو کوڕەی خێزانەکەیان هەموو هیوایەکیان بۆ داهاتویەکی پرشنگدار لەودا دەبینییەوە. دایکم هەوڵیدا دڵنیای بکاتەوە پێیگوت "هەموو شتێك باش دەبێت". کاتێك بۆ

ماڵەوە دەڕۆیشتینەوە، منیش لای خۆمەوە بە رادیەم وت کە هەنسکی دەدا "تکایە مەگری، حەتم باش دەبێت". بەڵام راستییەکە ئەوەبوو کە کەس نەیدەزانی ئەو باش بێت، چونکە بۆ بەرەکانی پێشەوەی شەڕ نێردرابوو. سەدان هەزار خێزانی وەك ئەوان کوڕەکانیان لەدەستدا، بەڵام بنەماڵەی ئێمە هیچ کەسێکی لەدەست نەدا. نادادپەروەرییەکی نادیار بوو، وەك جیاوازی نێوان چارەنووسمان وەهابوو. من تێگەشتم هەژارەکان کەمتر لەهەژاریدا دەژیان و پتر پەراوێزخرابوون و لەو هەڵبژاردنانە بێبەشکرابوون کە رێگە بەمرۆڤ دەدا ژیانی خۆ دروستبکەن. ئەگەر شیعە مەزهەب یان چینی کرێکار بویتایە، هەمیشە گومانێکی زۆرت لەسەر بوو. بەهۆی بەهانەی ئاسایشی، رێگە بە رادیە نەدەدرا تەنانەت بۆ پاککردنەوەش بێت بۆ خانووی مەزراکەمان. کاتێك دەڕۆشتین بۆ کێڵگەکە گەرەکەکەی ماڵی رادیەمان تێدەپەڕاند، بەڵام هەرگیز بۆ کچەکانی ترم باس نەکرد کە لەو گەڕەکەدا لەگەڵ خێزانێکی خزمەتکاردا کاتم بەسەربردووە.

زۆرجار هەبوون هەستم دەکرد لە بچووکترین و ئاساییترین رووداوی ژیانمدا ئازاد نیم لە عەمو. هیچی زیاترم لەوە نەدەویست کە جەحێڵێکی ئاسایی بم و بە جەحێڵی خۆم بژیم. کاتێك لە ئامادەیی بووم، نەعیمی خالۆزام بانگهێشتی کردم لەگەڵ خۆی و هاوڕێکانیدا بڕۆم بۆ ئاهەنگی دیسکۆی گەنجان لە هەنتین کلەب، یانەیەکی تایبەتی گەورە بوو تێیدا خێزانەکانی چینی ناوەندو سەرو ناوەند دەڕۆیشتن بۆ مەلەکردن، یاری تێنس، تەماشاکردنی فیلم و خواردن. من و ئامۆزاو خالۆزاکانم هەر لەوێ گەورەببووین. ئەوە ئەو شوێنە بوو کە یەکەمجار باوکم منی دەخولاندەوەو سەمای پێدەکردم و دوای کوژاندنەوەی روناکییەکان بۆ فیلم دایکم بەدزییەوە دەچوو بۆ خزمەتە زیادەکانی حومس و واهەستیدەکرد کەس چاودێری ناکات. هەروەها لەناوەڕاستی ژاوەژاوی حەوزی مەلەکردنەکەدابوو پوورە سەمەر رەخنەی لە عەمو گرت. کەمەندکێش ببووم لەڕووداوێکی لەوشێوەدا لەگەڵ کەسانی هاوتەمەنی خۆم کات بەسەربەرم، عەزییەکی وەنەوشەیی دیسکۆم لەبەرکرد لەگەڵ جوتێك گوارەی شۆڕو قژم لول کرد، هەروەها دایکم مکیاژێکی کاڵی بۆ یەکەمجار لەو شەوەدا بۆ کردم. سەری سوڕما، بەڵام ئەمە خۆ ئاهەنگی ناوکۆشك نەبوو.

کاتێك نەعیم هەڵیگرتم، دایكو باوکم خۆشحاڵ بوون بەبینینی یەکەم شەوی چوونە دەرەوەی کچەکەیان لەسەر پێی خۆی وەك جەوانێك. بۆ من، وەك خەڵاتێك وابوو پاش ئەو هەمووە پشووی کۆتایی هەفتە کە لە خانووی مەزراکە بەسەرم بردبوون. کاتێك چووینە ناو هۆڵی نادی سەید، پڕبوو لە هەرزەکاری تەمەنی ئێمە، روناکییەکانی دیسکۆکە بەڕەنگە جیاوازەکانیان فلاشیان دەکردو هەمووان سەمایان دەکرد. ئەو ئێوارەیە، هاوڕێیەکی خاڵۆزاکەم کە من بەکەشخەم دەزانی داوای لێکردم سەمابکەین. هەردوکمان سارد دەردەکەوتین چونکە ئەوەندە شەرممان دەکرد نەماندەتوانی لەیەکتر نزیك ببینەوە. کاتێك سەماکردنمان تەواوکردو لەتەنیشتی خاڵۆزاکەمەوە دانیشتین، دەنگەدەنگێك هەموو هۆڵەکەی گرتەوە. مۆسیقاکە بەردەوامبوو، بەڵام خەڵك لەوسەری هۆڵەکەو لەشوێنەکانیانەوە دەستیان بەئاوڕدانەوە کرد تا بزانن چی روودەدات. ئێمە لەسەر یەکێك لە مێزە دوورەکانی هۆڵەکە بووین، بەڵام قسەکان دەگەشتنە ئێمەش. کێشەیەك لەگۆڕێ بوو.

کەسێك لەمێزەکەی تەنیشتمانەوە بەدەنگی نزم وتی "عودەی هەر ئێستا گەشت. فەرمانی کردووە کەس بۆی نییە ئاهەنگەکە بەجێبهێڵێت".

عودەی کوڕی عەمو بوو، بەجلوبەرگە ڕازاوەو ئۆتۆمبێلە سەرنجڕاکێشەکانیو ژنبازییەوە کۆنترۆڵی لاپەڕەی رۆژنامەکانی کردبوو. منو نەعیم تەماشای یەکترمان کرد. پەیمانم بەدایكو باوکم دابوو بۆ کاتژمێر ١١:٣٠ لەماڵ بم، ئەویش بەهەمان شێوە، هەردوکمان نیگەران بووین بەوەی یەکەم شەوی هاتنە دەرەوەمان لەکاتی خۆیدا ناگەڕێینەوە ماڵ. هەستا بۆ ئەوەی بزانێت کە چی روودەداتو دوای خولەکێك گەڕایەوە.

وتی "عودەی فەرمانی کردووە هەموو دەرگاکان دابخرێن. جانتاو کۆتەکەت هەڵگرە، بەڵام کۆتەکەت لەبەر مەکە. بیدە بەسەر قۆڵتدا وەك ئەوەی پیاسەبکەی. واهەستدەکەم رێگای دەرچوونم دۆزیوەتەوە".

لە پەنجەرەیەکی بچووکی نزمی هۆڵەکەوە کردمییە دەرەوە، چەمیمەوەو خۆمم باریك کردەوەو پیایدا تێپەڕیم، خۆزگەم دەخواست لەبری ئەو عەزییە وەنەوشەییە نوێیەم پانتۆڵم لەبەردا بوایە. شتێکی باش بوو کە توانیمان خۆمان

لەنادی سەید "هەنتین کڵەب" ئەوەندە بەباشی دەربازبکەین چونکە پاسەوانەکانی عودەی هەموو شوێنێکیان تەنیبوو. لەدەرگای پشتەوە زۆر بەترسەوە بەحەوشەکەی دواوەدا تێپەڕبووین و ڕێگایەکمان لەدیواری دەرەوەدا بۆ لای ئۆتۆمبێلەکەمان دۆزییەوەو سەرکەوتوانە بۆی دەرچووین. وەختێك گەیشتمەوەماڵەوە، ئۆتۆمبێلەکەی باوکم لەگەراجەکەدا نەبوو. کاتێك بەدایکم وت چۆن خۆمان قوتارکردووە، هەرچەندە لەکاتی خۆیدا گەیشتبووینەوە ماڵەوە، بەڵام دایکم زۆر ڕووی گرژبوو لە حەنام.

"بەڵام دایکە، شتێکی هەڵەم نەکردووە! خۆ دوانەکەوتووم! بۆچی تووڕەی لێم؟"

ئیتر دەستیکرد بەگریەو قیژاندن.

"مەگەر تێناگەی، زەینەب؟ ئێمە سەبارەت بەتۆ زۆر نیگەران بووین! باوکت دەهری بوو کاتێك بیستی عودەی لە ئاهەنگەکەیە. ڕۆیشت بۆ یانەکە بۆ ئەوەی بەدوای تۆدا بگەڕێت. ئەو ئێستاش لەوێیە".

بۆچی هاواری بەسەرمدا دەکرد؟ هیچ شتێکی هەڵەم نەکردبوو. تەنها دەمزانی کە عودەی یەکەم شەوی ئازادیی لێ زەوتکردبووم. هەموو ئەوەی من دەمویست تەنها جەوان بوونم بوو، عەموو خێزانەکەی دەستیان بەسەر ژیانماندا گرتبوو. ئەو شەوە گریانی خۆم کرد تا خەوم لێکەوت، باوکیشم لە یانەکە پرسیاری لەهەمووان کردبوو بۆ ئەوەی بزانێت داخۆ منیان بینیوە. دواتر دایکم بۆی گێڕامەوە کە بەترس و لەرزەوە هاتووەتەوە بۆ ماڵ و یەکسەر ڕۆیشتووە بۆ ژوورەکەی من پاش ئەوەی خەوتبووم تا دڵنیابێت کە بەڕاستی لەژوورەکەدام. سەرلەبەیانی داهاتوو تەلەفۆنەکە بەردەوام زەنگی لێدەدا چونکە پوورەکانم و هاوڕێکانی دایکم بەیەکتریان وتبوو ترسابوون کە عودەی بەدناو تاکە بۆشایی هەموو کەسێك وەك جێیەکی "سەلامەت" مەزەنەیانکردبوو، داگیرکردبوو.

ژنانی بەغدا ئەو شتەیان دەزانی کە من لەتەمەنی پانزە یان شانزە ساڵیدا بەتەواوی تێنەدەگەشتم: عودەی، کە گەورەی نێو دوو کوڕەکەی سەدام بوو، ناوبانگێکی بەدی جیهانی هەبوو بەهۆی "لاقەکاری ناو کۆشکەکانەوە" لەوێدا دەستدرێژی سێکسی دەکردە سەر ژنان و ئەشکەنجەی دەدان. کەسی چاوبەگەڕی

هەبوو ژنانی لاویان فریودەدا تا بێن بۆ ئاهەنگەکانی. هەندێکیان دەرمانیان پێدەدراو رووتدەکرانەوەو بەرووتی سەمایان بۆ دەکرد پێش ئەوەی دەستدرێژییان بکرێتە سەر. لە عێراق، ئەگەر کچێکی جەحێڵ دەستدرێژی سێکی بکرێتەسەر چیتر ناتوانێت هاوسەرگیری بکات. ئەگەر بنەماڵەیەکی تێگەیشتووی هەبێت لەئامێزی دەگرن و هاوکاری دەکەن بۆ "پۆشینی ناموسی" بەوەی مارەی دەکەن لەوکەسەی دەستدرێژی کردووەتە سەری. بەڵام ئەگەر لاقەکارەکە عودەی بوایە، رێکەوتنی لەو جۆرە لەئارادا نەبوو. ژنەکە بەتەواوی لەژێر بەزەیی ئەودا دەبوو، زۆری بۆدەهێنرا پەیوەندی بە "بازنەی"ی قوربانییانی تری دەستدرێژییەوە بکات کە دەیدان بەهاوڕێو پاسەوانە تایبەتەکانیو هەتاهەتایە بێهیواو سەرشۆڕ دەبوون. نزیکەی ساڵێك پاش ئەو رووداوەی نادی سەید، جارێکیان عودەی بانگهێشی کچی هاوڕێیەکی دایکمی کرد، دایكو باوکی ئەوەندە بێزاربوون دایان بەکوڕی ئامۆزای لە دوبەی. بەزوترین کاتیش وڵاتی بەجێهێشت. لە ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەیدا دەزگیرانەکەی تەنها وێنەیەك بوو لەسەر کورسییەك لەتەنیشتییەوە.

رۆژێك لە نادی سەید وانەی تێنسم وەردەگرت لەو کاتەدا عودەی لەلایەکەوە وەستاو تەماشای کردم. باوکم یاریزانێکی نایابی تێنس بوو، بەجلو ڕەکتێکی تێنسەوە پێکەوە یاریمان دەکردو منی فێردەکرد. لەکاتێکدا راهێنەرەکەم یاساو رێساکانی یارییەکەی بۆ روونەدەکردمەوە لەپڕ کەوتمە بیری تەنورەی کورتی یاری تێنسەکەم. ئەگەر یارییەکەمان بوەستاندایە، دەکرا تۆمەتبار بکرێین بەوەی لەو ترساوین. ئەگەریش پشتگوێمان بخستایەو لە یاریکردن بەردەوامبووینایە، مانای بێڕێزی نواندنبوو بەرامبەری. بەهەرحاڵ بەردەوامبووین لەلێدانی کورت، پاشان راهێنەرەکەم بانگی کردم بۆ لای تۆڕەکە بەبیانوی پێدانی رێنماییەك بۆ یارییەکەو بەنهێنی پێیگوتم پاش گۆڕینەوەی چەند لێدانێکی تر بگەڕێمەوە بۆ ژوورەوە. ئەویش رۆیشت بۆ لای عودەی لەوکاتەی من خۆم لەبینینی دەپاراستو بەکاوەخۆ رۆیشتم بۆ ئەوسەری یاریگاکە.

• تا ئەو رۆژە، واهەستمدەکرد پارێزراوبم. من "هاوڕێی" خوشکەکەی عودەی بووم. دایکم "هاوڕێی" دایکی بوو. لەهەمویشی گرنگتر، باوکم هاوڕێی باوکی بوو.

کاتم لەگەڵ ئەو کچانەدا بەسەردەبرد کە خەیاڵیان بەهاوسەرگیریکردن لەگەڵ ئەو پیاوەدا دەکرد. دەزانم لوما وابیری دەکردەوە کە هاوسەرگیری لەگەڵ کوڕی سەرۆک کۆمار بەمانای دەسەڵاتو سەرمایەو مانەوەی هەمیشەیی لەکۆشك دێت. پێم ناژمێردرێت چەندجار لە کۆبوونەوەکانی کۆشك ژنانی لاوم دەبینی لەشەرما سورهەڵدەگەڕان کاتێك باسی عودەییان دەکرد. چما دەربارەی دڵڕەقیو درەندەییەکەی نەیانبیستبوو؟ داخۆ بەڕاستی حەزیان لە بیرۆکەی بەندکردن بوو لەکۆشکدا؟ ئایا دەسەڵات ئەوەند بەلایەنەوە گرنگ بوو کە قایلبوون ئازادی خۆیانی لەپێناودا بەختبکەن؟ نەمدەزانی، نەشمدەتوانی بپرسم. تەنها دەمتوانی نیگا تۆقیوەکانی سەر روخسارم بشارمەوە کاتێك گوێم لێدەبوو کچەکانی تر لەبارەیەوە قسەیان دەکرد.

شەوێك خێزانەکەم بەنیازبوون بۆ سەردانی خێزانێکی تر بڕۆن بۆ ئاهەنگێکی شەوی پێنج شەممە بەئامادەیی گروپێکی مۆسیقاژەنینی عێراقیو رۆژاوایی. جلەکانم پۆشیو لە پلەکانەکە هاتمە خوارەوە بۆ ئەوەی بەدایكو باوکم بڵێم ئامادەم.

کاتێك باوکم بینی چ پۆشاکێکم پۆشیوە گوتی "ئەوە زۆر تەنكو دانەپۆشە، پێویستە بیگۆڕی".

عەزییەکی قۆڵدرێژی زۆر جوانم پۆشیبوو، بەڵام راهاتبووم بەدڵی دایكو باوکم جل لەبەربکەم، بۆیە رۆیشتمە سەرەوەو گۆڕیم بەرگێکی مۆدێل کۆنتر. کاتێك دووبارە گەڕامەوە بۆ خوارەوە بەتوندی پێیگوتم دیسان بچمو ئەویش بگۆڕم، لەپڕ هەڵچووم.

پرسیام لێکرد "چیتە باوکە؟ خۆت ئەم جلانەت بۆ کڕیوم. تۆ باوکێکی ئازدیخوازیتو بەمشێوەیە گەورەتکردوومە. تۆ ئەو کەسەیت فێرتکردووم بەچەقۆو چەتاڵ خواردن بخۆمو کاتێك شت دەخۆم دەمم دابخەم، کەچی ئێستا خۆت وەك ئەوان ناندەخۆیتو وەك ئەوانیش دەخۆیتەوە. چیت بەسەرهاتووە، باوکە؟ تۆ کەسێکی دووڕوویت! دەبیتە کەسێکی تر!".

ئەوە رەفتارێکی زۆر عەیب بوو ئەگەر حەرامیش نەبێت، چونکە قورئان رێگەی پێنەدەداین بێڕێزی بەرامبەر دایكو باوکمان بکەین، رامکردە سەرەوەو

ئەویش لەگەڵمدا هاتو دەیپرسی چۆن ئەوەندە روقایمم و بەو تەرزە قسەی لەگەڵدا دەکەم. هەرگیز بەو شێوەیە قسەم لەگەڵدا نەکردبوو. بیرمە دایکم بۆی روونکردمەوە کە باوکم تەنها هەوڵی ئەوەیە من لە پۆلیسە تکریتییەکانی عەمو بپارێزێت کە دەهاتنە ناو نادی سەیدو بەزەبری چەك فەرمانیان بەشاگردو گارسۆنەکان دەکرد. لەڕاستیدا جاری داهاتوو کە لە وڵات چووینە دەرەوە، تێبینی ئەوەم کرد باوکم گرنگی بەجل لەبەرکردنی من نەدەدا. بەڵام بەئاستەم ئەم پیاوەی ترم وەك باوکم بۆ دەناسرایەوە. دەڵێی قوڵ قوڵ رۆچووبووە ناو دڵی بیابانێکی لینەوەو خۆی تێدا ناشتبوو. باوکم بەردەوام لەسەر ئاکارو رەفتاری رێکوپێك پێداگیری دەکرد. بیرمە ئەو کەسە بوو فێریکردم چۆن مێز رێکبخەم و برازێنمەوە. هەنووکە، لەگەڵ هەڵکشانی دەسەڵاتی خێڵەکی تکریتی لە بەغدا، ئەویش بەدەستەکانی خۆی خواردنی دەخوارد. چی بەسەر ئەو باوکەمدا هاتبوو کە عادەتیبوو سەمام لەگەڵ بکات؟ کە لەگەڵمدا مەلەی دەکرد، شۆخی دەکردو بەڵێنیشی پێدابووم فێری فڕۆکەوانیم بکات؟ چیتر زۆر بەزەحمەت دەمتوانی ئەو پیاوەی تێدا ببینمەوە. ببووە کەسێکی دی، کەسێکی کۆنەپەرست کە چیتر نە پێدەکەنی و نە نوکتەی دەگێڕایەوەو نە گۆرانی خۆش و گاڵتەئامێزی دەچڕی، بەڵام هەمیشە توندوتیژو ترساو بوو. دایکم هەموو ئەمانەی بەوە روونکردەوە گوایە عەمو گاڵتەی بەباوکم کردووە بەوپێیەی ئەو وەك کوڕێکی بازاڕی لاسار گەورەبووەو گەرچی رۆیشتووە بۆ باشترین خوێندنگاو بەئینگلیزییەکی رەوان قسەی دەکات، بۆیە بابە تەنها هەوڵدەدا ئەوە راستبکاتەوە چونکە بەمجۆرە سەلامەت و زامنترە. من دڵنیام راستیدەکرد. هەرنەبێ من تێدەگەیشتم باوکم ململانێی دەکرد لەگەڵ ئەم وێنە نوێیەدا کە بەنیازبوو بۆ خۆی سازبکات. بەڵام شتێکی دیکەش هەبوو دەمدی: پاش ئەو هەموو ساڵە لەبەرگریکردن، دواجار چووبووە ژێرباری عەمووەوە.

پێموایە ئەو رۆژەم لەیادە ئەمە روویدا. لەخانووی ناو مەزراکە بووین، باوکم لەبری سڵاو لە عەمو بکات و هەردوو لای ماچبکات وەك ئەوەی پیاوانی رۆژهەڵاتی ناوین ئاسایی دەیکەن، هەردوو شانی عەموی ماچکرد. تێبینیم کردبوو کە بەرپرسان لەبۆنە گشتییەکانی سەر تەلەفزیۆندا بەو شێوەیە سڵاویان لە عەمو

دەکرد، بەڵام ئەوە زۆر سوکی بوو ببینی هاورێ دێرینەکانیشی بەم شێوەیە هەڵسوکەوت بکەن. ئەگەر یەکێك بینیبێتمی، ئەرخەیانم توانیویانە لەنیگای سەر روخسارمەوە هەستبکەن کە چەندە بەوکارە قەڵس بووم. داخۆ ئەمە فەرمانێکی نوێ بوو لەلایەن عەمووەوە؟ یاخود باوکم خۆبەخشی کردبوو بەو شێوەیە ماچی عەمو بکات؟.

دواتر پرسیم لە دایکم "بۆچی باوکم لەبری ئەوەی ماچی روومەتی عەمو بکات ماچی شانی کرد؟".

وەڵامێکی کاڵو کرچی دایەوەو وتی "بەهۆی ترسی عەمووەوە لە میکرۆب، داوایکردووە هەمووان بەوجۆرە ماچی بکەن".

دەمزانی عەمو هەمیشە دەستەکانی دەشۆردو هەندێك جاریش خەڵکانی نامۆی ناچاردەکرد بەسابوونی دژە میکرۆب ئەو کارە بکەن پێش ئەوەی چاویان پێبکەوێت. سەبارەت بەشۆردن وابەستەیی هەبوو. بەڵام ئەمە ئەوەی ئاشکرا نەدەکرد بۆچی هێشتاش رێگەی بەژنانو منداڵان دەدا روومەتی ماچبکەن. عەمو بەسەر ژناندا دەیقیژاند، بەڵام پێویستی بە ریسواکردنو کەمکردنەوەی پیاوان بوو، تەنانەت لەکاتی تەنهایشدا. هەردەم واهەستیدەکرد جۆرێکە لەخواوەندو لەسەرویانەوە وەستاوە.

لەشەوێکی رەمەزاندا لەخانووی مەزرای پوورە ئەدا هەستم بەناماژەیەکی بچووکی لەخۆبایبوونی ئەو پیاوە کرد. کەشو هەوا خۆش بوو، پاسەوانو چێشتلێنەرەکان لەباخچەکەدا مێزی خوانی بەربانگیان ئامادە دەکرد. هەموومان بەدەوری مێزەکەدا نزامان خوێندو پاراینەوە "خوایە، من بۆ تۆ بەرۆژوبووم، پەنام بەتۆ گرتووەو بەنیازم سبەینێ بەرۆژووبم. خوایە، تکایە لەگوناهی باوەرداڕانو مسوڵمانانی ژن و پیاو خۆشببەو منیش لە گوناهەکانم ببەخشە، بۆخاتری خۆت خوایە گیان".

پاشان پێش ئەوەی بەشلەی نیسكو خورمای ناو ماست رۆژوومان بشکێنین، پێویستبوو چاوەڕانی عەمو بکەین پاڕانەوەکانی لەبەردەمی ئێمەدا بخوێنێ. من هەمیشە نوێژم وەك یادخەرەوەیەکی بێفیزیو ملکەچیمان چاولێدەکرد. کاتێك نوێژمان دەکرد پێویستبوو پێڵاوەکانمان دابکەنینو دەستنوێژ بشۆینو جلوبەرگی

پاك لەبەربکەین. هەموو جارێك کە سەرم دەخسە سەر زەوی‌و کڕنوشم دەبرد، هەوڵمدەدا نەتەنها سوپاسی خوا بکەم، بەڵکو هیچی‌و خۆبەکەم زانینم بەبیر بهێنمەوە، وەك ئەوەی مێرولەیەك بم لەبەردەم خودادا. داپیرەم فێریکردبووم کە هەمووان لەبەردەمی خوادا یەکسانن. بەڵام کاتێك عەمو خۆی بۆ نوێژخوێندن نامادەکرد، بەجلی سەربازییەوە وەستاو پێی بۆ حەننا بەرزدەکردەوە، ئەویش یەکەم تاکی پێڵاوەکەی بۆ داکەندو پاشانیش ئەوی تریان. هیچ خۆبەکەمزانینیەکم تێیدا بەدی نەدەکرد. مەگەر بوونی کارەکەرێك لەبەردەستدا لەکاتی نوێژکردندا راستەوڕاست کارێکی پێچەوانەو هەڵوێردی چەمکی نوێژخوێنی نەبوو؟ ئەوەی بیرخستمەوە کە لەبەردەم خێزانەکەم‌و لەکاتی پێبوونی تەلەفزیۆندا راهاتبووم نوێژم دەکرد، مەبەستمە بڵێم لەبەردەمی پێکەنینی دایکان‌و یاریکردنی منداڵەکاندا، لەبری ئەوەی سەرنجم لەسەر خوا چڕبکەمەوە نمایشمدەکرد گوایە دەزانم نوێژ بخوێنم. مەگەر عەموش هەر ئەمەی نەدەکردو نمایشێکی وازی نەدەکرد؟ پێم سەیربوو، چ جۆرە پیاوێك بوو، کە پێویستی نەبوو تەنانەت لەبەردەمی گەورەیی خوادا سادە بێت؟.

پاش ئەوەی ئێمە هەموو رۆژوومان شکاند، عەمو وەك هەمیشە دەستیدەکرد بەخواردنەوەی ویسکی شیفاس ریگاڵ. ئەوە منی زیاتر توشی شۆك کرد. تەنانەت کەسانی زۆر سیکولاری وەك باوکی منیش کە بەردەوام دەیانخواردەوە، لەبەر رێزگرتنی ئەو ماوە پیرۆزە لە مانگی رەمەزاندا دەستیان لە کهول نەدەدا. رەمەزان بەکاتێکی گرنگ دادەنرێت‌و فەترەیەکە خەڵکی لە کەفوکوڵی ژیان خاودەبێتەوە، رادەمێنێت‌و پەیوەندی لەتەك خێزانەکەی‌و کۆمەڵگا بەگشتی دەبەستێت.

بەیانی داهاتو کاتێك من‌و دایکم پیاسەمان دەکرد، پرسیاری ئەوەم لەدایکم کرد بۆچی عەمو خۆی پێڵاوەکانی بۆ نوێژکردن دانەکەنێ.

وتی "عەمو ئازاری پشتی هەیە، ناتوانێت بچەمێتەوە".

بەڵام هەستمکرد، دواجار بۆ نوێژکردن چەمیبووەوە. بۆچی دەکرێت ئەو جۆرە ئازارە جیاوازییەکی هەبێت لەوەی بچەمیتەوەو خۆت پێڵاوەکانت دابکەنی؟

پرسیم "باشە بۆچی عەمو لەماوەی رەمەزاندا ویسکی دەخواتەوە؟"

بەبێزارییەوە وتی "نازانم زەنوبە، نازانم".

خەڵکی خۆبەزلزانیی و تۆقانی سەدامیام بەهی هیتلەرو ستالین بەراورد دەکرد، پێموایە پێی خۆشبوو، چونکە من دەزانم کتێبەکانی ئەوانی کۆدەکردەوەو هەندێك جاریش خزمەتکارێکی هەبوو بۆی دەهێنا تا دوای خوانی ئێوارە بیخوێنێتەوە. جارنەجارێکیش ناوەکانیانی دەهێنایە ناو گفتوگۆوە، لەگەڵ ناوی کەسایەتییە مێژووییەکانی عەرەب وەك سەلاحەدین کە لەماوەی شەڕی خاچپەرستەکاندا لەدژی مەسیحییەکان جەنگی کرد، هەروەها حامورابیی پاشای مێزۆپۆتامیای دێرین کە بە داهێنانی یاساو رێساکانی بەناوبانگە. سەدام وەك ئەوان تەماشای خۆی دەکردو هەوڵیدەدا لەوانیش زیاتر بێت. ماوەی سێ ساڵ کاری بنیادنانەوەی بۆ باخچە هەڵواسراوەکانی بابلی شا نەبوخزنەسەر کرد، کە یەکێکە لە حەوت سەرسوڕهێنەرە دێرینەکەی جیهان. زۆر خۆشحاڵ بوو بەپرۆژەکانی وەبەرهێنانی ئەم دواییەی‌و زۆر پەلەی بوو پیشانی ئێمەی بدات.

بۆ شەوە ئاهەنگێك بانگهێشتکراین. بۆنەیەکی زۆر گەورە بوو، نمایشی سەرەتاو کردنەوە بوو. لەسەرتاسەری جیهانەوە گروپەکانی میوزیك‌و نمایشکاران هێنرابوون. باوکم لەماڵەوە نەبوو، ئێمە لەگەڵ مامە قەیس‌و خێزانەکەیدا رۆشتین. کامێراکانی تەلەفزیۆن روویان لەسەرمان بوو کاتێك دەچووینە ناو فیستیڤاڵی بابلەوە، لەوێ سەماکەری بولگاری‌و کچە سەماکەری باڵی روسی ئامادەبوون‌و رووبەرووی کورسییەکانی ریزی پێشەوە رێکخرابوون. مامە قەیس یەکێك بوو لە کەسانی ناودار، کچەکانیشی بەسەر بەرزی بۆ پێشەوە دەڕۆشتن، دەڵێی راهاتبوون لەسەر فەرشی سور رێبکەن‌و چێژیان لە گرنگی‌و سەرنجپێدان وەردەگرت. من لەدوای ئەوانەوە رێمدەکرد، پەشۆکابووم کاتێك زانیم وەك کەسانی زۆر گرنگ‌و دیار سەیرماندەکەن. دایك‌و باوکم گەلێ جار ئاخنیبوویانە مێشکمانەوە کە هەرگیز نابێت دەربارەی پەیوەندیمان بە عەمووەوە بەهیچ کەسێك بڵێین بۆیە توشی سەرسوڕمان بووم کە خەڵك بەو شێوەیە تەماشایان دەکردین. راستی نەمدەویست کەس بەو شێوەیە تەماشام بکات. پێمخۆشبوو نەبینرێم.

بەڵام سەرنجڕاکێشترین بەشی ئەو بۆنەیە خودی بابل خۆی بوو. بۆ زۆر شوێنەواری مێژووی رۆیشتبووم، هەر لە ئەسیناوە تاوەکو ریۆ. لە گرنگی

پاراستن و مانەوەی مێژوو تێدەگەیشتم. دەمزانی جوانی شوێنەوارێکی مێژوویی لە کۆنی و تەمەنەکەیدایە، لە بەهێزی دروستکردنەکەیدا لە دژی لەناوچوون، لە پێکهاتەو ڕێکخستن و تەنانەت لە بۆنی خشتە دێرینەکانیدایە. بەڵام ئەم شارە بەتەواوی نوێ بوو. لەبڕیارەکەیدا بەسەر نەبوخەزنەسەردا، عەمو دارمانەکانی کۆنی نەهێشتبوو. کاتێك من و دایکم بەپێ پێیدا تێپەڕبووین و تێگەشتین چ کارێکی کردووە، نەماندەزانی پێبکەنین یاخود بگرین. لەسەر لوتکەی خشتە دێرینەکان نووسراوێکی مێژوویی نووسرابوو "لەزەمانی نەبوخەزنەسەردا بنیادنراوە" ئەویش هەزاران خشتی زەردی نوێی دروستکردبوو، لەسەریان نووسرابوو "لەسەردەمی سەدام حسێندا دروستکراوە".

ئەو شەوە هەستێکی باشترم هەبوو بەوەی باوك و دایکم وازیان لە ململانێکانیان دژی عەمو هێنابوو. پوورە نەداو مامە قەیس بەئاشکرا پەیوەندییان لەگەڵ عەمودا نمایشدەکردو سودیشیان لە پەوەندییەکانیان وەرگرتبوو بۆ بازرگانیکردن و ڕاپەڕاندنی کارەکانیان و گەشەپێدانی سامانەکەیان. دەیانتوانی زیادەڕەوییەکی زیاتر لە خەرجکردنی پارەدا بکەن، بەڵام خێزانی ئێمە لەسەر موچەی فرۆکەوانێکی پرۆفێشناڵ نەماندەتوانی ڕێبەخۆمان بدەین، تەنانەت بەمیراتەکەی دایکیشمەوە کە هاوسەنگی زیادکردنی خەرجیمانی رادەگرت. ئێمە خێزانێکی چینی ناوەندی پرۆفێشناڵ بووین کەوتبووینە نێوان دوو جیهانەوە. ئەو خەڵکانەی لەو شەوەدا تەماشایان دەکردین بەکەسانی ناو کۆشکیان دادەنایین، خێزانەکانی کۆشکیش تەنها وەك بەشێك لەو خەڵکە لێیان دەڕوانین. ئێمە ئەندامی بازنەی هاوڕێکانی عەمو بووین، بەڵام ئەو ئەندامانی کۆمەڵی شیعەی دەچەوساندەوە. ئێمە نە سەربە جیهانی بەدەسەڵات بووین نە سەربە جیهانی بێ دەسەڵات بووین. من لەنێوانیاندا گەشتم دەکرد، بێئەوەی بتوانم بڕۆم بۆ لای یەکێکیان و ئەوی لای ئەمیان بینیبووم بگێڕمەوە یا باسبکەم.

فشاری دارایی لەسەرمان زۆر بوو و دژواربوو لەئاستی پێویستدا بمێنینەوە، بەئەندازەیەك شەوێکیان دایك و باوکم شەڕێکی گەورەیان بوو لەسەر ئەوەی چۆن بەرخورد لەگەڵ ئەم گرفتەدا بکەن و لەوەدا دواییهات، دایکم من و برا بچوکەکەمی برد بۆ خانووی مەزراکەو حەیدەر لەگەڵ باوکمدا لەماڵەوە مانەوە.

من نزیکەی هەژدە ساڵان بووم‌و کاتی چوونە کۆلێژم بوو، کەچی لەپڕ خۆم لەخانووی مەزراکەدا بینییەوە، بەتەواوی لەناوەڕاستی بیابانێکی وشکدا لە وەرزی هاویندا بەندبووم. دایکم‌و باوکم ماوەی مانگێك دەبوو پێکەوە قسەیان نەکردبوو کاتێك رۆیشتینەوە بۆماڵەوە بۆ ئەوەی جلوبەرگی زیاتر بهێنین، گەشتین‌و دەستبەجێ دەستیان کردەوە بەشەڕو دەمەقاڵێ. ئەڵێی بەڕاستی دیوارەکان گوێیان هەبوو؟ چوون تەلەفۆنەکە زەنگی لێدا، لە کۆشکەوە بوو، وتی عەمو دەیەوێت بەزووترین کات هەردوکیان لە خانووی ناو مەزراکە ببینێ. تەنانەت جانتاکەم نەکردبووەوەو حەزم لەو بیرۆکەی راستەوڕاست گەڕانەوەیە نەبوو. بۆیە یەکسەر دایك‌و باوکم بە ئۆتۆمبێلی جیا رۆیشتن‌و دایکم پەیمانیدا شۆفێرێك بنێریتەوە لەدووم. یەکەمجار بوو بەتەنها لەماڵەوە بم زۆرم لا خۆشبوو، تەماشای شتە ناشناکانی دەوروبەرم دەکرد کە بۆ ماوەی مانگێك بوو نەمبینیبوون، هەستمدەکرد هیچ شتێك بەو چەشنەی دەبوو ببێت نەمابوو. چیتر زۆر بەکەمی هاوڕێمان هەبوون. بەدەگمەن ئامۆزاو خاڵۆزاکانم دەبینی— پێویستبوو بەردەوام لەخانووی کێڵگەکە بین، هەستمدەکرد هەندێکیان بەشێوەیەك تەماشای ئێمەیان دەکرد وەك ئەوەی بەڕاستی "هاوڕێی سەدام" بین. من دەمویست هەڵێم. بیری داپیرەم دەکرد، عەباکەیم دەرهێناو لەبەرمکردو رۆیشتمە خوارەوە بۆ لای رێگا یەکتربڕەکەی نزیك ماڵەکەمان. تەکسییەکم راگرت‌و سواربووم. کە دەستی بەڕۆیشتن کرد، کەمێك هەستم بە ترس لەو سەرەڕۆییە دەکرد. خەریکبووم یاساکانم دەشکان. لە فەرمانەکانی دایك‌و باوکم دەردەچووم. کچێکی گەنج بووم بەتەنها بۆ شوێنێکی گشتی دەڕۆیشتمە دەرەوە، هاوڕێکانی کۆشکم‌و تەنانەت دایکیشم دووچاری ئابڕوچوون دەبوونەوە. بەشۆفێرەکەم وت بڕوات بۆ مزگەوتی کازمییە کە یەکێك بوو لەهێماو دروشمەکانی بەغدا خۆی، بۆ یەکەمجار کە دایکم باسی عەموی بۆ کردم، کاتێك بوو بۆ ئەو شوێنە پیرۆزە دەڕۆشتین.

کاتێك گەشتم، رۆیشتمە ناو حەوشەکەو لەوێ بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لەناو ئاپۆرەی سەدان ژنی تر کە هەر وەکو من جلیان پۆشیبوو بەئاسودەیی مامەوە.

نوێژم خوێندو پاڕامەوە "تکایە خوایە، شتێکمان بۆ بکە، تکایە خێزانەکەم

رزگاربکە، تکایە شتێکمان بۆ بکە. تکایە لەم زیندانە رزگارم بکە، خودایە".

لەکاتێکدا من لە مزگەوتەکە بووم، عەمو لە پرسوجۆی رزگارکردنی خێزانەکەمدا بوو. وەك دەرکەوت، هۆکاری بانگکردنی دایكو باوکم بۆ خانووی کێلگەکە هەوڵدان بوو بۆ ئاشتکردنەوەیان. عەمو، کە بەزۆر قۆناغدا تێپەڕیبوو، خۆی وەك راوێژکاری هاوسەرگیری دەبینی. کاتێك ئەو شۆفێرەی دایكو باوکم ناردیان زەنگی بۆ کردبوون لەمەڕ ئەوەی من دیارنەماوم، یەکسەر عەمو پێی وتبوون "زەینەب دەیەوێت پەیامێکتان بەگوێدا بدات. هەڵهاتووە تا سەرنجتان بەلای خۆیدا کێشکات. دەیەوێت پێکەوە بگەڕێنەوە. بۆیە لەسەرتانە ئەم کارە ئەگەر تەنها لەبەر خاتری ئەویش بووە ئەنجامبدەن".

گشت ئاواتی ئەو رۆژەم بوونم بوو لەگەڵ خەڵکانی ترو ئازادیم بوو لە عەمو، پاسەوانەکانو چاودێری. بەڵام دواتر تێگەیشتم کە عەمو تیمی گەڕانی بۆ دۆزینەوەی من ناردبوو بۆ ئاهەنگەکان. پۆلیس تەنانەت بەئاشکرا مزگەوتەکەش گەڕان، بەڵام منیان نەدۆزییەوە. دواتر لەخۆم دەپرسی، ئاخۆ چەندجار سەربازەکانی عەمو لەو مزگەوتە گەنجی هەژاری شیعەیان بارکردووە بۆ دوورخستنەوەیان بۆ ئێران یان کردنیان بەسەرباز، یاخود بۆ ترنجانە زیندانو ئەشکەنجەدانیان بەهۆی نوێژکردنەوە. داخۆ گەڕان بەدوای مندا نەبووە هۆی ئازار بۆ کەسی دی؟ ئاخۆ من کەسی ترم نەخستبووە مەترسییەوە وەك چۆن باوکم ئەو کوڕەی گەڕەکەکەمانی خستە مەترسییەوە ئەو شەوەی عەمو هات بۆ سەردانمان؟ داخۆ هەوڵەکەم دۆعایەك بوو لە لەدەستدانی خۆشەویستەکانم وەك هاوپۆلییەکانم، ئەیپاراستم، یان ئەفرەتێك بوو ئەو کارەی ئەستەم ئەکردەوە بەئاسانیو وەك کەسانی تر ونبم؟

کاتێك ئاخریەکەی خۆم هاتمەوە بۆ ماڵ، دایكو باوکم هەردوکیان لەوێ چاوڕێی منیان دەکرد. دەستیان کرد بە لەئامێزگرتنمو داوای لێبوردنیان کرد بەهۆی دەمەقاڵێو شەڕەکەیانەوەو وتیان هەموومان گەڕاوینەتەوە ماڵ. داخۆ کاری کۆتایی ئەو رۆژەم رەفتاری منداڵێکی نالەبار بوو؟ دڵنیا نەبووم ئاخۆ من دایكو باوکم ئاشتکردبووەوە یان عەمو، بەڵام هەرگیز بۆ راکردنی ئەو پاشنیوەڕۆیە سەرزەنشتیان نەکردم.

عەموش هەرگیز سەبارەت بەوە هیچی پێنەوتم، بەڵام ئاشکرا من توانای زۆری خۆم نیشاندا کە ئەتوانم رۆڵم هەبێت لە پاراستنی هاوسەرگیری دایك و باوکمدا. دایکم بۆی باسکردم کە عەمو حەزی لەو "گیانی خۆدانە بەرمەترسیەی"من هەبووە.

# لەبیرەوەرییەکانی عالیاوە

لەو ماوەیەدا سەدام چووە ناو چیای بیناکانیەوە لە بەغدا. سێ چیای دروستکردو بەچیاکانی نەبوخەزنەسەر لە بابل بەراوردی دەرکردن. هەر سێ مانگ جارێك کۆشکێکی دروستدەکرد، ئێمەش بۆ ئاهەنگی کردنەوەی هەریەکە لەو کۆشکە نوێیانە بانگهێشت دەکراین‌و حەزی لە نیشاندانیان دەکرد. جارێك جارێ ئەوەی دا کە خۆی دیزاینی نزیکەی ١٥٠ لە کۆشکەکانی کردوون. دەریاچەی نوێی بەدەوری کۆشکەکانیدا بنیاد دەناو جەختیشی لەوە دەکردەوە دەبێت سەرشارکرابن بە ماسی. ئەگەر نەیتوانیایە ماسی بگرێت، بۆمبێکی دەستی فرێدەدایە دەریاچەکەو چەندی بکرایە ماسی دەکوشت.

لەو ماوەیەدا زۆرجار باسی گەردون‌و خودای دەکرد. دەیووت خوا بەتەواوی بەچیاو درەخت‌و ئاژەڵەکان قایل نەبووە، بۆیە مرۆڤەکانی ئافەریدەکردووەو فەرمانی پێکردوون بەشەوو رۆژ بیپەرەستن. ئاسودەیی خودا زیادو زیادی کرد کاتێك فەرمانی بە مرۆڤایەتی کرد بە رۆژو شەو ناوی بهێنن‌و پەرستشی بکەن. سەدام هەستی خودایی بەهەستی سەرکردەیەك بەراورد دەکرد. بانگەشەی ئەوەی دەکرد سەرکردەیەك بەبێ ئەوەی خەڵك شوێنی بکەون‌و بیپەرەستن، ئیدی سەرکردە نییە. سەرکردە پێویستی بە خەڵکە بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن تا بتوانێت دەسەڵات‌و هێزی خۆی جێبەجێبکات‌و کامڵکردنی ئەم هەسارەی زەوییە بەدوا پنتی بگەیەنێت.

# دەسپێکی سپی

هەر لەو کاتەوەی باوکم شەربەتی فرێشی بۆ ئامادە دەکردمو دەیهێنایە سەر مێزەکەم، تا پاساوم نەبێت بۆ خواردنی شتێك دەست لە ئەرکەکانی قوتابخانە هەلگرم، ئەرزشی خوێندن لەمێشکمدا چەسپیبوو. لەودەمەی لە دەرچوونی قۆناغی ئامادەیی نزیك ببوومەوە، زانکۆم تەنها وەك شوێنی خوێندن نەدەبینی بەڵکو وەك رێگەیەك دەهاتە بەرچاوم بۆ دەربازبوون لەو ژیانەی تێیدا بووم. بێگومان هەموو ئەو کچە گەنجانەی پشووی هەفتەم لەگەڵدا بەسەردەبردن دەچوونە کۆلێژ، بەلام بەلای ئەوانەوە وەك کۆتا خالی تایبەتی ژیانیان وابوو. دایکی هەمووماں زانکۆیان تەواو کردبوو خەریکی پیشەی خۆیان بوون. زۆرێکیان بەدرێژایی ژیانیان بەردەوام بوون لە کارکردن، هاوسەرەکەی سەدام بەردەوام بوو لە کارکردن تەنانەت دوای ئەوەی مێردەکەشی بووە سەرۆك. زۆربەی ئەو کچە گەنجانەی دەمناسین زانکۆیان وەك شوێنێك دادەنا بۆ دۆزینەوەی هاوسەری ژیانیانو دوای ئەوە دەچوونە ژیانێکەوە کە تێیدا سەرقالی منداڵو ژینگەی کۆمەڵایەتییان دەبوون.

ئەوە ئەو ئامانجە نەبوو من خوازیاری بووم. لەوکاتەی خوێندکاری ناوەندی بووم، خەونم بە پیشەیەکەوە دەبینی کە تەنها باش نەبم تێیدا، بەڵکو خولیاگەری ئەو پیشەیە بمو شتێك بێت رێگەم بۆ خۆش بکات تا گەشت بکەمو خەڵکی جیهان ببینمو ئاشنام بکات بە ئەدەبو هونەرو کولتوری بیانی. بەهۆی گەشتو ئەو ساڵانەی خوێندنەوە ئینگلیزییەکەم رەوان ببوو هەروەها کەمێك فێری زمانی فەرەنسیش ببووم، بۆیە پلانمدانا لە کۆلێژ بواری سەرەکیم بکەمە وەرگێڕانو بەڵێنێکی دورمەودا لە باوکم وەربگرم تا بۆ خوێندنی دکتۆرا بمنێرێتە دەرەوە یاخود کار بۆ وەزارەتی دەرەوەی عێراق یانیش دەزگایەکی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەم. بڕوانامەی دکتۆرا لەزمانەکاندا دەبووە پاسپۆرت بۆ ئازادبوونمو پەیمانم بەخۆمدا لە تەمەنی بیستوشەش ساڵیدا ئەو بڕوانامەیە چنگ خەم.

خوێندکارانی قوتابخانە ئامادەییەکان نەیاندەتوانی بەئاسانیو بەخواستی خۆیان داواکاری پێشکەش بە زانکۆکان بکەن یاخود بوارەکانی خوێندنیان هەڵبژێرن. دەمانتوانی تەنها بەئارەزوو دەربڕین ئەو بەشانەی لامان پەسەند بوو ئاماژەی بۆ بکەین، بەڵام چارەنووسمان لەسەر سیستمێکی ژمارەیی توند بەندبوو کە نمرەی پتری دەبەخشییە ئەوانەی لە حزبی بەعسدا ئەندامبوون یاخود ئەوانەی تاکێکی خێزانەکەیان کوژرابوو یان هەرنەبێ کەمئەندام ببوو لە جەنگدا. من بەهیچ شێوەیەك ئەو نمرە زیادانە نەیگرتمەوە، لەبەرئەوە زۆر ئاسوودە بووم کاتێك نمرەیەکی بەرزم هێناو یەکەم بژاردەم وەریگرتم کە بەشی زمان بوو لە زانکۆی موستەنسریە، واتە دووهەمین زانکۆی گەورە لە عێراقدا. ڕشتەی خوێندنەکەم لە زمانی عەرەبیو ئینگلیزیو فەرەنسیدا بوو.

یەکەم ڕۆژی زانکۆ دەستپێکێکی تازەو نوێ بوو بەلامەوە. پۆشاکێکی تازەم لەبەرکردبوو، دایکم ئوتومبێلە کۆنەکەی پێدابووم‌و خۆم لێمخوڕی بۆ زانکۆ. هەستم بەسەربەستییەکی زۆر دەکرد کاتێك چوومە نێو ئەو گۆڕەپانە گەورە مۆدێرنەی زانکۆوە کە هەزارەها خوێندکاری تازەی تێدابوو لەوەوپێش نەمبینیبوون. خوێندکارە تازەکان دەبرانە لای خوێندکارانی ساڵانی پێشوو بۆ ئەوەی ڕێنوێنییان بکەن. بەو کەسانەیان دەگوت (ڕەفیق)و ناونیشانێکی بەعسی بوو بەمانای هاوڕێ یاخود هەڤاڵ دێت. ڕێنیشاندەرەکەی من کوڕێکی گەنجی قۆز بوو، دواتر دەرکەوت لێپرسراوێکی خوێندکارانی حزبی بەعسە. ئەو حزبە لە زانکۆشدا کاراو چالاك بوو، کاتێکیش بانگێشتی کۆبوونەوەی حزبی بەعس دەکرام دەمزانی هەر دەبێت بڕۆم. وەختێك مامۆستا باسی ئەو دروشمەی بەعسی دەکرد کە دەڵێت "جێبەجێی بکە پاشان گفتوگۆی بکە"، دەستم هەڵبڕیو زەردەخەنەیەکم کردو پرسیارێکم کرد.

بەدەنگێکی نەرم پرسیم "بۆچی؟ پێویستە بزانم چی جێبەجێ دەکەم پێش ئەوەی ئەنجامی بدەم، مەگەر وا نییە؟"

ژوورەکە ورتەی لێبڕاو کشومات بوو. مامۆستاکە گرژ بوو، زەردەخەنەیەکی نابەدڵانەی کرد. هەستم پێکرد هەوڵیدەدا نەرمونیان بێت لەگەڵم، چونکە تازە بووم.

گوتی "ئەگەر هەموو کەسێك گفتوگۆ لەسەر هەموو فەرمانێك بکات ئەوکات هیچ شتێکمان بۆ ناکرێت. پێویستە لەبڕیاردانـدا متمانـەمان بەسـەرکردەکانمان هەبێت، لەبەرئەوە دەستبەجێ فەرمانەکان بەجێدەهێنین‌و خۆمان بـەدووردەگرین لە دواخستنی کارو چالاکییە گرنگەکان".

وامدانابوو لەچوارچێوەی زانکۆدا هەندێك هەل‌و بوار هەیـە بـۆ گفتوگۆکردن، وەلێ هەڵە بـووم. هـەرزوو بـۆم دەرکـەوت لەهـەر پۆلێکدا لانـی کـەم دوو سـێخوڕی بەعسی تێدایە، زۆرێك لە مامۆستاکانی زانکۆو بەو مامۆستایەشـەوە کە ئـەو ڕۆژە وانەی پێگوتین ئاواتەخوازی هەڵاتن بوون لـە وڵات. وێـڕای ئـەوەش، بـۆ یەکـەمجار لەدوای ماوەیەکی زۆر هەستمکرد جیهان بەڕوومدا دەکرێتەوە. لەوکاتەی دەچومە زانکۆ گریمانەی تازە هاتە ئاراوەو هەستێکی نوێی ئارامی باڵی بەسەر ماڵەوەماندا کێشاو بەوەی جارێکی تر هەموومان لـە گـەڕەکی ئێـرلاینس (فرۆکـەوانی) پێکـەوە دەژیاین، دایکم ماندوێتی ڕەوایەوە. بـاوکم وەك جـاران لـەماڵ دوور نەدەکـەوتـەوە هەروەها چێشتلێنەرێکمان بەکرێ گرت‌و کۆتایی هێنا بەو لێکڕازینەبوونـە کەمـەی لـەنێوان دایـك‌و باوکمدا هـەبوو، ئـەویش لـەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتبـوو کـە لەوکاتەی باوکم لە گەشتێك دەگەڕایەوە دایکم هەردەم دەیویست لەگەڵیدا بچێتە دەرەوەو باوکیشم حەزیدەکرد لەماڵەوە بمێنێتەوەو چێشتی ماڵەوە بخوات. کاتێـك لە زانکۆ دەگەڕامەوە ماڵەوەو لە دەرگاکە دەچوومە ژوورەوە بـۆنی ئـەو خواردنـە خۆشـە دەهـات‌و خـوانی نیـوەڕۆ بـە زەڵاتـەو پێشـەکییەوە لەسـەر سـفرەی ڕازاوە پێشکەش دەکرا.

ڕۆژێکیان برنج بەپاقلەمان هەبوو، مـن کەوتمـە باسـکردنی هـەموو وانـەکانم‌و هـاوڕێ تازەکـانم، باوکیشـم هـەمان چەشـنی تاقیکردنـەوە دەسـتیکرد بـە پرسـیار لێکردنم. ئەم هاوڕێ تازانەت لەکوێ دەژین؟ دایك‌و باوکیان کێن؟ ژمارە تەلـەفۆنت داوە بەهیچیان؟ بۆ چـەند هەفتەیـەکی پڕشـادی‌و کـەم یاسـاو ڕێساکانم لـەبیرخۆم بردبووەوە. دەبوایە باشتر ئاگاداربوومایە.

"لەبیرت بێت، هاوڕێکانت لەبەر باوکت هاوڕێتن".

لەکۆتایی خوانەکەدا بووین، باوکم دوای بیرکردنەوەیـەکی قـوڵ ڕووی بەلامـدا وەرگێڕاو ئەو قسەیەی کردو مێزەکەی جێهێشت. چەتاڵەکەم لەسەر قاپەکە دانـاو

دیقەتمدا دایکم رووی تێکردمو دەستبەجێ زانی هەست بەچی دەکەم، بەڵام نەیدەویست نیگامان یەکانگیر بێت. هەرگیز ئەو رستەیەم بیرناچێتەوە. بەڕاستی بەو قسەیەی ئازاری پێگەیاندم، چوون هێندە لەپڕ ئەو قسەیەی کرد. لەگەڵ بەخەیاڵمدا دەهات دەرفەتێکم بۆ هەڵکەوتووە لەڕێیەوە بتوانم شوناسی خۆم دروست بکەم، باوکم ئەو هەڵەی لێدەبردم. خەڵکی لە زانکۆ خۆشیاندەویستم، پێموابوو لەبەرئەوەیە کەسێکی چاك بووم یاخود خوێندکارێکی باش بووم یانیش رەنگە لەبەرئەوە بوبێت من خۆم بووم. بەڵام بەتاکە دەستەواژەیەك باوکم ئەو هەموو گریمانە بێماناپانەی سەراوبن کرد. مەگەر ساویلکەیی بوو کە پێموابوو خەڵکی لەبەرخاتری خۆم خۆشیاندەویێم؟ چۆن بمتوانیایە باس لەو جیاوازییە بکەم؟ وەختێك بیرم لێکردەوە، لە قوڵایی ناخمدا درکم دەکرد ئەوە رێکەوت نەبوو کە لێپرسراوێکی حزبی بەعس لە زانکۆ بووە رێنیشاندەرم. داخۆ دەیزانی باوکم کێیە؟ دەیانزانی هەموو کەس کێیەو چییە.

بەلامەوە گرنگ نەبوو چیتر باوکم فڕۆکەوانی سەدام حسێن نییە یاخود تەنها بۆ چەند ساڵێکی کەم فڕۆکەوانی ئەو بوو، ئەو ناونیشانە ئیدی بەسەرماندا بڕابوو و خەڵکی هێشتا پێیان دەگوت فڕۆکەوانەکەی سەدام. بەدایکمیان دەگوت ژنی فڕۆکەوانەکەو منیشیان بەکچی فڕۆکەوانەکە بانگدەکرد. تەوژمێك لە بێباکی دایپۆشیبووم. گرنگ نەبوو چەند بەقورسی کارم دەکرد، باکم نەبوو دەبوومە چی، هەردەم بەهۆی سەرنشینەکەی باوکم یاخود بڵێین سەرنشینەکەی پێشوویەوە دەناسرامەوە، ئەو سەرنشینەی (سەدام) کە ملیۆنەها خەڵك لێی تۆقیبوون.

وێنەیەکم هەیە لەساڵی یەکەمی زانکۆداو لەبۆنەیەکدا بەجلوبەرگی یەکپۆشی زانکۆوە گرتوومە، تیایدا سەدام رێز لەو ژنانە دەنێت کە ئاڵتونیان بەخشیبوو. لە وێنەکەدا بەسۆزەوە زەردەخەنەم بۆ دەکاتو هەردوو دەستی خستوەتە سەر شانم، منیش زەردەخەنەم کردووە، بەڵام دەستم بەرداوەتەوەو توند بەیەکەوە گوشیومە. ئەو جارەیان دەمزانی ئەوە چ شەرمەزارییەکە، ئەو گوڵیەخەیەی لەو رۆژەدا بۆ بەخشینی ئاڵتون بە یەخەیەوە کردم خۆی ئاڵتونی بوو. رۆژی دواتریش کە لە زانکۆ پیاسەم دەکرد، خەڵکی دەستیان بۆ ڕادەکێشامو بەوردی تەماشایان دەکردم. بینیبوویان چۆن سەلامی لێ کردبوومو منیش چۆن

زەردەخەنەم بۆ کردبوو. دەیانچرپاندو دەیان گوت "ئەوە خۆیەتی، ئەوە کچی فرۆکەوانەکەیە".

ئەو گۆڕانکارییەم بینیبوو کە بەسەر دایك و باوکمدا هاتبوو، چونکە زیاترو زیاتر وەك دانیشتووی ناو خانووی مەزرایان لێهاتبوو. داخۆ ئەوە بەسەر منیشدا دەهات؟ ئاخۆ دواجار لەو شەڕو شۆڕە دەستهەڵدەگرم و ڕێگەیەك دەدۆزمەوە تا لێوەی دەربچم؟ دەمزانی ئەوان هەرگیز نابنە باوەڕداری ڕاستەقینەی وەك مامە قەیس و پوورە نەدا. بەڵام هەتاکو زیاتر بەچارەنووسیان ڕازیبوونایە، من زیاتر سوور دەبووم لەسەر بەربەرەکانێکردن لەگەڵ چارەنووسمدا. خوێندن تاکە ڕێگە بوو بۆ دەربازبوون. زمانی فەڕەنسی تازەترین زمان بوو بۆم، بەڵام زۆر خراپ بووم تێیدا لەبەرئەوە خۆم ناونووس کرد بۆ خوێندنی وانەی چڕوپڕ لە پەیمانگای فەڕەنسی و لەهەر هەفتەیەکدا سێ شەو و هاوزەمان لە تەواوی وانەکانی زانکۆشدا ئامادە دەبووم. لە وانەی شەوی یەکەمدا نەمدەتوانی سەرنج بخەمە سەر وانەکە کاتێك کوڕێکی گەنج لەتەنیشتمدا دانیشتبوو بەشپرزەییەوە قاچێکی دەلەقاند. لەبەرئەوەی مێزەکانمان بەیەکەوە بەسترابوونەوە ئەو جوڵە جوڵە وایلێکردبووم نەتوانم سەرنج بخەمە سەر وانەکە. بەڕێزەوە قەڵەمەکەم تێوەژەنی و بە زەردەخەنەیەکەوە پێمووت "تکایە وامەکە" ئیتر دووبارەی نەکردەوە. لەکاتی پشوودا، من و ئەو کوڕەو دوو خوێندکاری تر (کە ژن و پیاوێکی بەتەمەنتر بوون) لە کۆگایەکی بچووکدا کە پیاوێکی میسری مێزێکی بچووکی ساردەمەنی و شیرینی تێدا دانابوو، پێکەوە دەستمان کرد بە قسەکردن.

ناوی ئەو کوڕە گەنجە ئیهاب بوو. لەکۆتایی وەرزی یەکەمدا ئەو دوانەی تر پەیوەندییان دروستکردو بەئاشکرایی حەزیان بەیەکدا چوو بوو، هەروەها من و ئیهابیش لەلای خۆمانەوە زیاتر لە هاوڕێیەتی و گاڵتەو گەپدا قوڵبووینەوە. ئەو باڵا بەرزو ڕێك و قژێکی قاوەیی سورباوی هەبوو، چەند ساڵێکی کەم لەمن گەورەتر بوو، هەروەها بەوپەڕی لەخۆڕابینییەوە دەهات و دەڕۆیشت. گەنجێکی قۆزو کەشخە بوو، نەك لەبەرئەوەی مارکەی کابۆ بەناوبانگەکانی لەبەردەکرد یاخود پارەی کڕینی مارکە باشەکانی جلوبەرگی هەبوو، بەڵکو شێوازێکی ناوازەی هەبوو بۆ پۆشینی ئەو شتانەی لێی جوان بوون لەگەڵ چۆنیەتی گونجاندنیان. لەو

کۆگا بچووکەدا پێکەوە لەسەر کورسی پلاستیکی سپی دادەنیشتین‌و باسی شیعرو ئەدەبمان دەکرد. ئەو هەردەم کتێبێکی شیعری بەدەستەوە بوو، پێکەوە شیعرەکانمان بەدەنگی بەرز دەخوێندەوە. نەمدەتوانی وەك ئەو بم، بەڵام سەیری لێوەکانیم دەکرد کە کەمێك دەرتۆقیو و سوری تۆخ بوون. هەستێکی لەرادەبەدەرم بۆی هەبوو. ئەو لە دونیای کتێبدا دەژیا، منیش بەهەمان شێوە. ئیتر لەو دنیا بەپێزەدا هاوبەشی یەکتر بووین. ئەو لە شاعیرە رۆمانتیکییە بەریتانیاییەکانی وەك بایرن [10](Byron)و شێلی (Shelley[11])، هەروەها رۆماننووس گابریێل گارسیا مارکێز، نووسەرە عەرەبەکانیش مەحمود دەرویش‌و نەجیب مەحفوز توابووەوە. کتێبەکانی بەقەرز پێدەدام، منیش لە خانووی مەزراکەدا بەپەرۆشییەوە دەمخوێندنەوەو پێکەوە دەستمان دەکرد بەگەنگەشەکردنیان هەروەك زاخاوی دەبەخشییە مێشکی تەنیام. کاتێك لوماو ساراو تەمارا مقۆمقۆیان لەسەر خۆشبەختییەکانی هاوسەرداری لوما دەکرد بە مێردێکی رێکوپێك، من کتێبی (Love in the Time of Cholera) "خۆشەویستی لەسەردەمی کۆلێرادا"م دەخوێندەوە.

هەرگیز بەشێوەیەکی کەمەند کێشکەرانە خۆم دەرنەخستووە. بەزۆری سەرنجم لەسەر نامانجەکانم بووە. بەڵام پێش ئەوەی کتێبی "خۆشەویستی لەسەردەمی کۆلێرادا"ی بۆ بگێرمەوە چوومە ژوورەکەی خۆمەوەو لاپەرەکانیم بەعەتر پرژاند. جاری دواتر کە کتێبێکی پێدام، شیعرێکی لەسەر پارچە کاغەزێك خستبووە ناویەوە. شتێك بووە هۆی روودانی شتی ترو لەپشووی پێش دوا کاژێری وانە نەدەچوینە پۆلەوە بۆئەوەی بەردەوامبین لەسەر گفتوگۆکانمان دەربارەی ئەدەب. پاشان، شەوێکیان شیعرێکی خۆشەویستی بۆ خوێندمەوە کە وەسفی تایبەتمەندییە جوانەکانی ژنی دەکرد؛ چاوە جوانەکانی، دەم‌و لێوی، بۆنی خۆشی. ئەوە یەکێك بوو لە رۆمانسیترین شیعر کە لە ژیانمدا بیستبووم.

---

[10] (١٧٨٨-١٨٤٢) جۆرج گودن بایرن: شاعیری گەورەی بەریتانی، شیعرەکانی بەسەر رەوتی شیعری رۆمانتیکییەوە لەو کیشوەرە کاریگەرییان دانا) و.ك.

[11] (١٧٩٧-١٨٥١) کچی ماری وڵستۆنیکرافت و ولیام گۆدفین. نووسەری بریتانییەو ناوی ناوبانگی لەگەڵ نۆفیلێتی "فرانکشتێین، یان پرۆمیسیۆسی مۆدێرندا" پەیداکرد.) و.ك.

بەشەرمەوە گوتی "خۆم نووسیومە".

ئەیگوت بۆ منی نووسیوە، بەڵام دەمزانی مەبەستی من بوو.

گوتم "سوپاس ئیهاب". لێی نزیکبوومەوەو دەستم خستە سەر دەستیو هەستم بەگەرمی دەستی کرد. ئەو کارە زۆر بوێرانە بوو، دەستم لەسەر دەستی هێشتەوە، یەکەمجار بوو دەستی لێ بدەمو هەستم بەخۆشییەکی زۆر دەکرد. بۆ ماوەیەکی زۆر تەماشای چاوەکانی یەکترمان کرد. هەردوکمان دەمانزانی یەکمان خۆشدەوێت.

بەوجۆرەی کە باوە، کچێکی گەنجی ڕێکوپێکی مسوڵمان نابێت بەتەنها لەگەڵ پیاوێکدا بێت. لە کولتوری عێراقداو بەشێوەیەکی گشتی لە کولتوری عەرەبدا، ژووان بەستن ڕێگە پێنەدراو بوو (ئێستاش ڕێگە پێنەدراوە) تاوەکو لەیەکتر مارە دەکرێن. بەڵام بەهەر شێوەیەك بێت زۆربەی هاوڕێکانم دڵدارییان دەکرد، هەندێك جار بەو کارەم دەوت (دڵداری ژێرزەمینی). کچانو کوڕان شوێنیان دەدۆزییەوە تا بە تەنیا یان بە گروپ یەکتری تێدا ببینن و بەشێوەیەکی ڕێکوپێك یەکتر بناسن بەبێ بەستنی پەیوەندی سێکسی، چونکە کچان لەشەوی بوکێنی دەبوایە پاکیزە بوونایە. کەسم نەدەناسی باسی دڵداری بۆ دایكو باوکی کردبێت، بەڵام ئەو شەوە هەرکە گەیشتمەماڵەوە بەدڵێکی خۆشەوە رامکرد بۆ ژوورەکەی دایکم. هێشتا دایکم باشترین هاوڕێم بوو، دەمزانی کە باوەڕی بە خۆشەویستیو لادان لە ڕێساکان هەبوو. لەقۆناغی ئامادەییدا دایکم هەردەم پرسیاری لێدەکردم داخۆ دڵم هیچ کەسێکی نەگرتووە، کاتێك دەمگوت نەخێر هەناسەیەکی ساردی هەڵدەکێشا.

پێمگوت "دایکە کەوتوومەتە تەونی خۆشەویستییەوە".

گوتی "وای، ئازیزم چەندە خۆشە. ئادەی، ئادەی بۆم باس بکە".

گوتم "شیعرێکی زۆر ڕۆمانسی بۆ نووسیوم. دایکە، ئەو زۆر جوانو قۆزە، دەستم خستە ناو دەستییەوە".

دایکم کەیفی پێهات. لەکۆتایی ئەو هەفتەیەدا لە پەیمانگا دایبەزاندمو لەوکاتەی خوێندکارەکان دەچوونە ژوور بەپەرۆشەوە داوای لێکردم ئەو کوڕەی پیشاندەم. بەزەردەخەنەیەکەوە لێیپرسیم "زەینەب، پێم بڵێ کامەیە؟"، زیاتر

وەك هاوڕێیەك وابوو نەوەك دایكێك. كاتێك كوڕە باڵابەرزە گەنجەكەم پیشاندا بەپلەكانەكاندا سەردەكەوت، گوتی "ئای چەند قۆزە". دڵنیام پێی وابوو ئەوە خۆشەویستیو شەیداییەكی كاتیو راگوزەربوو.

وەها پێشبینی دەكرا وەختێك گەورەبووم مێرد بەپیاوێكی خۆشگوزەرانو عەلمانیو دەرچووی زانكۆو كۆسمۆپۆلیتان بكەم. ئیهاب هیچ كام لەمانە نەبوو. باوكی دوكاندار بوو، هەشت خوشكو برای هەبوو هیچ كام لە دایكو باوكی بڕوانامەی زانكۆیان نەبوو، هەرچەندە ئەو مكوڕ بوو لەسەرئەوەی ئەو بڕوانامەیە بەدەست بهێنێت، تا ئەو كاتەش ساڵی یەكەمی زانكۆی تەواو نەكردبوو. پەیڕەوكارێكی سوننی خەڵكی سامەڕا بوو، ناوچەیەكە دەكەوێتە باكوری رۆژاوای بەغداو دواتر ئەمەریكاییەكان ناویان لێنا (سێگۆشەی سوننی)، لەڕێی ئەوەوە بۆ یەكەمجار تێكەڵی دابونەریتی خێڵەكی بووم كە تاكو ئێستاش لە زۆربەی ناوچە گوندنشینەكانی عێراقدا نەریتێكی زاڵە. خێڵەكەی ئەو یەكێك بوو لە بەدەسەڵاترین خێڵی ناوچەكەو بەشێوەیەك پەروەردەكرا بوو ئەوپەڕی دڵسۆزی هەبێت بۆ شێخو ریش سپییەكانی خێڵەكەی كە ناكۆكیو گیروگرفتیان چارەسەر دەكرد، رەنگرێژی رێسایان دەكرد، رێیان بۆ هاوسەرگیری خۆشدەكرد، خۆیان لە بێگانە دەپاراستو لەگەڵ خێڵكانی ترو حكومەتدا دانوستانیان لەسەر هاوپەیمانێتی دەكرد، (لەڕووی مێژوویشەوە لەجەنگەكاندا رۆڵیان لەسەر دانوستان هەبووە). ئەو خێڵەی لەگەڵ خێڵەكەی ئەودا لەململانێدا بوو دەكەوتە نزیك شاری تكریتەوەو ئەم ململانێیە لە نەوەكانی پێشوەوە هەڵگیرسابوو، بەهۆی ئەندامێكی دیارو بەرچاوی ئەو خێڵەوە زیاتر ئاگرەكەی خۆش ببوو، ئەو كەسەش سەدام حسێن بوو كە سامانی دەوڵەتی هەڵڕشتبووە نێو ژێرخانی تكریتەوەو سامەڕای پشتگوێ خستبوو گەرچی زۆر لە تكریت گەورەترو لەناستی نێودەوڵەتیشدا وەك پێگەیەكی مێژوویی ناسراو پەرەی سەندبوو. ئیهاب رقی لە عەمو بوو. یەكەمجار بوو كەسێك ببینم لەمن زیاتر هەستی توندی بەرامبەر عەمو هەبووبێت.

بە سەدامو پیاوەكانی خێلەكەی دەگوت "ئەوان هەموویان تاوانكاری شێتو پێتی هیچو پوچن. هەموویان بێ رەوشتن، بێ مێشكن. لەگەڵ ئاژەڵەكانی خۆشیاندا كاری سێكسی ئەنجام دەدەن".

هەرگیز لەژیانمدا کەسێکم نەبینیبوو بەو شێوەیە قسە بکاتو زوو بۆم دەرکەوت کە ئیهاب کەسێکی داخ لەدڵەو متمانەی تەواوی بە من هەبوو کە ئەو قسانەی دەکرد، ئەگینا بەئاسانی لەسەر ئەو قسانەی دەکوژرا. ئەو هاوڕێیەکی لە بەعسی بێزاری هاوشێوەی پوورە (سەمەر)ی هەبوو لەسەر جیاوازی بیروڕای سیاسی لەگەڵ سەدامدا هەشت ساڵ زیندانی کرابوو، هەروەها پیاوێکی تریشی دەناسی زیندانی کرابوو لەسەر ئەوەی نەیهێشتبوو موخابەرات دەستدرێژی بکەنە سەر ژنەکەی. بەتاسەوە گوێم بۆ هەموو ئەو شتانە گرتبوو کە دەیگوتن، بەڵام بەهیچ شێوەیەك نەمدەوێرا رەخنە لە عەمو بگرم. کە دەهاتە سەر عەمو متمانەم بەهیچ کەس نەبوو، تەنانەت ئیهابیش. هیچم نەگوت دەربارەی پەیوەندی ئێمە بە سەدامەوە، بەڵام هەندێك جار ئەوەی لەسەر تەلەفۆنەکە بوو گفتوگۆ تەلەفۆنیەکەی دەپچڕاندو دواتر ئیهابیش بۆی دەرکەوت مەسەلەکە چییە.

گوتی "ئێوە هاودەمی سەدامن، وانییە؟ باوکت فڕۆکەوانی ئەو بوو".

لەوەی دەیگوت دەترسام، بەڵام لەکۆتاییدا سەرم بۆ لەقاندو چاوەڕێ بووم تا بزانم کە هێشتا منی خۆشدەوێت.

دەستی گرتمو پێیگوتم "تکایە ئاگات لەخۆت بێت کاتێك لەگەڵ ئەواندایت. تکریتییەکان سنوور نازانن. ئەوانە دەستدرێژکارنو بە لاقەکردن ناویان دەرکردووە. کاتێك گۆشت دەبینن وەك سەگ وان. ئەوان لەگەڵ ئەو جلە قۆڵ کورتو تەنورە کورتانە رانەهاتوون. پەلاماری هەموو ژنێك دەدەن، دەستدرێژی دەکەنە سەر خوشكو ژنی خۆشیان. لەبەرئەوەی دەسەڵاتیان هەیە، واهەستدەکەن دەتوانن دەستدرێژی بکەنە سەر هەموو ژنێك. سەدام ئەوەندە دەسەڵاتی زۆرە پێی وایە گوایە فیرعەونە".

هیچ تکریتییەکم نەدەناسیو نەبینیبوو دەستدرێژی کردبێتە سەر هاوڕێیەکی سەدامییەکان، مەگەر بەرەزامەندی خۆی شتێکی وەها کرابێت. بەڵام لەبەر رێزی ئیهابو زیندوکردنەوەی حەزی ئیسلام لەلام، دەستمکرد بەپۆشینی جلوبەرگ بەشێوەی کۆنسێرڤاتیڤانە هەروەك باوەڕی ئیسلام وایە پیاوانو ژنان پێویستە جلوبەرگی سادەی وەها بپۆشن جەستە تێیدا دەرنەکەوێت. لەوکاتەدا

زۆرێك لە گەنجان زیاتر بەرەو ئایینداری دەچوون، بەڵام هەرگیز دڵنیا نەبووم داخۆ ئەوە کاردانەوەیەك بوو بەرامبەر دایكو باوکە عەلمانییەکان یاخود بەشێك بوو لە هەڵگەڕانەوەیەکی بێدەنگ دژی گەندەڵیو ئەو ڕژێمە بەرەڵاو بێ ڕێزە. هاوڕێیەکم بڕیاریدا حیجاب بپۆشێت بەڵام ئەم بڕیارە سادەیە کارێکی سەخت بوو بۆ خانەوادەکەی، چونکە دەترسان بڕیاری خۆداپۆشینی ئەو سیفەتەی بداتە پاڵ گوایە زۆر روو لە ئایینەو ئەوکات بە هەبوونی مەیل بۆ پارتێکی ئیسلامی تۆمەتبار دەکراو لێپرسینەوەی حکومەتی دەهاتە سەر. زۆر جار بەتاسەوەم بزانم بۆچی زۆرێك لە ژنە رۆژاواییەکان درك بەو پاڵنەرانە ناکەن وا لەو ژنانە دەکات بەو چەشنە جلوبەرگ بپۆشن، هاوکات بەزەییان بەو ژنە مسوڵمانانەدا دێتەوە کە حیجاب لەبەردەکەن، بێئاگا لەوەی هەندێك جار خۆداپۆشین بژاردەیەکەو ژنە رۆشنبیرەکان بەویستی خۆیان هەڵیدەبژێرن.

نەمدەویست لەچك بکەم، بەڵام دەستمکرد بەپۆشینی جلوبەرگی قۆڵدرێژو تەنورەی درێژ، باوکم لەوە ترسا لەسنوور تێپەڕیبم. ئەوەی جێی سەرنج بوو ئەوەبوو ئەو رژێمەی عێراقی بەڕێوەدەبرد هێندە ئازادییەکانمانی سنووردارکردبوو کە پۆشینی لەچکێك، کردنی نوێژێك، لەبەرکردنی تەنورەی درێژو بەکارهێنانی وشەیەکی فارسی لە ئاخاوتنی عەرەبیدا دەکرا وەك بەهانەی نادڵسۆزی بەرامبەر دەوڵەت لێکبدرێتەوە. موخابەرات لەپرتاو مزگەوتەکانیان رادەماڵیو ئەو گەنجانەیان دەستگیر دەکرد گومانیان لەسەربوو بەهەبوونی پەیوەندی لەتەك حزبی دەعوای ئیسلامیی یاساغ لە وڵاتدا. لەوکاتەدا، خاڵۆزایەکم کە لەمن گەورەتر بوو لەگەڵ هەندێك هاوڕێیدا لەو راماڵینەدا بەرکەوتو ئەشکەنجەدرا. خێزانەکەی توانیان دانوستان بکەنو رێگەی بۆ خۆش بکەن بچێتە دەرەوەی وڵاتو دواتر ئەو هەواڵەمان بیست هەندێك لەو هاوڕێیانەی لەگەڵی گیرابوون لەسێدارە درابوون. شەوێکیان نەعیمی ئامۆزام رۆشتبوو بۆ مزگەوتێك بۆ نوێژکردنو باوکی بەترسەوە بانگی کردبوو. دواتر نەعیم پێیگوتم کە باوکمو مامم راستەوخۆ بردبوویان بۆ بارێكو بیرەیان بۆ کڕیبوو دواجار قەناعەتیان پێکردبوو کە بەو حاڵەوە گەڕانەوە بۆ مزگەوتەکە گەڵێ مەترسیدارە.

کاتێك بەدزییەوە کەوتبومە داوی خۆشەویستی ئیهابەوە، دەمزانی دایكو

باوکی لوما خەریکی هەڵسەنگاندنی هاوسەرێکی باش بوون بۆیو ئەویش بەبێ پرسیارو دوودڵی ئەو کەسەی پەسەند دەکرد کە بۆیان هەڵدەبژارد. سارا چیرۆکێکی جیاواز بوو، ئەو دەیویست رابکاتو دانس بکاتو یاسای دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان بشکێنێت.

رۆژێکیان لەچواردەوری مێزی نانخواردنی ماڵی پوورە ئەدا دانیشتبووین، گوتم "من بەخۆشەویستی هاوسەرگیری دەکەم".

لوما گوتی "زەینەب، خۆشەویستی دوای هاوسەرگیری دروست دەبێت، هێشتا ئەوە نازانیت؟"و لەخۆڕا کەوتە سەرزەنشت کردنم بەوەی دایکە لیبراڵەکەم ئەو قسەیەی نەخستبێتە مێشکمەوە کە ژنانی عێراقی بۆ چەندین وەچەیە بۆ کچەکانیان جێهێشتبوو.

بەردەوام بووم لە قسەکردن لەسەر هاوسەرە خەیاڵییەکەی دوارۆژمو گوتم "بەلامەوە گرنگ نییە ئەگەر هەژار بێت. لە بناغەوە ژیانێك بۆ خۆمان دروست دەکەین، لە تەختی زەوییەوە دەست پێدەکەینو بەرد بە بەردی هەڵدەچنین".

لوما خێرا وەڵامی دایەوە "مێرد بەکەسێکی دەوڵەمەند بکە، ئیتر پێویست ناکات خۆت تێك بدەیت".

سارا گوتی "من دەمەوێت بە خۆشەویستی هاوسەرگیری بکەم، بەڵام نیازم نییە مێرد بە کوڕێکی نەدار بکەم. ژیانی ئاسودەیی زۆر گرنگە. زەینەب، شووکردن بە پیاوێکی نەبوو بێ مێشکییە. چی دەخۆیت؟ کەسێکی پارەدارت خۆشبوێت. ئەوە هەمووی لە بەرژەوەندیو قازانجی تۆیە".

لە سارا تێدەگەیشتم هەروەك هێندەی پارێزەرێك بیرتیژ بوو، شتەکانی شەنوکەو دەکردو دووربین بوو لەوەی بێگومان دەکرێت کوڕێکی سەرمایەدار بدۆزێتەوەو مێردی پێبکەیت.

لەوکاتەدا، ساماندارى هەر وەك تەڵەیەك بوو بەلامەوە. لە وانەیەکی ئەدەبی ئینگلیزیدا رۆمانی Wuthering Heights "بەرزاییەکانی بەربا"م دەخوێندەوەو لە خانووی ناو مەزراکەوە بەرەو دەشتە کاکی بەکاکییەکانی نووسەری سەدەی هەژدەی ئینگلتەرا (ئیمیلی برۆنتی) هەڵهاتم کە دوو خۆشەویستە چارەڕەشەکەی رۆمانەکەی ململانێی گیروگرفتی چینایەتییان بوو. کوڕە قژ رەشە خەفەتبارەکە

ناوی (هیسکلیف) بوو، کچە قژکاڵە بێباکەکەش ناوی (کاسرین ئینشاو) بوو. کاسی لاو، خوێندەوارو خواپێداو بوو. هیسکلف، هەژارو رەشتاڵە بوو، بەمنداڵی بەخراپی مامەڵەی لەگەڵ کرابوو، بە نەزانی گەورە ببوو. لەجیاتی ئەوەی بەدوای خۆشەویستی دڵی بکەوێت و مێرد بە هیسکلیف بکات، کاسی ئەو کارەی ئەنجامدا کە لێی چاوەڕوان دەکرا، هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی گەنجی وشك و بێتامی خاوەن زەوی و زار کرد. هیسکلیفی دڵشکاو و ئالودە بووش بەدڵپیسییەوە تۆڵەی خۆی بە خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی دەوروبەری دەکردەوە. کچەکە هاوسەرگیری بۆ پارە کردو هەموو کەسانی ناو رۆمانەکە بە زووخاوەوە دەژیان و دەمردن.

جیاوازییەکانی نێوانمان وای لە ئیهاب کردبوو زیاتر جێی سەرنجی بم نەك کەمتر. بەلای منەوە خۆشەویستی راستەقینە لە زاڵبوون بەسەر بەربەستەکاندا خۆی دەبینییەوە، بەتایبەتی ئەو بەربەستانەی بەهۆی ئایینەوە یان جیاوازی چینایەتییەوە کوێرانە سەپابوون. ئەو عێراقەی تێیدا گەورە ببووم، ژن و ژنخوازییان لەناو خۆیاندا دەکردو ئەو جۆرە ژن و ژنخوازییە بەردەوام بوو سەرەڕای ئەو هەستە دژە شیعەییەی بەهۆی جەنگی ئێرانەوە هەژموونی کێشابوو. ئەو کەسانەی دەمناسین یەکەمجار پرسیاریان لەیەکتری نەدەکرد کە ئاینیان چییە یاخود سەر بە چ تیرەیەکن لەکاتێکدا خەڵکی ئەوروپاو ئەمەریکا ئەم پرسیارانەیان دەکرد، ئەگەرچی جاروبار وەڵامی ئەو پرسیارانە روون و ئاشکراش بوو. لە خانەوادەکەمدا چەند هاوسەرێکی سوننە - شیعە بوونیان هەبوو. ئەو دوو هاوڕێیەی سەرەتا لە پەیمانگا فەرەنسییەکە پێکەوە بووین لەگەڵ ئیهاب، پیاوێکی مسوڵمان و ژنێکی مەسیحی بوون و دواتر کەوتنە داوی خۆشەویستییەوەو هاوسەرگیرییان کرد. نەعیم شێتانە لەگەڵ کچێکی کورد کەوتە خۆشەویستییەوە، لەوکاتەدا من رۆڵی رۆمانسی نێوانیانم دەبینی، لەبەرئەوەی دایك و باوکی کچەکە دژی ئەوە بوون کچەکەیان مێرد بەکەسێك بکات کورد نەبێت. تەلەفۆنم بۆ کچەکە دەکردو پاشان تەلەفۆنەکەم دەدایە دەست نەعیم یاخود بەدزییەوە ژووانم بۆ رێکدەخستن.

کچێکی کورد هاوڕێیەکی خۆشەویستی تازەم بوو لەزانکۆ ناوی لانە بوو، کچی

دایكو باوكێكی پسپۆڕو بەتوانا بوو. ڕۆژێكیان لە زانكۆدا پێكەوە بووین كاتێك خوێندكارێكی تر نوكتەیەكی قۆڕی لەسەر عیزەت دووری جێگری سەرۆك كۆمار كرد. دەستبەجێ خوێندكارێكی تر بێدەنگی كردو ئاماژەی بۆ گوارەكانم كرد وەك ئەوەی ئامێرێكی نهێنی دەنگ تۆماركردنی پێوەبێتو دەستیكرد بە گوتنی ئەو سروودە نیشتیمانیانەی لە قوتابخانە فێركرابووین. دەیگوت "خوا سەرۆك بپارێزێت. خوا تەمەنی درێژ بكات" بەشێوەیەك ئەو وتافەی دەدا وەك ئەوەی نوشتەو چاوەزارێك بێت بۆ پاراستنی لە شتی خراپ. ئەوانی تر بە نوكتەكە پێكەنین، بەڵام من نەمتوانی پێبكەنم. من زیاتر لە ئەوان دەترسام نەوەك ئەوان لە من. زۆر پەرۆش بووم تا بەڕاستی پێیان بڵێم هەستم بەچی دەكرد، بەڵام نەمدەتوانیو دەمزانی هەرگیزیش ناتوانم. ئا بەو شێوەیە هەواڵدەرەكان كاریان دەكرد. ڕۆڵی شەیتانیان دەگێڕا تا وایان لێدەكردیت شتێك بڵێیت كە چاوەڕوان نەدەكرا بڵێیت. دەمزانی من هەواڵدەر نیم، بەڵام هەرچەندە ئەو ڕۆژە سەیرم دەكرد بۆم دەركەوت ڕەنگە یەكێك لە هاوڕێ تازەكانم هەواڵدەر بێت، لەبەرئەوە هەستەكانم لە گۆڕناو بەبێدەنگی مامەوەو گوتم چی بەخەیاڵیاندا دێت با وابێت.

یەكێك لەو شتانەی دەربارەی لانە بەدڵم بوو ئەوە بوو بەلایەوە قورس بوو هەستو سۆزەكانی دەرنەبڕێت. ئەو یەكێك بوو لەو سێ یاخود چوار هاوڕێیەم كە هاوڕێتیم خۆش بوو لەگەڵیانداو سەردانی ماڵەوەیانم دەكرد. ڕۆژێكیان لەسەر جێگە نووستنەكەی سەعیمان بۆ تاقیكردنەوەیەك دەكرد، خۆی لاركردەوە بەلامداو زۆر بەخێرایی بەگوێمدا چرپاندی:

"زەینەب، پێویستە نهێنییەكت پێ بڵێم كە زۆر ناخۆشە. لە باكوور حكومەت گازی كیمیایی ڕشتووە بەسەر كوردەكانداو هەزارەها كەسیان لێ مردووەو هەر لەو شوێنەدا كەوتوون كە لێی ڕاوەستابوون. لەچەند چركەساتێكدا تەواوی خەڵكی شارۆچكەكە كوژرابوون".

ئەوەی بیستبووی پێیگوتم. وێنەی ئەو خێزانە كوردانە دەهاتە پێش چاوم كە لەشەقامە تەسكو باریكەكاندا بەمردوویی ڕاكشابوونو منداڵان بەسەریەكدا كەوتبوونو منداڵی ساواش بەبێ هەناسە لەئامێزە مردووەكەی دایكیاندا بوون هەروەها وێنەی تەواوی گوندێك بەمێشكمدا دەهات كە ئەو گازەیان هەڵدەمژی و

لەبەر زۆری ژەهرەکەی هەر لە ڕێکردندا گیانیان دەردەچوو. باوکێك لەگەڵ منداڵەکانیدا بەمردوویی دۆزرانەوە کە بەدەوری مێزی نانخواردنی چێشتخانەکەیاندا دانیشتبوون و لە گەرمەی نانخواردندا بوون. ئەم شتە ناخۆشانەم لەو بیست، بەڵام نەمتوانی هیچ کاردانەوەیەکم هەبێت و نەمتوانی هیچ شتێکی پێ بڵێم. لەشم گرژ بوو، بیرمە لەبێدەنگیمدا لانە گەڕایەوە شوێنی خۆی. هەمیشە چاوەڕێی ئەو جۆرە کاردانەوەیەم لێدەکرد، چونکە دەستبەجێ ئەوەی بەبیردا هاتەوە کە ئەو قسە بۆ کچی هاوڕێیەکی سەدام دەکات.

هەردووکمان چوینەوە سەر کتێبەکەو واخۆمان دەرخست هەر خەریکی سەعیکردنی دارشتنی ئینگلیزین. بەڵام دواتر کاتێك بەتەنیا بووم ئەو وێنانە هێرشیان بۆ دەهێنام، گورزەیەك تیر لەسەرو ئەو دیوارەوە دەردەچوو بەچواردەوری ئەو بەشەی مێشکمدا دروستمکردبوو شاردبوومەوە تا بیرنەکەمەوە لەو زوڵم و زۆرانەی سەدام دژی گەلەکەی ئەنجامی دەدا. هەزارەها خەڵك مردن؟ هەزارەها؟ ڕەنگە لانە خزم و کەسی هەبووبێت لە هەرێمی کوردستان، کەواتە دەبێت ئەو هەواڵەی لە کەسێك بیستبێت کە لەوێ دەژیا. تەنانەت گومانم لەوە هەبوو کە باوکم ئەو هەواڵەی بیستبێت، ئەو لە هێڵی ئاسمانی مەدەنی فڕۆکەوانی دەکرد نەك سەربازی. ئەوە ترسناکترین شت بوو لەژیانمدا بیستبێتم. دەمزانی کە ناتوانم ئەو هەواڵە بۆ هیچ کەس بگێڕمەوە، تەنانەت بۆ دایکیشم. بینیبووم کە دایکم چەند بەتاسەوە لەباوکم دەپاڕایەوەو تۆقیبوو لەوەی کە چیتر ناتوانێت یەك چیرۆکی ترسناکی تری سەدام بشارێتەوە. بەڵام هەموو جارێك کە چاوەکانم دادەخست وێنەی ئەو باوکەو منداڵەکانی دەهاتە پێش چاوم. نەمدەتوانی بۆیان بگریم. نەمدەتوانی لەو کارەی بەرامبەریان کرا توڕەبم. نەمدەتوانی تاسەر وێنەکان لەمێشکمدا هەڵبگرم. دەبوایە بوونی ئەو وێنانە لەمێشکمدا نەهێڵم. دواجار، پێمنایە ناو ئەو بەشە سپییە ڕوونەی مێشکمەوە کە هاوشێوەی فیلمێکی سوتاو توانای سوتاندنی ئەو وێنانەی هەبوو.

کارو ستەمکارییەکانی سەدام لەهەڵکشاندا بوو، بەڵام لەبەر نەبوونی میدیای سەربەخۆ لەناو عێراقدا بەهیچ کلوجێك تۆمار نەدەکران و منیش بەشێوەیەکی ئاسایی ژیانم دەگوزەراند. لەگەڵ قەشەیەکی کاسۆلیکی فەرەنسی بەناوی (ماسیەر

کامڵ) وانەکانی فورکاریو تێنسو وێنەکێشانم دەخوێند. بەیانیان، دایکم بەدڵێکی خۆشەوە کاتژمێر حەوت، بەیانی باشی لێدەکردم. ئەو هەمیشە بەیانیان دڵخۆش بوو، هەڵبەت پێش ئەوەی رووداوەکانی ئەو رۆژە قەفەسی ژیانمانی بیربخاتەوە. بەهێمنی دەهاتە ژوورەوەو پەردەکانی لادەداو بەهێواشی پشتە دەستی بە روومەتمدا دەهێناو بە ماچکردن خەبەری دەکردمەوە. هەندێك جار گۆرانی دەگوتو ئەگەر گلەییم لە خانووی مەزراکە یاخود ناهەنگێکی کۆشك دەربڕیایە ئەوا بیری دەخستمەوە سوپاسگوزار بم بەرامبەر ئەو شتانەی خاوەنیان بوومو پێشنیازی بۆ دەکردم زیاتر وردببمەوە بۆ بینینی ئەو جوانیانەی لەدەوروبەرمان بوون. لەتەمەنی دوانزەساڵیمەوە وانەی پیانۆم لەلای ماسیەر کامڵ دەخوێندو ئەو کاتانەی لەماڵەوە بووم بۆ چەند کاتژمێرێك پەراوەم دەکرد. چرکە چرکی کاژێری ئامێری مۆسیقا ژەنینەکە سڕی دەکردم، راست، چەپ، راست، چەپ، هەروەها دەمتوانی لەمۆسیقادا خەمەکانم بڕەوێنمەوە وەك چۆن بابە لە جێگەی لێخوڕینی فڕۆکەکەیداو حەیدەریش لە یاری کۆمپیوتەرو هەڵوەشاندنو بەستنەوەی ئامێرە کارەباییەکانی ماڵەوە بەهێمنی خەمەکانیان دەڕەواندەوە. خەونی دایکم ئەوەبوو فێری ژەنینی پیانۆ ببم لەکاتێکدا ئەو هەرگیز وانەی فێربوونی پیانۆی نەخوێندبوو، بەدەستە نۆتەی میوزیکی بۆ دەهێنام کە بەزۆری گۆرانی رۆمانسی بوون. خۆشترینیان بەلایەوە (چیرۆکی عەشق) بوو داوای لێدەکردم دووبارە ئاوازەکەی بۆ بژەنمەوە.

کاتێك لەساڵی دووەمی کۆلێژ بووم، باوکم پێی گوتین خۆمان بپێچینەوە بۆ گەشتێکی دوو رۆژەو پێڵاوی تێنسو جلوبەرگی مەلەکردنو ئەرکی قوتابخانە لەگەڵ خۆمان بەرین. شۆفێرەکە بەڕێوەبوو، لەبەرئەوە منو براکانم بەپەلە رامانکردە قاتی سەرەوە بۆ خۆپێچانەوە. دەرگای کەنتۆرەکەم کردەوەو چاوم بڕییە هەر سێ قاتی مەلەکردنەکەمو سورەکەیانم هەڵبژارد. پاشان بەخۆمم گوت مەلە ناکەم، عەیبە، لەبەرئەوە جلی مەلەکردنەکەم دانایەوەو شتەکانی ترم پێچایەوەو رامکردە خوارەوە.

لەبیرم نییە پشووی ئەو هەفتەیەمان لەکوێ بەسەربرد تەنها ئەوە نەبێت ئەو خانووەی بۆی چووین زۆر گەورە بوو، هەر خێزانەو شوێنی تایبەتی خۆی

هەبوو. بەتەنیشت دەریاچەکەوە نانی نێوارەمان خوارد، نزیکەی هەموو کۆشکەکانی سەدام دەریاچەیان بەتەنیشتەوە بوو. سەدام گوتی، "باشە، هەمووتان جلی مەلە لەبەربکەنو بابڕۆین بۆ مەلەکردن". شەوێکی جوان بوو، ئاوی دەریاچەکە شینێکی تۆخ بوو، وەك ئاوێنە مەنگ بوو تا دوای چەند خولەکێك هەموویان هاتنو خۆیان تێفڕێدا. سەدام بەجلی مەلەکردنەوە هاتەوەو تەماشام دەکرد تا گەیشتە قەراغی ئاوەکەو چاوەڕێی خزمەتکارێکی دەکرد تا رۆبی مەلەکردنەکە لەبەری دابنێ‌و ئەو کۆمەڵە نیوە بازنەیەکیان بۆ دروستکرد تا مەلە بکات. تۆزێك لەوێ ڕاوەستاو لەیادمە بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەو کێشی لە باوکم زیاتر بوو بەڵام هێشتا جەستەی رێكو وەرزشی بوو. بەکەمێك فیزەوە خۆی دا بەئاوەکەدا. مەلەوانێکی زۆر باش بوو. هەموویان لەئاوەکەدا شلّپە شلّپیان بوو. پاشان گەڕایەوەو ئاوڕی دایەوە بەلای مندا کە لە قەراغی ئاوەکەدا وەستابووم‌و تەنورەیەکی درێژم لەبەردا بوو. گوتی "زەینەب بۆ لەگەڵماندا مەلە ناکەیت؟"

منیش بەپێی ئەو پاساوەی پلانم بۆ دانابوو گوتم "جلی مەلەکردنم بیرچووە!".

سارا گوتی "چۆن جلی مەلەکردنت بیرچووە؟ چەند بێ مێشکی! پێمان راگەیەنرا جلی مەلەکردن بهێنین".

سەدام پێیگوتم "زەنوبە، ئەوە گرفتێك نییە، برۆ سەرەوە بۆ ژوورەکەی من‌و یەکێك لەوەکانی من لەبەربکە لەگەڵ تیشێرتێك".

ئەو قسەیە وشکی کردم. بیرکردنەوە لە چوونە ناو ژورەکەی سەدام‌و لەبەرکردنی جلی مەلەکردنی ئەو، جەستەمی گرژ کرد. نەمدەتوانی بیهێنمە پێش چاوم کە چۆن جلەکانی ئەو بەسەر لاشەی رووتمدا لەبەربکەم‌و دواتریش بگەڕێمەوەو هەموو ئەوانەی لەوێ بوون تەماشام بکەن.

بڕیاری خۆمداو بەڕێزەوە وەڵامم دایەوەو گوتم "نا، سوپاست دەکەم عەمو گیان. ئەمشەو تەنها تەماشاتان دەکەم".

پاشان گوتی "باشە، ئەگەر شەرم دەکەیت لەبەری بکەیت تەنها دزداشەکەم لەبەربکە. ئێرە زۆر خۆشە، وانییە جەماعەت؟ یەڵڵا دەی". هەموو لایەك بەیەك دەنگ لەناو ئاوەکەدا هاواریان کرد، یەڵڵا، یەڵڵا، دەی".

لە دیمەنی پەشۆکاوی دایكو باوکم حاڵی بووم کە لەئاوەکەدا لەدوای سەدامەوە بوون. تەنها ئەوان بانگیان نەدەکردمو بێدەنگ بوونەکەیان پەیامێك بوو فامم کرد. گوتم بەوە هەڵناخەڵەتێم. جلەکانی لەبەرناکەم، تەنانەت دزداشەکەشی کە تا سەرئەژنۆم درێژ بوو. دزداشە بێت یاخود تیشێرت، لەئاوەکەدا بەلاشەمدا دەنووسێت. ئەو کاتە کچێکی گەنج بوومو دەمزانی ئەوە مانای چییە. جلەکانی عەمو لەبەرناکەم.

بۆ دواجار پێمگوت "عەمو، ئەمڕۆ ناتوانم مەلە بکەم". ئەوە تاکە رێگە بوو بەخەیاڵمدا هات تاکو بتوانم کۆتایی بەو گفتوگۆیە بهێنم. کاتێك ژنێك پاساوێکی دەهێنایەوە ئیتر هیچ قسەی نەدەکرد.

دوای ئەوەی مەلەکردنەکە کۆتایی هاتو خۆی وشککردەوە هاتە لامو وتی "زەینەب، ئەمشەو کاتێکی زۆر خۆشت لەدەستچوو. ئاوەکە زۆر خۆش بوو".

لە ئابی ١٩٨٨دا، عەمو موژدەی سەرکەوتنی راگەیاند بەسەر فارسە دوژمنەکانداو جەنگی هەشت ساڵەی ئێران کۆتایی هات.

پرسیارم لە دایکم کرد "کەواتە بەشی خۆمان لە ئێران دەستکەوتووە؟"

لەوەڵامدا گوتی "نا، بەڕاستی وانییە. سنورەکان هەمان شتن".

منیش گوتم "کەواتە هیچ شتێك نەگۆڕاوە؟ ئەی گرنگی بەکوشتدانی ئەو هەموو خەڵکە چی بوو؟"

برۆکانی بەرزکردەوەو بیروبۆچوونەکانی رونکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوە خۆشترین رۆژ بوو کە لە بەغدا بینیبێتم. شارەکە ترسی وەلانا. خەڵکی لەماڵەکانیانەوە رژانە سەر شەقامەکان. لەهەموو شوێنێك دەنگی مۆسیقا دەهات، خەڵکی سەمایان دەکرد، بەکورتی لەهەموو شار دەنگی بەزمو رەزم دەهات. لێمان خوڕی بۆ ناوشار، دەمانبینی ژنان ئاویان دەڕشتە سەر زەوی بۆ دەستپێکی تازەی سەلامەتیو خێرو بەرەکەت. کەسێکی نەناس ئاوی بەجامی سەیارەکەدا کردو گوتی "ئەگەر پێویست بکات تا تەواوی تەمەنم جامو پەنجەرە دەشۆم، هەموو شتێك ئەنجام دەدەم بەس نەچمە بەرەی جەنگ! سوپاس بۆ خوا! سوپاس دواجار کۆتایی هات".

لە کۆشکی سەرۆکایەتیدا ئاهەنگێکی فەرمی سەرکەوتن لەباخچەکەدا گێڕدرا

دوو جێگای جیاوازی تێدا رێکخرابوو، شوێنێکیان بۆ ئاهەنگی پیاوان بوو کە لەلایەن عەمو سەدامەوە خانەخوێی دەکراو شوێنەکەی تریان بۆ ئاهەنگی ژنان بوو لەلایەن پوورە ساجیدەوە خانەخوێی دەکرا. مێزی دووورودرێژی خواردن رازێنرابووەوە لە مەحشیو جۆرەها گۆشتو خواردنی عێراقیو میوەی دەرەکی وەك مانگۆو کیویو ئەناناس کە چەند ساڵێك بوو لە بەغدا بەرچاوم نەکەوتبوون، سەر مێزەکانیان نەخشاندبوو. وا رێکەوت لەنزیك رەغدی کچی سەدامەوە لەسەر مێزەکە دابنیشمو تەماشای ئەو خۆشیو شادییە بکەمو (بۆرەك) بخۆین کە جۆرە شرینییەکی بەناوبانگی عێراقییەو پڕدەکرێت لە پەنیرو بەشێوازێکی تێکەڵاوی تورکیو عێراقیو ئێرانی ئامادە دەکرێت. ژنە قەرەجەکان لەسەر شانۆکە بەجلوبەرگی ئاڵو واڵای سەوزو سوورو زەردو مۆرەوە گۆرانییان دەچڕیو سەمایان دەکرد. لەوکاتەی بەدەنگی تەپڵو تامبۆرینو ئەو ئامێرە موسیقیانەی تر کە نازانم ناوەکانیان چی بوو سەمایان دەکرد، قژە رەشە خاوەکانیان لە ڕانیان دەخشا. خڕپنو ورگ خڕ بوون، زۆر بەخەستو خۆڵی ماکیاژیان کردبوو شتی وەهام نەبینیبوو. سەرکوڵمیان زۆر سوور بوو، سوراوەکانیشیان تۆخو ئەستوور کردبوو. چاویان بە ماسکارا رەش رەش کردبوو. گوارەی قورسی ئاڵتون بەگوێیاندا شۆڕببووەوە. لەوکاتەی سەمایان دەکرد قۆڵو گەردنیان خرەی بازنەو ملوانکەو خشڵو زێڕیان لێبەرزدەبویەوە.

پاشان ئەو رۆتینە لە بەشی ژنان کۆتایی هاتو ئامێرەکانیان پێچایەوەو بەرەو بەشی پیاوان کەوتنە ڕێ بۆ نواندنێکی تر.

کاتێك ژنەکان رۆیشتن رەغد گوتی "ئێستا خوا دەزانێ ئەوان چی دەکەن".

پرسیم "گۆرانی دەڵێنو سەما دەکەن؟"

رەغد بەشێوەیەك تەماشای کردم، وای لێکردم زۆر هەست بەساویلکەیی خۆم بکەم.

گوتی "پیاوان حەزیان لە ژنی قەرەجە. مێردەکەم لەو ئاهەنگەی پیاواندایە". ئەوە تاکە راز بوو کە لەژیانمدا بۆ منی درکاندبێت سەرەڕای ئەوەی چەندین جاری تر پێکەوە بووینو لەهەمان کۆلێژیش وەرگیرابووین.

عەمو، رەغدی لە حسێن کامل مارەبڕی بوو لەوکاتەی رەغد تەمەنی تەنها

شانزە یان حەڤدە ساڵ بوو، حسێن ئەو تکرتییە بوو کە ئازاری باوکمی داو زۆرینەی هاووڵاتیانی عێراقی تۆقاندبوو. هەموو کەس دەیزانی رەغد بە مەرج شووی بە حسێن کردبوو، ئەویش تەواوکردنی خوێندن بوو. حسێنی نەخوێندەواریش رازی ببوو، ئەویش مەرجێکی خۆی هەبوو کە بریتیبوو لەوەی چەند ساڵ بخوێنێت دەبێت ئەوەندە منداڵی ببێت. ئەو تەنها دوو ساڵ لەمن گەورەتر بوو، بەڵام تا ئەو کاتەی جەنگەکە راگیرا سێ منداڵی هەبوو. ئەو رۆژە بەزەییم پێیدا دەهاتەوە. دواتر پرسیاری ژنە قەرەجەکانم لەدایکم کرد، ئەویش بۆی رونکردمەوە کە قەرەجەکان کۆچکەر بوون و عەمو مافی هاووڵاتی بوونی پێ بەخشیبوون. وا بیرمدەکردەوە کە ئەوانیش بەهەمان شێوە کەوتبوونە بەر جۆرە ترس و تۆقاندنێکی تایبەتەوە لەلایەن حکومەتەوە. سەدام پیاوەکانی ئەو ژنانەی ناردبوو بۆ بەرەی پێشەوەی جەنگ و ئەوانیشی لە بەغدا هێشتبووەوە تا لە کۆشکی سەرۆکایەتیدا گۆرانی بۆ بڵێن و سەمای بۆ بکەن.

شەوێکیان کاتێك وەك هەمیشە لە باڵکۆنی دواوەی پەیمانگا فەرەنسییەکە لەگەڵ ئیهاب قسەمان دەکرد، ئیهاب دەستی گرتم و بەهێواشی بەرەو لای خۆی رایکێشام و لەئامێزی گرتم. چاوم بڕییە نێو چاوی و ئەویش ماچی کردم. ئەوە یەکەم ماچ بوو، هەرگیز لەوەوپێش کارێکی لەو شێوەیەم نەکردبوو. لێوەکانی نەرم و بێوێنە بوون و لەبەرامبەر ئەو یەکەم هەستە عاشقانەمدا هەستم بەبێهێزی کرد. پێش ئەو یەکەم ماچکردنە قەدەغەیە، ماوەی ساڵ و نیوێك بوو پێکەوە بووین. دوای ئەو ئێوارەیە دەستمانکرد بەقسەکردن دەربارەی هاوسەرگیری و ئەو منداڵانەی دەمانبێت و ئەو ژیانەی پێکەوە بونیادی دەنێین. پلانێکمان دارشت، واماندانابوو کە هەرکە خوێندنم تەواو کرد شوێنێکی وەرگێڕان بکەمەوەو ئیهابیش وەك باوکی دوکانێکی قوماش بەتەنیشت خانەکەمەوە بکاتەوە.

باوکم کە هەرگیز بەو پەیوەندییەی ئێمەی نەزانی، کاتێك بیستی دەستبەجێ و بەتوندی رەتیکردەوە. من تەمەنم زۆر بچووك بوو، جیاوازی نێوان پێشینەی خێزانەکانمان بەرچاو بوو، ئیهاب نەیدەتوانی بژێوی ژیانم دابین بکات. هەرچەندە ئەو لە من گەورەتر بوو، من لە قۆناغی دووەم بووم بەڵام ئەو تەنانەت

ساڵی یەکەمی زانکۆشی تەواو نەکردبوو. بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، دایکم پشتیوانی لێنەکردم. بەدرێژایی ئەو ڕۆژە گریام، نانم نەخوارد. بە دایكو باوکم گوت چیتر پێکەنین لەمن نابینن، لەبەرئەوەی بەبێ ئیهاب هەرگیز خۆشی نابینم.

دوای مانگێك خەمو خەفەت بەتوڕەییەوە بەدایکم گوت "هەمیشە پێت دەوتم دەبێت بەخۆشەویستی هاوسەرگیری بکەم! ئێستا ئەو کوڕەم دۆزیوەتەوە کە خۆشم دەوێت، بەڵام تۆ بیرت گۆڕیوە. پێم بڵێ دایە، بڕوات بەخۆشەویستی هەیە یان نا؟ هێشتا دەتەوێت بەخۆشەویستی هاوسەرگیری بکەم یان وەك پوورە ئەدا گۆڕاویتو بەنیازی وەك لوما بمدەیت بە پیاوێکی دەوڵەمەند؟"

پێدەچێت بەو قسانە زۆر ئازارم دابێت. پێشتر بینیبووم ئەو عالیەیەی لەوەوبەر دەمناسی چەند بەسەختی هەوڵیدەدا شتێك بەزیندووی لەناخیدا بهێڵێتەوە، بەشێکی ناواخنی بریتیبوو لە باوەڕبوون بەخۆشەویستی.

لەکۆتاییدا، دایکم بیروڕای گۆڕیو پێموابێ ئەمە دوو مانگێکی خایاند. بەهەرحاڵ توانی باوکم ڕازی بکات تا ئیهاب بانگێشتی ماڵەوە بکەین. زۆر بەپەرۆشەوە چاوەڕێی بڕیاری باوکمم دەکرد دوای ئەوەی بەتەنیا لەگەڵ ئیهاب لەباخچەکەماندا پێکەوە چایان خواردەوەو باسی ئەو مەسەلەیان کرد.

باوکم گوتی "یەك دنیا قۆڵۆنیای لەخۆی دابوو. بەدڵم نییە. پێم وایە بەکەڵکی تۆ نایەت، بەڵام ئەگەر بەنیازی خۆکوشتن بیت کاتێك ڕازی نەبم، ئەوکاتە چارم نییە".

پەسەندکردنێکی نابەدڵانە بوو، بەڵام هەرچی چۆنێك بێت ڕازیمکرد. گوتی پێویستە ڕەزامەندی عەمو وەربگرێت. ئەوکاتە دەبوایە منو ئیهاب بۆ ماوەی شەش هەفتە چاوەڕوان بوینایە تاوەکو لێکۆڵینەوەی ئاسایش تەواو دەبوو.

لە عێراقدا، پرۆسەی هاوسەرگیری بەشێوەیەك دەستپێدەکات کە کۆمەڵێك ژن لە خانەوادەی زاوا بەشێوەیەکی فەرمی سەردانی ماڵی بووك دەکەنو داوا لەدایکی بووكو ژنەکانی تر دەکەن کچەکەیان پێ ببەخشنو شیرینییەکی تایبەت کە پێی دەوترێت کولیچە، لە هەویرو خورماو دارچینی پێکهاتووە، لەلایەن بووکە خانی دوارۆژەوە پێشکەش بەمیوانەکان دەکرێت، ئەویش دەبێت بەشێوەیەکی ڕێکوپێكو بەڕێز خۆی دەربخاتو شکۆو سەربەزی خێزانەکە بنوێنێت. دایکم

کولیچەو گوڵی کرێو شەربەتی هەناری فرێشی بۆ بۆنەکە دروستکرد.

کاتێك ئەو رۆژە هات، پوورەکانم بەتازەترین مۆدێلی جلەوە گەشتن‌و ماکیاژی تەواویان کردبوو، قژیان رێککردبوو هەروەها بۆنی خۆشیان لەخۆیان دابوو. دایکی ئیهاب‌و سێ خوشك‌و چەند پوورێکی خۆیانکرد بەماڵەکەمانداو جلوبەرگی کۆنباوی رەشی گەورەو دەڵبیان لەبەربوو، هیچ ماکیاژێکیان نەکردبوو. دایکی ئیهاب ژنێکی خرپن بوو، زۆر باڵای بەرز نەبوو، دەموچاوێکی تاڵی هەبوو، بەپەلە رووەو من هاتوو باوەشی پێداکردم. دەمم تەتەڵەی دەکرد لەوکاتەی دەمویست بەنەدەبەوە ماچی هەر رووەتێکی بکەم، بەڵام ئەو لەڕادەبەدەر دەموچاومی بە ماچ داگرتبووەوە. زیاتر لە دایك‌و پوورەکانم بیرو هەستی خۆی دەردەبڕی‌و ئەوانیش بەرێزەوە پێشوازییان لێکردن، بەڵام کەمدوو بوون لەگەڵیاندا. لەوکاتەی چاوم خستبووە سەر هەردوولایان پێموابوو هیچ جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ئەو ژنانەدا نەبوو کە بەهەمان زمان قسەیان دەکرد، لەبەرئەوەی هەردوولا لەیەکتری ورد دەبوونەوە.

قاوەی تورکیم بۆ دانان‌و لەنێوانیاندا دانیشتم‌و دایکی ئیهابیش بەوجۆرە داواکردنە نەریتییەی هەبوو داوای هاوسەرگیری لێکردم. لەوەوپێش ئەو جۆرە داواکردنانەم بیستبوو. کەسانی نەناس هاتبوونە ماڵمان تاکو بمخوازن، من‌و دایکیشم بەرێزەوە خۆشحاڵمان دەکردن لەبەرئەوەی دەبوایە وابوینایە، بەڵام دواتر بەوە پێدەکەنین چۆن مێرد بەکەسێك بکەم کە نەمدەناسی. لەوکاتەی دایکی ئیهاب کەوتبووە قسەکردن‌و بەڵێنی ئەوەی دەدا کە گەرەنتی دڵخۆش بوونم دەکات‌و وەك کچەکانی خۆی مامەڵەم لەگەڵ دەکات‌و هەرچییەکم پێویست بێت یاخود بویێت بۆم دەستەبەر دەکات‌و لەو شێوازە ژیانەی پێی راهاتووم پشتیوانیم دەکات، تێبینی ئەوەم کرد خوشکە گەورەکەی ئیهاب لە کەلوپەلی ناوماڵەکە وردەبووەوەو چاوی بڕیبووە ئەو وێنە خێزانیانەی بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوون. ئەو هەرگیز لەوەوپێش نەچووبووە ماڵێکی لەو شێوەیەوەو ئەوەش بەلای هەموومانەوە ئاشکرابوو دەبوایە خێزانەکەمان یارمەتی بداینایە ئەگەر بەو شێوەیە بژیامایە کە پێی راهاتبووم. پوورە سەمەر بە سەیرو سەرسوڕمانەوە نیگایەکی بۆ کردم‌و بەدزییەوە چەند سەرنجێکمان گۆڕییەوە. بەئاماژەی چاو

پێمگوت، دەبینی؟ مەگەر لە مەلەوانگەی هەنتین کلەپ پێم نەگوتی، دواجار ئەمو نارەزووەکانمی ژەهراوی نەکرد.

دواتر پوورە نەجوا هاتە لام‌و راشکاوانە لێیپرسیم: "زەینەب، بەنیازی خۆت تووشی چی بکەیت؟"

دوای چەند هەفتەیەك ریزێك ئۆتۆمبیل خۆیکرد بە کوێرە کۆڵانەکەمانداو (ئەوسەری دەرنەدەچوو) دەرزەنێك پیاو دابەزین‌و ژمارەیەك شێخی خێڵەکیشیان لەگەڵدابوو. هاتنە ژوورەوەو دزداشەیان لەبەردابوو، عەبای سەرشانیان دابوو بەخۆیاندا کە دەستچنی خوری بوون‌و بەدەزوولەی ئاڵتونی چنرابوون، هەروەها عەگالی سپییان لەسەرکردبوو. لەگەڵ پیاوەکانی خانەوادەکەی ئێمە کە هەموویان قاتیان لەبەردابوو تەوقەیان کردو بەشێوەی بازنەیی لەباخچەکەدا دانیشتن. بەپەشۆکاوییەوە لەگەڵ ژنەکانی تردا لەپەنجەرەکەوە تەماشامان دەکردن لەوکاتەی باوکی نیهاب‌و پیاوە ریش سپییە خێڵەکییە بەتەمەنەکانی تر دانیشتنی پیاوانیان کۆتایی پێهێنا بەجۆرێك رەزامەند بوون لەسەر هاوسەرگیریمان. هەریەك لە پیاوەکان شیعرو قورئانیان لەبەر دەخوێندەوە دەربارەی هاوسەرگیری. ئایەتێکی قورئانیان خوێندەوە کە دەفەرموێت "لەنێو بەڵگەو نیشانەکانی خودا ئەوەیە کە هەردوو رەگەزی لەنێوانتاندا بەدیهێناوە تاکو لەپای یەکترا ئارامبگرن‌و خۆشەویستی‌و میهرەبانی لەنێوانتاندا دروست بێت". باوکم بەرێز بوو بەرامبەریان، بەڵام بێتاقەت بوو هەروەها هیچ شیعرێك یان ئایەتێکی قورئانی لەبەرنەبوو. لەجیاتی ئەوە پێیگوتن کە من بەلای ئەوەوە زۆر ئازیزم‌و جگە لەبەختەوەری من خوازیاری هیچ شتێکی تر نییەو داوای لەخوا کرد هاوسەرگیری من‌و نیهاب پیرۆز بکات. کاتێك لەو قسانە تەواو بوون هەموویان دەستیان هێنا بە دەموچاویانداو سورەتی (الفاتیحە) یەکەم سورەتی قورئانی پیرۆزیان خوێند. پاشان تەوقەیان کرد، ئەمە ئاماژەیەك بوو تا بچمە دەرەوەو لەسەر سینییەکی گەورە جۆرە شەربەتێکی تایبەتیان پێشکەش بکەم. کاتێك گەیشتمە لای باوکم‌و شەربەتەکەم بۆ راگرت لەروخساریدا دەمخوێندەوە کە بەلایەوە چەند سەخت بوو بەم بارودۆخەدا تێبپەڕێت. کاتێك بۆ دڵدانەوەی زەردەخەنەیەکم بۆ کردو ویستم ماچێکی پێبدەم، رووی وەرگێڕا.

بۆ ئاهەنگی مارەبڕی، باخچەکەمان لێوانلێو بوو لە بۆنو بەرامی چێشتلێنانو گوڵو گوڵزارو یاداوەری منداڵییان دەخستمەوە یاد. رادیە گەڕایەوە تا یارمەتیمان بدات، ماوەی چەند ساڵێك بوو ببووینە هاوڕێی باشو زۆر خۆشحاڵ بووم دەمێك باسی ئەوکاتەی بۆ دەکردم کە لەگەڵ دراوسێکەیان کەوتبووە داوی خۆشەویستییەوە. ئەو قوتابخانەی ئامادەیی تەواوکردبوو، پاشان هاوسەرگیری کردبوو داوای لە باوکم کرد یارمەتی هاوسەرەکەی بداتو لە فڕۆکەخانە وەك فەرمانبەرێکی تۆمارنوس ئیشێکی بۆ بدۆزێتەوە. دایکم هێندە هاوسەرگیرییەکەی پێخۆش بوو جلوبەرگی هاوسەرگیرییەکەی خۆی بەخشییە رادیە هەتاکو بۆ ئاهەنگی گواستنەوەکەی بیپۆشێت. بەڵام ئەو رۆژە کە دیم، بەیەکەم منداڵیەوە دووگیان بوو، لەو خانووە بچووکەی تێیدا دەژیان لەگەڵ خوشكو براکانی هاوسەرەکەشیدا پێکەوە ژیانیان دەگوزەراندو لەتەك خەسوی کێشمەکێشیان بوو. پێیگوتم "خۆشەویستی شتێکی جوانە، بەڵام کاتێك تۆو هاوسەرەکەشت بێ پارە بن ژیان سەخت دەبێت".

بەپێی دابونەریت، ئاهەنگی مارەبڕین بۆنەیەکی ژنانەیەو کاتێك دەستیپێکرد لەگەڵ پوورەکانمو هاوڕێکانم لەباخچەکەدا وەستابوومو کۆمەڵێك منداڵ هاتن قورئانێکیان هەڵگرتبوو لەگەڵ ئەنگوستیلەی دەزگیرانداریو ملوانکەیەكو گوارەو بازنەو ئەو ئەڵقەیەی نیهاب وەك دیاری مارەبڕین بۆی هەڵبژاردبووم. پاشان نیهاب هات، قۆزو کەشخەو حەوت ژنی خێزانەکەی لەگەڵ بوو، هەریەکەیان زەمیلەیەکی نەریتباوی پڕ لە دیارییان پێبوو، وەك قوماشو بۆنو گوڵو شیرینی. ئەو شەوە منو نیهاب بۆ یەکەمجار لەپێش چاوی هەموولایەك پێکەوە کەوتینە سەماکردن. پاشان مایکرۆفۆنەکەی هەڵگرتو شیعرێکی خوێندەوە کە بۆ منی نوسیبوو. کاتێك قسەی دەکرد تەماشای منی دەکرد، منیش ئاوێتەی ئەو خۆشەویستیو هەستو سۆزە ببووم. هەموو هاوڕێ کچەکانم چاوبەفرمێسك بوون لەوەی چەندە قۆزو رۆمانسی بوو.

سارا پیرۆزبایی لێکردمو باوەشی پێداکردمو گوتی "زەینەب، دواجار کاری خۆت کرد. بەخۆشەویستی هاوسەرگیریت پێکهێنا!"

لەلایەکی تری باخچەکەوەو بەتەنیشت ژنە عەبا رەشەکانەوە نیگای نابەدڵی

دایکم و هاوڕێکانیم لەڕوخسارياندا دەخوێندەوە. شیعرەکەی ئیهاب برینداری کردبوون. شیعرەکە بەتەواوی ڕێگەپێدانێکی ئاشکرای دڵداری قەدەغەکراو بوو. هیچ شتێك دەربارەی خۆی، خێزانەکەی، لایەنی دارایی، نەبوونی بڕوانامەی زانکۆ، گەڕانەوەی بەرەو عەشیرەتگەری، لەگەڵ پێشبینییەکانی ئەواندا یەکینەدەگرتەوە. ئەوە بەلامەوە گرنگ نەبوو. بەنیگایەك پێم وتن من وەك ئێوە نابم. من بەو شێوەیەی ئێوە ژیان ناگوزەرێنم.

ئەو شەوە من دڵخۆش بووم، بەڵام دایکم غەمبارو پەست.

ڕۆژی دواتر دایکم پێیگوتم "زەینەب، دەزانی پوورە نەدا چی پێگوتم؟ وتی: عالیە، چۆن کچەکەت داوە بەکوڕێکی لەو چەشنە؟ تۆ خەریکی چیت؟ بیرۆکە لیبراڵیەکانت زۆری تێپەڕاندووە. ئەوە ژیانی کچەکەتە کە ئێمە باسی لێوە دەکەین".

زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و جارێکی تر پرسی "زەینەب، گومانت نییە لەوەی ئەنجامی دەدەیت؟"

پاش حەفتەیەك و لەناهەنگەکەدا، پاسەوانێکی کۆشکی کۆماری ئوتۆمبیلێکی متسیوبوشی سەوزی کاڵی هێنا بۆ ماڵمان. باوکم هاتە ژوورەوەو سویچو ساڵانەی ئوتۆمبیلەکەی پێدام.

گوتی "ئەمە دیاری هاوسەرگیریەکەتە لەلایەن عەمو سەدامەوە. تاکە ئوتومبێلی ڕەنگ فستەقییە لە عێراقدا".

ئوتومبێل لەلایەن حکومەتەوە هاوردە دەکراو جگە لە مارسیدسە ڕەشەکان ئوتومبیلەکانی تر زیاتر سپی بوون. بێجگە لەخێزانەکەم و ئیهاب کەسی تر نەیدەزانی کێ ئەو ئوتومبیلە سەوزەی پێ بەخشیبووم. زۆر حەزم لە لێخوڕینی دەکرد بەناو بەغداو هەر زوو بووە پێناسم. ڕۆژێکیان ئیهابم برد بۆ پیاسە، بەڵام پێیگوتم دەبێت بیفرۆشین و بەپارەکەی دوکانی کوتاڵی پێدابنێت.

منیش گوتم "ئیهاب، من نامەوێت بیفرۆشم. ئەوە دیارییە بۆ من". گوتی "ئوتومبیلێکی بچوکترو کۆنترت بۆ دەکڕم و ئەوەشی لێی مایەوە وەبەرهێنانی پێدەکەین بۆ دوارۆژمان". بەڵام من سوور بووم لەسەر ئەوەی نابێت ئاوا زوو بیفرۆشین، چونکە ئەوە بێڕێزییە".

دوای ئـەوەی دەزگیرانداریيەکـەمان بەفـەرمی چەسپا، ئـیتر دەمـانتوانی وەك هاوسـەر خۆمـان دەربخـەین و ئیهابیش زیـاتر بـە لەخۆڕابینییـەوە وەك هاوسـەری داهـاتووم خـۆی دەنوانـد. یەکـەم شـەو پێکـەوە چـوینە دەرەوە بـۆ بۆنەیـەکی کۆمەڵایەتی لەگەڵ پزیشکێکی خـەڵکی کوبا کـە فیـدل کاسـترۆ بـۆ خزمـەتی عـەمو ناردبووی، ئەو دەستبەجێ دڵپیسی کردوو سوور بوو لەسەر ئەوەی لەتەنیشـتمەوە دابنیشـێت. رانـەهاتبوو بمبینێـت لەگـەڵ پیـاوێکی تـردا پێبکـەنم، بەشـوێنی کۆبوونەوەی خەڵکی رانەهاتبوو.

شـێوازی پـەروەردەکردنی ئـەو ئاسـایی لـەهی مـن جیـاواز بـوو. ئێوارەیـەکیان کەوتینە گفتوگۆیەکی توندەوە دەربارەی مێژووی سوننەو شیعە داخۆ کێیان مـافی ئەوەی هەبوو لەدوای کۆچی دوایـی محەمـەدی پێغەمبـەر فـەرمانڕەوایی مسـوڵمان بکەن. من گوتم تێناگەم بۆچی روداوێك کە ١٣٠٠ ساڵ لەمەوبەر روویداوە بەردەوام ببێتە سەرچاوەیەکی رق و کینە لەنێوان مسـوڵماناندا. دایکم وای فێرکردبـووم کـە "بیروڕای شیعەش بەو شێوەیەیە" حەزرەتی عەلی کە ئامۆزای پێغەمبەرو زاوایەکی خۆشەویستی بوو لە مـافی خـۆی فێڵی لێکـرا تـا سـەرکردایەتی مسـوڵمانان بکـات و پاشانیش کوژرا، ئیتر رێگە بۆ فێڵکارەکە خۆشبوو تا دەسەڵات بگرێتە دەست.

ئیهاب گوتی "ئەگەر عەلی لەلایەن سیاسەتمەدارەکانەوە فێڵی لێکرابێت کەواتە ئەوە هەڵەی خۆیەتی. هەموو سیاسەتمەدارەکان بەفێڵەوە سیاسەت دەکەن و چـۆن دەیبەنەوە کێشەیەك نییە. ئەگەر عەلی دۆڕاندبێتی، ئـەوا ئەیسـەلماندووە شـایەنی ئەوە بێت سەرکردایەتی مسوڵمانان بکات. ئەرێ دەزانی زۆرێـك لـە خـەڵکی پێیـان وایە شیعەکان کلکیان هەیە".

کلك؟ بڕوام نەدەکرد ئەم قسەیە لەو ببیستم. وەك ئەوەی هەندێك مەسـیحی رۆژاوا لەکۆندا پێیان وابوو جولەکـەکان قۆچیان هەیـە، ئـەوهاش هەنـدێك سـوننی پێیان وابوو شیعەکان کلکیـان هەیـە. پێشـتر پـوورە سـەمەر بـۆی گێڕابوومـەوە کـە لەگەڵ هەندێك هاوڕێیدا رۆشتبوو بۆ ساونا لە هەنتین کلەپ و ژنێك کە نەیزانیبوو پوورم شیعەیە وتبوی شیعە بـەوە ناسـراون کـە کلکیـان هەیـە. پـوورە سـەمەریش هەستابووە سـەرپێی و خاولیەکـەی لـەخۆی کردبـووەوەو پشـتی تێکردبـوو گوتبـووی "ئەوە پشتم، جوان سەیری بکە. من شیعەم، سەیرکە بزانە کلکم هەیە؟"

لـەو رقو کینـەو نەزانینـە تێنەدەگەشـتم. شـیعە تاکـە لایـەن بـوو کـە سەرکوتکرابوونو ببوونە قوربانی، لەگەڵ ئەوەشدا رقیان لە سوننەکان نەبوو بەو شێوازەی سوننەکان رقیان لەوان بوو. بەڕوونو ئاشکرایی ئیهاب بڕوای بەو جۆرە باسو خواسانە نەبوو کەمێك رێزی بەرامبەر شیعە دەنواند. سامەڕا پێگەیەکی بـەهێزی خێڵـەکی سـوننە بـوو و بـە هـەبوونی مزگـەوتێکی مێـژوویی شـیعەش ناسرابوو. مزگەوتەکە پێی دەگوترا (ئەلەهدی) کە تاکە کەس بوو لەو دوانـزە نەوەی عەلیو فاتمە بڕوا وابوو نەکوژرا بێتو بەلای شیعە پەیڕەوکارەکانـەوە وەك کەسـایەتی عیسـای لێهـاتووە، لەبەرئـەوە سـەردانی مزگەوتەکـە دەکـەنو نـزا بـۆ گەڕانـەوەی دەکـەن. هەنـدێك لـە سـوننەکانی سـامەڕا پەسـتو بێـزار بـوون لـەو سـەردانە بەردەوامانــەی شـیعەکان بـۆ ناوجەرگـەی خاکەکـەیان، وادەردەکـەوت ئیهابیش یەکێك بێت لە ئەوان.

دوانیوەڕۆیـەکیان ئیهـاب بەتوڕەییـەوە گـوتی "زۆر رقـم لـە شـیعەیە. دەبێـت هەموویان لەناوببرێن. حەزدەکەم رۆژێك بچم بۆ نەجەفو هەموویان بکوژم".

ئـەو دەربڕینـە لـەناکاوە رقو کیناوییـەی تاسـاندمی. زۆر لەگـەڵ کەسـانی سـوننەدا بـووم، بـەڵام بـەهیچ شـێوەیەك شـتێکی لـەو بابەتـەم لێ نەبیسـتبوون. دەمزانی عەمو رقی لە شیعە بوو، بەڵام هەرگیز بەو شێوەیە قسـەی نـەدەکرد یـان هیچ نەبێ لای من قسەی وەهای نەدەکرد.

منیش بەتوڕەییەوە وتم "ئیهاب، مـن شـیعەم. کەواتـە پێتوایـە دەبێت منـیش بکوژرێم؟"

یەکسـەر دەسـتی گـرتمو گـوتی "نـا، نـا ئەزیزەکـەم. تـۆ نـا، تـۆ جیـاوازی. تـۆ تایبەتی".

تـا ئـەمرۆش لـەخۆم پەسـتم کـە رێگەمـدا ئـەو سـاتە بگـوزەرێو بەگـژ ئـەو تونڕەوییە کوێرانەیـدا نەچوومەوە، بـەڵام هێنـدە خۆشمدەویسـت نەمـدەبینی کە ئەو پیاوەی دەزگیرانداری بووم ئەو خوێندکارە شاعیرە نەبوو لەگەڵیدا کەوتبوومـە داوی خۆشـەویستییەوە. لەو ساتە رۆمانسیانەی بەدزییـەوە یـەکتریمان دەبینـی لـە پـەیمانگا فەرەنسـییەکە، ئـەو سـەرکۆنەی سـەدامو ئەوانەشـی دەکـرد لـەناو کۆشکەکەیدا بوون منیش ئاواتەخواز بووم لێی قوتاربم. پاشان خوازیاربوو چاوی

پێیان بکەوێت. هەمیشە دەمویست چاوپۆشی لەو جیاوازی چینایەتییە بکەم کە لەنێوانماندا هەبوو، بەڵام بەئاشکرایی ئەو وانەبوو. لەوکاتەی لەگەڵ دایکم خۆم ئامادە دەکرد تا بچم بۆ ئەمەریکا بۆ کڕینی جلوبەرگی گواستنەوەم، لیستێکی دوورودرێژی دیاری پێدام تا بیکڕم بۆ هەموو ئەندامانی خێزانەکەی و دراوسێکانی و هاوڕێکانی و هاوپیشەکانی. کاتێك لە شیکاگۆ بووم، ئیهاب هەر تەلەفۆنی بۆ دەکردم و داوای لێدەکردم لەماڵ بمێنمەوە و لەگەڵ خێزانەکەم نەچمە دەرەوە. بەردەوام تەلەفۆنی دەکردو داوایدەکرد دیاری تر بکڕم تەنانەت بۆ خێزانی هاوڕێکانی. وا دەردەکەوت هەستی وابوو بێت ئیتر ئەو بەتەواوەتی هاوسەری داهاتووی منەو هەرچییەکم پێبڵێت دەبێت ئەنجامی بدەم تەنانەت ئەگەر هەزارەها میل دووربم و منیش چیتر نەمدەتوانی خۆبگرم. کاتێك تەلەفۆنی دەکردو من لەوێ نەدەبووم ئەوا زۆر بەتوڕەیی پەیامی دەنگی جێدەهێشت. کاتێك لەبەر ئاوێنەیەکدا جلوبەرگی گواستنەوەم تاقی دەکردەوە، دایکم تیرو توانجی تێدەگرتم دەربارەی ئیهاب.

دەیگوت "حەیفە ئەم هەموو جوانییە بچێتە لای پیاوێك کە شایەنی تۆ نییە".

"تکایە دایکە، وازم لێبێنە" لێی پاڕامەوە. بەڵام لەناخدا هەستم بەترس دەکرد. ئایا بەڕاست پێیوابوو کە ئەو مافەی هەیە کۆنترۆڵی هاتوچۆکردنم بکات؟ ئەی بیرو بۆچوونەکانم چی؟ گرنگی هاوسەرداری لەگەڵ ئەو چی دەبوو ئەگەر ئەو ئازادییەی بێئەندازە خوازیاری بووم بەناوی خۆشەویستییەوە لەدەستم بچوایە؟

دایکم وتی "زەینەب، ئەو تەواو نییە. مێشکی گیرۆدە بووە. پێویستە کۆتایی بەمە بهێنیت. مەهێڵە هیچ پیاوێك کۆنترۆڵت بکات یان خراپ مامەڵەت لەگەڵ بکات!"

هەر لەوکاتەی منداڵێکی بچووك بووم هەردەم گوێم لەو دێڕە دەبوو کچێکی چێشتلێنەر ئەو رازەی بۆ درکاندبووم کەوا باوەپیارەکەی دەستدرێژی کردبووە سەر. هەرکە گەورەتر دەبووم و دەسەڵاتی عەمو بەسەر ژیانمانەوە زیاتر سەنگی دادەنا، دایکیشم زیاتر کەللەڕەق دەبوو. دوانیوەڕۆیەکیان، کاتێك لەبازاڕکردن

گەڕاینەوە، دواجار گوێبیستی گیرۆدەیی ئیهاب بووم لە تەلەفۆنەکەدا. ئەم جارەیان حەوت نامەی جێهێشتبوو، دوا نامەیان فەرمانی پێدەکردم کە دەستبەجێ بگەڕێمەوە بۆ عێراق. شێوازی دەنگەکەی بەڕاستی ترساندمی. ئەوەم بەخەیاڵدا هات کە دەبێت ئەو ساتە چۆن بێت کاتێك هاوسەرەکەم بەو شێوەیە قسەم لەگەڵ بکات بۆ تەواوی ژیانم. دواجار وەك "هیسکلیف"ی لێهات، گیرۆدەو خۆسەپێنەرو دڵپیس.

بە دایکم گوت هاوسەرگیرییەکە هەڵدەوەشێنمەوەو دەستمکرد بەگریان. داخۆ هێندە خوازیاری هەڵاتن بووم لە عەمو ئامادەبووم لە دیلگرێکەوە رابکەمە باوەشی یەکێکی دی؟ وەها رێگەم بەخۆمدابوو پیاوێکم خۆشبوێت کە نەگەر رقی لە منیش نەبێت، رقی لەکەسانی وەك من بوو، لە کەسی وەك نەنکم؟ بڕوام نەدەکرد بڕیاردانو هەڵسەنگاندنەکەم هێندە خراپ بووە. کاتێك لە شیکاگۆوە تەلەفۆنم بۆ ئیهاب کردو بڕیارەکەم پێگوت، شێت بوو، جیابوونەوەی رەتکردەوە. رازی بووم بەوەی بەتەنیا بیبینمو ئەو دیارییانەی بۆ بگێڕمەوە بۆ هاوسەرگیرییەکە بۆی هێنابووم، بەڵام کاتێك لە بەغدا چاوم پێکەوت هەڕەشەی ئەوەی لێکردم کە بمبات بۆ لای کەسێکی ئایینی لەنزیك سامەڕا تاکو دژی خواستی من مارەبڕییەکە دوایی پێبهێنێت. پاشان دەستیکرد بەشوێنکەوتنم لە بەغدا. بۆ هەر شوێنێك بڕۆشتمایە بەدوامەوە بوو، خێزانەکەم لەبەر سەلامەتی من توشی دڵەڕاوکێ ببوون. باوکم بڕیاریدا داوای هاوکاری بکات. دوای ئەوەی باوکم لەگەڵ یەکێك لە پاسەوانە ئەمنییەکانی سەدام رۆشتو قسەی لەگەڵدا کرد، ئیتر وازی لەو کارە هێنا. دوای ئەوەی جیابوومەوە زۆر سوپاسگوزاری ئەو دایكو باوکە بەسۆزو پشتیوانکارەم بووم کە هەرگیز پێشتر وانەبووم. دوای ئەوەی دەزگیرانداریەکە کۆتایی هات، تێکشکابووم. هێندە بێتاقەت بووم تەنانەت نەمدەویست لەماڵ بڕۆمە دەرەوە. لای هەموو کەسێك شەرمەزار ببووم، دایکم، باوکم. کەس پێی نەگوتم بەقسەت نەکردین، بەڵام دەمزانی هەموو کەسێك بەو شێوەیە بیردەکاتەوە. خەڵکی زۆر بەڕێز بوون لەگەڵمدا، بەڵام بەشێوەیەك تەماشایان دەکردم وەك ئەوەی بڵێن باشە، بۆ خۆت کاتێکی خۆشت بەسەربرد، ئەزموونی خۆتت تاقیکردەوە، بەڵام کەڵکی نەبوو. لەسەرەتاوە ئەوەت نەدەزانی،

بـەڵام لـەو هەڵیەتـەوە فێربوویـتو تـەواوی خانەوادەکەشـت شـەرمەزارکرد. ئێستاش هاتویتەوەو درکت بەوە کردووە کە هەروەك ئێمەیت، ئەو بیرکردنەوانـە وایـان لێکـردم زیـاتر هەسـت بەتـەنیایی بکـەم. تاکـە ڕێگـای رزگـاربوونم کـە بیرملێکردبووەوە هاوسەرگیری بـوو، بەتـەواوی بـاوەڕم بەغـەریزەکانی خـۆم نـەما. هیلاك بـووم لەدەسـت مشـتومڕکردنو بێزاربـووم لەدەسـت ئـەو کەسـەی لەگەڵیـدا نەدەگونجام.

داوام لـە دایکـم کـرد "دایکـە، بـۆ خۆگـۆڕینی هاوسـەرگیری عـودەی یارمـەتیم دەدەیت؟" لەپێشدا ئەو قسانەم ڕێکخستبوو بۆ ئـەوەی دڵخۆشـی بکـەمو سەریشـی گـرت. بـاوکم لـە تایلەنـد تۆپێـك قوماشـی ئاوریشـمی زەردی بـۆ هێنـابوومو لەگـەڵ دایکم بردمان بۆ لای بەرگدروویەك. کۆتایی ساڵی هەشتاکان بوو، زیادەڕەوی بـاوی بوو. کاتێك ئـەو شـەوە عەزیـە زەردەکـەم لەبـەرکرد بـۆ ئاهەنگەکـە، هەسـتم بـەو دەرقۆڵـە گەورانـە دەکـرد کـە لـە شـانمەوە دەرچـوبوونو تەنورەکەشـی قوماشـێکی ڕەقـی تـازەی وڵتـز بـوو بەچـواردەورمدا خڕبـبووەوە. لەبـەردەم ئاوێنـەی خۆڕازانـەوەی دایکـم دانیشـتم تـا ماکیـاژم بـۆ بکـات. لەبیرمـە لەئاوێنەکـەدا تەماشامدەکرد، کە چەند بەجوانی ئەساسی کردبوو، پشتچاوە ڕەشەکانی، عەزییە درەوشاوەکەیو قژە تازە بڕاوەکـەی چـەند لێ جـوان بـوو. بۆچـی چیتر قـژی درێـژ نەدەکرد؟ تاسەی قـژە درێـژە شـەکاوەکەیم دەکـرد. بەدەسـتی چـەناگەمی گرتبـوو لەوکاتەی برژانگەکانی بۆ ماسکاراو سەرکوڵمو سوراوی بۆ دەکـردم. لەئاوێنەکـەوە سەیری خۆمم دەکرد، بەڵام ئەو زەردەخەنەیەی دەمبینی هینی ئەو بوو نەك من. هەستمدەکرد یەکەم هەنگاوم دەنا بەرەو خۆبەدەستەوەدانم.

کاتێك ئەو شەوە چوینە هۆڵەکەوە، وا هەستمدەکرد ئەسپێکی براوەمو دایکم پیشانی جیهانم دەداتو دەڵێت، ئەمـە کچەکەمە، تەماشـای بکـەن. چـەند جوانـە. هەروەك خۆیەتی. هیچ لە ئێوە جیاوازتر نییـە. ژنـان لـە دەوروپشـتمدا چـەپڵەیان بۆ مۆسیقاکە لێدەداو بەلێوی ئاڵەوە زەردەخەنەیان دەکردو قـژیان سـپرا کردبـوو، دەموچاوو جلەکانیان دەدرەوشایەوە. منیش هەروەك ئەوان بووم، بەڵام وامئەزانی وەك پاکـەتێك دیـاری پێچـراومەتەوەو گرێـدراومو بـۆ شـوێنێکی هەڵـە نێـردراوم. هەسـتم بەکێشـی ئـەو ماکیـاژەی سـەر دەموچـاوم دەکـرد کـە وەك ماسـکێك رووی

راستەقینەمی لەژێرەوە شاردبووەوە. دەمبینی دایکم پێدەکەنی‌و هەڵدەپەڕی، منیش خوازیار بووم بزانم بەڕاستی دڵی خۆشە یاخود تەنها خۆدەرخستنە. کاتێك عودەی بە قات‌و بۆینباخەوە هاتە ژوورەوە، ژنان لەدەوری کۆبوونەوە وەك چۆن هەواداران لەدەوری ئەستێرەیەکی مۆسیقیی رۆك کۆدەبنەوە. لەوکاتەی هاوسەرەکەی سەمای بەدەوریدا دەکرد جوان‌و دڵگیر بوو. دەمناسی، خۆشمدەویست. کەسێکی بەڕێز بوو، بەڵام ئەویش بەهەمان شێوە کچی جێگری سەرۆك بوو باوکی ئەم هاوسەرگیرییەی بەهۆکاری سیاسی بۆ رێکخستبوو. چ پیاوێك دەتوانێت ئەو کارە بەرامبەر کچی خۆی بکات؟ خوازیار بووم بزانم، دەمزانی باوکم بەهیچ شێوەیەك کاری لەو چەشنە ناکات. چۆن ئەو خەڵکە دەیانتوانی ئاهەنگ بۆ دەستنیشانکردنی ئەو کچە بگێڕن بۆ ئەو پیاوە دەستدرێژکەرەی بەغدا؟ دەمزانی زۆربەیان خێزان‌و پوورو خوشکەکانی ئەو بوون، بەڵام بۆچی ئەوان هیچ لێپرسراوێتییەکی پەروەردەکردنی ئەویان نەگرتبووە ئەستۆ؟ چۆن دەیانتوانی لەیادی بکەن ئەو چ جۆرە دڕندەیەکە؟

دواتر عودەی دەزگیرانداریییەکەی هەڵوەشاندەوە. لەبەر خاتری کچەکە، لەدڵی خۆمدا پێمخۆش بوو کە جیابوونەوە. بەڵام ئەوەی بووە قسەو باسی خەڵکی ئەمە بوو: دەبێت چی کردبێت ئەو بەختە باشەی لەدەست خۆی دابێت؟

رۆژێکیان کە هێشتا خەفەتی نیهاب لەدڵمدا بوو، دایکم بەخۆشییەکی بێئەندازەوە پێیگوتم دایکی فەخری لە ئەمەریکاوە تەلەفۆنی بۆ کردوەو داوایکردووە شوو بەکوڕەکەی بکەم. دایکم زۆری پێخۆش بوو. چاوەکانی دەدرەوشانەوەو ماوەیەکی زۆر بوو بەو دڵخۆشییەوە نەمبینیبوو.

پرسیم "فەخری؟ فەخری کێیە؟" نەمدەزانی هەر باسی کێ دەکات.

"نۆ، لەبیرتە! لە شیکاگۆ بینیت!"

پیاوێکی بەتەمەنی وەبیرهێنامەوە لەوکاتەی رۆشتبووم بۆ ئەمەریکا بۆ کڕینی جلوبەرگی گواستنەوە لەکۆبونەوەیەکی گەورەدا کەمێك قسەم لەگەڵ کردبوو.

لەپێشدا بەهێواشی وتم "نا نا نا دایە". پێموابوو بەڕاستی نەبێت، بەڵام وا نەبوو.

گوتم "دایە، نامەوێت جارێکی تر بەو بارودۆخەدا تێبپەڕم. تەنها دەمەوێت گرنگی بەخوێندنەکەم بدەمو تەواو. ئێستا کاتی مێردکردن نییە".

گوتی "ئۆی خۆشەویستم، مەهێڵە ئەزموونێکی تاڵ هەموو داواکارەکانی تریش بەو شێوەیە رەنگ بکات، بەتایبەتی کەسانی چاکی وەك ئەم".

"دایکە، ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟ ناتوانم دیسان خۆم لە هاوسەرگیرییەکی ترەوە بئاڵێنم. پێویستم بەپشووە. بۆ ماوەی دوو ساڵ لەگەڵ ئیهابدا بووم. بۆ خۆم پێویستم بەهەندێك کات هەیە پێش ئەوەی بتوانم بیر لە بابەتی هاوسەرگیریو شتی لەو چەشنە بکەمەوە".

جارێکی تر بیری هێنامەوە "زەینەب، ئەو لە ئەمەریکا دەژی".

"دایکە بەڵام من نایناسم".

ئیتر بۆم دەرکەوت چەند بەڕاستییەتی. بەچاوێکی بەزەییانەو زۆر بەخەفەتبارانەوە تەماشای دەکردم. وەك ئەوەی هەرچی وزەی هەبوو لەم داواکارییەدا خستبویە گەڕ هەتاکو یارمەتی من بدات لەو گێژەدەییە رزگارم ببێت کە ئەوی تێدا بوو.

بەهێواشی پێیگوتم "زەینەب، سەیری دەوروبەرت بکە، ئەو شیشە ئاسنینانە نابینیت؟"

بەدوای چاوەکانی ئەودا چاوم دەگێڕا بەدیوارو کەلوپەلی ناوماڵو ئەو دەرگا شوشەییەی بەسەر باخچەکەماندا دەیڕوانی.

"ئەوان نەبینراون، بەڵام لەهەموو شوێنێکن. شوێنێکی گەورەیە، بەڵام هەموو رۆژێکی دە ساڵی رابردووی ژیانم هەستم بە توڵە ئاسنینەکانی ئەم زیندانەی چواردەورم کردووە. ئازیزەکەم، ئەمە هەلێکەو بۆت رەخساوە. لەدەستی مەدە. لێرە مەمێنەرەوە تاکو وەك منت لێنەیەت. خۆت دەرباز بکە. ئەمە هەلی ئازادبوونتە".

ئەوە ساتێکی زۆر پڕ ئێشو سەخت بوو. هانی دەدام پێچەوانەی هەموو ئەو شتانە بکەم کە چەند وەخت بوو فێری کردبووم بڕوام بە خۆشەویستیو هاوسەرگیری هەبێت، بەڵام ئەوەشی پیشاندەدام کە دواجار جەوهەری خۆی بەدەستەوە نەدابوو. ئەو زۆر لەوەوپێش وازی لە تکاکردن لە باوکم هێنا بوو

هەتاکو بڕۆن، بەڵام هێشتا ئاگای لەو دۆزەخە هەبوو کە ئێمەی تێدا دەژیاین. دەستی لە ئاواتەکانی ئازادبوونی خۆی هەڵگرتبوو، بەڵام هەرگیز هیوابڕاو نەبوو لە هاوکاریکردنی من بۆ دۆزینەوەی ئازادییەکانم.

لێمپرسی "بەهەرحاڵ، ئەو کێیە؟"

دەستیکرد بەباسکردنی ئەوەی چەند بازرگانێکی سەرکەوتوەو بڕوانامەی ماستەری هەیەو لە شیکاگۆ دەژی. پیاوێکە لەبنەماڵەیەکی باشی شیعەیەو لەسەرەتای ١٩٨٠ کانەوە وڵاتیان جێهێشتووە، ئەویش دەیکردە ئەو کاتەی تازە چووبوومە قوتابخانەی ناوەندی.

"تەمەنی چەندە؟"

وتی "کەمێك بەتەمەنە، ٣٣ ساڵە"

"گاڵتەم پێدەکەیت دایکە؟ ١٣ ساڵ لەمن گەورەترە!"

گوتی "زەینەب، ڕێگەی عیشقت تاقیکردەوەو سەرکەوتوو نەبوو. تۆ ناڵێیت ڕەنگە ئەمە لەباشترین بەرژەوەندی تۆدا بێت؟ تۆ شایەنی ژیانێکی تری وەك لەو دواڕۆژەی لێرە دەتبێت. تۆ پیشەیەکت دەوێت، دەتەوێت دنیا ببینیت، ئەو ئازادییەت دەوێت کە خوازیاری چی بیت بەئەنجامی بگەیەنیت. چۆن دەتوانیت هیچ کام لەو شتانە لێرە بەدەست بهێنیت؟ متمانەم پێبکە ئەزیزەکەم. زەینەب، ئەم هەلە بقۆزەوە. لەو ژیانە بژی کە من ناتوانم تێیدا بژیم".

هەستم بەفرمێسکی دوودڵی دەکرد دەڕژانە چاوەکانمەوە.

"شیرینەکەم، تەنها بەڵێنیم پێبدە کە بەڕاستی ئەم بابەتە لەبەرچاو دەگریت، باشە؟"

لەبەر دایکم گوتم باشە.

لەوکاتەدا تازە لوما هاوسەرگیری کردبوو، پێش ئەوەی مێردی پێبکات تەنها یەکجار دەستگیرانەکەی لە ژووری میوانەکەی خۆیاندا بینیبوو. ئیتر ئەوەی باسی لێوە دەکرد بریتیبوو لەڕازاندنەوەو شت کڕین بۆ خانووە تازەکەی. ئاخۆ ئەوە دەبووە چارەنووسی منیش ئەگەر ئەوێم جێنەهێشتایە؟ هاوسەرێکی دەوڵەمەندو خانوویەکی گەورە بۆ ڕازاندنەوەی؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵی بەهاوسەرگیرییەکەی خۆشبوو، ئەوەش بەمێشکمدا هات کە ڕەنگە ئەو ڕێگەچارە

کۆنباوانە باشترین بن. ڕەنگە هۆکارێك هەبووبێت هەتاکو کچان متمانە بە بڕیارو هەڵسەنگاندنەکانی باوانیان بکەن کاتێك دەهاتە سەر بابەتی هاوسەرگیری. ئایا دەبوایە هەر گوێم بۆ دایکم بگرتایەو بەگوێم بکردایە؟ خەونەکەیم بهێنایەتە دی؟ ببووم‌ایەتە کچێکی باش‌و بۆ تاکە جارێك خۆشحاڵم بکردایە؟ نەمدەزانی بڵێم چی. هێند سەخت لەخۆشەویستیدا شکستم هێنابوو چیتر متمانەم بەبڕیاری خۆم نەمابوو. نەمدەتوانی بەخەیاڵمدا بێت جارێکی تر بکەومە خۆشەویستییەوە، بەڵام ئەگەر جارێکی تر بکەوتبامە خۆشەویستییەوەو دوچاری هەمان هەڵە بومایەتەوە چی؟ دایکم ڕاستیدەکرد. ڕێگەی خۆشەویستم تاقیکردەوە بەڵام سەرکەوتوو نەبووم.

لایەنێکی باشی ئەو نەهامەتییەی لەگەڵ ئیهاب توشم هات ئەوە بوو منو باوکمی زیاتر نزیك کردەوەو لەوەوپێش بەو شێوەیە نەبووین. لەوکاتەدا باوکم زۆر میهرەبان‌و بەسۆز بوو لەگەڵمدا. هەمیشە بە خەڵات‌و دیاری خۆشەویستی خۆی پیشاندەدام. بۆ نموونە ڕاهێنەرێکی تازەی یاری تێنسی هێنایە ماڵەوە لەگەڵ ڕەکتەی تازەدا بەو هیوایەی لەو خەمۆکییەو لەماڵەوە بمهێنێتە دەرەوە. هەر لەسەرەتاوە هەرچی دەگوت دەربارەی ئیهاب ڕاست بوو. لەگەڵ باوکم ڕانەهاتبووم باسی شتی تایبەتی بکەم، بەڵام بەڕاستی بیروبۆچوونی ئەوم لەلا مەبەست بوو.

پێمگوت "باوکە، داوای ئامۆژگاریت لێدەکەم. تۆ ئەم داخوازییەت پێ چۆنە؟ پەسەندی بکەم؟"

گوتی "زەینەب، ئەوە بەدەست خۆتە. نە بەدەست منەو نە دایکت. خۆت بڕیار بدە".

منیش گوتم "نا، باوکە. پێشتر ئەوەم تاقیکردەوە. سەرکەوتوو نەبووم‌و تۆش‌و دایکیشم شەرمەزارکرد. نامەوێت جارێکی تر ئەوکارە بکەم. ئێوە ئەو بڕیارە بۆ من بدەن. متمانەم بە بڕیارەکەتان هەیە چی باش بێت ئەوەم بۆ بکەن‌و منیش پێوەی پابەنددەبم. دەمەوێت ببمە کچێکی باش بۆ تۆو دایکم. پێشتر زۆر هەڵە بووم. نامەوێت بەهەمان باردا بڕۆمەوەو هەمان چەوتی ئەنجام بدەمەوە. تکایە باوکە، پێویستم بە مۆژیاری تۆ هەیە. پێم بڵێ چ بکەم".

هەرچەندە دیار بوو نەیدەویست عێراق بەجێبهێڵم، بەڵام پێیگوتم "زەینەب،

هەرگیز ناتوانم ئەو کارە بکەم. تەنها دەتوانم ئەوەت پێبڵێم نابێت ڕێگە بەدایکت بدەیت زۆرت لێبکات تا پەسەندی بکەیت. ئەگەر بەدڵتە پەسەندی بکە. دەبێت تۆ بۆ خەونەکانی خۆت بژیت نەك خەونەکانی دایکت".

تەواوی ئەو شەوە نەخەوتمو قسەکانی باوکمم لێکدەدایەوە. باوکم ڕاست بوو. نەدەبوایە هەوڵبدەم خەونەکانی دایکم بهێنمە دی، بەڵام دایکیشم ڕاست بوو. من نەمدەویست لەو زیندانە بمێنمەوەو ژیان بکەم. شایەتحاڵێکی هەوڵەکانی خۆکوشتن، فرمێسك ڕشتنو سەردانەکانی (دایکم) بووم بۆلای دایکی لە کەربەلا. ئازارو نەهامەتییەکانیم بەچاوی خۆم بینیبوو. ئاخۆ لەپێش منیش خۆیان مەڵاسدابوو؟

لەئەنجامی ئەو داخوازییە، زۆر شتی باشو خراپم بەسەرهات کە بەڕوونی بیرم ناکەوێتەوەو ناتوانم بڵێم بۆچی دواجار ئەو بڕیارەم داو پەسەندمکرد. حەزم لە سەردانی ئەمەریکا هەبوو، بەڵام خۆ نیشتمانم نەبوو. عێراقم خۆشدەویستو نەمدەتوانی بیر لە جێهێشتنی خێزانەکەمو تەواوی ژیانم بکەمەوە لەدوای خۆم. بەڵام بۆ ساڵەهای ساڵ پشووەکانی هەفتە لەو خانووەدا گەیشتبووە ئەوپەڕی. لەڕادەبەدەر دەترسام لەوەی وەك دایکم گیرۆدەبم، ئەوجا چ لەڕووی جەستەییەوە بێت یاخود لەڕووی هەستو سۆزەوە. دواجار، من بە فەخریم نەگوت بەڵێ، بەڵکو بەدایکمم گوت بەڵێ. ئەو چی دەگوت دەربارەی ئیهاب ڕاست بوون، هاوکات من هەڵە بوومو پتر لەخۆم متمانەم بەدایکم هەبوو کە باشترین شت چی بێت هەر ئەوەم بۆ ئەنجام بدات.

کاتێك بەدایکم گوت ڕازیم ئەویش گوتی "سوپاس بۆ خوا".

ئەم جارەیان کارەکان بەخێرایی دەڕۆشتنە پێش. عەمو بەنابەدڵی ڕەزامەندی دەربڕی. دایکی فەخری لە ئەمەریکاوە کەوتە ڕێ هەتاکو بەشێوەیەکی فەرمی داخوازیم بکات. کاتێك گەیشتە جێ قاوەی تورکیو کولیچەم بۆ دانا. ژنێکی بچووکی لوت باریك بوو. کەوتە باسو خواسو پیاهەڵدانی کوڕەکەیو وێنەکەی دایە دەستم. لە وێنەکە وردبوومەوەو تەماشای دەموچاویم کرد. زۆر لاواز بوو. ڕومەتەکانی دەرپەڕیبوونو لێوەکانی باریكو لوتی لە لوتی دایکی دەچوو. تۆزێك لێی ساردبوومەوە، بەڵام وا بەخەیاڵمدا هات کە وێنە

هەردەم بەهەڵەدا دەتبات. ڕۆژێکیان تەلەفۆنەکە لێیداو دەموچاوی وێنەکە کەوتە قسە، بەشێوەیەکی فەرمی بەڵام هاوڕێیانە قسەی دەکرد. پاشان بەئامادەبوونی ژمارەیەکی کەمی پوورو پوورزاو ئامۆزاکانم لەهۆڵی ماڵەکەماندا ئاهەنگێکی بچووکی نیشانەکردنمان گێڕا. ئەو ڕۆژە بەتەواوەتی هەستم بەکەساسی خۆم دەکرد، منێك کە زۆر بەجۆشەوە باسم لە خۆشەویستی دەکرد، لە ئاهەنگی نیشانەکردنمدا کورسییەکی بەتاڵ لەتەنیشتم دانرابوو گەرچی دەبوایە دەزگیرانەکەم لەسەری دابنیشتایە.

دایکم چەند کاژێرێکی پێچوو تا دیزاینی عەزییەکەی بۆ کردمو دیاری بۆ میوانی نیشانەکردنەکە کڕیو جلوبەرگی گواستنەوەی بۆ ئامادە کردم. پلانەکە وابوو دایکمو براکانم بۆ ماوەی دوو هەفتە لەگەڵم بێن بۆ ئەمەریکاو باوکیشم هەرکات بۆی بڕەخسایە بهاتایە. مامۆستاکانم سەرسامکرد کاتێك پێمگوتن لە خوێندن دادەبڕێم. من یەکێك لەخوێندکارە باشەکانیان بووم، بەڵام بۆم ڕونکردنەوە کە کتێبەکانی خوێندنی ساڵی دواترم کڕیوەو بۆ تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ دەگەڕێمەوە. پێشتر بلیتێکی گەڕانەوەم بڕیبوو هەروەها پلانی دەرچونم لەکاتی خۆیدا داڕشتبوو.

لانە بەگریانەوە پێیگوتم "ناگەڕێیتەوە، دەزانم ناگەڕێیتەوە". منیش باوەشم پێداکردو گوتم، "دەبێت ساڵی چوارەم تەواو بکەم. بێگومان دەگەڕێمەوە. تەنانەت ئەلبومەکانمو کتێبی یادەوەرییەکانم لەگەڵ خۆمدا نابەم. کاتێك گەڕامەوە بۆ ماوەی دوو مانگ دەمێنمەوەو ئەوکاتە زۆر پێکەوە دەبین".

فڕۆکەخانەکە خەڵکێکی زۆری لێنەبوو بۆ ماڵئاوایی کردن. ئەوەی لەیادمە ئەوەیە لە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی سەدام حسێن بەبێدەنگی لەگەڵ خێزانەکەمو شۆفێرەکەمان لە بەشی کەسانی تایبەت دانیشتبووین. باوکم چاوی پڕ فرمێسك بوو. براکانم غەمگینو پەشۆکا بوون، تەنانەت شۆفێرەکەشمان هەوڵیدەدا خۆی بگرێتو نەگری. هەموویان خەمبار بوون جگە لە دایکم. دایکم وەها دەردەکەوت کە بەجێهێنانی ئەركو فەرمانێکی پێسپێردرابێت.

باوکم کاپتنی بەشی یەکەمی ئەو گەشتە ئاسمانییە بوو کە هەڵیگرتبوومو دەیبردمە دەرەوەی ژیانی خۆی. هەرکە فڕۆکەکەی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە،

گوێبیستی گۆرانییەکی فەیروزی گۆرانیبێژی لوبنانی بووین کە وەسفی جوانیو رووبارەکانو هونەری شیعری بەغدای دەکرد. لەپەنجەرەی فڕۆکەکەوە چاوم بڕیبووە شارەکەم. بۆ ماوەی هەشت ساڵ بوو بەهۆی جەنگەوە رەش هەڵگەڕابوو، بەڵام ئەو کاتەی من بەجێمهێشت یەکپارچە رووناکی بوو. هەروەکو فەرشێکی جوانی پڕ گڵۆپی درەوشاوە وابوو کە هەریەکەیان چیرۆکی خۆی هەبوو. لەخوارەوەو لەو شوێنەی پوورازو ئامۆزاکانمو قوتابخانەکەموماڵەوەو هەروەها هاوڕێکانمی لێبوو ماچەکانیان دڵمی دەتوانەوە کاتێك ماڵئاواییم لێکردن. لەوکاتەی روناکییەکان کزبوونو ئیتر دیار نەمان دەموچاوم نا بەپەنجەرەکەوەو هەوڵمدەدا فرمێسکەکانم رابگرم.

خۆ هیچ نەبێت چیتر عەمو ناتوانێت کۆنترۆڵی ژیانم بکات. لەو کاتەوەی لە ئیهاب جیاببوومەوە تەنها یەکجار بینیبووم. دەستی خستە سەرشانمو بۆ ماوەیەکی زۆر تەماشای کردم. ئەوە یەکێك بوو لەو کاتانەی پێموابوو چاوەکانی دەخوێندمەوەو وادەردەکەوت ئەو نارەحەتییە ببینێت کە بەتەواوەتی چەشتبووم بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیرییەکەمەوە، بەڵام دەربارەی جیابوونەوەکە هیچی نەگوت. لە دەزگیرانداریە تازەکەمەوە هیچ دەنگێکی نەبوو، هیچ دیارییەك نەبوو، هیچ پیرۆزباییەك نەبوو. وا بیرمکردەوە کە میهرەبانانە بەهۆی رۆیشتنمەوە سزا دەدرام. لەگەڵ ئەوەشدا دڵتەنگییەکەم لەرادەبەدەر بوو. ئاخۆ بەداخی ئەو شوێنەی لێی دەرۆیشتم دەگریام یاخود لەبەر ئەو شوێنەی بۆی دەچووم؟ نەمدەزانی. وا هەستمدەکرد بەرەو کونێکی تاریك دەفڕمو دەمویست خەوم لێبکەوێت.

لە فڕۆکەکە دابەزیمە جیهانێکی ئەمەریکایی قەرەباڵغەوە. لە دەروازەکە خانەوادەی فەخریو هەندێك لە هاوڕێکانی لەوێ بوون تا پێشوازیمان لێبکەن. بەخێرایی چاوم بۆ فەخری گێڕا لەناویانداو وەك لە وێنەکەدا بینیبووم ناسیمەوە. لەپێشدا سەلامم لە هەمووان کرد، دەستمکرد بەماچکردن لەگەڵ دایکیو باوکی کە پیاوێکی قۆز بوو بەگەرمییەوە بەخێرهاتنی لێکردم. پاشان خوشکێکی بەخێرهاتنی کردم کە بەهەمان شێوەی رەغدو رەنا تەماشای دەکردم کاتێك دەچوومە ئاهەنگەکانیانەوە، هەروەها سەلامم لە خزمەکانی ترو هاوڕێکانی

کرد. ئیتر کەسی تر نەما.

"پێتوایە تاچەند دەتوانیت خۆت لە سەلام لێکردنم بدزیتەوە؟" فەخری پرسی.

بەرێزەوە زەردەخەنەیەکم کردو بەشەرمەوە تەوقەم لەگەڵ کرد بێ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بدەمەوە. نەمویست ئەملاولای ماچ بکەم، هەستم بەشەرم کرد. کاتێك و دواجار کە تەماشای ناوچەوانیم کرد بۆم دەرکەوت بۆ یەکتر نەگونجاوین. هیچ حەزێکم لا دروست نەبوو بۆی، هیچ پەیوەندییەك دروست نەبوو. هیچ نەرمییەك

لەچاوەکانیدا نەبوو، هیچ بانگێشتێك بۆ خۆشەویستی نەبوو. ئەوەی لەپێشمەوە وەستابوو پیاوێکی درێژی بەتەمەنتر بوو کتومت لەدایکی دەچوو.

کاتێك هەردوو جانتاکەی لەشوێنی شتومەکەکان هەڵگرت، بەلامەوە وەك ئەوە وابوو تەواوی ژیانم لەدەستەکانیدا هەڵدەگرێت. هەستم بەو دەسەڵاتە کرد کە بەسەرمەوە هەیبوو، هەستم بەبێدەسەڵاتی دەکرد لەوکاتەی لەدەروازەی فرۆکەخانەکەوە شوێنی کەوتم بۆ شوێنی راوەستانی ئۆتۆمبیلەکان، لەکوێ سندوقی ئۆتۆمبیلێکی رەشی گرانبەهای ئەمەریکایی کردەوە تا جانتاکان بکاتە ناویەوە.

گوتی "ئەم ئۆتۆمبیلەم بەخۆشی تۆوە کڕیوە، چۆنە بەلاتەوە؟"

بەرێزەوە زەردەخەنەیەکم کردو گوتم "زۆر جوانە". ئاخۆ بەنیازبوو بە پارەو ئۆتۆمبیلێکی دەستی دووی گرانبەها سەرنجم بۆ لای خۆی رابکێشێت؟ ئاوێنەی لایەکی شکا بوو. گوتم "ئەوە چاکەی خۆتە بەخۆشی منەوە کڕیوتە". ئەویش گوتی "لە مەزادێکدا کڕیم. ئاوێنەکەشی چاکدەکەمەوە".

# لەبیرەوەرییەکانی عالیەوە

سەمیرە تاکە کەس بوو کە بەناوی خۆیەوە سەدامی بانگی دەکرد. شایەنی باسکردنە سەمیرە تەمەنی ٣٥ ساڵبوو ژنێکی قژ کاڵی چاو شین بوو.

یەکەم پەیوەندی کە سەدام لەگەڵ سەمیرەدا بەستی لە هاوینی ساڵی ١٩٨١دا بوو. سەمیرە لەقوتابخانەی ئەلەقاسیبی ناوەندی مامۆستا بوو. سەدام هەمیشە سەردانی ئەو ناوچەیەی دەکرد چونکە لەنزیك قوتابخانەکە مەلەوانگەیەکی هەبوو گەلێ جار لەگەڵ هاورێکانی دەچووە ئەوێ بۆ مەلەکردن. سەمیرە دەیویست بەهەر جۆرێك بێت خۆی لێ نزیك بکاتەوە. دەیگوت پێویستی بەیارمەتی ئەوە بۆ جیابوونەوە لە مێردەکەی. ئەویش هاوکاری کرد بۆ جیابوونەوە لە مێردەکەی‌و بەیەکجاری بووە خانمی سەدام، لەهەموو ئەو ئاهەنگانەی سەدام خانەخوێی دەکرد سەمیرە ئامادە دەبوو، تەنانەت لەو ئاهەنگانەش کە تایبەتمەند بوون بەپیاوان. سەمیرە هەرگیز لای ئەوی چۆڵنەدەکرد. سەدام هەمیشە باسی لەوە دەکرد چەندێك ئەو راستییەی بەدڵە کە هەندێك جار سەمیرە وەك هەرزەکارێك‌و هەندێك جاریش وەك ژنێکی گەورە رەفتاری دەکرد. باسی لەوە دەکرد کە چەند ئاسودەیە کاتێك لەگەڵ سەمیرەدایە، لەبەرئەوە سەدام داوای هەر شتێکی بکردایە سەمیرە بۆی بەئەنجام دەگەیاند. ناو بەناو سەمیرەی دەنارد بۆ پشکنینی پزیشکی تاکو دڵنیابێت تەندروستی باشەو هیچ نەخۆشییەکی نییە. ئەو تاکە ژنی بوو کە لەگەڵ ئەوو هاورێکانی دەیخواردەوەو لەناوەراستی ئاهەنگەکەدا لەگەڵیدا دەچووە ڤانەکەوەو پاش کەمێك دەگەرایەوەو بۆنی جوتبوون‌و ئاڵۆشی سێکسی لێدەهات.

سەمیرە بەهەمان شێوەی سەدام لە خێزانێکی هەژار بوو. بەڵام بەپێچەوانەی سەدامەوە ئەو لە بەغدا گەورە ببوو، بنەماڵەیەکی گەورەترو ناوبانگێکی باشیان هەبوو. سەمیرە هاوبەشی توندوتیژییەکانی سەدامی دەکرد بۆ سەر ئەوانەی ژیانێکی خۆشیان دەگوزەراند. هەردەم پێکەوە نەفرەتیان لەوانە دەکرد کە ئاسودە بوون. سەدام لەو ماوەیەدا زۆر گۆرا. پێش ناسینی سەمیرە، زۆر هەوڵیدەدا

هاوشێوەی هەڵسوکەوتو شێوەی ژیانی کەسانی دەستەبژێر خۆی بنوێنێت. داوای لە ئێمە دەکرد فێری بکەین چۆن بە چەقۆو چەتاڵ نان بخوات. هەرگیز نەفرەتی لە کەس نەدەکردو هەوڵیدەدا شێوە زاری قسەکردنی بگۆڕێت بۆ شێوە زارێکی شارییانە. لەماوەی ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ سەمیرەدا، وازی لەو هەوڵانەی هێنا تا بەرێکوپێکی رەفتار بکاتو دەستیدایە قسەی ناشیرین لەگەڵ سەمیرەو هەموو ئەوانەی لەدەوری بوون.

رۆژێکیان سەمیرە بەگاڵتەوە پێیدا کێشا. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە عەگالەکەی سەری بکەوێتە خوارەوە بۆ سەر ئەرزەکە، ئەوەش بەلای عەرەبەوە بەسوکایەتیکردن دادەنرێت. ئەویش دەستبەجێ بەهەرچی هێزی خۆی هەیە بەو عەگالەی وەك قایشێکی چەرم قایمە کەوتە وێزەی. لەوکاتەی سەدام لێیدەدا، سەمیرە دەستیکرد بەماچکردنی دەستو قاچی، ئەوەش خۆشییەکی زۆری دەبەخشییە سەدام. ئیتر ئەو بەردەوام بوو لەلێدانی ئەمیش بەردەوام بوو لە ماچکردنیو ئێمەش هەموو شایەتحاڵی ئەمە بووین تا ئەوکاتەی چوونە ڤانەکەوە بۆ ماکیاژ کردن.

١

# زیانی لاوەکی

دەبوایە لە مانگی حوزەیراندا لە ئەمەریکا ببوومایە بە بووک، لەگەڵ ئەوەشدا پرۆسەی هاوسەرگیرییەکە دەبوو لەسەر کولتوری عێراقی بەدوو بەش ئەنجام بدرێت. بەشی یەکەم بریتییە لە بۆنەیەکی ئایینی ئیسلامی، ئیتر دوای ئەوە دوو دەزگیرانەکە بەئاشکرا رێگەپێدراون تاکو زیاتر لەنزیکەوە یەکتر بناسن و بۆخۆیان سەربەستن و وەك ماوەیەکی ئەزموونییە. ئەگەر ئەمە شکست بخوات ئەوا هاوسەرگیرییەکە هەڵدەوەشێتەوە. بەپێچەوانەشەوە ئیتر ئەو دووانە وا لەقەڵەم دەدرێت بەشێوەیەکی فەرمی هاوسەرگیریيان ئەنجامداوە، ئەویش لەکاتێکدا لە بۆنەیەکی گشتی گەورەدا وەك هاوسەری یەکتری دەناسێنرێن (ئاهەنگی گواستنەوە). زۆرجار چەند مانگێك لەنێوان ئەو دوو بۆنەیەدا هەیە. لەو بارودۆخەی ئێمەدا، بۆنە گشتییەکە (ئاهەنگی گواستنەوە) بەخێرایی دوای بۆنە ئاینییەکە هات.

لەبەیانی رۆژی مارەبڕینەکەمدا داوام لەدایکم کرد بمڕازێنێتەوە بەو جلوبەرگە سپی و ئاڵتونییەی لە بەغدا دیزاینی بۆ کردبووم، کە سایەیەکی(کەواو سەڵتە) قەشەنگی نەریتباوی عێراقی بوو، عەزییەکی درێژی بێ قۆڵ بوو بە گوڵ و شیعر بەدەزوولەی ئاڵتون رازاندبوویەوە. بیرمنایە هیچ هەستێکی وەهام هەبووبێت، چونکە ئاهەنگی گواستنەوەکەمان لەدوو ئۆتۆمبێلدا لەسەر هێڵی خێرادا بەرەو ماڵی فەخری دەستیپێکرد. من لە بەشی دواوەی ئۆتۆمبێلەکەدا سەرنشین بووم و بەڕابردوویەکی عێراقییەوە بۆ دوارۆژێکی ئەمەریکایی بەرێکەوتبووم. بۆ ماوەی ٣٠ خولەك بوو بەرێوەبووین کاتێك ئۆتۆمبێلەکەی پێشمان لەسەر هێڵە خێراکە لایداو ئێمەش بەدوایدا سوڕاینەوە. باوکم لە ئۆتۆمبێلەکەی پێشەوە دابەزی و بەرەو رووی ئێمە هات لەوکاتەی ئوتومبێلەکان و بارهەڵگرەکان بەخێراییەکی مەترسیدار بەلای چەپماندا گڤەیان دەکرد. دایکم ئاهێکی بێزاری هەڵکێشاو جامەکەی لای خۆی دادایەوە.

باوکم بەتوڕەییەوەو بەرزتر لە دەنگی ئەو ئۆتۆمبێلانەی تێدەپەڕین هاواری کرد "عالیە، ئەمە دروست نییە! نابێت ئەم هاوسەرگیرییە سەربگرێت. نابێت ئەم کارە بەرامبەر ئەو کچە بکەین!"

دایکم دەستیکرد بە گریانو گوتی "نایبەمەوە بۆ عێراق. ئەمە دەرفەتو بەختی ئەوە بۆ داوارۆژی. دەبێت ئەم هاوسەرگیرییە ببێت. ڕێگەی پێنادەم بگەڕێتەوە بۆ عێراق. نایبەمەوە بۆ ئەوێ!"

ئەمە درێژەی ئەو مشتومڕە بوو کە شەوی پێشتر لەنێوانیاندا دەستی پێکردبوو. وادەردەکەوت چەند ناکۆکییەك هەبووبێت لەسەر مەرجەکانی مارەیی‌و باوکم هەستی بەوە کردبوو فەخری بێڕێزانە مامەڵەی لەگەڵ کردبوو. گوتی متمانە بە فەخری ناکات، چونکە بەڵێنەکانی بەجێ نەهێنابوو. قسەکانی دایکم کەمێك پەیوەندییان بە زاواوە هەبوو لە هەوڵی ئەوەدابوو هەرچییەکی پێدەکرا بیکات تاکو بوکە لە ئەمەریکا بمێنێتەوە. ئەمە هەمان ئەو دەمەقاڵێیە بوو لە تەمەنی دوانزە ساڵییەوە بەردەوام گوێبیستی دەبووم کە دایکم هەمیشە شەڕی دەکرد بۆ بەجێهێشتنی عێراق‌و باوکیشم شەڕی لەگەڵدا دەکرد بۆ مانەوە لە عێراق. بەڵام ئەو جارە جیاوازییەکەی ئەوەبوو دەمەقاڵێیان لەسەر ژیانی من دەکرد نەك ژیانی خۆیان. بیرم لەوە دەکردەوە چەندە ناخۆشە ئەو دوو کەسەی ئەوپەڕی خۆشمدەویستن هەوڵیاندەدا یەکتری رازیبکەن هەتاکو لە ڕۆژی گواستنەوەکەمدا ژیانم تێکبدەن. تەنها من نەدەگریام. لەبیرمە چاوم بڕیبووە لای ڕێگاکەو گێژەڵوکەیەك هات وەك ئەوەی بەقەڵسی پێیان بڵێت بەسەو چیتر کۆتایی پێبهێنن.

دواجار باوکم راستەوخۆ رووی تێکردم‌و بەچاوی پڕ فرمێسکەوە داوای لێکردم‌و گوتی "زەینەب، لێت دەپاڕێمەوە ئەم کارە مەکە. لەسەرت پێویست نییە ئەم کارە بکەیت. مەهێڵە دایکت بڕیاری خۆی بەسەرتدا بسەپێنێت. ئەمە ژیانی تۆیە شیرینەکەم، نەك ژیانی ئەو".

لەوساتەدا باوکم زۆر خۆشدەویست. سەرەڕای جیاوازییەکانمان هەرگیزاو هەرگیز گومانم لەوە نەبوو چەندە خۆشی دەویستم. لەلایەن خۆمەوە پێموابوو باوکم راستدەکات. لەپای چی مێرد بە نەناسێك بکەم کە هیچ حەزێکم بۆی

نەبێت؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە مەبەستی دایکم تێدەگەیشتمو ئەو شتەی هەستم دەکرد بەلامەوە چاکە ئەوەبوو بۆ تەنیا جارێك باشو گوێڕایەڵی دایکم بم. بەدەر لەوەش، ئەگەر بڕۆشتمایەتەوە ئەڵتەرناتیڤەکان چی دەبوون؟ لەڕاستیدا کەس باسی ئەوەی نەدەکرد، بەڵام ئەوەش هەبوو. مەگەر شتێکی باشتر لەوێ چاوەڕێی دەکردم؟ ئەگەر بڕۆشتمایەتەوە بۆ بەغدا، تەواوی خێزانەکەم شەرمەزار دەکرد. خەڵکی وایان لێکدەدایەوە خەوشو ناتەواوییەکم تێدایە، دوو جار دەزگیرانداریو دوو جار شکستهێنان یانی چی.

لەکۆتاییدا گوتم "خۆم لێپرسراوێتی هاوسەرگیرییەکەم لەئەستۆ دەگرم" تاکە وەڵامێکم دانەوە هەتاکو لایەنی هیچ کامێکیان نەگرم "خۆم قسەی لەگەڵدا دەکەمو دواتر بڕیاری لەسەر دەدەم".

کاتێك گەیشتینە ماڵی فەخری بۆ گێڕانی بۆنە ئاینییەکە، میوانەکان پێشتر گەیشتبوونو لە قاتی خوارەوە بوون. لەگەڵ فەخریدا ڕۆیشتینە نهۆمی سەرەوە تا بەتەنها بینو بۆ یەکەمجار گفتوگۆیەکی ڕاستەقینەم لەگەڵ کرد دەربارەی پێشبینیو تێڕوانینەکانم بۆ هاوسەرگیرییەکەمان. پێمگوت کە چاوەڕوانی ڕێزو بەدەستهێنانی بروانامەی زانکۆو پیشەیەکی ڕێکوپێكو دابینکردنی دارایی لە هاوسەرگیریەکەمان دەکەم. پێمگوت نابێت چاوەڕێی چێشتلێنانو پاککردنەوەم لێبکاتو نابێت شتی وەهام پێبکات تەنها لەبەرئەوەی ئافرەتم. ویستم ڕاستو ڕەوان بمو سەرگوزەشتەی خۆمو نیهابم بۆ باسکرد هەتاکو هیچ خراپ تێگەیشتنێك دروست نەبێت. سەرم سوڕما بوو کە بینیم بەو شێوەیە گوێی لێ گرتبووم.

ئەویش وتی "زەینەب، بەڵێنت پێدەدەم خۆشم بوێیتو باش ئاگام لێت بێت. ڕێز لەو شتانە دەگرم کە تۆ داوای دەکەیتو دڵنیات دەکەم هەوڵدەدەم ژیانێکی ئاسوودەت پێ ببەخشم".

هێشتا بەلامەوە قۆز نەبوو، چاوەکانی بچووكو لوتی درێژ بوو، بەڵام بۆ یەکەمین جار گریمانەی دروستبوونی خۆشەویستی دوای هاوسەرگیریم بینی. لەو ژوورەی قاتی سەرەوە نەرمونیانو بەڕێز بوو لەبەرامبەرم لەکاتێکدا خێزانەکەی لەخوارەوە چاوەڕێیان دەکرد. پێیگوتم لێم تێگەشتووەو پشتیوانیم لێدەکات

لەوەی ببمە هەرچییەك كە بمەوێت لەژیانداو بەلامەوە وابوو ڕەنگە پێشتر كاتی تەواومان نەبووبێت تاكو بەتەنها پێكەوە بین و لەیەكتری تێبگەین. كاتێك پێكەوە ڕۆیشتینە خوارەوە، پەشۆكا بووم بەڵام ئاهێكم بەبەردا هاتبووەوە.

توانیم بەرامبەر دایك و باوكم بوەستم و بەدەروونێكی ئاسودەوە پێیان بڵێم كە خواستم وایە بەردەوام بم.

هەركە هاتمە خوارەوەو سایەكەم لەبەردا بوو، براكانم بینی، حەیدەر تەماشای دەرەوەی دەكردو حەسەنیش كە هێشتا ١٠ساڵی تەواو نەكردبوو لەتەنیشت باوكمەوە كە نارەزاییەكانی سەر رووخساری كەمببووەوە وەستابوو. بەدەر لە خێزانەكەم، تەنها ژمارەیەكی كەمی ئەو دوو حەشامەتە خەڵكەم دەناسی كە لەوێ كۆببوونەوە. وەك رێكمانخستبوو، بەتەنیشت فەخرییەوە لەسەر قەنەفەكە دانیشتبووم و ئیمامیش بەرامبەرمان دانیشتبوو، خۆم ئامادەكردبوو بۆ بینینی یەكەم مارەبڕی ئایینی لەسەر دابونەریتی عێراقی. بۆنەیەكی جوان بوو، پڕبوو لە هێماكانی ئیسلامی و هەموو ئەو دابونەریتانەی لە كولتوری عێراقیدا هەن وەك هەر كولتورێكی دیكەی ئێرانی و توركی رۆژهەڵاتی ناوین. دوو ژنی هاوسەرداری دڵخۆش كە یەكێكیان دایكم بوو پارچەیەك قوماشیان لەسەر سەرمان راگرتبوو دووانی تریش قامیشی شەكریان لەسەرمان لێكدەخست بۆ شیرینكردنی هاوسەرگیرییەكەمان. قاچەكانم كردبووە ناو سەتڵێكی سلفەر كە پڕبوو لە پەڕەی گوڵەباخ و نەعنا، قورئانێكیان لەسەر كۆشم دانابوو، هێلیان كردبووە نێو پەنجەكانمەوە. وا هەستم دەكرد تەماشای شانۆ دەكەم.

ئیمامەكە پرسیاری لێكردم "زەینەب، لەپێشی خوداو پێغەمبەرەكەیدا ئەم پیاوەت لاپەسەندە ببێتە هاوسەرت؟"

وەڵامم نەدایەوە. پێشتر دایكم پێی گوتبوم تا ١٢ جار هەمان پرسیارم لێدەكات هەتاكو وەڵام دەدەمەوە هەر جارێكیشیان ئاماژەیەكە بۆ نەوەیەكی پێغەمبەر كە مەزهەبی شیعە لەو بڕوایەدابوو سەركردەی دروستی گەلی مسوڵمان بوون. فەخری پێشتر بەڵێی گوتبوو، هەر جارەو كاتێكی زۆری پێدەچوو تاكو ئیمامەكە پرسیارەكەی بۆ دووبارە دەكردمەوە، كاتێكی زۆر پرسیارەكەم دەهێناو دەبرد، هەموو ئەوانەش لەژوورەكەدا بوون بەهێمنی چاویان تێبڕیبووم و سەرم

پڕبوو لەو دەنگانەی بەشپرزەییەوە گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد. چی رویدەدا ئەگەر بمگوتایە نەخێر؟ ئاخۆ ئیدی درەنگی کردبوو؟ دەمبینی باوکم خەمو پەژارەی هەبوو بەرامبەرمو هەستم بە سەنگو قورسایی دایکم دەکرد بەسەرمەوەو نزای هاوسەرگیرییەکی بەختەوەری بۆ دەکردم کە چیدی لەژیانی خۆیدا نەمابوو. دەمویست بقیژێنمو بڵێم نا! چۆن دەمتوانی شتێکی هێندە عەیب ئەنجام بدەم؟ ئەی چەند خولەکێك لەوەوبەر گفتوگۆیەکی جوانو تەواوم لەگەڵدا نەکردبوو؟ دووبارەو چەندبارە ئیمامەکە پرسیاری دەکردو منیش دواجار بەپێچەوانەی هەموو غەریزەکانم گوێم لەخۆم بوو گوتم "بەڵێ".

فەخری بەدڵێکی ئاسودەوە تەماشای کردمو ماچێکی نێوچاوانی کردم، بەڵام من نەمتوانی تەماشای بکەم.

حەسەن بەقیژەوە لە ژوورەکە رۆیشتە دەرەوەو باوکم دوای کەوت. لەوکاتەی دایکی فەخری کوڕەکەی ماچدەکرد بۆ پیرۆزبایی لێکردنی وتەیەکی دا بەگوێیداو گوتی "باشە خۆ ئەمە پرسە نییە! دەبێت ئەمە بۆنەیەکی خۆش بێت!"

گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەمان ئیمزاکرد، لاپەڕەیەك بوو جێگەی مارەییەکەیو ئیمزاکان بەتاڵ بوون. دە رۆژ دوای ئەوە قۆڵ لەقۆڵی هاوسەرەکەم لەبۆنەی گواستنەوەکەمدا بۆ ناو هۆڵێك رێمدەکرد. لەو هۆڵەدا کە بەکرێ گیرابوو، دوو سەد کەسی لێبوو کە بۆ ئاهەنگ گێڕانی ئەو بۆنەیە هاتبوون. زۆر کەمیانم دەناسین. زەردەخەنە دەستکردەکەم دەکردو سەلامم لێدەکردنو لەگەڵ هاوسەرەکەمدا کەوتمە سەماکردن. ئەو دیمەنێکی سەرکەوتوانە بەڕوخسارییەوە دیار بوو وەك ئەوەبوو ماسییەکی گەورەی گرتبێت.

ئەو شەوە چەند ژوورێکی ئوتێلێکمان بەکرێ گرتو وا پلانمان دانا بۆ بەیانییەکەی لەگەڵ دایكو باوکماندا نانی بەیانی بخۆین، پێش ئەوەی بۆ مانگی هەنگوینی بۆ دوورگەی هاوای سەفەر بکەین. بەجلی نووستنەوەو بەشەرمەوە چوومە لای. هەرگیز لەوەوپێش سێکسم نەکردبوو، بەڵام دەمزانی چۆن ماچێك دڵ دەتوێنێتەوە. داوای لێکردم لەسەر جێگاکە پاڵ بکەومو قاچم بڵاو بکەمەوە. منیش وەهام کرد. پاشان، کەسێکی نەناسی ناحەز دەستبەجێ خۆیدا بەسەرمداو زۆری لێکردم. هیچ شتێکی نەگوت. ماچ نەبوو، دەست پیاهێنان بەهیچ شێوەیەك

نەبوو، هیچ مەیلێکی نەبوو تاکو پارمەتی ئاسودەبوونم بدات. تەنها شەرمەزارانە خۆی پێدا دەدام، پاشان وەستا. هەستم بە ئازارو بێزاری دەکرد، بەلام هەردووکمان تەماشای چەرچەفەکەمان کرد خوێناوی نەبوو. دەمزانی لەهەندێك ناوچە گوندنشینەکانی عێراق پیاوان دەبوایە چەرچەفی هاوسەرگیرییان بەخوێنی کچێنی سوور بکردایە، ئەگینا تەواوی خێزانی بوکەکە شەرمەزار دەبوون. خێزانی ئێمە زۆر لەوانە رۆشنبیرتر بوون، دایکم کە مامۆستای بایۆلۆجی بوو بۆی رونکردبوومەوە مەرج نییە هەموو کاتێك خوێن ببینرێت.

گوتی "ئەوە چیتە؟ دەی، خۆت بکەرەوە! دڵنیام دەزانیت چۆن ئەو کارە بکەیت".

منیش گوتم "چی؟ ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟ فەخری، چۆن دەتوانیت وام پێ بڵێیت؟"

گوتی "دەی تۆ کچ نیت، خوێنت لێ نەهات".

منیش گوتم "فەخری، من کچم، بەلام ئەمەوێت بزانیت پێویست بەخوێن ناکات تاکو پیشانی بدات کچ بیت. ئەوە لەسەر کچەکە دەوەستێت".

"بەهەرحاڵ نازانم تۆ چیتە، بەلام کچ نیت. من دەخەوم" ئەو قسانەی کردو رووی لێ وەرگێڕام.

تەنانەت ناتوانم باسی ئەو هەستانە بکەم کە لەو شەوەدا بەتەوژم پێمدا تێدەپەڕین. بەتەنها، بەئاگا، لەو تاریکییەدا راکشابووم تاکو بزانم چ هەڵەیەکم ئەنجام دابوو. وێنەی توێکارییەکانی دایکم بۆ ئەمەی ئامادە نەکردبووم. تاکە شتێك پێشتر ئەنجامم دابوو ماچکردنی ئیهاب بوو، بەلام قسەو باسی وەهام بیستبوو کە رووداوەکانی وەرزش دەبنە هۆی لەدەستدانی پەردەی کچێنی، منیش کەوتمە بیرکردنەوە تاکو بزانم هیچ کاتێك ئازارم بەخۆم گەیاندووە بەبێ ئەوەی درکم بە مەترسییەکەی کردبێت. ئایا هیچ شتێکی تر هەبوو ئەنجامم دابێت؟ هەتاکو توانیم لەو پیاوەی تەنیشتم دوورکەوتمەوەو لە لێواری جێگاکەدا وەك منداڵ خۆم خڕکردەوەو ترس و مەراق و دوودڵی دایگرتم و ئیتر زانیم ئەمە یەکەمین شەوە لەو هەزار شەوانەی تر کە بەرێوەبوون.

بۆ بەیانیەکەی، کاتێك دایك و باوکمان هاتن هەتاکو نانی بەیانی پێکەوە

بخۆین و بمانگەیەننە فرۆکەخانە، دایکم بردە لایەکەوە.

"دایکە، ئەو شتەی پێتگوتم دەربارەی خوێن لێهاتن دڵنیایت کە راستە؟"

گوتی "بەڵێ گیانەکەم، بەڵام بەپێی ئەوەی تۆ باسی دەکەیت لام وانییە سێکستان کردبێت".

تەنها پاکیزەیەك تێدەکەوێت و گومان بە پاکیی و بێ تاوانی ژنەکەی دەبات کە نەیتوانیبێت کاری خۆی بکات، بەمەش بێتوانایی پەردەپۆش دەکات.

گەشتێکی ئاسمانیمان کرد بۆ هاوای بۆ بەسەربردنی مانگی هەنگوینیمان، بەڵام تاکە جوانییەك لەوێ بینیم دەریایەکی قوڵی شین بوو کە لەگەڵ ئاسماندا یەکیان گرتبووەوەو وای لێکردم خۆزگە بخوازم زۆر لەوێش دوورتر بوومایە. بوك و زاوا تازەکانی تر هەرچی وزەیان تیابوو بەخۆشەییەوە دەریاندەبڕی بەنۆشکردنی خواردنەوەکانی ناوچەی کەمەرەی زەوی و باوەشپێداکردن لە حەوزی ئاوەکاندا و خۆشی و شادییان دەگێڕا. دڵخۆشی ئەوان تەنها منی دڵتەنگ و بێتاقەت دەکرد. تاکە جارێك کە فەخری لەگەڵمدا باشبووبێت ئەو کاتانە بوو کە لەپێش ئەوانی تردا دەوەستاین و وێنەیان دەگرتین و هاتوهاواری خۆشی دەکرد لەوکاتەی پێی دەگوتن ئێمە لە مانگی هەنگوینیداین. کاتێکیش بەتەنها پێکەوە بووین واهەستمدەکرد مێردم بەپیاوێکی تەواو جیاواز کردووە نەك ئەو پیاوەی بەوپەڕی سەرنجەوە گوێی بۆ گرتبووم لەپێش مارەبڕینم لە بۆنە ئاینییەکەدا. لەئوتێلەکەدا خواردنەکەیان بەشێوەی بۆفیە بوو، ئەویش درۆیکرد هەتاکو بەخۆڕایی نان بخۆین، گوتی کەوا تکتی خواردنەکانی پێبووەو ونی کردووە. پاشان پێیگوتم تا دەتوانم نان بخۆم بۆ ئەوەی تاکو تەواوی رۆژەکە برسیم نەبێت. تووشی شۆك بووم و شەرمەزاری دایگرتم. ئەوە ئەو دنیایە نەبوو کە من لێوەی هاتبووم. لەوەتەی لەدایك ببووم راستگۆ فێرکرابووم و راهێنرابووم نە درۆ بکەم و نە دزی. کەچی شووم بەپیاوێك کردبوو کە ئەو دوو سیفەتەی هەبوو بێ رێزو سوکیش بوو. لەشەودا پێی دەگوتم هەڵسوکەوتی ژنانە نازانم و شارەزانیم چۆن پیاو خۆشحاڵ بکەم.

لە شەوی سێیەم و چوارەمی مانگی هەنگوینیمدا تەنانەت نەمدەتوانی لەسەر هەمان جێگا لەتەکیدا بمێنمەوە. لەسەر قەنەفەکە رادەکشام و دەگریام. هەر

وەبیری خۆمم دەهێنایەوە کە خۆشەویستی لەدوای هاوسەرگیری دێت. بەخۆمم دەگوت ئەگەر لوماو ئەوانی تر توانییان دڵخۆش بن، ئەی بۆچی من ناتوانم؟ ئەوە تەنها یەکترناسینێك بوو کە هێندە قورس بوو. هەوڵمدەداو تەقەلام دەکرد تاکو لەو گێژاوە بێمە دەرەوە. نوشوستی خۆمم وا لێکدایەوە کە ژنێتی نازانم. چ شتێکی نابەجێم دەکرد؟ هەستم بەهیچ کامێك لەو خۆشییانە نەدەکرد دایکم بۆی باسکردبووم‌و بێگومان ئەو زەردەخەنەیەم بەخۆمەوە نەدەبینی کە بەدایکمەوە دەمبینی دوای ئەوەی دەمزانی لەگەڵ باوکم سەرجێییان کردبوو. پێموابوو ئەگەر بتوانم بۆی بسەلێنم کە کچم‌و ژن نیم ئەوا باشتر مامەڵەم لەگەڵ دەکات. هەوڵمدا ئەوە بەخەیاڵمدا بهێنم ئەو ماوە پڕ ئێشە تێپەڕدەبێت‌و هەرچۆنێك بێت فێردەبم خۆشم بوێت. چیم بکردایە ئەگەر ئەو رۆژە بهاتایە؟ چۆن هەڵسوکەوتم بکردایە؟ وەڵامێکی بچکۆلانەو لۆژیکانە بەمێشکمدا هات: ماچی دەکەم. شەوی دواتر چوومە سەر جێگەکەم‌و ماچم کردو زۆر هەوڵمدا هەتا وای پیشانبدەم خۆشمدەوێت. لەکۆتایی شەودا سەلماندم، چەرچەفەکە خوێناوی بوو.

ئەو بەبینینی خوێنەکە دڵخۆش بوو. بەپێکەنینەوە گوتی "کەواتە کچ بووی".

ئاهێك بەبەرمدا هاتەوە، بەڵام پەشۆکا بووم. تەماشای پەڕۆکەم کردو پەڵە خوێنی پێوە بوو نیتر وام پێباشبوو وەك سەلێنەرێك هەڵیبگرم، ئەویش هەمان ئەو شتە بوو کە هەمیشە من‌و دایکیشم گاڵتەمان بەخانەوادەکەی سەدام دەکرد بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. بەڵام نەمتوانی ئەو کارە نەکەم. دوای ئەوە جارێکی تر باسی بابەتی کچێتی نەکردەوەو بەشێوەیەکی باشتر مامەڵەی لەگەڵ دەکردم.

بۆ ماوەیەك پێکەوە قسەمان کرد دەربارەی چۆنیەتی گوزەراندنی هاوسەرگیری. لەئاکامی کاریگەری دایك‌و باوکی بەسەر هاوسەرگیرییەکەمانەوەو بەتایبەتیش دایکی توشی دڵەڕاوکێ ببووم. هەردەم چیرۆکم دەبیست دەربارەی دەستێوەردانی ماڵە خەزوران لە ژیانی بوك‌و زاواداو دەمویست دڵنیابم لەوەی ئەوە بەسەر مندا نایەت. فەخری رازی بوو، بەڵێنمان بەیەکتریدا پابەندی رێسایەك بین لە هاوسەرگیرییەکەماندا ئەویش بریتیبوو لەوەی کێشەکانمان لەناو خۆماندا نەڕواتە دەرەوەو خێزانەکانمان تێنەگەیەنین، بەڵام کاتێك گەڕاینەوە بۆ

شیکاگۆ سەرم سوڕما لەوەی چەند ڕێسایەکی تریش لەمێشکیدا هەیە. ئەو کاتەی خۆی دەگۆڕی بۆ چوونە سەر ئیش، بۆ یەکەمین جار ئاگاداری کردمەوە کە دەبێت هەموو بەیانییەك لەگەڵ ئەو هەستم‌و نانی بەیانی بۆ ئامادەبکەم‌و کراسەکەی بۆ ئوتو بکەم. ئوتوەکەی هێنایە ژووری نووستنەکەو لەو کاتەی پلاکەکەی دەکرد بە کارەباکەوە ئەرکەکانی ژنایەتی بۆ خوێندمەوە کە دەبێت چی بکەم‌و چی نەکەم. بیست دۆلاری پێدام‌و پێیگوتم ئەوە خەرجی هەفتەیەکمە.

منیش بەسەرسوڕمانەوە چاوم بڕیە بیست دۆلارەکە لە دەستمداو پرسیم "بیست دۆلار؟"

گوتی "دەبێت ئەوە لە پێداویستییەکانت زیاتر بێت".

ئەو سویچی ئۆتۆمبێلەی لە فرۆکەخانە پێشکەشی کردبووم هەڵگرت بۆ خۆی‌و لەبری ئەوە سویچی ئۆتۆمبیلێکی کۆنی دایە دەستم کە هێند کۆن بوو بەحاڵ ئیشی دەکرد. هەروەها پێشتر ڕێککەوتبووین لەسەر خوێندنم، پێمگوت پێویستە چەند وانەیەك بخوێنم هەتاکو یارمەتی خۆئامادەکردنم بدات بۆ تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ لە بەغدا، بەڵام ئەو پێیگوتم کە پێیوایە بەدەستهێنانی بڕوانامە تەنها بەفیڕۆدانی کاتەو ئامۆژگاری ئەوەی کردم لەجیاتی ئەوە مۆڵەتێکی نوسینگەی خانووبەرە دەربهێنم تا بتوانم پارە پەیدابکەم.

لەهەموو ئەو شتانە پاشگەز دەبووەوە کە لەگفتوگۆکەماندا لەپێش بۆنە ئاینییەکەدا بەڵێنی پێدابووم، وەك ئەوەی نە بای دیبێ‌و نە بۆران. ڕێکەوتنەکەمانم بیرهێنایەوە، ئەویش لە وەڵامدا گوتی پابەندە پێیانەوە بەو مانایەی هەرچیەکم پێخۆشە دەتوانم بیکەم بەمەرجێ پێش هەموو شتێك ئەرکی ژنێتی خۆمم بەجێبهێنایە، لەحاڵێکدا هەردوکمان لەوە تێگەیشتبوین من پێیانەوە سەرقاڵبووم. دەیگوت کە دەبێت ژنی بم‌و ئاگام لەماڵەکەی بێت‌و هەرکە مۆڵەتی نوسینگەکەم دەرهێنا دەست بکەم بەمنداڵخستنەوە. کردمە دەمەقاڵێ‌و دژی وەستامەوە، دەی چ بەدیلێکی ترم هەبوو؟ ئەگەر پەیوەندیم بکردایە بە دایك‌و باوکمەوە ئەوا زیاتر توشی شەڕ دەهاتن لەگەڵ یەکتریداو پێشنیازی ئەوەیان بۆ دەکردم هیچ نەبێت ماوەیەك بوار بدەم بە هاوسەرگیرییەکەمان. لەسەر بابەتی خوێندنەکە سازشمانکرد. ڕازیبوو بەوەی پارەم بداتێ لە کۆلێژێکی لۆکاڵی

ناوچەکەدا دوو وانە بخوێنم‌و منیش رازیبووم بەوەی خولێکی نوسینگەی خانووبەرە بخوێنم لەگەڵ کۆرسێکی زمانی ئینگلیزی بۆ فێربوونی نووسینی ئینگلیزی بۆ خۆئامادەکردنم بۆ تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ لە بەغدا.

لەکۆتاییدا، وا لێکمدایەوە ئەگەر بیسەلمێنم دەتوانم ئیشی ماڵ بکەم بەهەمان ئەو شێوەیەی سەلماندم کچ بووم، ئەوا داواکارییەکانی بۆ جێبەجێدەکردم. کراسەکانم هەرگیز هاوشێوەی ئەوەکانی رادیە نەبوون بەڵام ئوتوم دەکردن. چێشتم لێدەنا، هەرچەندە هەموو ئێوارەیەك لەسەر مێزی نانخواردن گاڵتەی بەچێشتەکانم دەکرد، هەندێك جار لەپێش چاوی میوانەکانیش گاڵتەی پێدەکردم. هەستم بە هەژاری‌و بێدەسەڵاتی‌و ئەوپەڕی پابەندی بە ئەوەوە دەکرد لەهەردوو رووی دارایی‌و هەست‌و سۆزەوە. کاتێك لەناوەڕاستی هەفتەدا داوای پارەی زیاترم لێدەکرد، داوای لێکردم ئەو شتانەی بۆ بژمێرم کە ئەو بیست دۆلارەم تێدا خەرج کردبوون‌و کەوتە سەرزەنشتکردنم، لەبەرئەوەی دوو کارتی ئەحواڵپرسینم بۆ هاوڕێکانم لە بەغدا کڕیبوو.

هەستمدەکرد لە زیندانی عێراق هەڵاتووم‌و لە زیندانێکی تاکەکەسی شیکاگۆ خۆمگرتووەتەوە. هەستم بە خەمۆکی‌و گیرۆدەیی دەکرد. سەیری دەورووبەری خۆمم دەکرد لە شوقەکەمداو بیری خانووی ناو مەزراکەی دەخستمەوە، ئیتر بیرمکردەوە چی بکەم، شتێك بەخەیاڵمدا هات ئەویش دەستکردن بەخوێندنەوە بوو. لەبێ پارەیی‌و بێ کەسیدا پەنام بردە بەر نووسینەکانی دانیاڵ ستیل. زۆر کتێبی ئەو نووسەرە لە دوکانی کتێب فرۆشەکەی نزیك ماڵەوەمان هەبوو، هیوام دەخواست بەشی ئەو کاتەم بکات هەتاکو فێری نهێنییەکانی چۆنیەتی خۆشویستنی مێردێك دەبم کەوا دیاربوو هیچ باکی بۆ خۆشەویستی من نەبێت. نووسینەکانی دانیاڵ ستیل دەربارەی ئەو پەیوەندییانە بوون کە ژنان مامەڵەی خراپیان بەرامبەر دەکرا، لەکۆتایشدا ئازادبوونی دەکردە خەڵاتیان. لەڕاستیدا، ئێستا دڵنیانیم کە ئایا تەواوی کتێبەکانی دەربارەی ئەو شتانە بوون، ئەوە دەزانم کە من لەو جەشنە نووسینانەیم دەخوێندەوە.

مانگێك بەسەر هاوسەرگیرییەکەماندا تێپەڕیبوو کە سەدام حسێن کوەیتی داگیرکرد، لەمێژ بوو عێراق چاوی بڕیبووە کێڵگە نەوتییەکانی‌و داخستنێکی

نێودەوڵەتی لێکەوتەوەو دوای پێنج مانگ بووە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگی کەنداو لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩١دا. لەکاتی نانی ئێوارە لەماڵی دایكو باوکی فەخری گوێبیستی هەواڵی ئەو داگیرکردنە بووم. ئەو شەوە لەجیاتی ئەوەی خەزوورم هێرش بکاتە سەر سەدام لەسەر مێزی نانخواردنەکە، پێی راگەیاندین کە تەلەفۆنی بۆ باڵیۆزخانەی عێراق کردووەو پەیامی پیرۆزبایی پێگەیاندوون! وەك دەیگوت، کوەیتییەکان ئەو عەرەبانەن کە عێراقییەکانو زۆرینەی عەرەبەکانی تر رقیان لێیانە. لە بەغدا، ئەوی لە کوەیتییەکان دەمانبینی ئەوە بوو کە شێخە دەوڵەمەندە لوتبەرزەکان دەهاتنە بەغداو ئەو پارانەی بەناڕەوایی دەستیان کەوتبوو لە موڵكو ماڵو لەشفرۆشە عێراقیەکاندا خەرجیان دەکردو نرخی هەردوکیان فڕاندبوو. رقو کینە لە کوەیتییەکان هێندە لە مێشکی عێراقییەکان چەسپیبوو تەنانەت ئەو رقەی باوکی فەخری بەرامبەر سەدام هەیبوو لەوکاتەدا وەلای نابوو. کاتی خۆی هاتبوو تا سەدام وەدەربنرێت دوای ئەوەی ئەو کارە قێزەونانەی کرد لەکاتی دەستبەسەرداگرتنی کوەیتدا.

منیش لای خۆمەوە گوتم چی؟ جەنگێکی تر؟ تازە لە جەنگێك رزگارمان ببوو! زۆر خەڵك کوژران، زۆر. عەمو، بڕوام پێکردیت کاتێك گوتت عێراقم خۆشدەوێت. بەڵام ئەگەر خۆشتت دەوێت، بۆچی گەلەکەت بەرەو جەنگێکی تر دەبەیت؟ گرنگییەکەی لەچیدایە؟ بۆچی ئەم کارە دەکەیت؟

دەستبەجێ کۆشکی سپی هۆشیاری دایە بەغداو دوا ئاگاداری بۆ دەرکرد. هەموو شەوێك لەهەواڵەکاندا باسی عێراق دەکرا. منو فەخری تەماشای تەلەفزیۆنمان دەکرد کاتێك لەهەواڵێکدا باسی ئەو کیمیابارانەی کرد کە چەند ساڵێك لەمەوبەر کردبویە سەر کوردەکانو هەزارەها کەسی لێ کوشتبوون. لەو دیمەنانەی پیشانی دەدا، ئەو رووداوە بەمێشکدا هاتەوە کە لانە بۆی باسکردبووم. فەخریش پەنجەی بۆ تەلەفزیۆنەکە راکێشاو چاوی لەمن بڕی وەك ئەوەی من ئەو کارەم کردبێت. گوتی "سەیرکە عەموت چ تاوانکارێکە!". من هیچم نەگوت. تازە لە عێراق رزگارم ببوو. هێشتا فەخری تێنەدەگەشت یاخود بەلایەوە گرنگ نەبوو بزانێت کاتێك من پێی دەڵێم عەمو لەخۆشەویستییەوە نییە بەڵکو دەترسام لەوەی بەناوی خۆیەوە بانگی بکەم بڵێم سەدام حسێن. دەمزانی عەمو

لەهەموو شوێنێك سیخوڕی هەبوو. نەمدەزانی لەو ناوچەیەی ئێمەدا کێ سیخوڕی بوو. متمانەم بەهیچ کەس نەدەکرد، بەمێردەکەی خۆشمەوە.

چەند هەفتەیەك دوای داگیرکردنەکە، لەوکاتەی باوکم بەگەشتێك لەدەرەوەی عێراق بوو تەلەفۆنێکی بۆ کردم. فەخری وەڵامی تەلەفۆنەکەی دایەوەو یەکسەر دەستیکرد بەسکاڵاکردن لەدەستی من، بەوەی من کەیبانویەکی باش نیمو شتی لەو بابەتە تا توڕەیی هەڵچواندم. وەك ئەوە وابوو سکاڵا لەئاست بازرگانێك بکات کە بەروبوومی خراپی پێ فرۆشتبوو. چۆن وێرای بەرامبەر باوکم ئەو قسانە بکات؟ لەدژی من؟ ئەی چی بەسەر رێککەوتنەکەماندا هاتبوو بۆ چارەسەرکردنی گیرو گرفتە خێزانیەکانمان لەنێوان خۆماندا.

هەرگیز دەنگێکی نەرمو لەسەرەخۆی وەك دەنگی باوکمم نەبیستبوو، کاتێك فەخری تەلەفۆنەکەی دایە دەستم گوتی "تۆ باشیت ئازیزەکەم؟" خوازیاربووم بفڕمە باوەشیەوە بۆ ئەوەی پارێزگاریم لێبکات. خۆزگە ئامۆژگارییەکەیم لەگوێ بگرتایەوەو شووم بە فەخری نەکردایە تاکو ئەو دێوەزمەو نەهامەتییە بەسەرمدا نەهاتایە. فەخری لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو، هەستێکی بەهێزی وەهام لادروست ببوو کە دەبێت لێپرسراوێتی لەئەستۆ بگرم بۆ سەرخستنی هاوسەرگیرییەکەم. باوکم نەیدەتوانی هیچ شتێك بکات بۆ یارمەتیدانم.

پێمگوت "بابە گیان زۆر بیرت دەکەم. خۆزگە بمتوانیایە بهاتمایەتەوە بەغداو سەردانم بکردیتایە".

گوتی "شیرینەکەم، لەئێستادا ناتوانیت. سنورەکان داخراون. کاتێك دەتوانیت بێیت کە هەلومەرجەکە بگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی".

پاشان کەمێك وەستاو گوتی "زەینەب، هەموو هاوسەرگیرییەکی تازە قورسە. تەنها ئارامگر بەو ئاگات لەخۆت بێت هەتاکو یەکتر دەبینینەوە".

پاشان هەر بۆ خۆشی باسی شتێکی هاوسەرگیری کرد کە لە عێراق دەیگێڕایەوە کاتێك ئەم مەسەلەیە بهاتایەتە پێش.

"زەینەب، دەزانیت هەمیشە دەڵێم هاوسەرگیری وەك بەرمیلێك وایە نیوەی پڕە لە هەنگوینو نیوەکەی تریشی پڕە لەپیسایی. دەتوانیت لەبەشی هەنگوینەکەوە دەست پێبکەیتو دواتر بەشەکەی تر چارەسەر بکەیت. وەلێ

پێشـنیازت بـۆ دەکـەم کـە تێکـەڵیان بکـەیت. ئەمـە نهێنـی هاوسـەرگیریی سەرکەوتووە".

لەسـەرخۆ پێکـەنیم. بـاوکم بـەو ئامۆژگارییـە نـاوی دەرکردبـوو هـەردەم گەورەکانی دەهێنایـە پێکـەنین. هەنوکـەش بـەو شـێوەیە مۆژیـاری منـی دەکـردو سـەرەی مـن بـوو. بیرملێکـردەوە، تاچـەند ئـارامگربم؟ رەنگـە خۆشەویسـتی دوای هاوسـەرگیری دروسـت ببێـت، بـەڵام نیـازی بەچـەند مـاوە دەبێـت؟ لای خۆمـەوە دواکاتم دانا: یەك ساڵ، یەك ساڵ بوار بدەمە هاوسەرگیرییەکە. ئەگەر تـا ئەوکاتـە سەرکەوتوو نەبوایە، ئیتر کەس پێی نەدەگوتم هەوڵم نەداوە تـاکو ژیـانێکی خـۆش بەسەربەرم.

بەگەڕانەوە بۆ ئەوکاتە، هـەروەها ئێسـتاشـی لەسـەربێت دەزانم کـە لەگێـژاوی کولتوریشـدا بووم. وامدانابوو گواسـتنەوەم بـۆ ئەمـەریکاو گوزەرانـدنی ژیـان لـەوێ ئاسان دەبێت، لەگەڵ ئەمەریکاییەکاندا هەستم بەئاسودەیی دەکرد هـەروەها دوای ئەوەی بـاوکم مەشقی هاوینـەی لـە کۆمپانیـای بـۆینگ تـەواوکرد، شـاری (سـیێتڵ) وەك نیشتمانی دووەم بوو بەلامەوە، بـەڵام ئـەو کەسـانەی لـەو گەڕەکـەی فـەخری بـوون نـە لـە ئەمەریکاییـەکان دەچـوون نـە لـەو عێراقیانـەی دەمناسـین. ئـەوان کەسـانی بازرگـانو پرۆفێشـناڵی شـیعە بـوون وەك دراوسـێکانی خاڵـە عـادل کـە سنورداش کرابوونەوەو خەونەکانیان لەپاش خۆیان جێهێشتبوو تـاکو لەبـەر بـاران ژەنگ دایان برزێنێت وەك ئەو سندوقە ئاسنینانەی لەپاش کارگەیەك لەبەر باران بەجێدەمێنن. هەنـدێکیان هـەموو شـتێکیان لەدەسـت دابـوو. ئـەوانی تـر، وەك خانەوادەکەی فەخری توانیان لە وڵات خۆیـان دەربـاز بکـەن پـێش ئـەوەی موڵكو ماڵەکەیان لێ دابماڵرێت. دە ساڵ دواتر، لەو شوێنەدا خۆیان گرتەوە، بیستو چوار سـەعات خـەریکی ئـیشو کـار بـوونو ئەوپـەڕی هـەوڵیان دەدا بـۆ خسـتنە بەرخوێنـدنی منداڵـەکانیانو هـەروەها بـە جـۆشو خرۆشـێکی زیـاترەوە وەك لـەو دەمەی لە عێراق بوون ئامێزیـان بـۆ ئـەو ئایینـە کردبـووەوە کـە لـە وڵاتـی خۆیـان بەهۆیەوە چەوسێنرابوونەوە.

تاکە کەسێك بەدیمکردو دەمتوانی قسەی لەگەڵ بکەم، ژنێکی گەنجی عێراقـی هاوتەمەنی خۆم بوو لـە ئێرانـەوە هـاتبووە ئەمـەریکا. ئـەویش تـەنها بـوو مێـردی

بەپیاوێکی زۆر گەورەتر لەخۆی کردبوو. سەر بە بنەماڵەیەکی ناسراو بوو ماوەیەك پێش ئەوەی موخابەرات هەڵبکوتنە سەر خانەوادەی دایکم لە بەغداوە دیپۆرتی ئێران کرابوونەوە. ئەوە یەکەمجار بوو گوێبیستی چیرۆکی کەسێکی دیپۆرتکراو بم کە چی بەسەردا هاتبوو فرمێسکەکانیم وەك ئیسفەنج هەڵدەمژی. لەنیوەی شەودا پۆلیسی نهێنی هەڵیانکوتابووە سەریانو تەنها پانزە خولەکیان بۆ دانابوون هەتاکو خۆیان بپێچنەوە. لە تاریکایی ئەو شەوەدا سواری پاس کرابوونو بەرەو سنوری ئێران لەگەڵ سەدەها دانیشتووی تری بەغدا کە بنەچەیان ئێرانی بوو رەوانە کرابوون. ئەوان بۆ چەندین رۆژ لە کەشوهەوایەکی سەرماو سۆڵەدا بەزۆرو بەپێ رێیان کردبوو هەتاکو بگەرێنرێنەوە بۆ ئێران. کاتێك شەوان لە دەشتە سەرماو سۆڵەکاندا دەمانەوە بۆ خەوتن، سەربازە عێراقییەکان بەچەکەوە دەگەڕان بەنێویانداو کچانو ژنانیان جیادەکردەوە هەتاکو لاقەیان بکەن. باوانی ئەم کچە هەوڵیاندا ئەم کچەو خوشکەکەی لەژێر بەتانییەکدا بشارنەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێت سەربازەکان دۆزیبوویاننەوە، ئیدی باوکی بەرتیلی دابوویە سەربازەکان تاکو واز لە کچەکانی بهێنن. دوای ئەوەی یەك فلسیان پێنەهێشتبوون، سەربازەکان بەرەو لای خێزانەکانی ترو ئەو کچانەیان ئەتك کردبوو کە باوکیان هێندە پارەیان پێنەبوو هەتاکو بیانپارێزن. لەگەڵ روتێکردنی قەیرانێکی پڕتاوی پەنابەران کە لەجیهانی دەرەوەدا پشتگوێ خرابوون، ئێران لە کامپە کاتییەکانی پەنابەران بۆ چەندین مانگ عێراقییەکانی لەخۆگرت پێش ئەوەی دواجار رێگەیان پێبدرێت برۆنە تارانو بەدوای بژێوی ژیانی خۆیاندا بگەرێن لەنێو ئەو ئێرانییانەی وەك هاووڵاتی ئەو وڵاتە لێیاندەڕوانین کە جەنگیان لەگەڵیاندا بەرپاکردبوو. خێزانی ئەو کچە گەنجە بۆ چەندین ساڵ بوو دەستیان بەپارەوە گرتبوو هەتاکو کچەکەیان بنێرنە دەرەوەی ئێران. فەریادڕەسی کچەکە، پیاوێکی بەتەمەنتر بوو کە هێشتا بەتەواوەتی باش نەیدەناسی لەگەڵ ئەوەی خەریك بوو دەبووە باوکی منداڵەکەی. وا بیرمکردەوە کە دەکرا من لەجێی ئەو بومایە. عەمو ئێمەی رزگارکردو لەجیاتی ئەمە ئەشکەنجەو ئازاری ئەوی دا.

ئەو خەڵکانەی لەو ناوچەیەی فەخریدا دەژیان پاساوەکانیان دروستبوون هەتاکو سەرسەختانە رقیان لە سەدامو بەتایبەتی خێزانەکەی بێت. بەلای

ئەوانەوە من هاوڕێی سەدام بووم و لە کۆشک و تەلارەکانیدا کاتێکی خۆشم بەسەربردبوو لەوکاتەی ئەوان لەناڕەحەتی و ئازارچەشتندا بوون. هەرگیز فەخری ڕێینەدەدا ئەو شتانە لەیاد بکەم. شتێکی منی هەڵدەگرت و بەلوشکەوە بۆنێکی پێوەدەکردو دەیگوت "ئا، ئەمەشت وەك دیارییەکی تر وەرگرت، لەبەرئەوەی هاوڕێی سەدام بویت؟" ئەوەی خەمناك بوو ئەوە بوو دەمبینی ژن و مێردە پرۆفێشناڵەکانی تر کە لەڕێگەی باوانیانەوە یاخود کەسانی گەورەتر لەخۆیانەوە ئاسانکاری بۆ بەیەکگەیشتنیان کرابوو، هاوسەرگیرییەکی پڕ خۆشەویستی و سەرکەوتویان دەگوزەراند. لەلایەکی ترەوە، فەخری منی وەك بوکێك دەبینی کە لەدوورەوە داوای کردبێت و هێنرابێتە بەردەستی، وەك ئەو کچە تەنهایەی ئێران منی دەبینی، هاوشێوەی ئەو هەزارەها بووکە گەنجە پەناهەندانەی تر کە لە وڵاتانی سەرکوتکاری جیهانەوە رژابوونە ولایەتە یەکگرتووەکانەوە چاویلێدەکردم. چاوەڕێی ئەوەم لێدەکرا نەك تەنها ملکەچ و گوێڕایەڵی ڕاهێنانی هاوسەرگیری بم، بەڵکو سوپاسگوزاری ئەو دەرفەتەش بم کە بۆم ڕەخسابوو، ئەویش بریتیبوو لە تێکەڵێکی ژەهراوی لوتبەرزی ئەمەریکایی و خۆنوێنی عەرەبانە.

هەندێك جار واهەستمدەکرد کاتێك تەماشای دەموچاوی دەکردم وەك ئەوە بوو دیقەتی ڕوخساری سەدام حسێن بدات. ئیتر گومانم دەکرد هاوسەرگیرییەکەمانی قۆستبووەوە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو نایەکسانییە. شەوێکیان لەوکاتەی فرمێسکەکانم دەتکایە ناو قاپ شۆرەکەوەو لە سابووناوەکەدا تکەی دەکرد، لەبەرخۆمەوە ئەو قسەیەی باوکمم بەخەیاڵدا هات کە دەیگوت "هاوڕێکانت لەبەر من هاوڕێتن". بەدڵێکی پڕ لەداخەوە گوتم "دوژمنەکانیشم بەهۆی تۆوە دوژمنمن" بابە. من کچی فرۆکەوانەکەی سەدام حسێن بووم، فەخریش لەسەر جێگا ئەو کارەی بە من دەکرد کە تەواوی ئەو خەڵکەی لەوێ پەناهەندە بوون دەیانویست بەسەر سەدامدا بیهێنن. هەوڵمدا ئەو جنێوە کورتە ناشیرینە لە مێشکم دەربکەم کە هەموو شەوێك لەو کاتەی لەگەڵم جوت دەبوو بەکاریدەهێنا. دەیگوت "fuck you, fuck you" لەوکاتەی من خوازیاری دەرکەوتنی بەیانی بووم. بەلای ئەوەوە ڕەنگە من پارچە تەختەیەکی ڕەقی وشك بووبم.

لە مانای تێرکردنی حەزە سێکسییەکانی پیاو لەلایەن ژنانەوە تێدەگەشتم. ئەوە دابونەریتی عەرەب بوو. دواتر ئەوەم بۆ دەرکەوت شێواوییەکی زۆر هەیە لەنێوان بابەتە ئایینیو دابونەریتییەکانداو ئیسلام لەبابەتی خۆشییەکانی سێکسەوە زۆر روونو ئاشکرا باسی کردووەو دەیخاتە ئەستۆی هەردوو هاوسەرەکە، ئەمەش ئەوە بوو کە دایکم بۆی باس کردبووم. هەولمدا لەگەڵ فەخریدا باسی سێکس بکەم، بەڵام ئەو تەنها لێم تورە بوو. لەکۆتاییدا، تەلەفۆنم بۆ دایکی کرد بەو هەستەی کە ئەگەر فەخری یاسایەکی هاوسەرگیرییەکەمانی پێشێل کردبێت ئەوا منیش کردوومە بەتایبەتی ئەگەر بەناوی یارمەتیدانی سەرخستنی هاوسەرگیرییەکەمانەوە بووبێت. پێموابوو ئەو وەك ژنێك لەوە تێگەشتبوو، بۆ کورەکەی رووندەکاتەوە کە پێویستە ژن بەنەرمی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت. بۆ چا خواردنەوە بانگێشتی کردم، منیش دوای ئەحواڵ پرسینو رووخۆشییە نەریتباوەکان بەشێوەیەکی ناراستەخۆ بابەتەکەم هێنایە پێشەوە. بەڵام ئەو سەلیقەیەی بەرامبەر ئەو ژنە بەکارمهێنا، بووە هۆی تەقینەوەی پرسیارو سەرسورمانی بەرامبەرەکەم بەدەست راوەشاندنەوە. "ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟" پێمدا هەڵشاخاو بەسەر کوپە چاکەدا خۆی رادەوەشاندو دەنگی بەرزو نزمی دەکرد تا نوزەی لێدەبرا. "ئەوە ئەرکی ژنانەی تۆیە پێداویستییەکانی کورەکەم دابین بکەیت! وەك ژنێکی باش، پێویستە هەر کاتێك بێت ئامادە بیت هەتا حەزە سێکسییەکانی کورەکەم تێر بکەیت. حەزەکانی ئەو لەپێش هەموو شتێکەوەیە، دایکت ئەمەی فێرنەکردویت؟ پێم بڵێ، پێش ئەوەی بچیتە سەر جێگا حەمام دەکەیتو بۆن لەخۆت دەدەیت؟ قژت رێك دەکەیتو ژێرکراسی سێکسی لەبەردەکەیتو حەوت جار بەدەوری جێگەی نوستنەکەدا دێیتو دەچیت پێش ئەوەی خۆت بدەیت بەدەستەوە؟" ئەمە ماوەی دوو کاژێری خایاند هەتاکو لەکۆتاییدا هەناسەی لێبڕا. تاکە شتێك کە بیرملێکردەوە بیڵێم لەوکاتەی رۆیشتم بەوپەڕی رێزەوە ئەوەبوو کە گوتم "ببورە، من هاوڕانیم لەگەڵت".

ئاخۆ گاڵتەی دەکرد؟ حەوت جار هاتنو رۆشتن بەدەوری جێگای نوستنەکەداو خۆدەرخستنم بۆ فەخری؟ ئەوەی ئەو باسیدەکرد کۆیلەیەتی بوو. دواتر بۆمدەرکەوت کەوا لەچەند شوێنێك ئەم هاتوچۆکردنە بەدەوری جێگەی

نوستندا بەڕاستی بوونی هەیەو پیادەدەکرێت، بەڵام گومانم لەوە هەبوو کە لە ژووری نوستنی خەسومدا ئەوکارە بکرێت. کاتێك لەگەڵیدا دەچوومە هەندێك کۆبوونەوەی ژنانەوە، ئەو بەردەوام سکاڵای لە مێردەکەی دەکردو غەیبەتی دەکرد. زۆر جیاواز لە کۆبونەوەکانی دایکم کە بۆ ئاهەنگ گێڕان بوو، ئەو کۆبوونەوانە هەمووی دەربارەی ئایینو ئەرکەکانی ژن بوو. هەندێك جار پێموابوو ئەوان باسوخواسی ئایینێکی جیاواز دەکەن لەو ئایینەی فێری من کرابوو. ئەو هێڵە دابەشکارە لەکوێ بوو لەنێوان بوونە ژنێکی چاكو ڕێگەدان بەهاوسەرەکەت هەتاکو دەستت بەسەردا بگرێتو دەستدرێژیت بکاتە سەر؟ ئایا ژنان کەمتر بوون لە پیاوان؟ چەند پیاو کۆبوونەوە بۆ باسکردنی ئەرکەکانی هاوسەرێتییان؟

سێ مانگ دوای گواستنەوەکەم دەیکردە یادی لەدایکبوونی بیستو یەك ساڵەم. دیاری فەخری بریتیبوو لە ٥٠ دۆلارو تۆمەتبارکردنێکی تازەی سەرجێکردن کە هەر لێی تێنەدەگەشتم: ئیتر ببوومە (لەشفرۆشێك) بەلایەوە کە چیتر دەسەڵاتم بەسەر جەستەمدا نەدەشکا. جاری دواتر کە تووشی دەمەبۆڵە هاتین، رەتمکردەوە سێکسی لەگەڵدا بکەم. قیژاندی بەسەرمداو فڕێی دامە سەر جێگای نوستنەکە. پاشان خستمیە سەر سكو دەموچاوی نامە سەر پشتییەکە. سەری دانەواندمو لەدواوە دەستیکرد بەئیشی خۆی، بەشێوەیەك ئازاری دەدام کە لەوەوپێش هەرگیز بەو جۆرە ئازاری نەدابووم. یەك لەسەر یەك دەیگوت " fuck you". هێندە بەسەر بەرگەپشتییەکەدا گریام هەتاکو دەنگم نوسا. نەمدەتوانی هەناسە بدەمو دەترسام لەوەی بخنکێم. باشم لەبیرە چەندە بێدەسەڵات بووم. لەکۆتاییدا، خۆم شلکردو گیانم لەخۆم دەرکردو جەستەم وەك قاوغێکی بەتاڵ لێکرد بۆی تا دەستدرێژیم بکاتە سەر، تاکو ئەو دەسەڵاتەی تەنها لەخەیاڵیدا هەبوو بەسەرمەوەبێت. لەو ساتەوەختە پڕ ئازارەدا، چرکەکانم دەژمارد هەتاکو تەواو بوو. پاشان هەستاو جلەکانی لەبەرکردو ڕۆیشتو وەك ئەوەی شتێکی پیس بم منی لەپاش خۆی بەجێهێشت. بەگەڵاوگەڵ لەجێگا هاتمە دەرەوەو چوومە بەر دوشەکە. بۆ ماوەی کاژێرێك لەو حەمامە پلاستیکە ڕوونەدا مامەوە، هەنسکم دەداو لەئازارا دەلەرزیم. ئەو لاقەی کردمو دەستدرێژی کردە سەرم.

کە هاتمە دەرەوە فەخری پێیگوتم خۆم بگۆڕم لەبەرئەوەی وایدانابوو بۆ

نانخواردنی ئێواره لەگەڵ دایکی بچوینایەتە دەرەوە. ئەوە ئەوکاتە بوو لێی جیابوومەوە. بەسەریدا قیژاندمو پێمگوت کە خۆشم ناوێتو رقم لێتە. بەچەپۆك کەوتمە سەری و کاتێك ویستی دەستم بگرێت بەدەستو قۆڵیمدا کێشا. هاواری کردو گوتی "توندوتیژی خێزانیم بەرامبەر دەکەیت"و تەلەفۆنی کرد بۆ هێڵی فریاگوزاری ٩١١ و گوتی "ژنەکەم لێمدەدات" دوای ئەو هەمووەی بەسەرهێنام ئەم تۆمەتەشی بۆ زیادکرد. رامکرد بۆ ژووری نوستنەکەو لەدوای خۆم دەرگاکەم کلیل کردو جانتایەکم پڕ کرد لەو جلانەی بەدڵم بوونو زێڕو زیوەکەی دایکم پێی دابووم لەگەڵ ٤٠٠ دۆلار. کاتێك پۆلیس گەیشت لەژوورەکە هاتمە دەرەوەو دایکی لە ژووری دانیشتنەکە چاوەڕێی ئێمەی دەکرد تاکو پێکەوە بڕۆین بۆ نانخواردنی ئێوارە. فەخری پێی گوتن کە من پەلامارم داوەو ئەو قوربانیی دەستی من بووە.

"تەماشا بکە، لێرەی دام. پێویستە بیبەن بۆ بنکە تاکو وانەیەك فێر ببێت" فەخری ئەمەی بە پۆلیسەکە گوتو نیشانەی گازێکی بچوکی پیشانی پۆلیسەکە دەدا کە تەنانەت پێستەکەشی کون نەکردبوو.

منیش گوتم "بەڵێ، لێمدا. ئامادەم لەگەڵت بێم".

کاتێك بەرەو ئۆتۆمبێلەکەی دەڕۆیشتین، پۆلیسەکە لەسەرخۆ پرسیاری ئەوەی لێکردم کە ئایا کەسی ترم خۆشناوێت. منیش پێمگوت "نەخێر". پرسی "ئازاری دایت؟" یەکسەر وەڵامم نەدایەوە، پاشان بەهێواشی وتم نا. نەمویست باسی ژیانی سێکسیم بۆ کەسێکی نەناسو پۆلیسێکی تاكو تەنهای وەك ئەو بکەم. هەرگیز وام بەسەردا نەهاتبوو قسە بۆ پۆلیس بکەم، ئەو تاکە جارەی پۆلیسم بینیبوو لێی تۆقابووم. کاتێك گەیشتینە بنکەکە داوام کرد تەلەفۆن بۆ هاوڕێیەکی دایکم بکەم، ئەویش گەیشتە لام هەتاکو بمبات بۆ لای خۆی. رۆژی دواتر لەوکاتەی فەخری لەئیش بوو ئەو هاوڕێیەم بە ئۆتۆمبێلەکەی بردمی بۆ شوقەکەم. دەستمانکرد بە پێچانەوەی جلەکانمو قاڵییە دەستچنە ئێرانیەکەمو ئەو دیارییە فەخفوورییەی دایکم پێیدابووم. هەموو شتێکم پێچایەوە، بە هەموو دیارییەکانی گواستنەوەشمەوەو پاشان رۆیشتم.

گوتی "چەرچەفەکانیش ببە".

نازانم بۆچی کە ئەوەم بیردەکەوێتەوە پێکەنینم دێت ئەگەرچی ئەو کاتە

زۆر خەفەتاوی بوو؟

"باشە چی لەو چەرچەفانە بکەم؟ بۆچیمە؟"

گوتی "باشە، هیچ نەبێت بەرگە پشتییەکەت ببە".

گوتم "بۆچی؟"

"بۆ ئەوەی مانایەك بگەیەنێت بۆ فەخری، بۆ ئەوەی کە هاتەوە ماڵەوە بیری بخاتەوە کەوا تۆ رۆیشتویت و بەجێتهێشتووە".

ئەوە کارێکی بچووکی قەناعەتپێکەری تۆڵەکردنەوە بوو کە تەنها ژنان ئەو شتانەیان بەخەیاڵدا دێت. بیرۆکەکەم بەدڵ بوو. چوومە سەر جێگاکەو بەرگەکەم لە پشتییەکە داماڵی کە چواردەورەکەی سەوزو ناوەڕاستەکەشی گوڵی بێجی تێدا بوو. بردنی ئەو بەرگە پشتییە تاکە کارێك بوو کە بەڕاستی لەو هاوسەرگیرییەدا خۆشی پێدەبەخشیم. هێشتا ماومە. وەك بیرخەرەوەیەك وایە لەو وانەیەوە فێر ببووم کە دایکم لە بەغدا پێیدابووم: هەرگیز نەهێڵی هیچ پیاوێك دەستدرێژیت بکاتە سەر، هەمیشە گیانێکی ئازاد بە.

کاتێك لەژیانی فەخریدا نەمام، برینداری تووڕە بووم و رقم لە پیاو دەبووەوە. هەموو پیاوێك. هەردوو ئەو پیاوەی دەرگیربووم لەگەڵیاندا بەڵێنیان پێدابووم خۆشیان بوێم و ئاگایان لێم بێت و منیش متمانەم پێکردبوون. بەڵام هەردوکیان بەرنامەی نهێنی خۆیان هەبوو. هیچ کامێکیان وەك ئەو کەسە نەبوون کە لەسەرەتادا وا دەردەکەوتن. هەردوکیان دووڕوو بوون و بەدرۆکانیان هەڵیان فریواندبووم هەتاکو بمکەنە تەڵەکەوەو دەستم بەسەردابگرن. ئەو دوو کەسایەتییە نێرە سەرەکییەی ژیانم بریتیبوون لە عەمو کە دەستی گرتبوو بەسەر ملیۆنەها کەس و دەستدرێژی کردبوونە سەر، هەروەها باوکیشم کە پیاوێکی خۆشەویست بوو، بەڵام ژنەکەی هێندە هەستی بەگیرۆدەیی دەکرد کە هەوڵی خۆکوشتنی دابوو هەتاکو رزگاری ببێت. نازانم باسی ئەوەم کرد کە چەندین جاری تر هەوڵی خۆکوشتنی دابوو نەك تەنها ئەو جارەی کە منداڵ بووم؟ ئاخۆ لەبەرئەوە بوو کە توشی دڵەڕاوکێ دەبووم وا هەندێکجار لە شوێنی هەڵگرتنی دەرمانەکان نزیك دەبوومەوە؟

زۆر زۆر زۆر تامەزرۆی رۆشتنەوە بووم. هێندە هەستم بەغەریبی دەکرد

نازاری دەدام. تەنها دەمویست بگەڕێمەوە بۆ خوێندنەکەمو وا دابنێم ئەو چەند مانگە دژوارەم بەسەردا نەهاتبوو. بەڵام تەنانەت نەمدەتوانی تەلەفۆن بۆ دایکم بکەمو پێی بڵێم فەخریم بەجێهێشتووە. هەموو ڕێگەکانی پەیوەندیکردن بڕدرابوون. سەدجار هەوڵمدا پەیوەندی بکەم بەماڵەوە، بەڵام پەیوەندییەکان نەدەڕۆیشتن. خزمەتگوزاری پۆستیش وەستابوو، لەبەرئەوە نەمدەتوانی هیچ بنوسم. هێشتا ئەو کارتی گەڕانەوەم ماوە، بەڵام هیچ گەشتێکی نێودەوڵەتی بۆ عێراق ڕێگەپێدراو نەبوو. (دواتر زانیم باوکم فڕۆکەکەی بەهەموو سەرنشینەکانەوە بەرەو تاران بردبوو لەبەر سەلامەتبونیان، ئەوەکو فڕۆکەخانە بۆردومان بکرێتو سەرنشینەکانی تیابچن).

تاکە ڕێگا بمتوانیایە خۆم بگەیەنمە عێراق بە ئوردوندا تێدەپەڕی، بەڵام لەوێ کەسم نەدەناسیو لەوە دەترسام ئەگەر بچومایەتە ئەوێ لە بێ پارەییدا گیرم بخۆم. لەبەرئەوەی هیچ شوێنێك نەبوو ڕووی تێبکەم، دواجار تەلەفۆنم بۆ خاڵێکی باوکم کرد لە لۆس ئەنجلوسو ئەویش بانگێشتی کردم بۆ ئەوەی لەگەڵ خێزانەکەیدا بژیم. دوای ئەوە نامەیەکم بۆ دایکم نوسیو تێدا ئاگادارم کردبووەوە فەخریم جێهێشتوەو بەرەو شوێنێکی تر ڕۆیشتووم. بەشێوەیەك ناردم کە تەنها ئەو ڕێگەیەم بەخەیاڵدا هاتبوو: لەبەشی پێشەوە ئەم ناونیشانەم بەئینگلیزی نوسیبوو، عەممان، ئوردونو لەپشتەکەی پەیامێکم بە عەرەبی نوسیبوو بەم شێوەیە، "بۆ خەڵکی ئوردون: داوا لە بەخشندەییو میهرەبانیتان دەکەم ئەم نامەیە بگەیەننە دەستی دایکە خۆشەویستەکەم لە بەغدا لەگەڵ سوپاسی بێ پایانی کچە خۆشەویستەکەی کە لە ئەمەریکا گیریکردووە".

کاتێك گەیشتمە لۆس ئەنجلوس، ڕۆیشتم بۆ فەرمانگەی پەنابەرانو مافی هاووڵاتی پێدان، لەبەرئەوەی ڤیزای گەشتەکەم کە وادانرا بوو لەکۆتاییدا وەك هاوسەری کەسێکی هەڵگری گرین کارت مافی مانەوەم پێبدرێت خەریك بوو بەسەردەچوو. دوای چەند کاژێرێك لە سەرەگرتن توانیم قسە لەگەڵ کارمەندێکی ئەفریکی – ئەمەریکی لەو فەرمانگەیەدا بکەم کە هێندە نەرمونیانو دایکانە قسەی لەگەڵ دەکردم هێشتا شێوەیم لەبەرچاوە. گوێی بۆ گرتمو وایلێکردم هەست بکەم باش دەبم. پێیگوتم دەتوانم ئیشێکم دەست بکەوێتو ئەو ڕۆژە کە

لەوێ تەواو بووم بۆ ماوەیەکی کاتی ڕێگەی ئیشکردنیان پێدام کە تایبەت بوو بەو بیانیانەی بەهۆی قەیرانی سیاسیەوە لەو وڵاتەدا گیریان خواردبوو. دوو ئیشم دەستکەوت، یەکێکیان فرۆشتنی پۆشاك بوو لە The Limitedو ئەویتریان وەك ژمێرەر بوو لە کۆگای پەڕاوگەی (هۆڵمارك) کە لەلایەن خێزانێکی دڵفراوانی ئیتالییەوە بەڕێوەدەبراو خاڵی باوکم دەیناسین. هەرکە هەندێك پارەم دەستکەوت داوای جیابوونەوەم کردو ئۆتۆمبێلێکم کڕی. ئۆتۆمبێلەکە شۆفرلێتێکی شەقو شڕی دوو ڕەنگی مۆدێل ١٩٧٨ بوو ٦٠٠ دۆلارم پێدا. ئەوە یەکەمین شت بوو کە بەپارەی خۆم کڕیبێتمو زۆر چێژم لە لێخوڕینی دەبینی.

لەهەمان کاتدا، ئەمەریکاو عێراق لە لێواری جەنگدا بوون. عەمو بەردەوام لەسەر تەلەفزیۆن بوو. لەبیرمە تەلەفزیۆن کوڕێکی بچووکی بەریتانی پیشاندەدا کە یەکێك بوو لەو سەدان کەسەی بەبارمتە گیرابوونو وەك قەڵایەکی مرۆیی بەکاردەهێنران لەو ڕۆژانەی کە بەرەو هەڵگیرسانی جەنگ دەڕۆیشت. سەدام ڕێگەی دا بەکامێراکان تاکو وێنەیان بگرن کە چەند بەباشی مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن. کوڕە بچووکەکەی خستبووە باوەشیەوەو دەستی بەسەریدا دەهێنا. پرسیاری لێدەکرد "ئاخۆ ئەمڕۆ ستوارت شیرەکەی خوارد؟"و بیرم لە حەسەنی داماوی برا بچوکم دەکردەوە کە لە بەغدا تەماشای ئەوە دەکات کە هەمیشە سەدام لەباوەشی دەکردو وەك ئێستای ستوارت لێی تۆقیبوو. هەستم بەشەرمەزاری کرد کاتێك ئەو ساتەم بیرکەوتەوە کە سەدام پێکێك ویسکی هەڵگرتبوو دەینا بەلێوی حەسەنەوەو زۆری لێدەکرد بیخواتەوە، گومانم لەوەدا نەبوو کە دەیویست وەك پیاوێکی خۆی گەورەی بکات.

بێژەری هەواڵی کەناڵە ئەمەریکاییەکان بەڕەفتارێکی قێزەونانە ئەو شێوازەیان شرۆڤە دەکرد کە سەدام مامەڵەی لەگەڵ ئەو منداڵە بچووکە بەریتانییەدا دەکرد، بەهەرحاڵ بەلای منەوە ئەو خۆشەویستییەی بۆ منداڵەکەی پیشاندەدا لە دڵیەوە بوو. (دەمزانی عەمو هیچ گرفتێکی نەدەبینی لەنێوان خۆشویستنی خەڵكو کوشتنیاندا). ئەوان باسی لادانی پیاوێکیان دەکرد کە دەست بەسەر منداڵێکدا دەهێنیو دواتریش وەك قەڵغانێکی مرۆیی بەکاریدەهێنێت. ڕاستییان دەکرد، بەڵام ئەی بۆچی یەك هەنگاوی تریان نەدەنا؟ ئەگەر

ئەمەریکاییـەکان هێنـدە بـەزەییان بـەو تاکـە منداڵـەدا دەهاتـەوە، ئـەی بۆچـی تەنانەت هەر باسێکی ئەو ملیۆنەها منداڵەیان نەدەکرد کە شیریان نـەبوو بیخۆن؟ یاخود بۆچی هـەنگاوی ژیرانـەیان نـەدەنا؟ هـەموو عێراقییـەکان وەك ئـەو منداڵـە بچوکە وابوون‌و هـەمووومان بارمتـە بـووین. ئەوکاتـەی یەکـەمجار عـەموم بینـی زۆر گەورە بووم هـەتاکو لەباوەشیدا دابنیشـم، بـەڵام بـۆ مـاوەی دە سـاڵ هەڵسوکەوتم لەگەڵـدا کـرد، دایـك‌و باوکیشـم بەهـەمان شـێوە. ئەمەریکاییـەکان خـەڵکانێکی بەسۆزو بەخشـندە بـوون. بۆچـی ئـەوان بێدەنگیان لـەو هـەموو تاوانانـە کـرد کـە سەدام ئەنجامی دابوون لەوکاتەی یەکێك بـوو لـە باشـترین هاوەڵـەکانی ئەمـەریکاو حکومـەتی ئەمـەریکا پـارەی بـۆ دەنـارد؟ چـەندەها سـاڵ بـوو لـە ئەشـکەنجەدان بـەردەوام بـوو، لـە پاکتـاوی رەگـەزی‌و گەنـدەڵی‌و دیپۆرتکردنـەوەی بەکۆمـەڵی گەلەکەی بۆ ئێران. بۆچی ئێستا هـەموو کەسێك ئاگای لـە زوڵـم‌و زۆرداریيەکـەی بـوو؟ ئایا کۆشـکی سـپی باسـی لـە بۆردومـانکردنی قوربانییـەکانی دەکـرد؟ بۆچـی (ئێف بـی ئـای) کـەوتبووە هەراسـانکردنی منداڵە عێراقـی – ئەمەریکاییـەکان لـە قوتابخانـە؟ کارمەنـدەکانی دەنـاردە ماڵـە عێراقـی – ئەمەریکاییـەکان‌و پرسـیاریان لێدەکرد دەربـارەی دڵسـۆزییان بـۆ ئەمـەریکا؟ تەنانـەت پەنابـەرەکانیان دەکـردە کامپـە دەستبەسـەرەکانەوە وەك چـۆن ژاپـۆنی–ئەمەریکاییەکانیان دەکـردە ئـەو کامپانـەوە لەسـەروەختی جـەنگی جیهـانی دووەمـدا؟ ئـەو شـێوازەی حکومـەتی ئەمـەریکا بەکاریـدەهێنا بـۆ بەشـەیتانیکردنی عێراقییـەکان ئـەو شـێوازەی بیردەهێنامـەوە کـە عـەمو بەکاریـدەهێنا بـۆ بەشـەیتانیکردنی ئێرانییـەکان‌و لـە مرۆڤایـەتییانی کـەم دەکـردەوە بـەئامادەکردنیان بـۆ جـەنگ. کەسـێکی ئێرانـی – ئەمەریکاییم بینی‌و ئامۆژگاری کردم "هەرگیز نـەڵێیت تـۆ عێراقیـت. بـڕوام پێبکـە هەراسانت دەکەن. بڵێ خەڵکی سعودییەم". هەراسـانکردنەکەم بـەلاوە باشـتر بـوو. خێزانەکەم زۆر نەهامەتییان چەشـتبوو بـۆ ئـەوەی بیسـەلمێنن هـاووڵاتی عێـراقین. من هاووڵاتی عێراقی بووم. شانازیم بەعێراقیتییەوە دەکرد.

کریسـمس زوو هـات. وەختـی بـازاڕکردن هاتـە پێشـەوە. رووناکیـەکان لـە بازاڕەکـانی سـاوزەرن کالیفۆرنیـا دەدرەوشـانەوە. منـاڵان دەچـوونە باوەشـی بابـە نوئێلەوەو ئاواتەکانیان دەخواسـت. هەنـدێك جار دایکان بـەبێ ئاگای کچەکانیان

دەچوونەوە بۆ کۆگای هالمارك و ئەو شتەیان بۆ کچەکەیان دەکڕی کە پێشتر لەگەڵ دایکیدا چاوی پێکەوتبوو حەزی لێی بوو. من زۆر بیری دایکمم دەکرد. ماوەی سێ مانگ بوو هیچ جۆرە پەیوەندییەکم لەگەڵماڵەوەدا نەمابوو. زۆر هەستم بەتەنیایی دەکرد. لە ٢ی کانوونی دووەمی ١٩٩١دا، دایکم تەلەفۆنی بۆ کردم. کەسێك لە ئوردونەوە نامەکەی بۆ ناردبوو، پێیگوتم پێش ئەوەی زەرفەکە بکاتەوە بەچاوی پڕ فرمێسکەوە تەماشای نامەکەی کردبوو. وادیار بوو زۆر بێهێزو بەپەلە بێت وەك ئەوەی تازە لە گریان بووبێتەوە. دەمزانی بە چ حاڵێك ئەو تەلەفۆنەی کردبوو.

زۆر بەخێرایی و بەگریانەوە گوتی "شیرینەکەم، باخچەکەمان وشکە".

ئەوە وتەیەکی نهێنی بوو پێشتر لەسەری رێککەوتبووین بەکاریبهێنین تاوەکو گوێگرەکانی سەدام لێمان تێنەگەن، بەو مانایەی کەوا شتێکی خراپ لەئارادایە. بەخێرایی قسەی دەکرد. "هەندێك شت هەیە دەبێت بیزانیت لەحاڵەتێکدا ئەگەر لەم شەڕەدا شتێکمان بەسەردا هات، لەبەرئەوەی تۆ تاکە کەسی سەلامەتیت لەدەرەوەی ماڵ. دەبێت بزانیت خاوەنی کام موڵکیت تاکو دواتر بزانیت چییان لێبکەیت".

پێیگوتم قەڵەم و کاغەزێك بهێنم و دەستیکرد بەباسکردنی میراتییەکەی، چی شتێك بەناوی چ کەسێکەوە بوو. فرمێسك بەڕوومەتمدا دەهاتە خوارەوە. هیچم نەنوسی، بەلامەوە گرنگ نەبوو خاوەنی چی بوین. تەنها گوێم بۆ گرت و دەگریام و خۆزگەم دەخواست لەوێ بم، بەلامەوە گرنگ نەبوو چ جۆرە شەڕێك روودەدات. پێشتر ئەوەمان بینیبوو، مەگەر وانەبوو؟ ئەو لەهەمووومان ئازاتر بوو دەیهێنایە پێکەنین و هەستمان بەئارامی دەکرد. بەڵام ئەمجارەیان دەترساو منیش لەوە دەترسام لەدەستم بچێت. پێمگوت خۆشمدەوێت، جارێکی تر پێمگوت خۆشمدەوێت. پاشان پەیوەندییەکە پچڕا. لەوە دەترسام کە جارێکی تر گوێم لە دەنگی نەبوایەتەوە.

شەوی دواتر جەنگی کەنداو دەستیپێکرد. وەك زۆرێك لە پەناهەندە عێراقییەکان، لە تەلەفزیۆندا تەماشای جەنگەکەم دەکردو ئازارم دەچەشت بەوەی لەگەڵ خێزانەکەم نەبووم. بۆ پەناهەندە عێراقییەکان، هەر بینایەك کە

دەتەقییەوەو ڕووناکی لێدەبووەوە ناوێکی خۆی هەبوو، ئامانجە سەربازییەکان لە کەسە مەدەنییەکانی دەدا، ئەو پردانەی دەتەقینەوە ئەو ڕێگایانە بوون کە پێیدا دەچووین بۆ قوتابخانە. بەلای منەوە تەواوی شەڕەکە لە یارییەکی ڤیدیۆیی دەچوو نەوەك لە جەنگێك. لە CNN ئەو خەڵکەی پیشان نەدەدا چاوەڕێی کۆتاییهاتنی ئەو جەنگە بوون، خەڵکی ئاسایی خوازیاربوون بزانن کە ئاخۆ مردن چاوەڕێیان دەکات، هیچ لەو خێزانانەی پیشان نەدەدا کە ژیانیان تیاچووبوو پەرتەوازە ببوو یان سەریان لێ شێوابوو بەهۆی تێکشکاندنی هێڵەکانی کارەبا هەروەك چێشتیان لەبەر لێدەناو ماڵەکانیان پێ ڕووناك دەکردەوەو پەککەوتنی قوتابخانەکان و نەخۆشخانەکان و شوێنە بازرگانیەکان لێدەکەوتەوە کە بەکارەبا ئیشەکانیان رایی دەبوو. وەك مردوویەك دەچوومە سەر کارو زۆر خەمی خێزانەکەم بوو لەبەرئەوەی جەنگەکە هەر بەردەوام بوو. کاتێك پێناگۆن دانی بە (زیانی لاوەکی)دا نا، لەوە ترساین ئەو خەڵکەی کەوتبوونە ژێر داروپەردووەوە بیانناسین. ئەو دووفاقیە بۆ عێراقییە – ئەمەریکاییەکان دڵخورپێنەر بوون، زۆرێکیان کۆماری بوون و دەنگیان بۆ سەرۆك بۆش دابوو هەروەها بۆ چەندین ساڵ بوو لۆبییان بەرامبەر حکومەتی ئەمەریکا پەیدادەکرد هەتاکو دەربارەی سەدام حسێن شتێك بکەن. دواجار واشنتۆن لە پەیامەکە تێگەیشت کە ئەوە خێزانەکان بوو دەیانناڵاند نەك سەدام، بەڵام وادیاربوو ئەم پەیامە نەدەگەشتە خەڵکە ئەمەریکاییەکان. بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر تێبگەشتنایە، دەمانتوانی ڕێگەیەکی تر بدۆزینەوە بۆ گۆڕینی دیکتاتۆری و ڕزگارکردنی خێزانەکانمان. هەردەم خۆزگەم دەخواست ڕێگەیەك هەبوایە کە بمتوانیایە یارمەتی خەڵکی عێراقم پێبدایە.

هاوڕێیەکم داوای لێکردم بەشداری لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیدا بکەم کۆمەڵگەی عێراقی – ئەمەریکایی ڕێکیاندەخست لە مزگەوتێکدا لە لۆس ئەنجلوس بۆ مەبەستی ڕاگرتنی بۆردومانەکان. مزگەوتەکە تەنها خانوویەکی سادەبوو کرابوو بە مزگەوت بێ ئەوەی هیچ نوسینێکی قورئانی و ئاڵتونی لە مزگەوتەکەدا هەبێت، بەڵام لەوکاتەی چاوەڕێی دەستپێکردنی کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکە بووم، زۆر بەکوڵ و تاسەوە دەپاڕامەوەو نزامدەکرد. لە خودا پاڕامەوە بۆچی لە خێزانەکەم دووری خستبومەوە لەکاتێکدا هەتا بڵێی

پێویستیمان بەیەکتر هەبوو. دەستمکرد بەگریان‌و نەمدەتوانی ژێر ببمەوە. ئەی خودا، بۆچی ئەم کارەم بەرامبەر دەکەیت؟ چۆن ئەم کارەم بەرامبەر دەکەیت؟ چاوەڕێم رزگارم بکەیت. بۆچی لێرە بەتەنها جێتهێشتووم. بۆچی ناهێڵیت بگەڕێمەوەماڵەوەو لەگەڵ خێزانەکەم بم؟ بەڵام هیچ وەڵامێکم نەبیست‌و هێندە توڕە بووم دەستم لە نزاکردن‌و پاڕانەوە هەڵگرت.

پەیامنێرێکی رۆژنامەی لۆس ئەنجلوس تایمز بینیبووی کە گریابووم‌و داوای چاوپێکەوتنی لێکردم. پێمگوت خێزانەکەم لە بەغدایەو نازانم داخۆ زیندوون یاخود مردبوون. پرسیاری ئەوەی لێکردم چۆن گەیشتومەتە ئەمەریکا. ئەوە پرسیارێکی سادە بوو، بەڵام وەڵامەکەی هێندە ئاڵۆزبوو نەمدەزانی چۆن پێی بڵێم. تەنانەت نەمدەزانی چۆن باسی خۆم بکەم. پەناهەندە نەبووم. گەشتیار نەبووم. وەك بوکێك هاتبووم، بەڵام بوکیش نەبووم. نەمدەتوانی پێی بڵێم گیرمخواردبوو، لەبەرئەوەی دایك‌و باوکم هاوڕێی سەدام حسێن بوون‌و دایکم ناردبوومی بۆ ئەمەریکا هەتاکو بۆخۆم ژیانێکی باشتر بگوزەرێنم. لەبەرئەوە نیوەی راستییەکەم پێگوت‌و گوتم بۆ پشودان‌و بەڤیزای گەشتیاری هاتومەتە ئەمەریکا، بەڵام لەبەرئەوەی سنورەکان داخراون گیرمخواردووە. ئەویش ئەو بەسەرهاتەی منی نووسی‌و بۆ هاوڕێیەکی خۆی گێڕایەوە کە لە CBS NEWS کاری دەکرد. من وەك پۆستەری کچێکی نەتەوەیی بۆ بەرنامەی (لایەنی عێراقی) وەك قوربانییەکی بێتاوانی گیرخواردوو بەهۆی جەنگەوە لەهەواڵەکەدا دەرکەوتم. خەڵك لە کۆگای هاڵمارك دەیانناسیمەوەو دەیانگوت "ئا، تۆ ئەو کچە گوناهە عێراقییەی، وانییە؟ هێشتا هیچت لەدایکتەوە پێنەگەشتووە؟" من عێراقییەکی بەختەوەرو بێتاوان‌و بێ هەڕەشە بووم کە تەنها خەڵکی بەسۆزو باشم دەبینی لەکاتێکدا ئەو عێراقیانەی تر کە دەمناسین پێیان دەگوترا (لی ڕەش)و ئۆتۆمبێلەکانیان دەشکێنرا‌و ماڵەکانیان هێرشی دەکرایە سەر، سەرەڕای ئەوەی هەندێکیان لە ئەمەریکا لەدایك ببوون. ئەو هەراسانکردن‌و سەرکردنەسەرە بیرەوەری پاسپۆرتەکانمانی دەهێنامەوە یاد کە دوای چەند نەوەیەك هەر "رەچەڵەکی عوسمانی" یان "رەچەڵەکی ئێرانی" لەسەر نوسرابوو. لەبەرچی ئەو خەڵکە بەشەیتانی کرابوون؟

هیچ کەسێك هۆکارێکی لانەبوو هەتاکو بمبەستنەوە بەو پیاوەی کە فرۆکەوانی سەدام حسێن بوو. لەم بەسەرهاتانەدا، ناوم زەینەب رەشید بوو نەك زەینەب سالبی. بەدرۆوە وامنەگوتبوو، عەمو گۆڕیبوی بەو ناوە. خەڵکی لێی بێزاربوون کە ئیشی باش و موڵك و ماڵی دەدایە پیاوەکانی هۆزەکەی لە تکریت، بەڵام لەبری راگرتنی دیاردەی خزم خزمێنە، سەدام فەرمانیدا بەهەموو لایەك ناوی باپیریان بەکاربهێنن لەبەر ئەو راستییەی کە هیچ کەسێك نەزانێت ئەو کەسە تایبەتانە کێ بوون. دڵنیام بەڵگە فەرمییەکان زیاتر دروست بوون وەك ئەوەی لەبیرمە، بەڵام ئەنجامەکەی هەر هەمان شت بوو. ناوی دووەممان بەشێوەیەکی فەرمی کرا بەناوی باپیرمان و لەوکاتەی هاتمە ولایەتە یەکگرتووەکان لەپاسپۆرتەکەم نوسرابوو زەینەب رەشید.

لەو رۆژانەی جەنگ روو لە کزبوون بوو، ئەو سوپاو تانکە تەقێنراوانەم بینی کە لەسەر رێگا سەرەکییەکەی کوەیتەوە بەرەو بەغدا ریزیان بەستبوو. زۆربەی لاشەی سەربازە کوژراوەکان ببوون بە قەرەبروت و بیرم لە رادیە دەکردەوە. ئاخۆ چەند لە ئامۆزاو پوورزاکانی و دراوسێکانی بەزۆر نێردرابوون بۆ شەڕکردن لە گۆڕەپانی ئەو جەنگەی سەدام بەبێ بەها هەڵیگیرساندبوو، ئەمریکاییەکانیش وەك دوژمن دایانـدەنان و دەیانکوشـتن؟ ئـەو گەنجانـە چ بژاردەیـەکی تریـان لەبەردەستدا بوو. هەزارەها گەنج مردن، بێگومان زۆربەیان بەزۆر نێردرابوونە ناو سوپاو دایکیان و ژنەکانیان هەرگیز نەیانزانی چییان بەسەردا هاتبوو.

لەو دەمەی جەنگەکە بەرەو کۆتایی دەڕۆشت، هەواڵم بۆ هات کە خێزانەکەم زیندوو بوون. دایکم توانی بە پزیشکێکی بەریتانیدا نامەیەکم بۆ بنێرێت کە لەعێراقەوە رۆیشتبوو بۆ ئوردون. پزیشکەکە نامەکەی لە لەندەنەوە بۆ ئیمەیڵ کردبووم.

کچە خۆشەویستەکەم،

خۆزگە ئێستا لام بویتایەو ماچم کردیتایە. تۆ روناکی ژیانمی. ئێمە لە خەمو پەژارەیەکی زۆردایین. سوپاسی خوا دەکەین کە هەتا ئەمڕۆ "شەممە" ئێمەی بە سەلامەتی هێشتووەتەوە. لەوانەیە باشترین شت لەکاتی سەختیو دژواریدا بۆ ئێمە ئارامگرتنو خۆراگری بێت.

سوپاس بۆ خوا تۆ لێرە نیت. داواکارین لەخودا ئەم نەهامەتیو دەردەسەرییە نەکاتە بەشی هیچ کەسێکی تر. بەردەوام لە دڵەڕاوکێدامو دەگریەم. نازانم چ چارەنوسێك چاوەڕێمان دەکات. بەڵام تۆ دەمناسی، من هەمیشە بۆ هەموو شتێك نیگەرانم. ئەم جەنگە زۆر توشی دڵتەنگیو نارەحەتی کردووم.

دواجار کە قسەم لەگەڵ کردیت لە ١٥ی مانگدا بوو. لە ١٦ی مانگدا بۆردومانەکان دەستیان پێکرد. بەغدامان جێهێشتو رۆیشتین بۆ خالص "شارۆچکەیەکە ٦٠ میل لە بەغداوە دوورە" هەتاکو لەماڵی خزمێکی خزمێکمان بمێنینەوە. ژوورەکە زۆر زۆر سارد بوو، وەك سەهۆڵبەندان وابوو. هەموو شەوێك رادیۆمان دەکردەوە. پاشان لەبەرئەوەی ئەو ماڵە پڕبوو لەو کەسانەی لە بەغداوە هەڵهاتبوون، لەوێ رۆیشتینو لە خانوویەکی چۆڵکراودا جێگیر بووین. ئاودەستی تێدا نەبوو، پڕ بوو لە قالۆنچەو مێشو مەگەز. بۆنێکی زۆر ناخۆشو بۆگەنی ئاژەڵو شتی لێدەهات. بۆیەکی پیسو قێزەونو ترشاوی هەبوو. بە فڵچەو گەسك پیسایيو پاشەڕۆکانمان ماڵی. زۆر تاریكو سارد بوو، بەڵام بۆ ماوەیەك هەستمان بە ترسو هەڕەشەی جەنگەکە نەدەکرد. پاشان لەوێش دەوروپشتمان بۆردومان دەکرا. یەك هەفتەی پڕ بە کولەمەرگی لەوێ ماینەوە. توشی داڕوخان بووم، لەبەرئەوە گەڕاینەوە بۆ بەغدا. بەلامەوە باشتر بوو لە ماڵەکەی خۆمدا بمرم نەك لەو شوێنە چەپەڵە بژیامایە. جەنگی ئێران بەبەراورد بەم جەنگە هەر هیچ نەبوو.

ئێستا بۆ ماوەی ١٠ رۆژە لە بەغداین. هەموو بەیانیانو ئێوارانێك ئاسمان یەکپارچە دەبێتە ئاگرباران. وەك جەنگی ئەستێرەکان وایە؛ پڕە لە فڕۆکەو فڕۆکەی جەنگیو موشەكو قونبەلەو فیشەك. هەموو چرکەیەك خانووەکە دەکەوێتە لەرزە. لەگەڵ لەرینەوەکەدا راهاتوین، بەڵام ترسەکەمان ناشکێت.

*لەئێستادا یەك سەدە بۆ دواوە دەگەڕێینەوە. شەوان فانۆس بەكاردەهێنین. سەلاجەكەمان بیرچووەتەوە. هەموو شتومەكێكی شارستانیانە لەبیركراون. كارەبا نییە، ئاو نییە، غازێكی زۆر زۆر كەم هەیە، نەوتیش نییە.*

*كچەكەم، تكایە خەم مەخۆ. داوات لێدەكەم بەهێز بیتو خووڕەوشتت بەرز ڕابگریتو ئەوەی ڕاستو دروستە ئەنجامی بدە. تۆ ژنێكی پتەو و خۆگریت. گوێ بۆ گەورەكانت بگرەو ئامۆژگارییەكانیان لەبەرچاو بگرە. ڕێزی خۆت بگرە.*

*ئومێەوارین جارێكی تر خوا بەیەكمان بگەیەنێتەوە. خۆشەویستیم بۆ هەموو كەسێك هەیە لە ئەمەریكا. دوو ڕۆژی تر دەڕۆین بۆ شارۆچكەیەكی تر لەسەروو تكریتەوەو لەخوارو موسڵەوە. نازانین كەی دەگەڕێینەوە. بەویستی خوا، دەتبینینەوە. ئێمە شانازیت پێوە دەكەین.*

*دایكت*

لەگەڵ جەنگەكە دوایی هات، ڕۆژنامەی نیۆرك تایمز كۆپییەكی ئەو نامەیەی بڵاوكردەوە لەگەڵ بەشێك لە قسەكانی من كە دەڵێت "دایكم باشترین هاوڕێمەو منیش تاكە كچی ئەوم. تەنها دەمەوێت بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە". هەروەها گوتم كە خەمی باوكمو برا گەورەكەمە، لەبەرئەوەی دایكم بەناستەم باسی ئەو دوانەی كردبوو لەنامەكەیدا.

عەمو جەنگەكەی دۆڕاندبوو. ئەوەش دۆڕاندنێكی شەرمەزارانە بوو كە هەرگیز لەوەوپێش وێنەی نەبوو. پێموانەبوو لەخۆباییەكەی بتوانێت چارەسەری ئەو شكستهێنانە بكات. بەڕاستی پێموابوو دەستبەرداری پۆستەكەی دەبێت یاخود كۆتایی بەژیانی خۆی دەهێنێتو چەند وتەیەكی پڕ بایەخ دوای خۆی جێدەهێڵێت بۆ زامنكردنی میراتییەكەی. زۆر سەرسام بووم كە ئەوكارەی ئەنجام نەداو لەبەرخۆمەوە قسەم بۆ سەدام دەكرد لەوكاتەی بە شۆفرلێتەكەم بەرەو ئیش دەڕۆیشتم. ئەگەر تۆ تەنها باوەڕت تەنها بەیەك شت هەبێت لەو شەوانەی دەتگوت كە چەندێك گەلەكەتو وڵاتەكەت خۆشدەوێت، بۆچی دەست لەكار ناكێشیتەوە؟ ئیتر ئەو هەموو كوشتارییە بەس نییە لە جەنگە بێ ماناكانتدا؟ عەمو، ئەگەر ناتوانیت بڕۆیت، تكایە بۆ ئەو ورەیە ناهێنیتە بەرخۆتو خۆت بكوژیت؟ ئایا سزای مەرگ بۆ تۆ بەس نییە كە بەسەر خەڵكیدا دەسەپێنیت؟

ئەو لەپۆستەکەیدا مایەوەو بەردەوام بوو لە شەڕکردن، بەڵام ئەمجارەیان دژی هاوڵاتییەکانی خۆی. ئەو عێراقییانەی لە ئەمەریکا بوون خۆشحاڵ بوون کاتێك لەڕێگەی راگەیاندنەکانو وتی ناو عێراقی – ئەمەریکاییەکانەوە بیستمان، شەش رۆژ بوو هەموو عێراقییەکان لەسەرانسەری وڵاتدا دژی سەدام راپەڕیبوون. لە باکوور کوردەکان لەگەڵ حکومەت شەڕیان بوو. لە باشووریش، فڕۆکەکان نامیلکەیان خستبووە خوارەوە کە تیایدا ئەمەریکا پەیمانی دابوو پشتیوانی شیعە بکات ئەگەر لە دژی سەدام راپەڕن. شیعەکان راپەڕینو تێکۆشان بۆ دوایهێنانی ئەو سەرکوتکارییەی دەیەها ساڵ بوو لەلایەن سەدامەوە بەسەریاندا هاتبوو.

پاشان هەرچۆنێك بێت پەیمانەکە شکاو سەدام حسێن کۆنترۆڵی گرتەوە دەست. پەیامی کیمیابارانکردنەکە گەیشتبووە گەلی ئەمەریکاو کوردەکان لەلایەن ولایەتە یەکگرتوەکانەوە پاراستنو خۆبەڕێوەبردنیان پێبەخشرا، بەڵام لە باشور شیعەکان ئەو مافی پاراستنەیان پێنەدرا. سەدام حسێن رێگەی پێدرابوو ناوچەی دژە فرین لەو ناوچەیەدا ببەزێنێتو هەزارەها شیعە رەشەکوژ بکات. سەدام، چەکداری بۆ مەزارگەی پیرۆزی نەجەف ناردو پەلاماری مەزارگەکەیان دا کە شۆڕشگێڕەکان پەنایان بۆ بردبوو، هەروەها کەوتە بۆردومانکردنی هۆڕەکانی باشور کە سەرهەڵداوەکان خۆیان تێدا حەشار دابوو. بۆ دڵنیابوون لەوەی جارێکی تر لەوێ خۆیان حەشار نەدەن، سەدام فەرمانی بە ئەندازیارەکانی کرد رێڕەوی ئاوی فوڕات لابدەنو گوندەکانیانو خانووە قامیشو قوڕەکان خاپوور بکەن کە ماوەی پێنج هەزار ساڵ بوو لەو ناوچە زەلکاوانەدا بوونیان هەبوو.

لەو نێوەندی دژواریو ناڵاندنو مەرگەساتەدا، کەس ئەوەی بەخەیاڵدا نەدەهات کە خێزانێك هەبێتو کەسێکی لەدەست نەدابێت لەو جەنگەدا؟ دواتر بۆمدەرکەوت لەماوەی بۆردومانەکاندا، باوکم لەسوچێکدا دانیشتبوو لە خەفەتی کاولبوونی وڵاتەکەی ئیفلیج ببوو. هەر دەیگوت "عێراق نەما"و بەخواردنەوەی ویسکی خۆی سڕ دەکرد. دایکم توشی هیستریا ببوو، نەیدەتوانی خۆی رابهێنێت هەتا گەیشتبووە ئەو مەراقەی چۆن لەکاتی جەنگەکەدا خۆراك بۆ خێزانەکەی پەیدا بکات. وەك ژنانی تر، فێرببوو چۆن لەسەر ساج نان بکات. لەو رۆژە بێ سەروبەرانەی دوای جەنگەکە، دایکم بوارێکی بچووکی بۆ رەخسا هەتاکو دواجار

ئەو قەفەزە بەجێبهێڵێت. بۆی دەرکەوت زۆر شتی تر هەیە کە ئەمو نیگەرانی بێت نەك ڕۆیشتنی هاوڕێیەکی بۆ ئوردون. دایکم بە باوکمی گوتبوو "من دەڕۆم، دەتوانیت بێیت لەگەڵم یانیش بمێنیتەوە"، بەڵام باوکم نەیدەتوانی عێراق بەجێبهێڵێت وەك چۆن دایکم نەیدەتوانی بمێنێتەوە. براکانیشم دەبوایە لەنێوان ئەواندا یەکێکیان هەڵبژاردایەو جیاببونایەتەوە. حەیدەر کە هەمیشە لەباوکمەوە نزیك بوو لەگەڵ ئەودا مایەوە. حەسەن زۆر هۆگری دایکم بوو لەگەڵیدا ڕۆیشتبوو بۆ ئوردون.

ئەو خۆشەویستی‌و گۆرانی وتن‌و زەردەخەنەو دڵخۆشییەی لەسەرەتای دەساڵی ژیانمدا لەبیرم بوو هیچی نەما. ئەمو خێزانەکەمی پەرتەوازە کرد. دایکم گلەیی لە باوکم دەکرد چونکە لە عێراق مابووەوە، باوکم گلەیی لەدایکم دەکرد بۆ ئەو هاوسەرگیرییە شکستخواردووەی بۆ منی ڕێکخستبوو. سێ منداڵەکەیان هەریەکەو لە سێ وڵاتی جیاواز دەژیان‌و هەریەکەو بەلایەکدا بڵاوبوونەوەو نەماندەزانی کەی یەکتری دەبینینەوەو نەماندەزانی بۆچی دایك‌و باوکمان هێشتبویان ئەو کارەساتەمان بەسەربێت.

کاتێك دایکم ڕۆیشت بۆ ئوردون، پوورە لەیلاش لەگەڵیدا ڕۆیشت. چیرۆکی ئەو دوو ژنە کە بەغدایان بەجێهێشت فیلمێکی ئەمەریکایم بیردەهێنێتەوە بەناوی "سەلمەو لویس" کە دەربارەی دوو ژن بوون‌و لەدەست مێردی دەستدرێژکار هەڵهاتبوون. ڕێگاکانی عێراق بەچڕوپڕی پاسەوانیان دەکراو نۆکەرەکانی سەدام چەکدارو پەرش‌و بڵاوکرابوونەوە. دایکم‌و پوورم لەدواوەی سەیارەکەدا حەسەنیان پێچایەوەو دایاننا‌و وەك چاوەزارێك ملوانکەیەکیان بۆ لەمل کردبوو کە وێنەیەکی سەدام حسێنی پێوەبوو بۆ ئەوەی ئەگەر پێویستی کرد بیسەلمێنن دڵسۆزی سەدامن‌و بەرەو ئوردون ملیاننناوە. لە خاڵەکانی پشکنیندا رادیۆکەیان دەخستە سەر کەناڵێکی نیشتیمانی‌و گۆرانی (کاکە سەدام، خوا بیپارێزێت) یان دەگوت. چەند کاتژمێرێك دوای لێخوڕین بەنێو بیابانی تەختدا، پرسیاریان لە پیاوێکی دەشتەکی کردبوو سنووری ئوردون کامەیەو ئەویش پێی گوتبوون "خانمەکان، ماوەی کاتژمێرێك خاکی ئوردونتان بڕیوە". ئەوانیش دەستیان کردبوو بەقاقای پێکەنین‌و سەیارەکەیان ڕاگرتبوو، دابەزیبوون‌و دەنگی تەسجیلەکەیان تا کۆتا زیادکردبوو و کەوتبوونە کێشانی جگەرەی ڤێرجینیا

سلیمز.

دایکم بەو بیابانە چۆڵەدا هاواری کردبوو "ئازاد بووم، دواجار ئازاد بووم".

بەڵام پوورە لەیلا بەدایکمی نەگوتبوو کەوا مێردەکەشی دەچێت بۆ لایان، بۆیە دایکم بەتەنیا مایەوەو ژیانی دەگوزەراند. کاتێك هەواڵی ڕۆیشتنی دایکم بە سەدام گەیشتبوو، دەستیکردبوو بە قسەپێگوتنی وەك "ئەو ئێرانیە ناپاکە! ئەو ژنە گەوجە". وادیارە هەرگیز نەیبەخشیبێت بۆ ئەو هەڵهاتنەی، بەڵام واشی دانەنابوو شایەنی سزادان بێت.

دوای ئەوەی جەنگەکە کۆتایی هاتو کاتێك دایکم هات بۆ ئەمەریکا بۆ سەردانیکردنم، هەردوکمان خەریکی پرۆسەی جیابوونەوە بووین لە مێردەکانمان. پێمنەگوت فەخری چی بەسەرهێنابووم، لەبەرئەوەی نەمدەتوانیو خۆشی ئەو شتانەی زۆر بەسەرهاتبوو. لەبری ئەوە، باسی داهاتوومان دەکرد. باسی ئەوەم بۆ کرد چەندێك بەلامەوە خۆش بوو ئیش بکەمو بژێوی ژیانی خۆم پەیدا بکەمو شەوانیش بچم بۆ خوێندن. بۆ یەکەمین جار خۆم لێپرسراوی ژیانی خۆم بووم. ئەویش باسی شوقە تازەکەی عەممانو ئەو ڕێستۆرانتەی بۆ کردم کە پلانی دانابوو بیکاتەوە.

بەدڵێکی خۆشەوە پرسیاری لێکردمو گوتی "بۆچی لەگەڵمدا ناگەڕێیتەوە بۆ عەممان؟ دەتوانیت لەوێ زانکۆ تەواو بکەیت. هەندێك خێزانی لێیە کە دڵیان پێتدا چووە داوات بکەن کاتێك زانییان وازت لە فەخری هێناوە".

منیش بەسەر سوڕمانەوە پێمگوت "ئەوە بەڕاستتە، دایکە؟" من دواجار تامو چێژی سەربەستیم کردبوو، بەهیچ شێوەیەکیش دەستبەرداری نەدەبووم. "دەتەوێت جارێکی تریش شوو بکەم؟ دایە، لەگەڵتدا نایەم. لە ئەمەریکا دەمێنمەوەو خوێندن لێرە تەواو دەکەم. ئەگەر لەگەڵت بێم، دەبێت ئەو ژیانە بگوزەرێنم کە تۆ لەمنت دەوێت نەك ئەو ژیانەی خۆم دەمەوێت. دایکە، تکایە وازم لێ بهێنە. لێگەڕێ با بۆخۆم شتێك بکەم، ڕۆژێك دێت بگەڕێمەوە بۆ عێراق. دەمەوێت هاوکاری خەڵکی ئەوێ بکەم. دایکە، وازم لێبهێنە".

چاوەکانی پڕ بوون لە گریان، بەڵام گوتی باشە.

# لەبیرەوەرییەکانی عالیەوە

رۆژێکیان لەکانونی یەکەمی ١٩٨٩دا، سەدام بانگی کردین، کاتێک گەیشتینە شوێنی حەوانەوەی تەماشای تەلەفزیۆنی دەکرد. سەیری ئەو هەواڵەی دەکرد کە ئەمەریکاییەکان پانامایان داگیردەکرد بۆ روخاندنی حکومەتەکەی مانوێل نۆریگا. ئەو گەلێ بێتاقەت بوو بەبینینی ئەو کارە. پرسیارێکی لێکردین "بڕوا دەکەن ئەم ئەمریکییانە چی بە نۆریگا دەکەن؟ ئەوان هاورێی ئەم بوون و ئێستاش وڵاتەکەی داگیردەکەن و لەژێر چنگی دەریدەهێنن". لەڕادەبەدەر بێتاقەت و توڕە بوو لەو کارە.

دواهەمین جار کە بینیم ساڵێك دوای ئەوە بوو لە ٢٨ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠دا بوو. ئەوەش دوو هەفتە پێش هەڵایسانی جەنگی کەنداو بوو. چەند مانگێك لەوەوبەر سەردانی ئەمەریکاملن کردبوو، پێمانوابوو ئەمەریکاییەکان جەنگەکەیان بەڕاست گرتووە. ئێمە نیگەرانی خۆمانمان بۆ دەربڕی. لەبیرمە ئەو شەوە خەریکی راوە ماسی بوو، دەستیکرد بەپێکەنین و گاڵتەکردن بە ئەمەریکاییەکان و هەموو ئامێرە سەربازیی و سەتەلایتەکانیان. پێشبینی جەنگی نەدەکرد. لەڕاستیدا، من راستەوخۆ پرسیارم لێکرد کە ئاخۆ پێشبینی جەنگ دەکات؟ لەوەڵامدا گوتی ئەمەریکاییەکان هێرش ناکەنە سەر عێراق، لەبەرئەوەی ترسیان لە کاردانەوەی عەرەبەکانی تر هەیە. هەروەها بڕوای وابوو سەربازە ئەمەریکاییەکان ناتوانن بەرگەی گەرمای عێراق بگرن.

ئەو شەوە ئیسراحەتی کرد. تەنانەت چێشتی بۆ لێناین و بەرخی ئاخنراوی لەسەر نەریتی عێراقی بۆ ئامادەکردین. باسی ئەوەی دەکرد ئەگەر ئەمەریکاییەکان بوێرن هێرش بکەن چۆن سەرکردایەتی جیهانی عەرەبی دەکات لەجەنگەکەدا. خەوێکی بۆ گێڕاینەوە کە تازە بینیبوی و لەخەویدا لەگەڵ حسێن کامیل بوون و سەگی رەش بە وەڕینەوە دوایان کەوتبوون. لەخەوەکەیدا سەگەکە ویستبووی پەلاماری بدات، بەڵام حسێن کامل بەیەك پێداکێشان کوشتبووی و

سەدامی رزگار کردبوو. گوتی کەوا خەوێکی تریشی بینیوەو لەخەویدا ئەو بەپێوە بووەو هەزارەها مسوڵمان لەدوایەوە نوێژیان کردووە. گوتی، لەو خەوەدا پیاوێکی سەر بەمێزەر (مەبەستی لە کەسێکی ئایینی بوو) رووی تێکرْدووەو داوای لێکردووە پێش نوێژییان بۆ بکات. سەدام لەمێشکیدا ئەو خەوەی وا لێکدابووەوە کە بەرەو ئەوە دەچێت سەرکردایەتی هەموو مسوڵمانان بکات. لەو رۆژگارەدا، بەڕاستی متمانەی بەم خەوانە هەبوو، بەم خەوانە هێزی دەدایە بەرخۆی.

ئەو رۆژەی بەغدام بەجێهێشت، هەروەك ئەوەندەی پێنەچوو جەنگەکەش هەڵگیرسا، وا هەستمدەکرد لە کۆتو بەندی رزگارم بووە. ئەوەش بڕیارێکی ساکار نەبوو. ئەو زۆر تورەبوو کە وڵاتم بەجێهێشت، بەڵام من بەلامەوە گرنگ نەبوو. پێویست بوو بڕۆمو خۆمو منداڵەکانم ئازاد بکەم. لەو ساڵانەدا خۆمم بیرچووبووەوە. پێویستم بەکاتە هەتاکو ئەو فشارە قورسە لەسەر خۆم لاببەمو خۆم رێکبخەمەوە. پێویستم بەکاتە هەتاکو جارێکی تر خۆم لەناخی خۆمدا بدۆزمەوە. ژیانی منو ژیانی چەندەها عێراقی لەناوچووبوو، نەك بەهۆی جەنگی کەنداوەوە بەڵکو بەهۆی خودی سەدام حسێنەوە. ماوەیەکی زۆر بوو خەوێکی خۆشم نەکردبوو بەبێ بوونی ترسو دێوەزمەی سەدام حسێن.

# بوونە نەینەب

لە شەوی کریسمسی ساڵی ١٩٩١دا، ئەو شتە بەنرخانەی خاوەنیان بووم کۆمکردنەوەو سواری شەمەندەفەرێك بووم بەرەو واشنتۆن دی سی. قاڵییە ئێرانیەکەم لەژێر پێمدا دانابوو. بەدەوری کەمەرمدا هەموو ئەو زێڕو زیوانەم هەڵگرتبوو کە دایکم بۆ هاوسەرگیرییەکەم پێی بەخشیبوم لەگەڵ هەموو ئەو پارانەی لەماوەی هەشت مانگی ئیشدا پەیدام کردبوون، چوون وەك کاشێرو فرۆشیارو یاریدەدەری ژمێریار کارم کردبوو. زۆرم سەرما بوو، چاکەتەکەم خەت خەتێکی مارکەی دیۆر بوو لەخۆمەوە ئاڵاندو خەریك بوو خەوم لێبکەوێت. کەسێکی کەساس بووم، بەڵام کەلوپەلی بەنرخ و دەوڵەمەندانەم پێبوو. سوێندم بۆ خۆم خواردبوو هەرگیز جارێکی تر ڕێگە نەدەم هیچ کەسێك ئازارم بداتو خۆیم بەسەردا بسەپێنێت. لەحاڵەتێکدا بووم خۆمم وەك (کەسێکی رزگاربوو) دانابوو، ئەگەر پرسیاریان لێبکردمایە چۆن خۆمم دەبینی، وەڵامەکە بریتی دەبوو لەوەی وەك قەڵایەك وام خەندەق بەچواردەوریدا هەڵکەندرابێت، پاسەوانەکانیشی لەسەرەوە لوولەی چەکەکانیان لەحاڵەتی ئامادەباشیدا دانابێت. وامدانابوو هیچ پەیوەندییەکی ئەویندارى لەگەڵ هیچ پیاوێك نەبەستم. باسی ژیانیشم لە عێراق بۆ هیچ کەسێك نەگێڕمەوە. لەوکاتەدا هیچ کەسێك هیچی نەدەزانی دەربارەی کچە فرکەوانەکەو ئەو هاوسەرگیرییە رێکخراوەی لێی هەڵهاتبووم. ژیانم لەبوژانەوەدا بوو. لەوە بەدواوە هەرشتێکم لەژیانمدا بکردایە تەنها بەویستی خۆم دەبوو. ئەگەر هەر کەسێك پرسیاری لێبکردمایە چۆن گەیشتوومەتە ئەمەریکا، هەمان ئەو وەڵامەم دەدایەوە کە بە پەیامنێری رۆژنامەکەم گوتبوو: بۆ پشوودان هاتمە ئێرە، بەڵام بەهۆی جەنگی کەنداوەوە گیرمخوارد. هەرگیز کەس پرسیاری ئەوەی لێنەکردم بۆچی نەگەڕامەوە.

لە واشنتۆن، ئیشێکم بۆ رەخسابوو وەك یاریدەدەری باڵیۆز لە کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەب، بەڵام کاری لەپێشینەی خۆم بەدەستهێنانی بڕوانامەی زانکۆ بوو.

دوای ئـەوەی گەیشـتمە جـێ، شـوقەیەکی لـەبارم پەیـداکرد، دەکەوتـە ئـادەمز مۆرگانەوە. زۆر بچووك بـوو، بەحاڵـە حاڵ شـوێنی جێگەیـەکی نووسـتن‌و مێزێکی بچووکی تێدا بـووەوە، بـەڵام زۆر کـەیفم سـاز بـوو. هـەر هـەنگاوێکی دەمنـا بـەنێو شـەقامەکانی گەڕەکـە تـازەو هەمەچەشـنەکەی لێـی دەژیـام چێژی تایبـەتی خـۆی هـەبوو. لـەو دەوروبـەرەدا کەسـانی گواتیمـالایی‌و ئەسـیوپیایی‌و تایلەنـدی‌و هاووڵاتیان‌و پەناهەندەکانی تری لێبوو بەسەرگوزەشتەو خواستە بەرزەکانیانـەوە. بانگێشتکرام بۆ ئاهەنگی سەری ساڵ لەگەڵ کۆمەڵە خـەڵکێکی هاوتەمـەنی خـۆم، ئەوە یەکەم ئاهەنگ بوو بەشداری تێدا بکەم‌و کەسـی تێـدا نەناسـم. لەگەڵ ئـەو خەڵکانەدا یاریم دەکـردو پێدەکەنیم کـە هـەرگیز نـەمبینیبوون، تـاکو بەرەبـەیان پێکەوە ماینەوە. لـەماوەی ئـەو چـەند سـاڵەدا ئـەوە خۆشـترین کـاتم بـوو. هەسـتم بەئازادی دەکـردو هـەموو شـتێکی دەوروبـەرم ئـازاد بـوو. کۆمەڵـە کـوڕێکی گـەنج‌و کچانێکی گەنج لەچەند وڵاتێکی جیاوازەوە تێکەڵاوی یـەکتر ببـوون، یـەکێك لـەوان کوڕێکی باڵا بەرزی ڕێکی فەلەستینی – ئەمریکی بوو بەناوی ئەمجەد عەتاڵڵا تازە لە زانکۆی ڤێرجینیا دەرچووبوو لەبەشی بڵاوکردنەوەکانی ڕێکخراوێکی ئـاڵوگۆڕی خوێندکاراندا کاری دەکرد. جوانترین چاوی هەبوو، ئەمدەتوانی چاویان تێنـەبڕم هـەتاکو ئـەو سـاتە چاوی وەهـام نـەبینیبوو. داوای لێکـردم ئەگـەر پێمخۆش بێت لەگەڵیدا بچمە دەرەوە بۆ نانی ئێوارە، بەڵام من بێ دوودڵی ڕەتم کردەوە. پیاو نـا، دەمویسـت مێشـکم سـاف بکـەم‌و بڕوانامـەی زانکـۆ بەدەسـت بهێـنم پاشـان هەڵبژاردنەکانم لەبەرچاو بگرم.

چوومە خوێندنی ئێواران‌و پەیتا پـەیتا لەگـەڵ ئـەو کۆمەڵـە تازەیـەدا ڕاهاتم، یاریمان دەکردو چێشتمان لێدەناو کاتمان خۆش بەسەردەبرد. وەهـا ڕێکـەوت مـن‌و ئەمجەد لەهـەمان بینـادا کارمـان دەکـردو مـن ئۆتـۆمبێلم نـەبوو، لەبەرئـەوە دوای ئیشـکردن ئەگـەر لەگـەڵ هاوڕێیانـدا بچـوینایەتە شـوێنێك ئـەو دەیگەیانـدم. شـەوێکیان هاوڕێیـەکمان وانـەی تایکوانـدۆی پێـدەگوتین، ئێمـەش گاڵتـەو گـەپمان دەکردو بەیەکتری پێدەکەنین کاتێك پەراوەی جوڵەکانمان دەکرد. گەیشتە سەرەی من هەتاکو نمایشی بۆ بکەم.

پێیگوتم "زەینەب، بکێشە بەسنگمدا".

منیش پێکەنیم‌و بەهێواشی مستێکم لێدا.

گوتی "وابەهێواشی نا، قایمتر لێم بدە".

پێکەنیم‌و دانەیەکی ترم پێداکێشا. گوتی "قایمتر".

گوتم "دەترسم ئازارت بدەم". گوتی "نا بڕوام پێبکە وانییە".

دەنگی قایم‌و توند بوو. بەوپەڕی هێزی خۆمەوە کێشام بەسنگیدا. نەجوڵا. هەر دەیگوت "قایمتر، قایمتر". دواجار منیش بەقایمتر لێمدا.

"قایمتر".

چاوم خستە سەری‌و بەڕاستی لێمدا. ئەمجارەیان هەتا توانیم بەقایمی لێمداو بەردەوام بووم لە لێدانی. لەبەرچاوی ئەو هەموو خەڵکەدا کە هێشتا باش نەمدەناسین رقم جوڵاو داخی فەخری لە بۆکسەکانمەوە دەردەچوو. رقم لێی بوو چونکە ئازاری دابووم، رقم لێی بوو چونکە شەرمەزای کردبووم، رقم لێی بوو چونکە دەستدرێژی کردبووە سەرم. دواجار دام لە قوڵپەی گریان‌و لە ژوورەکە رۆیشتمە دەرەوەو هاوڕێ تازەکانم چاودێرییان کردم. لەماوەی کەمتر لە مانگێك لە گەیشتنم بۆ واشنتۆن، ئەناسێك لە خەندەکەکە پەڕییەوەو بەربەستەکانی شکاند. لە ژوورێکی تەنیشتەوە لەنزیك پیانۆیەکەوە بەتەنها دانیشتبووم‌و هەنسکم دەدا کاتێك ئەمجەد هاتە ژوورەوەو لەتەنیشتمەوە دانیشت. دەستی خستە سەر دەستم‌و هیچی نەگوت. نازانم تا چەندێك لەوێ ماینەوە. هەستم بە شەرمەزاری دەکرد کە لەبەرچاوی ئەودا دەگریام، بەڵام ئامادەبوونیشی لەلام بێ ئەوەی قسەبکات هەستێکی ئاسودەیی پێدەبەخشیم. بە ئۆتۆمبێلەکەی گەیاندمیەوە مامەڵەوە بێ ئەوەی هیچ پرسیارێکم لێبکات.

چەند هەفتەیەك دواتر هاتە شوقە بچووکەکەم‌و لەبەرئەوەی کورسیم نەبوو لەسەر ئەرزەکە دانیشتین‌و دەستمان کرد بەقسەکردن. واڕێکەوت رۆژی ڤالانتاین بوو کە ڕۆژێکی پشووە لە ئەمەریکا، ئەویش بەهۆی کارتی پیرۆزباییەوە دەمزانی ئەو رۆژەیە. هاتمە سەر باسکردنی فەخری بۆی، لەبەرئەوەی سەرەڕای سوێندخواردنم کە ڕابردوو وەلابنێم‌و باسی نەکەم، بەڵام ئەمجەد شایەنی ئەوە بوو باسی فەخری بۆ روونبکەمەوە. لەبیرمە تەماشای دەموچاویم دەکرد هەتاکو کاردانەوەیەکی لێ ببیستم وەك رەتدانەوەیەك، شتێك؟ بەڵام لەچاوەکانیدا تەنها

میهرەبانیم دەبینی، بۆیە بەردەوام بووم لە قسەکردن. وردە وردە باسی ئەوەم بۆ کرد فەخری چی بەسەرهێنابووم و لەبەرخاتری چی هاتبووم بۆ ئەمەریکا. ئەویش گوێی گرتبوو. بۆ یەکەمین جار، ئەوەم بۆ دەرکەوت کاتێک بەڕاشکاوی ئەو هەستەی ناخم و ژیانم بۆ کەسێك دەربڕم چ هەستێك دروست دەبێت. لەچەند خاڵێکدا پێدەکەنیم و لە هەندێکی تریشدا دەگریام. سارێژبوون و هێوربوونەوەی پێدەبەخشیم و هێندە ئاسودە بووم هەموو ئەو شتانەم بە ئەمجەد گوت کە بەڵێنم دابوو بەنهێنی بیانپارێزم، بۆ ئەوەی تێبگات دەستکردنەوە بەژیانێکی تازە لەلایەن خۆمەوە چەند بەلامەوە گرنگ بوو.

دواجار گوتم "باوکم فڕۆکەوانی سەدام حسێن بوو. ئێمە هاوڕێی ئەو بووین".

جارێکی تر چاوەڕێی نابەدڵی و ڕەتکردنەوەیم دەکرد. گوتی "سوپاس کە متمانەت پێکردم. لەڕاستیدا ئەوە شەرەفێکی گەورەیە".

پرسیارم لێکرد "ئێستا رقت لێم نییە؟"

گوتی "نا، بێگومان نا. خۆت ئەو ژیانەت هەڵنەبژاردبوو، بەڵکو بۆت هەڵبژێردرابوو. پێموایە ئازایەتییەکی بێ وێنەت نواند کە فەخریت بەجێهێشت. من رقم لێت نییە. شانازی بەبوونە هاوڕێتەوە دەکەم. تۆ تێتگەیاندم عێراقییەکان بە چ بارودۆخێکدا تێپەڕیوون".

گفتی پێدام ئەو نهێنیانەم بپارێزێت و دەمزانی هەرگیز ئەو بەڵێنە ناشکێنێت. متمانەم پێکردو ئیتر پێکەوە کاتمان بەسەردەبرد. کاتێك باسی ئەوەم کرد تامەزرۆی خواردنی عێراقیم، بردمی بۆ ریستۆرانتێکی ئێرانی. کاتێك پێمگوت بیری باوەش پیاکردنی خێزانەکەم دەکەم، بوکەڵەیەکی ورچی بۆ هێنام. کاتێك پێمگوت لەئیشدا ناتوانم پشوی نیوەڕۆ وەربگرم، نانی نیوەڕۆی بۆ دەهێنامە سەر مێزەکەم. تەنها ماوەی شەش هەفتە بوو لە واشنتۆن بووم و ماوەی ساڵێکیش بوو هاوسەرگیرییەکەم کۆتایی پێهاتبوو. سەرەڕای هەموو ئەو بڕیارانەی بەسەر خۆمدا دابوون شتێك هاتە مێشکمەوە، ناشێت کەوتبمە داوی خۆشەویستییەوە. دەمزانی ئەو کارە چەند مەترسیدارە. ئەو سۆزو میهرەبانییەی ئەمجەد مانای چی بوو؟ شەوێکیان دوای تەماشاکردنی فیلمێك لە سینەما لەگەڵ هاوڕێیانداو لەکاتی گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە، داوام لە ئەمجەد کرد ئۆتۆمبێلەکە

رابگرێت بۆ ئەوەی قسەبکەین. درەنگ بوو، لە نیوەشەو نزیک ببووەوە، بەقەراغی پۆتۆماک ریڤەر لە جۆرج تاون پیاسەمان کرد. هێندە سارد بوو هەناسەمان دەبووە هەڵم.

پێمگوت "ئەمجەد، تۆ بەدەر لەباشبوونت لەگەڵمدا هیچ شتێکی تر نەبویت، لەهەموو لایەنێکەوە باش بوویت. نامەوێت دوو دڵ بم، لەبەرئەوە دەمەوێت چەند پرسیارێکت لێبکەم. باشە تۆ لەگەڵ هەموو ئافرەتەکانی دەوروپشتتدا هێندە باشیت، یاخود بەتایبەتی لەگەڵ مندا بەو شێوەیەیت؟ نامەوێت تووشی ئازارو مەینەتی ببم. وەڵامەکەت هەرچییەك بێت بەلامەوە ئاساییە، بەڵام ئەمجەد دەمەوێت لێت تێبگەم. ئاخۆ تۆ تەنها هاوڕێیەکیت، یاخود زیاتری لە هاوڕێیەك؟"

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو بەو چاوە ئەفسوناویانەیەوە تەماشای کردمو گوتی "زەینەب، دەمەوێت تەواوی ژیانم لەگەڵ تۆدا بەسەر بەرم، بۆت دەگونجێت".

هەستم بە خۆشەویستییەکی بێ هاوتا کرد بۆی. ئەوە بەخەیاڵمدا نەهاتبوو ئەو قسانە بکات. باوەشم پێداکردو لەگەرمی ئامێزیدا نوقمی خۆشەویستی بووم. دواترو هەر ئەو شەوەی پێکەوە پیاسەمان کرد پێی گوتم خۆشەویستی من بەدڵیدا چوو بوو. هەستم بەو قوماشە خورییە دەکرد لە ڕوومەتم دەخشاو پێی رانەهاتبووم، خۆزگەم دەخواست بکەومە خۆشەویستییەوەو بتوانم هەموو ئەو پیاوانەی پێشوو لەژیانمدا بسڕمەوە. لێدانی دڵم زیادی دەکرد، بەڵام لەمێشکمدا گوێم لە دەنگێك بوو دەیگوت، زەینەب وریابە. لەسەرخۆ بە. لەمەشدا هەمان هەڵە مەکەرەوە.

لەکۆتاییدا پێمگوت "دەربارەی ئەوەی لەژیانماندا چی ڕوودەدات هیچ نازانم. با جاری هەنگاوێکی بۆ بنێین هەتاکو دوو ساڵ، ئیتر دەتوانین بەتەواوەتی باسی لێوە بکەین".

پرسیاری لەماوەی کاتەکە نەکرد. تەنها گوتی "تێدەگەم". منیش گوتم "هەروەها دەبێت لەچەند شتێك تێبگەیت. ئەمە کارێکی ئاسان نییە بۆ من. لەبەرئەوە نابێت چاوەڕێی ماچکردنو سێکسم لێبکەیت لەبەر ئەو بابەتە. هەروەها ئەگەر کارەکە لەنێوانماندا سەریگرت پێویستە بزانیت من منداڵم

ناوێت". بۆ ماوەیەك سەیری كردمو دەمبینی هەموو ئەو شتانە لەمێشكیدا هەڵدەگرێتو ئامادەكارییان بۆ دەكات.

گوتی "ئەگەر پێویست بكات لەنێوان چەند شتێكدا هەڵبژاردن بكەم، ئەوا تۆ هەڵدەبژێرم".

رقم لەسەرمای ئەو شەوە بوو، بەڵام ساتەوەختێكی جوان بوو. هەتاكو پێیەكانمان سڕ بوون لەوێ وەستاینو یەكتریمان لەئامێز گرت. ئەمجەد هەرگیز پێشبینی ئەوەی نەكردبوو لەگەڵ هاوڕێیەكی سەدامدا بكەوێتە خۆشەویستییەوە یاخود تەنانەت چاویشی پێی بكەوێت. ئەو چالاكوانێكی سیاسی بوو بەردەوام بەشداری لە خۆپیشاندانەكانی دژی سیاسەتی ئەمەریكا دەكرد بۆ پاڵپشتیكردنی سەدام حسێن لە جەنگی ئێران – عێراقدا. لە هەندێك شتدا، ئەو زیاتری دەزانی دەربارەی مێژووی تازەی عێراق لەبەرئەوەی ئێمە راگەیاندنێكی سەربەخۆمان نەبوو، بەپێچەوانەشەوە لەبەرئەوەی هێندە لەنزیكەوە سەدام حسێنم بینیبوو بەلامەوە قورس بوو لە گۆشەنیگایەكی شیاودا دایبنێم. كاتێك منو ئەمجەد قسەمان كرد توشی شۆك بووم بەوەی بۆمدەركەوت هەندێك لەو راستییانەی لەژیانمدا پێمگوترابوونو بڕوام پێیان هەبوو هەڵە بوون. لە ئەمجەدەوە زانیم كە عێراق نەوەك ئێران جەنگەكەی هەڵگیرساندبوو یەك ملیۆن گەنجیش لە هەردوولا بەخۆڕایی ژیانیان تیاچوو بوو. هەرچەندە دایكم هەستی لەدەستدانی ژیانو بێ بەهایی جەنگەكەی بۆ باسكردبووم، بەڵام فێڵو تەڵەكەبازییە گەورەكانی عەمو بەلامەوە سەرسوڕهێنەر بوون. ئەوە هەمووی پلان بۆداڕێژراو بوو نەك بەرگریكردن. ئەمجەد پێیوابوو بە ڕاگەیاندنی جەنگ بۆ سەر ئێران، سەدام لەزۆربەی قۆناغە هەستیارەكانی شۆڕشدا ئێرانی هەژاندو كۆنترۆڵی بۆ سیاسەتمەدارە توندەكان زامنكرد لەوكاتەی زۆرێك لە تاقمی حزبەكان شەڕیان لەسەر كۆنترۆڵكردنی چارەنووسی وڵاتەكە دەكرد. لەڕاستیدا هیچ كام لەمانە سەرسامی نەكردم، بەڵام هەتاكو زیاتر شتم بۆ دەربكەوتایە زیاتر قێزم دەهاتەوە لەو كاتانەی لەگەڵ عەمودا بەسەرم بردبوو. مێشكم دەهاتو دەچوو لەنێوان وێنەكانی ئەمجەدو خۆم لەسەردەمی جەنگی ئێراندا. لەكاتێكدا ئەو لەبەردەم باڵیۆزخانەی عێراق لە واشنتۆن دژی جەنگەكە نارەزایی بەدەموچاوی

هەڵبەستراوەوە دەردەبڕی هەتاکو نەناسرێتەوەو لەلایەن موخابەراتەوە توشی دەردەسەری نەکرێت، من لەخانووی مەزراکەدا جوان خۆم گۆڕیبوو سەرمان پێوە نەبوو لەئاست ئەو پیاوەی ئەو هەموو نەهامەتییەی دروستکردبوو. لەڕێی ئەمجەدەوە حەزمدەکرد زیاتر شت بزانم دەربارەی ئێران. بەهەرحاڵ، ئەی دوژمنەکانمان کێ بوونو بۆچی سەریان هەڵدا؟ ئەی چیرۆکی ژنانی ئێرانی چی بوو، لەشۆڕشدا رۆڵیان چی بوو، لەدوای شۆڕشەوە بەچی حاڵو گوزرانێکدا تێپەڕیبوون؟ ئەمجەد بووە مامۆستاو هاودەمی گیانی سیاسیم. پێمگوت زۆر هەست بەتاوان دەکەم بۆ هەڵبەزو دابەز لە باوەڕی ئاینیمداو دانم بەوەدا نا کە لەدوای جەنگی کەنداو ئەزموونی تاڵی فەخری وازم لە نوێژو تەنانەت رۆژوگرتنی رەمەزانیش هێنابوو.

پێمگوت "زۆر لە خوا تووڕەو زویر بوومو هەستم دەکرد خودا ناپاکی لەگەڵ کردووم". ئەویش گوتی "هەستت بەناپاکی خوا نەدەکرد ئەگەر یەکەمجار خۆشت نەویستایە. دەبوایە پەیوەندییەکت لەگەڵیدا هەبێت هەتاکو هەست بەو رقە بکەیت کاتێك شتێکی ناخۆشت لەژیاندا بەسەرهات، وایە؟"

ئەو کۆمێنتە کە وەك خودی ئەمجەد ژیرانەو میهرەبانانە بوو، بارێکی قورسی سەرشانی لابردمو لەکۆتاییدا توانای پێبەخشیم دەستبکەم بەگەڕانێکی بەرفراوانتر بەدوای لایەنی روحانییدا. جارێکی تر بەو بەشەی ئیسلامی ناساندم کە لەپەیڕەوی کولتورە کۆنەکاندا روون نەبوو، ئەو بەشە جوانەی ئیسلام، بیروباوەڕی دایکم. ئەمجەد لە خانەوادەیەکی سوننە بوو، بڕوانامەی زانکۆی لە ئاییندا هەبوو. تێگەیشتنی لە ئیسلام تەنها لەسەر بنەمای بیروباوەڕ نەبوو، بەڵکو لەسەر مێژوو و زانستی سیاسی هاوچەرخیش بوو. دایكو باوکی لە فەلەستین موڵكو ماڵیان لێ داماڵرابوو سەرەنجام توانیبوویان چەند ئەندامێکی کەمی خێزانەکەیان ناو بەناو رەوانەی خاکی هیوابەخشی ئەمەریکا بکەن. باوکی لە ئاشێك کاری دەکرد لەوکاتەی ئەو خەریکی خوێندنی زانکۆ بوو، دایکیشی لە کافتریای قوتابخانەیەکدا کارگوزار بوو، وردە وردە ژیانیان پێکەوەنا. باوکی بووە وەرگێڕو دایکیشی وەك فرۆشیارێك کاری دەکرد. لەگەڵ ئەوەی لە سفرەوە دەستیان پێکرد، بەڵام توانییان کوڕەکانیان بنێرنە کۆلێژو لەئێستادا هەردوکیان

خوێندکاری دکتۆران.

کەوتبوومە داوی خۆشەویستی کوڕێکی بلیمەتو بێ وێنەوە، دەمتوانی لەگەڵی قسەی بکەم، پێبکەنمو کاتێکی خۆش بەسەربەرم. کۆمەڵە هاوڕێیەکی چاكو ئیشێکی خۆشم هەبوو لەگەڵ ئەوەی یەك ساڵم بۆ هەژمارکرا لەکۆی ئەو سێ ساڵەی لە عێراق خوێندبووم، دواجار توانیم بێمەوە سەر ڕەوتی ئاسایی خۆم بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی زانکۆ. هەموو شتێك بەلامەوە تازە بوو، خۆشم تازە ببوومەوەو هەموو هەنگاوێکم بەئازادییەوە دەنا. ئەوە یەکێك بوو لە خۆشترین کاتەکانی ژیانم.

دوای ماوەیەك لە ئوردنەوە تەلەفۆنێکم لە دایکمەوە بۆ هات. دایکم ترسی لێنیشتبوو. هەموو هەفتە یان دوو هەفتە جارێك بەتەلەفۆن قسەم لەگەڵ دەکرد، بەزۆریش سەختی جیابوونەوەکەی لە باوکمو زیانکردنی لە ئیشی ڕێستۆرانتەکەدا باسو خواسمان بوو. هەرگیز باسی ئەمجەدم بۆ نەکردبوو، دواین شت کە لە دایکمم دەویست ئامۆژگاریکردنی بوو سەبارەت بە هاوسەرگیری. یەکێك لە خزمەکانی ئەمجەد پێی گوتبووم بەنیازە بڕوات بۆ عەممانو منیش ژمارە تەلەفۆنی دایکمم دابویە. لە ئوردون یەکتریيان بینیبوو، بێگومان خزمەکەی ئەمجەد باسی منو ئەمجەدی بۆ دایکم کردبوو.

لە تەلەفۆنەکەدا دایکم بەبێتاقەتی پێیگوتم "ئای خوایە زەینەب، لەگەڵ پیاوێك ژووان دەبەستیت!"

تەنها لەبەرئەوەی لە ئەمەریکا دەژیام، یاساو ڕێساکان نەگۆڕابوون. بەئاشکرایی لەگەڵ پیاوێکدا ژوانم دەبەست گەرچی دەزگیرانیشی نەبووم. ببوومە دێوەزمەی هەموو دایكو باوکە پەنابەرەکان، ژنێکی جیابووەوە لە مێردەکەی بەتەنیاو لەدەرەوەی دابونەریتە کولتورییەکانو لە وڵاتێکی بێگانەدا دەژیام. هەرچەندە دایکم بەوەی نەدەزانی، تەنانەت ڕێگەم بە ئەمجەد دابوو ماچیشم بکات. بەڵام ئەوە دایکمی زۆر نەدەترساند.

گوتی "ئازیزەکەم، بۆچی تا ئێستا پێت ڕانەگەیاندوم؟ تەواو، ئیتر تۆم لەدەستچوو؟"

بۆ هێورکردنەوەی ئازارو خەمەکانی، پێمگوت "دایکە ئارام بە، کێشەی تیا

نییە. ناوی ئەمجەدە. کوڕێکی باشە. زۆر بەخێرایی ئەم شتە روویدا. بەتەمابووم تەلەفۆنت بۆ بکەمو داوات لێبکەم ئەگەر ئاسایی بێت ئەمجەد بێت بۆ ئوردونو داوات لێبکات رەزامەندیت وەربگرێت هەتاکو من بخوازێت".

پاش داخستنەوە، تەلەفۆنم بۆ ئەمجەد کردو پێمگوت پێویستە بڕوات بۆ ئوردونو داخوازیم بکات. زۆری پێخۆش بوو. دایكو باوکیشی زۆریان پێخۆش بوو، هەر رووداوێك رێگە بۆ قەومانی یەکێکی تر خۆشدەکات، ئیتر دوو ساڵی چاوەڕێکردنم کۆتایی پێهات. جارێکی تر، پێداویستییە هەستیو سۆزییەکانی دایکم لەپێش ئەوەکانی خۆمەوە دانابوو. تەلەفۆنم بۆ کردەوە.

پێمگوت "دایکە، شتێك هەیە دەمەوێت بیزانیت. پیرۆزباییم لێت دەوێت، خۆشمدەوێت، بەڵام بەبێ ئەوەش من هەر مێردی پێدەکەم".

باوکم رازیبوو لەگەڵ حەیدەر بڕوات بۆ عەممان بۆ بینینی ئەمجەد. بەخۆشیو شادییەوە دەمڕوانی کاتێك ئەمجەد خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو بۆ خوازبێنیم بە لەبەرچاوگرتنی دابونەریتە کولتورییەکانو بەتایبەتیش رێزگرتن لە خێزانەکەم. دوو هاوڕێی نزیکیشی لەگەڵیدا رۆیشتن تاکو لەبری پیاوی خانەوادەکەی قسە بکەن.

دوای چەند سەردانێك بۆ لای دایكو باوکم هەتاکو بیانناسێت، بەباوکمی گوتبوو "کچەکەتم خۆش دەوێت. دەزانم زۆر مەینەتی چەشتووە. دەمەوێت ئەوە بزانیت هەرچییەك ببێتە مایەی کامەرانی کچەکەت ئەنجامی دەدەم. لەناخی دڵمەوە بەڵێنت پێدەدەم هەتاکو بتوانم باشترین ژیانی بۆ دەرەخسێنم".

ئەمجەد پێیگوتم لەوکاتەی باوکم پیرۆزبایی لێکردبوو، گریابوو. دەمزانی باوکم درکی بەوە کردبوو وەك پارێزکارێك لە رۆڵگێڕانی باوکایەتیدا نوشوستی خواردبوو. جەنگی کەنداو رێگەی پێنەدابوو بێتو رزگارم بکات، تاكو تەنها جێیهێشتبووم هەتاکو خۆم ئاگام لەخۆم بێت. لەئێستاشداو بۆ یەکەمین جار، رازیبوو بەوەی کچەکەی بەمتمانەوە بداتە دەست کەسێك کە لەو چەند یەکتربینینەدا بەدڵیدا چوو بوو رێزی لێگرتبوو، بەڵام ئەو کەسە پیاوێك بوو کە لە جیهانێکی تەواو جیاوازەوە هاتبوو وەك لە جیهانەکەی باوکم. ئەمجەد هێشتا هەر خەریکی فێربوونی عەرەبی بوو، زۆربەی گفتوگۆکانیشیان بە ئینگلیزی بوو.

باوکم پێی گوتبوو "کچەکەمت پێدەبەخشم گەرچی لەژیانمدا لە هەموو شتێك زیاتر خۆشم دەوێت. من ناتوانم لای بمو هاوکاری بکەم، بەڵام تۆ دەتوانی. تەنها داوات لێدەکەم دڵخۆشی بکەیت، متمانەشم پێتە کامەرانی پێبەخشیت. لەبیرت بێت لەپشت هەموو شێرە پیاوێکەوە شێرە ژنێك هەیەو لەپشت هەموو شێرە ژنێکیشەوە شێرە پیاوێك هەیە. ئەمجەد، زەینەب رۆشنایی چاوەکانمە. باش ئاگات لێی بێت".

خۆزگە لەوێ بومایە. خۆزگە بمتوانیایە رابکەمە باوەشی باوکمەوە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەمجەدەوە، من هاووڵاتی ئەمریکایی نەبوومو نەمدەتوانی ڤیزا وەربگرم. هەروەها لەبەر سنوردارکردنی ڤیزا بۆ پیاوی عێراقی لەدوای جەنگی کەنداو بۆ سەردانیکردنی ئەمەریکا، لەخێزانەکەمدا تەنها دایکم دەیتوانی بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەم بێت بۆ ئەمەریکا. سەبارەت بە دابەشبوونی خێزانەکەمان، بەهۆی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن سەدام حسێنەوە بابەتە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان بوون بەچەند لایەنێکەوە، سەرەنجام بەیەکجاری ئەو دابەشبوونەی نێو خێزانەکەمان رویدا کە عەمو دەستی پێکردبوو. نۆ ساڵ تێپەڕیبوو باوکم نەبینیبوو، نۆ ساڵ بوو پێم نەنابووە بەغداو بەئاستەمیش دەمناسینەوە.

ئامۆژگارەکەی ئەمجەد، دکتۆر عەبدولعەزیز بوو لە زانکۆی ڤێرجینیا، رابەرێکی ئاینی یاخود ئیمام بوو، دامانئابوو مارەبڕینەکەمان بەشێوەی ئیسلامی بۆ جێبەجێ بکاتو پارمەتی گرێبەستی هاسەرگیرییەکەمان بکات. پێشتر منو ئەمجەد باسی مارەییەکەمان کردبوو، لەسەر ئەوە رێککەوتبوین شتێکی هێمایی بێتو بریتیبوو لە یەك پارەی ئاسنینی دێرینی قودس.

کاتێك دکتۆر عەبدولعەزیزمان لە بیرۆکەی لە چارلۆتزڤیل بینی گوتی "زۆر باشە، بەڵام زەینەب سەرەڕای مارەییەکەت زۆر مافی ترت هەیە باسی لێوە بکەیت. پێویستە هەموو مەرجەکانیشت بنووسیت".

منیش گوتم "مەرج؟" هیچم نەدەزانی دەربارەی یاساو رێساکانی هاوسەرگیری مسوڵمانان. کاتێك مێردم بە فەخری کرد، تاکە شتێك دەمزانی بریتیبوو لە مارەییو پارچە کاغەزێکیش لەبەردەستم دانراو ئیمزام کرد.

دکتۆر عەبدولعەزیز ئاهێکی هەڵکێشاو بەدەنگێکی نەرمو لەسەرەخۆوە گوتی "بەداخەوە، ئەمە کێشەیەکی زۆر باوە. خەڵکی یاسای ئیسلام نازانن و وادادەنێن پیادەکارییە کولتورییەکان لە ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە. تۆ زۆر مافی ترت لەسەرو مارەییەکەتەوە هەیە داوایان بکەیت. کاتێك لەئیسلامدا ئافرەتێك مێرد دەکات مافی ئەوەی هەیە داوای جێبەجێکردنی هەموو ئەو مەرجانە بکات کە دەیەوێت لە هاوسەرگیرییەکەیدا بۆی دابین بکرێت. پاشان ئەگەر پیاوەکە رازی بوو بەو مەرجانە دەبێ ئیمزایان بکات. ئەمەش دەرفەتی تۆیە هەتاکو هەر مەرجێکت هەیە بیخەیتە بەردەست وەك بەشێك لە گرێبەستی هاوسەرگیریت لەگەڵ ئەمجەد دا.

"هەرچییەکم بوێت؟"

لەوەڵامدا گوتی "هەرچییەك، هەر لە گوزەراندنی چۆنیەتی شێوازی ژیانت هەتاکو دەگاتە ئەو شێوازەی منداڵەکانتی لەسەر بەخێودەکەیت". ئەوە جۆرە رێککەوتنێکی بەڵگەنامەیی و گرێبەستی هاوسەرگیری بوو. ئیمامەکە لەسەر جێگاکەی هەستاو گوتی "زەینەب، ئەمە کۆمپیوتەرەکەمە، هەر مەرجێکت هەیە بۆ گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەت بینووسە. ئەگەر ئەمجەد رازی بێت، ئەوا دەبێت پەیرەویان بکات و لێدەرچوونی نییە. بەختێکی باش". بەجێی هێشتین.

ئای خوایە، نەمدەزانی چی بکەم! تازە کۆمەڵە مافێکم بۆ دەرکەوتبوو لەوەوپێش هیچ کەس بۆی روون نەکردبوومەوە کە وەك ژنێکی موسوڵمان ئەو مافانەم هەبوو. ئەوەش شتێکی تر بوو لە عێراق پێمان نەگوترابوو! ئاخۆ تاچەند ژنان ئەمەیان دەزانی؟ تەنانەت دایکیشم ئەمەی نەدەزانی لەگەڵ ئەوەی تازە کۆتایی بە جیابوونەوەکەی هاتبوو! کاتێك مێردم بە فەخری کرد ئەگەر ئەمانەم بزانیایە لەبری ئەوەی لەماڵەکەدا بهاتمایەو بچوومایەو گوێڕایەڵی بوومایەو ببوومایەتە ژنێکی باش بۆی، ئەوا ئەوکاتە دەمتوانی تەماشای گرێبەستەکەم بکردایەو بمگوتایە ئەمەتا، تۆ ئەمەت ئیمزا کردوەو بەنووسین ئەو بەڵگەیەم لەبەردەستدا دەبوو کە ئەو هەموو بەڵێنەی پێدابووم پێش ئەوەی مارە بکرێین.

ئەوکاتە نەمدەزانی چۆن کۆمپیوتەر بەکاربهێنم و شت بنووسم. لەبەرئەوە من قسەم دەکردو ئەمجەدیش دەینووسی.

گوتم "نابێت ڕێگری هەر پیشەیەکم لێبکەیت یان ڕێگەی خوێندنم لێبگریت". دوای ئەوەی کلیکی دوا وشەی کرد لەسەر کیبۆردەکە، ئەمجەد گوتی "رازیم". زۆرم پێخۆش بوو، ئەویش تەماشای منی دەکردو زۆر خۆشحاڵبوو.

"پێویستە پەنجا بەپەنجا ئیش‌و کاروباری ناومالْم لەگەلْدا بکەیت. پێویستە نیوەی چێشتەکان تۆ لێی بنێیت، پێویستە نیوەی پاککردنەوەکان تۆ بیکەیت، پێویستە ..."

گوتی "پێش ئەوەی کەسك لێدان زیاد بکەیت، پێتوانییە کە دەلێیت هەموو ئیشی ناومالْ ئەمانەی هەمووی تێدایە؟"

بەدوودلْییەوە گوتم "هەم، باشە". ئەو مەبەستێکی هەبوو، بەلاّم من هەر مەرجێکی ترم بەخەیالْدا هات نووسیم. نەمویست هیچ شتێك بەجێبهێلْم.

لە کۆتاییدا گوتم "گرنگترین شت ئەوەیە دەمەوێت مافی دەستپێشخەری جیابوونەوەم هەبێت". ئەویش گوتی "بێگومان"و نووسی.

لەناخمدا گوتم، ئای خوایە ئەمە بەڕاستی سەریگرت. گوتم "لەئێستادا هیچی تر بەخەیالْمدا نایەت". ئەویش گوتی "باشە، هەرکات بتەوێت دەتوانیت خالْی تر بۆ ئەم گرێبەستە زیاد بکەیت".

دواترو هەر لەو رۆژەدا لە مالْی دکتۆر عەبدولعەزیز بۆنەیەکی ئاینی بچووکمان گێڕا بەئامادەبوونی خێزانی ئەمجەدو دایکم‌و چەند هاوڕێیەکی تریش کە لەو رۆژەوەی من‌و ئەمجەد یەکتریمان بینیبوو پێکەوە بووین. ئەو ئێوارەیە ئارامم نەمابوو هەتاکو گرێبەستەکە پیشانی دایکم بدەم. سەربەرز بووم کە شتێکی هێندە گرنگ فێرببم‌و پیاوێکی وەها نایاب‌و پشتیوانکارم هەبێت.

دایکم پێی گوتم "بەلاّم زەینەب ژن مافی ئەوەی نییە مێردەکەی تەلاّق بدات. یەکەمجار دەبێت پیاوەکە بەجیابوونەوەکە رازی بێت".

منیش پێمگوت "گرنگ ئەوەیە لەگرێبەستەکەدایە. کەس پێی نەگوتبووین ئەو مافەمان هەیە".

پێداگری لە قسەکانی کردو گوتی "شیرینەکەم، ئەگەر وەهاش بێت، بەڕاست دەتەوێت ئەم هەموو مەرجانە لەگرێبەستەکەدا هەبێت؟ سەرەنجام خۆ ناتەوێت هاوسەرگیرییەکەت لەگەلْ ئەمجەد بخەیتە بەرمەترسی".

"دایکە، ئەوە چیت بەسەرهاتووە؟ بەڕاست پێشنیازی ئەوەم بۆ دەکەیت دەست لەو مافانە هەڵبگرم کە ڕەنگە لەگەڵ فەخری هاوسەرگیرییەکەی بپاراستمایە ئەگەر لەگرێبەستەکەماندا هەبوایە؟ تێناگەم! بۆچی؟"

زۆر بێتاقەت بووم. چی بەسەر هاتبوو؟ هەرگیز پێمنەگوت فەخری چی بەسەرهێنا بووم. یەکەم، لەبەرئەوە بوو تووشی جەنگ هاتبوون و دایکم توشی دارمانی دەروونی ببوو. پاشانیش بەهۆی جیابوونەوەی لە باوکم. بەڵام ئەگەرچی ئەو بەسەرهاتی دەستدرێژییەکەی نەدەزانی کە فەخری بەسەری هێنابووم، بەڵام وادەردەکەوت کەسێکی جیاواز بێت لەو ژنە بەهێزو متمانەدارەی دەمناسی.

"زەینەب، داوای لێبووردن دەکەم. چی دەکەیت بیکە. داوای لێبووردن دەکەم هەرچییەکم گوتبێت".

"دایکە، مەسەلە هەر گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە نییە. لەو کاتەوەی لێرەیت، ئامۆژگاری چێشتلێنان و ماڵداریم دەکەیت. جاران بەخۆتت دەگوت ژنێکی بەهێزو متمانەبەخۆ بوویت، بەڵام دایکە هەستدەکەم گۆڕاویت. لێت تێناگەم".

دوای چەند مانگێک لە سەردانی ئەمجەد بۆ بینینی دایکم لە عەممان، لەوماوەیەدا دایکم لەبەر هۆکاری دارایی بەتەواوەتی وازی لەکاری ڕێستۆرانتەکە هێنابوو گەڕابووەوە بۆ بەغدا کە هیچ نەبێت شوێنێکی هەبوو تاکو بەخۆڕایی تێیدا بژیت. بەڵام ئەو کۆمەڵگایەی بۆی گەڕابووەوە لەچاو ساڵەکانی حەفتاکان و هەشتاکاندا بۆ ژنێکی زگورد ئاسان نەبوو، بەتایبەتیش ژنێکی جیابووەوەی تەمەن مامناوەند. ئاهەنگی نانخواردنی ئێوارەی سازدەکردو بانگێشتی ئەو ژن و مێردانەی دەکرد کە دەیناسین، ئەویش بۆ سەرزەنشتکردنی ئەو ژنانەی پێیان وابوو بۆ ژنێکی تەڵاقدراو گونجاو نییە ئاهەنگی ڕەشبەڵەک سازبکات. هاوڕێیەتی لەگەڵ هەندێك هاوڕێی کۆندا تازە دەکردەوە، بەڵام لە جیاتی هەڵپەڕکێ و دانسکردن خۆی و هاوڕێکانی قورئانیان دەخوێندەوەو گفتوگۆیان لەسەر دەکرد.

دایکم پێی گوتم "هەندێك لە هاوڕێکانم گلەییان لەمن دەکرد بۆ جیابوونەوەکەمان چونکە من لەپێشدا داوای جیابوونەوەم کرد. دواجاریش کە بیری لێدەکەمەوە پێدەچێت هەڵەم کردبێت. ڕەنگە وا باشتر بوایە لەگەڵ باوکت بمابامەوە".

بەتوندی باوەشم پێداکردو گوتم "دایکە، بێهیوا مەبە. دەبێت بەهێز بیت. تۆ قەشەنگیت. رەنگە هاوسەرگیرییەکەت لەگەڵ باوکمدا هەر روو لەباشتر نەبوایە، بەڵام کەسێکی تر دەدۆزیتەوە".

"پێموانییە وابێت، خۆشەویستەکەم. چیتر بڕوام بەو ئامۆژگارییە نەماوە کە لەسەر خۆشەویستیو هاوسەرگیری پێمدەدایت. چیتر متمانە بەخۆشم ناکەم. پێدەچێت ئەوەی فێرم کردیت تاکو ببیتە ژنێکی بەهێز هەڵە بووبێت. رەنگە وا باشتربێت ببیتە ژنێکی باش".

چاوی بڕیبووە ئەرزەکەو بەهیچ شێوەیەك تەماشای چاوی نەدەکردم.

دوای چەند مانگێك، دایکم هاتەوەو ئەو عەزییەی بۆ هێنابووم کە بۆی دروست کردبووم، عەزییەکی سپیو ئاڵتونی بوو بەشیعری دڵداریو ناوی ئێمە رازاندبویەوە. لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٣دا منو ئەمجەد هاوسەرگیریمان ئەنجامدا. خێزانی ئەو بۆنەکەیان رێکخست، لەدابونەریتی موسوڵمانەکانی عێراقدا خانەوادەی زاوا میوانداری ئەو بۆنەیە سازدەکەن. منو ئەمجەد بۆ شەوی گواستنەوەکەمان ئوتێلمان بەکرێ گرتو پێش هاتنی ئەو شەوە منو دایکم لەئوتێلەکەدا خۆمان گۆڕی بۆ ئاهەنگەکە. ئەو رۆژە زۆر جوان بوو. قژی یەکترمان دادەهێناو پێدەکەنین کاتێك ئەو خانمەی بۆ رازاندنەوەمان دانرابوو هاتە ژوورەکەمانەوە، پێیوابوو ئێمە خوشکین. کاتێك رۆیشت، هێشتا رۆبی حەماممان لەبەردابوو دەستم کردە ملی دایکمو پێدەکەنین "ئێمە دوو خوشکین!"

لەکاتێکدا دایکم یارمەتی خۆگۆڕینەکەی دەدام، نیگەران بووم لەوەی عەزییەکە سنگەکەی زۆر رووت بوو.

نێوچەوانی ماچ کردمو گوتی "نۆ، ئازیزەکەم، گوێی مەدەرێ. ئاهەنگی گواستنەوەکەتو ژیانت بەخۆشی بەسەربەرە. خۆشم دەوێیت، شیرینەکەم. ئەمجەد پیاوێکی باشە. باش ئاگات لێی بێتو دڵخۆش بە. هەرگیز ئەوەت لەیاد نەچێت! دڵخۆش بیت".

ئەو رۆژە زۆر دڵشادبووم. بەڕاستی دڵخۆشبووم. دایکم خۆی لە بووك دەچوو، هەمووکەسێك باسی جوانییەکەی دەکرد. بەلامەوە وەك جاران دەگەشایەوە. ئەوە دایکم بوو، عالیەی شۆخو شەنگ. گوێم لە پێکەنینەکەی بوو لەناو ئەو

خەڵکەداو کاتێکی خۆشی بەسەردەبرد. گواستنەوەکەم باشترین ئاهەنگ بوو کە تاکو ئەوکاتە ئامادەی بووبم لەگەڵ ئەوەی بەڕاستی زۆریش گوێم پێنەدەدا. بەتایبەتی زۆربەی کاتەکەم بەسەما لەتەك ئەمجەد بەسەربرد کە ڕەنگدانەوەی ئەوەبوو چەندە خۆشمدەویستو چەندە بەختەوەر بووین.

ورده ورده، لەڕووی سێکسیشەوە متمانەم پێکرد هەڵبەت بێگومان دەیزانی متمانەم پێیبوو. ئەمجەد سارێژکارو ئارامگرترینو تێگەیشتوترین کەس بوو لەژیانمدا چاوم پێی کەوتبێت. جاری واهەبوو لە شوقە بچووکەکەمدا بۆ چەندین سەعات بەپێوە یەکتریمان ماچ دەکرد بەشێوەیەك قاچم دەکەوتە لەرزین، بەڵام دەترسام رابکشێمو شوێنێکیش نەبوو لێی دابنیشین. دواتر پێکەوە رادەکشاینو بۆ چەند کاتژمێرێك لەئامێزی دەگرتم هەتاکو خەومان لێدەکەوت. شەوێکیان، کاتێك گۆرانی "لەیادنەچوو"ی گۆرانی بێژان ناتالو نات کینگ کۆڵ ئیشی دەکرد، قسەی بۆ دەکردمو دەستی لێدەدام، ئیتر خۆمدا بەدەستەوەو بەلایەکی تری ئازارەکەمدا بردمی، واتە دواجار لەو قسانەی دایکم تێگەشتم کە لەسەر مێزی نانخواردنی چێشتخانەکە باسی دەکرد.

ئەمجەد خەریکی ساڵی یەکەمی خوێندنی دکتۆراکەی بوو لە زانکۆی ڤێرجینیا کە بەئۆتۆمبێل دوو کاتژمێر دوور بوو لە واشنتۆنەوە. تەمەنم بیستو سێ ساڵ بوو، بە ڕۆژ دەوامی تەواوم دەکردو شەوانیش دەمخوێند. هاوسەری یەکتر بووین، شتێکی لۆژیکیش بوو پێکەوە بژین، بەڵام هاتوچۆکردن بەهیچ شێوەیەك ڕێی تێنەدەچوو لەوەش ترسابووم ئەگەر واز لە ئیشەکەم بهێنمو لەگەڵ ئەودا بژیم ئەو دەستکەوتانەم لەدەستدەدا کە بۆ دەستبەسەرداگرتنی چارەنوسم دەستەبەرم کردبوون. زۆر بەزوویی پیاوی خەونەکانم بەدەستهێنابوو.

بەم شێوەیە ئاگادارم کردەوە "دەتوانم لە چارلۆتزڤیل لەگەڵتدا بژیم، دواتر توشی خەمۆکی ببمو جێتبهێڵم، یاخود دەتوانم لە واشنتۆن بمێنمەوەو لە پشووی هەفتەکاندا بتبینمو کامەران بم". ئەویش ئەو هەڵبژاردەی دووەمیانی پەسەندکرد، لەبەرئەوە لە ڕۆژانی پشووی هەفتەکاندا یەکتریمان دەبینی.

بۆ پایزی داهاتوودا بەشێوەی فول تایم لە زانکۆی جۆرج مەیسن دەمخوێندو بڕیارمدا بەشی سەرەکی خوێندنەکەم (خوێندنی نێودەوڵەتیو ژنان) بێت. لێرەدا،

هیچ نەبێت دەرفەتێکم هەبوو بەدڵی خۆم شت بخوێنمەوەو ئەوەی دەمویست بیڵێم. دەربارەی فێمینیزم شت فێربووم‌و بەلامەوە سەیربوو هەتاکو ئەوکاتە هێشتا ژنانی رۆژاوا لە هەوڵ‌و تێکۆشاندا بوون بۆ بەدەستهێنانی هەندێك ماف، وەك مووچەی یەکسان بەرامبەر کاری یەکسان کە لەزۆرێك لەو وڵاتانەی پێیان دەگوترا وڵاتە (پێشکەوتووەکان) گەرەنتی درابوو. لەیەکێك لەوانەکانمدا شتێك فێربووم کە هەرگیز لە کۆبوونەوەی خێزانیدا نەمبیستبوو: ستالین فەرمانی بە سەربازە روسییەکان کردبوو هەتاکو دەتوانن ژمارەیەکی زۆری ژنانی ئەڵمانی لە جەنگی جیهانی دووەمدا لاقە بکەن. زانیم هۆلۆکۆست چییە، زانیم بزووتنەوەی دژە کۆیلایەتی لە ولایەتە یەکگرتووەکاندا چییە، زانیم بزوتنەوەی دژی جیاکاری رەشپێستەکان لە باشوری ئەفەریقادا چییە. تەواوی تێروانینم بۆ جیهان لەگۆڕاندا بوو. لەبەرئەوەی لە ناوچەیەکی ئەوپەڕی دیکتاتۆریەتدا گەورە ببووم توانای تێگەیشتنم لە بنەمای گۆڕانکاریی جیهانێك بەو گوژمە نەبوو کە دادپەروەری بەربەرەکانێی نادادپەروەری دەکردو کار لەگەڵ کردەوەو گۆڕانکارییە سیاسییەکان لەگەڵ گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان‌و یەکسانی جێندەری لەگەڵ جیاکاری جێندەری‌و چاکە لەگەڵ خراپە بەردەوام شەڕی یەکترییان دەکرد. ئەوە فێربووم گەلانی تریش زەبروزەنگ‌و چەوسانەوەیان بینیبوو، بەڵام رزگاریان ببوو. نەتەوەکانی تر ستەمکارەکانیان روخاندبوو، لێرەوە هەموو ئەمانە هیوایان پێدەبەخشیم.

ئەمجەد ئەو کتێبانەی دەدامێ کە دەیزانی یارمەتی تێگەشتنم دەدەن لەو جیهانەی تاکو ئەوکاتە بۆ من سنووردار کرابوو. چەند شێوازێکی زەبروزەنگ‌و زۆرداری سەدام حسێنم بینیبوو بۆمدەرکەوت ئەم شێوازانە لای هەموو دیکتاتۆرەکان باو بووە بە هیتلەرو ستالینیشەوە هەروەك بینیبووشم سەدام کارەکانی ئەوانی دەخوێندەوە. عێراقی سەدام حسێنم لە رۆمانی (١٩٨٤)ی جۆرج ئۆروێلدا بینی‌و هەستم بەترسناکی عەمو دەکرد لە رۆمانی Heart of Darkness (دڵی تاریکستان)ی جۆزف کۆنراددا. کتێبی (کۆماری ترس)ی کەنعان مەکیەم خوێندەوەو زیاتر ترسناکی سەدام حسێنم بۆ دەرکەوت کە لە عێراق چی ئەنجامدابوو، خوازیاربووم بزانم کە دایك‌و باوکم هیچ شتێکیان لەو بارەیەوە

دەزانی یان نا. دواجار لەو کتێبەوە بوو تێگەشتم شەپۆلی بەزۆر ئاودیوکردنی شیعەکان کە دایکم لێی دووربوو، یەکێك بوو لەسەرەتای ئەو ئۆپراسیۆنانەی پاکتاوی رەگەزی کە لەلایەن سەدامەوە جێبەجێ دەکرا. ماکیە، وای خەملاندبوو دوو سەد هەزار شیعە دیپۆرت کرابوون بێجگە لەو هەزارەها خێزانانەی چەشنی مالی فەخری کە بۆخۆیان هەلهاتبوون.

ئەو شالاوە لە راگەیاندنی رۆژاوادا هێندە فەرامۆشکرابوو تەنانەت ئەمجەدیش نەیبیستبوو وەك ئەو پشتگوێخستنەی کە سەدام بەپالپشتی دارایی رۆژاوا شەڕی ئێرانی دەکرد.

هەموو ئەم زانیارییانەم کۆکردەوە، بەلام بێجگە لە ئەمجەد بەکەسی ترم نەگوت. بەلای منەوە ئەو زانیارییانە تایبەتیو ئەکادیمی بوون. هەرگیز پەیوەندیم بە پارتێکی ئۆپۆزسیۆنەوە نەکردبوو چونکە ئەگونجا ئاکامی خراپی بۆ سەر خێزانەکەم هەبایە. هەروەها بەتەواوەتی دژی گەمارۆ ئابورییەکان بووم کە زۆرێك لە عێراقییە دوورخراوە ناحەزەکانی رژێم پشتیوانییان لێدەکرد. بڕوام بەبیرۆکەی گەمارۆی ئابووری نەبوو مەگەر خەلکە چەوساوەکە خۆی داوای بکردایە وەك ئەو حالەتەی لە ولاتی باشوری ئەفەریکا روویدا. دەمزانی هەر گەمارۆیەکی ئابووری کە بەسەر عێراقدا بسەپێنرایە عێراقییەکانی بێبەشدەکرد لە خواردنو دەرمان لەولاشەوە عەمو هەر دەولەمەندتر دەبوو. عەمو هەرگیز نەهامەتی نەدەچەشت، بەلام ئەو ئەشکەنجە لۆژیکییە لەپشت گەمارۆکانەوە بوو ئەوەبوو کە عێراقییەکان هێندە نارەحەتی بچێژن هەرچی چۆنێك بێت راپەڕنو سەدام لە کورسی دەسەلات بهێننە خوارەوە. پێموابوو ئەمە بێ شەرمیو بێ ئابڕوویی بوو، دلڕەقی بوو، زۆر دوور بوو لە بیری راستەقینەی تێکڕای خێزانە عێراقییەکان. ئەو سەدامەی من دەمناسی زۆر باشتر لە گەلەکەی تێگەشتبوو لەچاو ئەوانەی سەپاندنی گەمارۆیان بۆ سەری بەباش دەزانی. پێش ئەوەی عێراق بەجێبهێلم، گومانم لەوە هەبوو کە بەدەستی ئەنقەست خۆراکی جۆراوجۆری بەسەر مارکێتە جۆراوجۆرەکاندا دابەش دەکرد هەتاکو خەلکی رۆژەکەی بە کۆکردنەوەی ژەمەخۆراکێك بەسەر بباتو کاتی نەبێت بۆ گیروگرفت نانەوە. ئەو کاتە زانیم کە چەند بەخراپی ئەشکەنجەی ئەوانە دەدا کە لە دژی

راپەڕیبوون. بێگومان ئەوەش کتومت ئەو کارەبوو کە ئەنجامیدا، واتە دەوڵەمەندکردنی خۆی بوو لەپای فرۆشتنی نەوتی عێراق لە بازاڕی ڕەشداو دابەشکردنی خواردنی خراپ بەسەر شیعەکانی باشورداو دزینی کارەباو ئاوو گوندەکانیانو زیاتریش بە لەناوبردنی خەڵکەکەیان.

تەنها لەبەرنەوەی لە ئەمەریکا بووم هەستم بەسەلامەتی نەدەکرد. هەموو عێراقییەك دەیزانی موخابەرات لەسەرتاسەری جیهاندا سیخوڕی هەبوو. زۆر بەسەرهاتی عێراقییەکان لە تاراوگە هەبوو کە لەماڵەکانی خۆیاندا هێرشیان کرابووە سەرو کوژرابوون، بەجۆرێك، ڤیدیۆیەك وێنەی لاقەکردنی خوشکی بەرهەڵستکارێکی تۆمارکردبوو کە لە تاراوگە دەژیاو وەك هەڕەشەیەك بۆی نێردرابوو. بەڵام ترسی من هاوشێوەی زۆرێك لە عێراقییەکان تەنها لەبەر هەبوونی بەڵگەیەك نەبوو لەسەرمان.

بەتەواوی بەهەموو بەشەکانی جەستەو مێشكو گیانمەوە لە سەدام دەترسامو ئەو ترسە لە ئەندامەکانی لەشمدا بەهیچ لەونێ لێم دورنەدەکەوتەوە، لە ساتە ئاسودەکانی هاوسەرگیرییەکەشمدا لە ڤێرجینیا هەر لەگەڵمدا بوو. ئەمدەویست بیر لەوە بکەمەوە چەندێك لە عەموەوە نزیك بووم. هەندێك جار ترس وەك بەشێك لە لاشەم دەهاتە پێش چاو، وەك خانەکانی لەشم، وەك خوێنم. لەوە دڵنیام هاوڕێکانم منیان بەلاوە سەیر بوو. جارێکیان چووم بۆ ماڵی هاوڕێیەکمو بتڵێك لە ویسکی شیڤاز ریڤاڵم بینی، داواملێکرد لایبات لەبەرچاوم. کاتێك میوانم دەهات ئەگەر هەرکەسێکیان باسی سیاسەت یان تەنانەت غەیبەتی کەسێکیان بکردایە دەنگی تەسجیلەکەم زیاددەکرد. شەوێکیان، بەڕێکەوت چەتاڵەکەی عەموم بۆ میوانەکان بەکارهێناو کاتێك هاوڕێیەکی میسریم هەڵیگرتو لە نیشانەکەی سەری وردبووەوە لە دەستیم فڕاندو جارێکی تر بەکارمنەهێنایەوە. هەڵەیەکی بێباکانەم کرد. چۆن رونم بکردایەتەوە بەچ چەشنێ ئەو چەتاڵە گەیشتبووە دەستی من؟ چۆن بمتوانیایە بۆ دەسەڵاتدارانی ئەمەریکایی روونبکەمەوە باوکم ئەو کەسە بوو کە بازرگانە گەشتیارە عێراقییەکانی بە فڕۆکەکەی گەیاندە تاران بۆ پاراستنی سەلامەتییان لەکاتی جەنگی کەنداوداو دایکیشم کرێمی نەرمکردنو شێدارکردنی دابووە سەدام کاتێك

گوتبوی پێستی دەموچاوی وشکە؟ بەدەر لە ئەمجەد هیچ کام لەم شتانەم بۆ هیچ کەسێکی تر باس نەکردبوو. ئەگەر باسمان بکردایە، هەردەم پێم دەگوت (عەمو) لەبەرئەوەی تەنانەت لەماڵی خۆشماندا دەترسام بەئاشکرا پێی بڵێم (سەدام حسێن). هەرگیز بەشداریم لە کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا نەدەکرد کە دەربارەی عێراق با. هەرگیز لەخوێندنەکەشمدا لەسەر عێراق هیچم نەدەنووسی. پاش ماوەیەك، ژمارەیەکی کەمی خەڵك لەوبارەیەوە پرسیاریان لێدەکردم. ملیۆنەها عێراقی دەیەها ساڵ بوو لە ئازارو دەردەسەریدا بوون و ئەو باجەیان لەبەر زوڵم و زۆرداری پیاوێك دەدا کە نزیکەی هەموو کەسێك خوازیاری روخاندنی بوو. ئەمەریکاییەکان لە گێروگرفتەکانی تردا دەهاتنە سەر خەت.

ماوەی شەش مانگ بوو لەگەڵ ئەمجەد دا هاوسەرگیریمان کردبوو کاتێك لە گۆڤاری (تایم)دا بەسەرهاتێکم خوێندەوە دەربارەی (کامپەکانی لاقەکردن) لە بۆسنیا – هێرزیگۆڤینیاو کرواتیا، کە ژنان تیایدا دەستبەسەر کرابوون و وەك باسدەکرا بە رۆژو بەشەو لەلایەن سەربازە سربیەکانەوە دەستدرێژی سێکسیان دەکرایە سەر. وێنەیەکی تێدابوو ژنان لەسەر شتێکی وەك قەرەوێڵەی نەخۆشخانە دانیشتبوون. هەندێکیان جەوان بوون و وادەردەکەوت هەندێك لەو ژنانە دایکیان بن. شتێك لە لاپەڕەکانی ئەو گۆڤارەدا دەستبەجێ ئازارێکی وەها بەسوێی لەناخمدا چاند کە دەستمکرد بەگریان. ئەمجەد لەگەڵ هەندێك برادەردا لە چێشتخانەکە خەریکی ئامادەکردنی خواردنی ئێوارە بوون و بەڕاکردن هاتەلام و دەیویست بزانێ چیم بەسەر هاتبوو. چیرۆکەکەم پیشانداو لەو دەمەی هەوڵی هێورکردنەوەی دەدام و چیرۆکەکەی دەخوێندەوە پێمگوت دەبێت شتێك بکەین "پێویستە شتێك بکەم بۆ یارمەتیدانی ئەم ژنانە".

رۆژی دواتر چووم بۆ کتێبخانەکەو هەتاکو توانیم بەنێو کتێبەکاندا گەڕام بۆ دەستکەوتنی زانیاری دەربارەی ناوچەکە. پێویستبوو بزانم ئەو شوێنە لەکوێ بوو، خەڵکەکانی کێ بوون، مێژووەکەی چی بوو، شەڕەکە لەبەر چی بوو. نازانم چی پاڵنەرم بوو، لاقەکردنەکەم، تێگەیشتنم لەوەی ژیان لەکاتی جەنگدا چۆنە، رق و کینەم لە نادادپەروەری کۆمەڵایەتی یاخود تەنها لەبەر ئەو گریمانەیە بوو تاکو بتوانم شتێك بکەم بۆ یارمەتیدانیان، بەڵام واهەستمدەکرد ئەرکێکم پێ

سپێردرابێت. دەفتەری ژمارە تەلەفۆنەکانم دەرهێناو پەیوەندیم بە گروپەکانی ژنانەوە کرد تاکو خۆبەخشانە یارمەتی پشتیوانیکردنی پرۆژەکانیان بکەن لە بۆسنیاو کرواتیا. بۆ نەگبەتی من، هیچ رێکخراوێکم نەدۆزییەوە ئیش لەگەڵ ئەم ژنانەدا بکات. ژنێکیان پێی گوتم "شەش مانگی تر تەلەفۆنمان بۆ بکەرەوە. رەنگە ئەوکاتە شتێکمان بۆ بکرێت". شەش مانگ؟ چۆن بمانتوانیایە شەش مانگ چاوەڕێ بکەین بۆ وەڵامدانەوەی ئەو لاقەکردنە بێشومارە؟ لای خۆمەوە ئەوکاتە زانیم خەڵکی باسی نەگرتنەبەری رێوشوێنیان دژی هۆلۆکۆستی نازییەکان دەکرد بەبیانوی ئەوەی نەیانزانیبوو. کەس نەیدەتوانی ئەو قسەیە بکات سەبارەت بە بۆسنیا. سەدەها هەزار هاووڵاتی مەدەنی بۆسنیو کرواتی لەجینۆسایدێکدا دەکوژران و بەشێوەیەکی کرداری ئەو کارە ئەنجام دەدراو لەسەر تەلەفزیۆن پیشاندەدرا. بیست هەزار ژن لاقە کرابوون. چۆن رێگەدرابوو ئەمە رووبدات؟ باشە چ بیانویەکمان هەبوو بۆ نەگرتنەبەری رێوشوێن؟

شەوێکیان لەقاوەخانەیەکدا، ئەو بیرۆکەیەی لەمێشکمدا بوو بە ئەمجەدو ئەیادی برایم گوت. ئەویش بریتیبوو لە جۆرە پرۆگرامێکی نێودەوڵەتی کە تێیدا خێزانەکان دەبوونە سپۆنسەری منداڵان و پێکەوە باسی ئەو بابەتەمان کرد. لەهەمان کاتدا دەکرا پرۆگرامێك رێکبخرێت و تیایدا یەك ژن سپۆنسەری قوربانییەکی لاقەکردنی بکردایەو هەموو مانگێك پارەی بۆ بناردایە تاکو بۆخۆی خەرجی بکردایە بۆئەوەی بهاتایەتەوە سەرخۆو کەسە سپۆنسەرەکە نامەی بۆ بناردایە تا هەستی بەوە بکردایە ئەو تەنها نییەو کەسێك هەیە پشتیوانی لێبکات. رۆژی دواتر، ژمارەیەك تەلەفۆنی ترم کردو هاوکاریم بۆ ئەو رێکخراوانە دەربڕی کە ئەو جۆرە پرۆگرامانە رێکبخەن و توانیم دانیشتنێك لەگەڵ ئۆڵ سۆڵس یونیتاریان چێرچ (All Souls Unitarian Church) وەربگرم. هەفتەی دواتر بەجانتاکەی خەزورمەوە رۆیشتم بۆ کۆبوونەوەی بۆردی بەڕێوەبەرەکانی ئەو رێکخراوە، پێموابوو ئەو جانتایە بەتەمەنترو جدیتر دەرمدەخات. چەند ئایەتێکی قورئانم خوێندو لە خوا پاڕامەوە زمان پاراوم بکات وەك چۆن موسا لە خوا پاڕایەوە زمان پاراوی بکات کاتێك رووبەڕووی فیرعەون بووەوە. بۆردی بەڕێوەبەرەکانی ئەو کەنیسەیە رازیبوون دەستبکەم بەو پرۆژەیە

لەژێر چەترە قازانج نەویستەکەیاندا. ئەگەر پێویستی بکردایە ئامۆژگارییان دەکردمو کاری ژمێریارییان بۆ ئەو بەخشینانە دەکرد کە کۆکرابوونەوە. یەك ساڵم بەدەستەوە بوو تاکو پرۆژەکەم بکەمە پرۆژەیەکی سەربەخۆی قازانج نەویست. بێ وێنە بوو!

ئەمجەد زۆری پێخۆشبوو پشتیوانیشم بوو. پێکەوە دەستمان بەدامەزراندنی ئەو رێکخراوە کرد. ئەو کاری لەسەر یەکخستنی بڵاوکراوەکان دەکرد لەوکاتەی من خەریکی رەشنوسی نامیلکەکان بووم بەهاوکاری هەندێك خۆبەخشی کەنیسەکە. ژێرزەمینی ماڵی باوکی ئەمجەد بووە سەنتەری کارەکانمانو دایكو باوکی خۆبەخشانە کاری قەدکردنو رێکخستنی نامیلکەکانیان دەکرد. دوای دوو مانگ کاری بەستنی پەیوەندیو کۆکردنەوەی پارە، منو ئەمجەد بووینە هاودامەزرێنەری (ژنان لەپێناو ژنانی نێودەوڵەتی) کە لە بۆسنیا پێمان دەگوت (ژنان لەپێناو ژنان). لەو پارەی کۆمانکردبووەوە لەگەڵ ئەو پارەی بۆ بەسەربردنی مانگی هەنگوینیمان لە ئیسپانیا هەڵمانگرتبوو برێکی تەواو بوو تاکو پێی بچینە کرواتیاو دەست بەکارەکانمان بکەین. جودی دارنێل پەرستیارێکی خەڵکی فیلادلفیا بوو پێشینەی کاری خۆبەخشی هەبوو لە کرواتیا، یارمەتیداین تاکو (ژنان لەپێناو ژنانی نێودەوڵەتی) بکەینە ئەمرێکی واقع. تەلەفۆنم بۆ کردو داوای هاوکاریم لێکرد، ئەویش گوتی "منیش بخەنە ناو پرۆژەکەوە".

کاتێك لە زاگریبی پایتەختی کرواتیا نیشتینەوە، دارنێل پێشتر کۆبوونەوەی رێکخستبوو بۆمان بۆ چاوکرانەوەمانو یارمەتی بەرەوپێشبردنی کارەکانمان. یەکەم چاوپێکەوتنمان لەگەڵ ئەجسا بوو، ژنێکی قژ رەشی قژ کورت بوو، دەموچاوی هەڵئاوساوو سووربووەوەو زەردەخەنەیەکی جوانی هەبوو. تازە لەکەمپێکدا ئازادکرابوو لەبەرامبەر ئازادکردنی سەربازێکدا (سەربازەکان ئازاد دەکران لەبەرامبەر ئازادکردنی ژنانی سیڤیلدا). لای مێزەکەی ئێمەوە دانیشت، جلوبەرگێکی فشی لەبەردابوو کە پێی بەخشرابوو، دوای ئەوەی بۆمان روونکردەوە ئێمە هاتوینەتە ئەو شوێنە بۆ دامەزراندنی پرۆگرامێكو پێویستمان بە تێگەیشتنێکی باشتری پێداویستییەکانی ژنان هەبوو تاکو بمانتوانیایە بەشێوەیەکی رێکوپێك بەدەمیانەوە بچین، دەستیکرد بەباسکردنی راستەقینەی

ڕووداوەکان بەو شێوەیەی ئەزموونی کردبوو.

"بۆ ماوەی نۆ مانگ لە کەمپێکی لاقەکردندا زیندانی کرام و کاتێک سکم هەشت مانگ بوو ئازادکرام" هێندە بەخێرایی ئەو قسانەی کرد وەک ئەوەی باسی کەسێکی تر بکات. "دوو مانگ لەمەوبەر منداڵەکەم بوو، بەڵام بەهۆی ناتەواوی تەندروستییەوە مرد. نەمدەزانی هەست بەچی بکەم لەمەڕ ئەو منداڵە. خۆشمدەویست لەبەرئەوەی منداڵی خۆم بوو، بەڵام هەرکاتێک تەماشام دەکرد بیری ئەو قسانەم دەکەوتەوە کە سەربازەکان پێیان دەگوتم لەوکاتەی دەستدرێژی سێکسییان دەکردە سەرم "تۆ موسوڵمانیت. تۆ تورکیت. تۆ شایەنی لاقەکردنیت. ئەمە تۆڵەی ئەوەیە کە پێشینەکانتان بەسەر گەلەکەی ئێمەیان هێنا". ئەوان هەرگیز لە جنێودان و سووککردن و تفلێکردن و لاقەکردنم وچانیان نەدەگرت".

نەیدەزانی کامەیان باوکی منداڵە کچەکەی بوو. تەنانەت هەمووشیانی بیرنەدەهاتەوە. هەستمدەکرد خوێن لەدەموچاومدا نەدەما لەوکاتەی بۆ وەرگێڕەکە دەوەستا تاکو قسەکانی وەربگێڕێت و لەوماوەیەدا فرمێسکەکانی هەڵدەمژییەوە پێشئەوەی دەستبکاتەوە بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی. باسی ئەو ژیانەی کرد پێشتر لەگەڵ هاوسەرەکەی و دوو منداڵەکەی گوزەراندبووی گوایە کێڵگەیەک و مەڕیشیان هەبوون.

"ژیانێکم هەبوو، بەڵام ئێستا هەموویم لەدەستچوو. هەموو شتێکم لەچرکەساتێکدا لەدەستچوو. نازانم بۆچی. من چیم لێکردبوون؟ مێردەکەم چی کردبوو؟ لەو ڕۆژەوەی گرتیانم چاوم بەمێردەکەم و منداڵەکانم نەکەوتووەتەوە. نازانم جارێکی تر دەیانبینمەوە یان نا. ئەگەر بیانبینمەوە، داخۆ منیان دەوێتەوە؟ ئاخۆ جارێکی تر خۆشیان دەوێم دوای ئەوەی بەم شێوەیە دەمبینن؟ تەماشام بکە، تەماشام بکە!"

لەوکاتەی ئەو دەگریا من و ئەمجەد نەدەگریاین، لەناخەوە دەمانزانی ئەگەر بگریەین ئەوا لە شکۆمەندی فرمێسکەکانی ئەو کەمدەکاتەوە. بەڵام کاتێک گەڕاینەوە بۆ ئوتێلەکە ڕاکشاین و یەکترمان لەئامێزگرت و پێکەوە هەنسکمان هەڵدەڕشت. بۆ ماوەی هەفتەیەک بەناو کرواتیادا گەڕاین و ئەوکارە تۆقێنەرانەمان بینی کە هێشتاش بەئاستەم مێشکم قەبوڵیان دەکات. لەدێهاتەکاندا ژنانی تەمەن

هەشتا ساڵو کچانی تەمەن چوار ساڵ لاقەکرابوونو پاشان فڕێدرابوونو ئەندامەکانی جەستەیان دادڕێنرابوون. کوڕان بەزۆر فەرمانیان پێکرابوو دایکی خۆیان لاقە بکەن. باوکان بەزۆر کچەکانی خۆیانیان پێ ئەتك کرابوو. رۆشنبیرترین ژن دەستنیشان دەکران تاکو لەپێش چاوی دانیشتوانی شاردا لاقە بکرێن. هەندێك لە سەربازە سربییەکان فەرمانیان پێکرابوو خەڵکی لاقە بکەن تاکو پیاوێتیو نێرینەیی خۆیان بسەلمێنن. سەربازێکی گیراو کە ئەو کارەی رەتکردبووەوە باسی ئەوەی کرد چۆن فەرماندەکەی گاڵتەی پێکردووەو پانتۆڵەکەی خۆی داناوەو لەبەرچاوی ئەودا ژنێکی لاقە کردوەو پێی گوتبوو "بەم شێوەیە دەکرێت"، سەربازە هاوەڵەکانیشی پێکەنینیان پێی هاتبوو.

ئەم کارانە بێ بنەماو هەڕەمەکی نەبوون. هەزارەها خەڵك لاقەکرابوونو هەزارەها گەواهیدەری لاقەکردنەکانیش هەبوون. هەبوو دەیانگوت سەربازەکانی هەموو سوپاکان خەڵکیان لاقە دەکرد، بەڵام تەنها یەك سوپا هەبوو بەناوی سوپای سربیا کە لەژێر کۆنترۆڵی سلۆبۆدان میلۆسۆڤیجدا بوو و ئەو کامپانەی بۆ لاقەکردن دروستکردبوو. ئەوانەش کامپی کاتی نەبوون لەدارستانەکاندا، بەڵکو سوپای سربیا ئوتێلەکانو قوتابخانەکانو بینا گشتییەکانی بۆ ئەو مەبەستە داگیرکردبوو لەبەرچاوی هەموو دنیاو بەبێ وەستان بەردەوامبوون لە ئەنجامدانی ئەو کارە قێزەونە. پاشان ئەو قوربانیانەیان بە سکی پڕەوە ئازاد دەکرد تاکو نەتوانن منداڵە سربییەکانیان لەباربەرنو ببنە مایەی شەرمەزاری خێزانەکانیانو ئەوانیش دەستیان لێهەڵگرن. نەتەوە یەکگرتووەکان شانزە کامپی لاقەکردنیان هەژمارکرد کە لەلایەن سوپای سربیاوە دامەزرابوون. لاقەکردن بەهەمان شێوەی پاکتاوی رەگەزی لەڕێی بەکارهێنانی چەکەوە ببووە ستراتیژێکی جەنگو رەنگە زیاتر لەوەش کاریگەری هەبووبێت، چونکە تەنها نابێتە مایەی لەناوبردنی تاکەکان بەڵکو تەواوی خێزانەکانو کۆمەڵگاکان دادەڕوخێنێت. سەربازە سربییەکان هاندەدران تاکو رقیان لە بۆسنییەکان بێت لەبەرئەوەی لەکۆندا ئیمپراتۆری عوسمانی دەستی بەسەر بەڵکانەکاندا گرتبوو، هەروەها رقیان لە کرواتییەکانیش بێت ئەویش لەبەرئەوەی دەگوترا کە باوكو باپیرانیان ئوستاشی بوونو هاوسۆزی نازییەکان بوون. بەو سەربازانە گوترابوو ئەوان تۆڵەی

ئەو تاوانانە دەکەنەوە کە لەلایەن باپیرانی ئەو ژنانـەوە بەسـەر بـاپیرانی ئەوانـدا هێنرابوو. وەك ئەوەی ژنان گۆڕەپانی جەنگ بن و تیایدا دوو دوژمنی کۆن بەیـەك گەیشتبن بۆ ئەوەی دەستبەجێ خاڵی سەرکەوتنیان تۆمار بکەن.

زۆربەی ئەو ژنانەی چاومان پێیان کـەوت جانتایـەکی بچوکیان پێبوو لەگەڵ چەند پارچە جلێك و چەند شتێك کە پێیانوابوو لەکاتی بەجێهێشتنی ماڵەکانیانـدا کەڵکی لێوەردەگرن وەك بەڵگەنامەی مردن و بڕوانامەی قوتابخانەو تاپۆی خـانوو. هەندێکیان بەختەوەر بوون و وێنەیان هەڵگرتبوو تاکو پیشانی بـدەن و بڵێن ئەمـە کوڕەکەمە، ئەوەی کوشتیان یاخود ئەمە هاوسەرەکەمە، نەتبینیوە؟ لەیادمە ژنێك بێهەستانە باسی ئـەوەی کـرد چـۆن لـە ماڵەکـەی هـەڵهاتبوو لەوودەمـەی سـەربازە سـربیەکان پـەلاماری گوندەکـەیان دابـوون. پـەلی هـەردوو کوڕەکـەی گرتبـوو رایکردبوو، ئاوڕی دابوویەوەو بەچاوی خۆی سوتاندنی خانووەکەی بینیبوو پاشان هـەر رایکردبـوو بـۆ پاراسـتنی ژیـانی دوو کوڕەکـەی. بـۆ مـاوەی دوو رۆژ بـەنێو تاریکستانی جەنگەڵێکدا رایانکردبوو، ئەمـە چیرۆکێك بـوو هەردەم دەمبیستوو دەمبیستەوە. ئـەوە راکردنێك بـوو بـەنێو ناوجەرگەی تارکیستانێکی نـامۆدا کـە نەتـدەزانی کوێیـەو چـییە، بـەڵام دەتزانـی دەبێـت رابکـەیت و هـەر رابکـەیت و یادەوەرییەکانت و کۆمەڵگەکەت لـەپاش خـۆت بـەجێبهێڵیت و هەنـدێك جار لاشـەی کەسـە خۆشەویسـتەکانیش لـەدوای خـۆت بـەجێبهێڵیت. بـەدەر لـە دەسـتە لەرزۆکەکانی کە ئاماژەیەك بـوو ئـەو رووداوە بەسـەر خۆیـدا هاتبێـت، رەنگـە ئـەم ژنە چیرۆکی کەسێکی تری گێڕابێتەوە، چونکە کاریگەرییەکی زۆر کـەم لەدەنگیـدا دیار بوو.

رۆیشتین بۆ کرواتیا بۆ هاوکاریکردنی قوربانیـانی لاقـەکراو، بـەڵام ئەنـدامانی گروپەکانی ژنان لە کرواتیاو بۆسنیا بۆیان رونکردینـەوە لەبەرچی لەکاتێکدا ئـەو مـەیل و ئـارەزووەی هـەمان بـوو بـۆ هاوکاریـکردنیـان، هەرچـەندە سروشـتی بـوو، یارمەتیدەر نابێت بۆ گێڕانەوەیان بۆ نـاو کۆمـەڵگا. هەنـدێك لـەم ژنانـە دایکمیـان بیرخسـتمەوە کـە جگـەرەیان دەکێشـاو پێکـەوە چرپەچـرپیان بـوو تەنانـەت بەپێکـەنینێکی میهرەبانانـەوە پێدەکـەنین کاتێـك بینییـان هێنـدە بەتونـدی و بەڕاستی مەسەلەکەم گرتبوو. یەکێك لە ژنەکان پرسیاری لێکردم "هـەر بەڕاسـتی

دەتـەوێت مانگانـە ژنـان ریـز ببەسـتن تـاكو یارمـەتی وەربگـرنو دراوسـێكانیان دەستیان بۆ رابكێشنو بڵێن، سـەیركە ئـەرێ ئەوانـە ژنـە لاقـەكراوەكان نـین؟ ئایـا ئەوە بەس نییە هەندێكیان لە كامپی پەنابەرانـدا دەژیـن كـە تـابلۆی 'قوربانیانی لاقـەكراوی' پێـدا هەڵواسـراوەو دۆزینـەوەیان لەلایـەن میـدیاكارەكانو كارمەنـدە نێودەوڵەتییەكانیشەوە ئاسانە؟"

بەشـێوەیەكی سـادەو پسـپۆڕانە، ئـەوە یەكـەم وانـەو توانجبـوو لەسـەرم. دووەمیان ئەوە بوو مامۆستا هـەرە باشـەكانم ژن بـوونو داوای هاوكـاریم لێكـردن. ئەوان ژیریی‌و داناییان هێندە زۆربوو كە تینوو بووم بۆی. هێنـدە میهرەبـان بـوون هاوبەشی داناییەكەیان كردمو مەمنونیان بووم كاتێك هەلێكیان بۆ رەخساندم لـەو شتانە تێبگەم كـە پێشـتر هەمیشـە قەدەغـە بـوون بـۆم. ئاواتـەخوازی تێگەیشـتنی نەك تـەنها نـاڵینو مەینـەتی ئـەم ژنانـە بـووم بـەڵكو مـەراقم بـاری دەروونـی ئـەو پیاوانـەش بـوو كـە ئـەو كارەیـان ئـەنجام دابـوو. چـۆن دڵـی ئـەو پیاوانـە هێنـدە گوشـرابوو بڕوایـان بـەوە هـەبێت مـافی ئـەوەیان هەیـە ئـەو ئـازارە تووشـی ئـەو كەسانە بكەن؟ چەند سەربازی سربی بەزۆر برابوونە نێو ریزەكانی سوپا؟ چەند كەس پێیان گوترابوو دڵسۆزی خۆتان بە كوشتنو لاقـەكردنی ژنـانی دوژمنـەكانتان بسەلمێنن؟ چەند كەس ئەو كارەیان رەتكردبووەوە، ئەی باجەكەیان چیبوو؟ بوونە قوربانی لەڕووی رەوشتەوە بەچەندین جۆر ئاسان بوو، بـەڵام شـێوازەكانی جیـاواز بوون.

لە یەكێك لەدوا شەوەكانی مانەوەمان لە كرواتیا، منو ئەمجـەد بـۆ ماوەیـەكی زۆر باسی بابەتە رەوشتیو هەڵبژاردە كەسیەكانمان كرد.

ئەمجەد پرسیارێكی كرد كە لێی تێنەدەگەیشـت "چـی جـۆرە تاوانكارێـك ئـەم شتانە بەرامبەر مرۆڤێكی تر دەكات؟"

گوتم "هەندێك جار ئـەو باجـەی دەبێت بیـدەن بـۆ رەتكردنـەوەی فـەرمانێك زۆر گەورەیە".

"بەڵام خۆ هەموو كەسێك دەمانچەی لەسەر سەر نییە تاكو ئەو كارە بكات".

"پێدەچێت ئـەوە بـۆ هەنـدێكیان راسـت بێـت، بـەڵام چـی وا ئاسـانی دەكـات. ئەگەر كەسـێك لولـەی دەمانچە بخاتـە سـەر سـەرت، ئایـا بەلاتـەوە ئاسـانە بڵێیـت

دەمەوێت بمرم نەك ئەمە بكەم. ئەی دەڵێی چی ئەگەر ژیانی كەسانی تر هەڕەشەی لەسەر بێت، ئەو كەسانەی خۆشت دەوێن، دایكو باوكت، ژنو منداڵەكانت، خزمەكانت؟ ئەمجەد پێمبڵێ، ئەگەر كەسێك بەدەمانچەیەكەوە بڵێت ئەم كەسە نەناسە بكوژە ئەگەرنا ژنەكەت دەكوژم تۆ ژیانی كامیان هەڵدەبژێریت، من یاخود كەسە نەناسەكە؟

بەچاوە جوانەكانی تەماشای كردم، گوتی "كەسێك دەبێت بڵێت نا، نەخێر".

لەزۆر شوێنی جیاوازەوە دەستمان پێكردو بەهەمان دەرەنجام كۆتاییمان پێهێنا. نەماندەتوانی ئەو مێژووە بگۆڕین وای لە خەڵكی دەكرد رقی هەستێت، بەڵام بەڵێنمان بەیەكتریدا لە هیچ بارودۆخێكدا هیچ كام لە ئێمە نەبێتە بەشێك بۆ تەشەنەسەندنی ئەو رقو كینەیە. رێگەمان بەیەكتری دا چاو بخەینە سەر ئەوانەی كوژرابوون نەك زۆركردنمان بۆ كوشتنی مرۆڤێكی تر.

سێ مانگ دواتر، بەتەنیا گەڕامەوە بۆ كرواتیا بۆ گەیاندنی یەكەمین كۆمەكی دارایی كە كۆمانكردبووەوە. یادی لەدایكبوونی بیستو چوار ساڵەم لە كەمپێكی پەنابەریدا بەسەربرد لەناوچەیەكدا پێی دەگوترا (سپلیت) لە دورگەیەكی كرواتیا. لەوێ ژنێكم بینی پێنج ساڵ لەمن گەنجتر بوو بەناوی ئینگەر، بە ئینگلیزییەكی باش قسەی دەكردو باسی ئەوەی بۆ كردم چەندێك بیری باوكی دەكات لە بۆسنیا. بەو خێزانانەی ناساندم كە لەژوورگەلێكدا دەژیان پێشتر پۆلی قوتابخانە بوون. بەزۆر بیست كەس لە ژورێكی بچووك ئاخنرابوونو پێكەوە دەنووستنو ژمارەیەكی كەمی بەتانیو ئاوێكی زۆر كەمیان پێدەدرا. زۆر زۆرم تینوو بوو، ژنێك زانیی تینومە، چونكە بە زمانی سیربۆ – كرواتی شتێكی بە كچەكەی گوتو ئەویش چوو لەسوچێكدا بوتڵێك ئاوی شاراوەی هێناو پێكەوە خواردمانەوە. زۆر سەرم سوڕمابوو لە بەخشندەیی پەنابەرەكان. لەوكاتەی سواری پاسێك بووم كە دوانزە كاژێری پێدەچوو بۆ گەیشتنە زاگریب، ئینگەر لەكەمپەكەدا مایەوە.

ئەو شەوە نەمتوانی بخەوم. بۆچی لەكاتێكدا من لەپاسێكدا دانیشتبوومو بەرەو ئوتێلەكەم بەڕێكەوتبووم ئەو دەبوایە مەینەتی بچەژێت؟ بەخت؟ بەخت هاتنە ڕێ؟ بەزەیی خوا؟ سوپاس بۆ خوا. سوپاس بۆ خوا. سوپاس بۆ خوا من

بەوشێوەیەی نینگەرو پەنابەرەکانی تر نازارو مەینەتیم نەچێشت. ئەمجەد بەردەوام ئەوەی پێدەگوتم کە ئەگەر ئەو هاوسەرگیرییە خراپو ناخۆشە نەبوایە هەرگیز نەدەچووم بۆ واشنتۆن یان ئەوم نەدەبینی یاخود دەرفەتی ئەنجامدانی ئەم کارەم نەدەبوو. بەرەنگاربوونەوەی ئەو نادادپەروەرییەی منو ئەمجەد بینیبوومان ببووە سەرەکیترین بەشی ژیانمان. بەیارمەتی کەنیسەی یونیتاریان، خوێندکاران کۆنسێرتی کۆکردنەوەی یارمەتییان ئەنجامدەداو خۆبەخشانە لەسەرتاسەری وڵاتەوە پەیوەندییان پێوە دەکردینو توانیمان بڕە پارەی تەواو کۆبکەینەوە بۆ دروستکردنی ئۆفیسێكو لە ژێرزەمینەکەی ماڵی ئەمجەد بێینە دەرەوە، بەڵام پارەی تەواو بۆ من نەبوو هەتاکو رێکخراوەکە بەڕێوەببەم. ئەمجەد خەونی ژیانی وەلانا کە بریتیبوو لەبەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆراو پرۆفیسۆرێکی فول تایم، لەبەرامبەردا بەشێوەی فول تایمو وەك کارمەندێکی کاتیی ناو ئۆفیس دەستیکرد بە کارکردنو پشتگیری کارەکانمانی دەکرد.

ژنانی ئەمەریکاییو کەنەداییو تەنانەت ژنانی بەنگلادیشیش ناوی خۆیان تۆمارکرد وەك سپۆنسەرو مانگانە بەنەخت پارەیان دەنارد لەگەڵ نامەیەك بۆ قوربانیانی جەنگەکە. زۆر مکوڕ بووم لەسەر ئەوەی ئەم پارە نەختە راستەوخۆ بگاتە دەستی ژنەکان، لەبەرئەوەی جۆرە ئازادییەکی دەنواند تاکو جارێکی تر لەژیانیاندا هەڵبژاردەیەکیان لەبەردەست بێت ئەگەرچی بڕێکی کەمیش بوایە. دەیانتوانی دەرمان بۆ منداڵەکانیان بکڕن یاخود میوەیان پێبکڕیایە یاخود بابەتی جوانکاری ئەگەر بیانویستایە. ئەوە لەدەست ئەواندا بوو نەك ئێمە. دواتر، دەستمانکرد بەدانانی چەند بەرنامەیەك بۆ یارمەتیدانیان تاکو بگەڕێنەوە نێو کۆمەڵگا، دەستمانکرد بە دامەزراندنی گروپی پشتیوانکار تاکو جێگەی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتیانەی بگرتایەتەوە کە لەدەستیان دابوو بۆ ئەوەی رێگەیان بۆ خۆش بکەن گفتوگۆی بابەتە گرنگترەکانی وەك رۆڵی ژنان لە جەنگو بواری ئابووریو سیاسەتو کۆمەڵگادا بکەن. ئەم (پەنابەرە نەبینراوانە) کە دواتر وام پێدەگوتن، لەو پەنابەرانە نەدەچوون کە لە بەرگە شڕو شیتاڵەکانیاندا خەریك بوو لەبرسان دەمردن. پێودانگە بنەڕەتییەکانو رەفتاری پاکوخاوێنی ناگۆڕین هەرچەندە ژیان لەگۆڕاندایە، ئەوە لە ئەزموونی خۆمەوە دەزانم. هەرگیز ئەو شێوازی ئاخاوتنو

سوراوکردنو خۆگرییەم گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە لەوکاتانەی هەرچییەکی هەمبوو لەدەستم دابوو. بۆچی زۆرێك لە خەڵکی وادادەنێن هەموو پەنابەرەکان لێکدەچنو هاوشێوەی یەکتری رەفتاردەکەن وەك ئەوەی لەگەڵ موڵكو ماڵە مادییەکانیاندا کولتورو پەروەردەشیان لێدزرابێت؟ تەنها لەبەرئەوەی جلوبەرگی خاوێنیان لەبەردابوو یا خود بەڕێکوپێکی قسەیان دەکرد مانای ئەوە نەبوو ئەم ژنانە پێویستییان بەهاوکاری نەبێت. هەندێك جار سوراوکردن یاخود پۆشینی جلوبەرگی پاكو خاوێن بەمانای ئەوە دێت ئەو ژنە هیوایەکی هەیە کە تەواوی ژیانی رابردووی لەدەست نەداوە. دەبوایە بژاردەی قورسم بکردایە لە هەڵبژاردنی ئەو وێنانەی بۆ بڵاوکراوەکانمان بەکارمان دەهێنا، خەڵکی پارەی زیاتریان دەدا لەبەر خاتری وێنەی ئەو ژنانەی لەچکە بەسەر بوونو برسیو داماو دەردەکەوتن. لەو جۆرە ژنانە زۆر بوون، بەڵام بەلای منەوە وێناکردنی ئەو پەنابەرانە بەو شێوەیە شێوازێکی تری داماڵینی شکۆمەندییان بوو. لەکۆتاییدا دەستمان کرد بە بەرنامەی پێدانی قەرزی بچووك بۆ پرۆژەی بچووكو پرۆگرامی راهێنانی کار بە لەخۆگرتنی کارامەیی جۆربەجۆری ترەوە کە خۆم لە قوتابخانەی ناوەندیو ئامادەیی خوێندبوومن.

هەر سپۆنسەرێك نامەی دەنوسی بۆ (خوشکەکەی)و خوشکەکەشی نامەی بۆ دەنوسییەوە. هەموو رۆژێك لەگەڵ خۆبەخشەکاندا دادەنیشتمو نامەکانمان ئامادە دەکردو دەمانکردنە زەرفەوە. لەپێش هەموو شتێکدا ئەم نامانەم وەك یارمەتیدەرێك بۆ قوربانییەکانی جەنگ دەبینی کە وای لێدەکردن هەست بەتەنیایی نەکەن. بەڵام هەرکات نامەکان لەلایەن ژنەکانی بۆسنیاو کرواتیاوە دەنێردرانەوە، درکم بەوە دەکرد کە ڕزگاربووانی جەنگ ئەم نامە تایبەتیانەیان دەنوسی تاکو باسی ئەو ئازارو نەهامەتیانەیان بۆ ئەو کەسە نەناسراوانە بکەن کە نەیاندەتوانی لەگەڵ هیچ کەسێکی تردا باسیان بکەن. لەڕێی ئەوانەوە، نەیاندەهێشت ناسنامەکەیان بفەوتێت، بەڵام هێشتا بەبێ ناو مابوونەوە. نامەکان گەواهیدەر بوونو ئەو نامانەش کە ژنە سپۆنسەرەکان بۆیان دەنوسینەوە بەڵگە بوون بۆ ئازارو نەهامەتیەکانیان. ئەو نامانە کاریگەرییەکی بەهێزیان لەسەرم هەبوو، وەك پەیوەندییەکی بێدەنگی هەستو سۆزی وابوون کە تیایاندا ژنان

تەنها باسی جەنگو زیانەکانیان نەدەکرد، بەڵکو باسی خێزانەکانیانو باخچەکانیشیان دەکرد. هەندێکیان هۆنراوەیی بوونو هەندێکیشیان نێجگار کاریگەر بوون. ژنێکی خەڵکی ساراگەیڤۆ لە نامەکەیدا بۆ سپۆنسەرەکەی نووسیبوو "نامەکانتم پێگەیشت. هاوشێوەی تیشکی رۆژ وابوون کە دەگاتە بنی ئەشکەوتێکی تاریكو رووناکی دەکاتەوە. من لەو بۆردومانو ئەهامەتیانەدا دەژیام بەڵام (من) کوژرام تیایدا".

هەرکە دەستم بەهاتوچۆکردنی نێوان ئەمەریکاو ناوجەرگەی ئەوروپا کرد، بۆمدەرکەوت بۆچی ئەجسا دەستنیشان کرابوو تاکو یەکەم کەس بێت قسەمان لەگەڵدا بکات. ئەو سەردەمێکی گوزەراندبوو تاکو بێتەوە سەرخۆ لەو شتانەی بەسەریدا هاتبوو. نزیکەی هەموو ئەو ژنانەی تر کە چاوم پێیان کەوتبوو بەچاوی وشکهەڵهاتوو ماندووەوە قسەیان دەکرد. دواتر زانیم گریان یەکەم نیشانەی سارێژبوون بوو. من چارەسەرساز نەبوومو هەردەم لەگەڵ ئەو ژنانەدا دادەنیشتمو دەستیانم دەگرتو هەوڵمدەدا ببمە شایەتحاڵی ئەو ناخۆشیو خەمانەی باسیان لێوەدەکرد. ئەگەر ژنێك باسی لاقەکردنی بکردایە، لەوە تێدەگەیشتم کە بەدەگمەن دەیگوت بەسەر خۆیدا هاتووە. هەمیشە دەیانگوت ئەو کارەساتە بەسەر کەسێکی تر، رەنگە دراوسێیەك یاخود تەنانەت تەواوی گوندەکەیدا هاتبوو بێجگە لەخۆی. ئاخۆ ئەم ژنانە زۆر شەرمەزار دەبوون ئەگەر باسی جەستەیان بکردایە لەبەرئەوەی وەك عێراق لایەنی سێکسییان بەشەرەفی خێزانەکەیانەوە بەسترابووەوە؟ داخۆ باسکردنیان عەیبو شوورەیی بوو بەلایانەوە؟ دڵنیا نەبووم، بەڵام ئەوەشم دەزانی ئازاری لاقەکردن بابەتە کولتورییەکانی تێپەڕاندبوو. رقم لەوەبوو کاتێك خەڵکی وای بۆدەچوون ژنانی مسوڵمان بەشێوازێکی جیاواز لە لاقەکردنیان دەڕوانی وەك لەژنانی تر. بۆ ئەو هەڵوێستەیان هەبوو؟ جگە لە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن کاتێك ژنان پارەی پێوەردەگرن یاخود لە ساتەوەختەکانی بەدەستهێنانی ناوداریدا کە شتی تایبەتی ژیانیان ئاشکرا دەکەن (کە ئارەزوویەکی زۆر سەیرەو وا دەبینم ئەو ژنانە پێی ڕاهاتوون)، ژنانی ئەمەریکایش حەزیان نەدەکرد باسی لاقەکردن بکەن.

ئەو پەنابەرانەی چاوم پێیانکەوت ئەوەندە تووشی زەبری دەروونی ببوون

بەهۆی ئەوەی هێندە ناخۆشییان بەسەردا هاتبوو دەمبینین بێدەنگو بەچاوی وشکەڵاتووەوە لەدەرەوەی خێمەکانیان بۆ چەندین کاژێر دادەنیشتنو منداڵانی بچووکیش بەدەوریاندا باز بازێنیان دەکردو پشتگوێ خرابوون. کاتێك ویستم چاوپێکەوتن لەگەڵ ژنێکدا بکەم گوتی "زۆر بێهیوا بووم، تازە هیچ شتێك فریام ناکەوێت". هەر چیرۆکێکم دەبیست وای لێدەکردم زیاتر سوپاسگوزاربم لەبەختی خۆم، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەسەرهاتێك ئازاری لەناخمدا دروستدەکردو دەمزانی لەهەمان شوێنی ئەو ژنانەوە سەرچاوەی گرتبوو. ئالودەی کارەکەم ببووم، زۆرم پێخۆش بوو کارم بۆ ژنان دەکردو لەیادی لەدایکبوونی پانزە ساڵیمدا بەدایکم گوتبوو حەزدەکەم لەو بوارەدا کار بکەم. لەهەر شوێنێك بمتوانیایە شەوو ڕۆژم بەقسەکردن بەسەردەبرد، بۆ ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ کەنیسەکان، پەرستگای جولەکەکان، مزگەوتەکان، قوتابخانەکان و زانکۆکان. دەمویست خەڵکی کۆبکەمەوە بۆ هاتنەدەنگو وەستاندنی ئەوەی لەبەرچاوماندا ڕوویدەدا. سەرکۆنەی ئاشتیپارێزی نەتەوە یەکگرتووەکانم کرد بۆ خۆبەدوورگرتنو تەماشاکردنی تاوانەکان لەبری ڕێگریکردنیان. لەبەردەم کۆشکی سپی نارەزایم دەربڕی، لەسەردەمی ئیدارەی بۆش هیچ نەکرابوو بۆ بۆسنیاو لەسەردەمی ئیدارەی کلینتۆنیشدا تاکو ساڵی دووەم کاری لەسەر بەڵێنەکانی نەکرد. موکەبەرەکەم بەدەستەوە بوو، لەپێش خەڵکەکەدا هوتافم دەکێشاو دەمانگوت "ئەو جینۆسایدە ڕابگرن، ئەو لاقەکردنە ڕابگرن". بۆ یەکەمجار لەژیانمدا، هەستم بە جۆشو خرۆش دەکرد کە توانیم بۆ ڕای گشتی هەڵوێستەکانم دەربڕم.

سەدام حسێن بەئاشکرا پشتیوانی خۆی بۆ سەرکردە سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ ڕاگەیاندو منیش هاوتەریبی تەواوم لەنێوانیاندا دەبینی. لەبەشی دواوەی مێشکمدا ئەو ئاگادارکردنەوانەی ئیهابو ئەو پروپاگەندانەم وەبیرهاتەوە کەوا موخابەرات ژنانیانی لاقە دەکردو بەڤیدیۆ تۆماریان دەکردو پێیان دەگوترا دەبێت بینە هەواڵدەر ئەگینا هەڕەشەی بڵاوکردنەوەی ڤیدۆکەیان دەکرد کە دەبووە هۆی ئەوەی هەندێکیان لەلایەن مێردەکانیانو خێزانەکانیانەوە وازیان لێبهێنرایە یاخود تەنانەت بەتۆمەتی شەرەف بکوژرانایە. خوشکی محەمەد باقر سەدر کە کەسایەتییەکی بەڕێزی شیعەی عێراق بوو لاقە کرابوو. لەبیرمە کاتێك پوورە

سەمەر لە مەلەوانگەی هەنتین کلەب بۆی باسکردم چۆن لاقەیان کردبوو لەوکاتەی ئەشکەنجەشیان دابوو پاشانیش بە دووگیانییەوە بەرەڵایان کردبوو.
ئەمدەتوانی هێرش بکەمە سەر سەدام حسێن، لەبەرامبەردا هێرشم دەکردە سەر سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ. ئەمدەتوانی لە عێراق شەڕ بکەم، بۆیە لە بۆسنیاو کرواتیا شەڕم دەکرد. میلۆسۆڤیچ تاوانبار بوو، بەئاشکرا داوام دەکرد دەبێت بەتۆمەتی ئەنجامدانی تاوانی جەنگ دادگایی بکرێت. باسی کارەکەم بۆ کەس نەکرد لە عێراق، چونکە دەترسام عەمو سزایان بدات لەبەرامبەر چالاکی سیاسی من لەو وڵاتانەدا.

بێجگە لەخوێندنی وانەکانم و بەجێهێنانی ئەرکەکانی خوێندن و کارکردنم لە ئۆفیسەکەمدا، بەکەمی ئەبوایە بواری شتی ترم نەبوو. لەبیرمە بەناو زانکۆدا دەڕۆیشتم و سەدان خوێندکارم دەبینی پێدەکەنین و دەمەتەقێیان دەکردو دڵدارییان دەکردو دەیانخوێندەوە، منیش خۆزگەم دەخواست لە زانکۆ هاوڕێی زیاترم بگرتایە. بەڵام کاتم بەدەستەوە نەبوو، لەبەرئەوەی هەمیشە لەخوێندنەکەمەوە رامدەکرد بۆ کارکردن. هیچ شتێك هاوشێوەی کارەکەم بەلامەوە گرنگ نەبوو. خەونم پێوە دەبینی، چووبووە ناخمەوە، بۆی دەژیام. زوو زوو ئەو ژنە دەهاتەوە یادم کە گوتی تازە ئەو زۆر بێهیوایە لەوەی یارمەتی بدرێت بۆ چارەسەرکردنی مەینەتییەکانی و مەراقم بۆ دەخوارد. لەبەرئەوەی حەزمدەکرد بەردەوام کار بۆ ئەو ژنانە بکەم، هەندێکجار زۆرم لەخۆم دەکرد تاکو دەست لەکار هەڵبگرم و لە ئۆفیسەکە بچمە دەرەوە. رێکخراوەکە دەستی بەگەشەکردن کردو داواکارییەکانیش لەسەر من و ئەمجەد زیادیان کرد. هەر سەنتێکی کۆمان بکردایەتەوە بۆ پرۆگرامەکە بوو کەچی هێشتاش بەشی نەدەکرد. نەماندەتوانی پارەی پسوڵەکان بدەین، هەرکاتێك تەلەفۆنەکە زەنگی لێبدایە دەترسام لەوەی خاوەن قەرز بێت. بەزۆری باس و خواسەکە لەسەر بۆسنیا بوو، هەندێك لە هاوڕێکانمان بێتاقەت بوون لەگەڵماندا. تەنانەت هەندێك کەسی خانەوادەکەی ئەمجەد پێیان دەگوتین "کاری باشتان ئەنجامداوە، بەڵام پێویستە گەشە بکەن و مووچەی خۆتان هەبێت. تەماشا بکە ئەم کارە چ زیانێکی بەسەر هێناون". بیرمان لەوە دەکردەوە وازبهێنین، بەڵام هەرجارێك بمانویستایە بیری

ئەجسامان دەکەوتەوە لەگەڵ ئەو پارەی لە بەخشەرێکەوە دەهات کە وەك ئاماژەیەك لێی تێدەگەیشتم تاکو بەردەوام بین.

رۆژێکیان دایکم تەلەفۆنی بۆ کردمو لەوکاتەدا لەماڵی خێزانێك بووم لە ساراگیڤۆو لەوێ دەمامەوە. دەبێت ئەمجەد ژمارە تەلەفۆنەکەمی دابێتێ. کاتێك لەو ماڵە تەلەفۆنەکە لێیدا بە قیژەو گریانەوە گوتی "ئەوە تۆ چی دەکەیت لەوێ؟ نازانیت بە چی نارەحەتییەك هەوڵمدا هەتاکو لەو شەڕو گرفتانەی ئێرە دەربازت بکەم کە ئەم وڵاتەی تەوق دابوو؟ بۆچی خۆت دەخەیتە جەنگێکی ترەوە؟ بۆچی ئەمەم لەگەڵدا دەکەیت؟ بۆ؟

تەنها ئەوەم دەزانی کە بەردەوام دەچوومە ناوچەکانی جەنگەوە، لەبەرئەوەی لەوێ هەستم بەئاسودەیی دەکرد. وەك ئەو کوڕەی *The Jungle Book* (کتێبی جەنگەڵ) وابووم کە هەرکاتێك کێشەیەك لەگوندەکەیدا سەری هەڵبدایە یەکسەر بەرەو جەنگەڵکە هەڵدەهات. ناوچەکانی جەنگ جەنگەڵی من بوون. بەردەوام دەڕۆیشتمەوە بۆ ناو گوللەو فیشەکەکان. هەردەم دەڕۆیشتمەوە بۆ لای ئازاری ئەو کەسانە. لەهەمانکاتدا، زیاتر لە خێزانەکەم دووردەکەوتمەوە. دەستبەجێ باوکم ژنێکی تری خواستبوو، پێموابوو ئەو کارەی ناپاکی بوو. لە رۆژانی پشوودا تەلەفۆنم بۆ باوکمو براکانم دەکرد. تاکو ماوەیەکی زۆر دایکم بەردەوام کاژێر ۲ی بەیانی تەلەفۆنی بۆ دەکردم بۆ گلەیی‌و سکاڵاکردن لەدەست باوکم. بۆچی دەبوایە لە نیوەی شەودا تەلەفۆنم بۆ بکات؟ بێگومان من هیچ شتێکم پێنەدەکرا. زۆر ماندوو شەکەت بووم. پێویستم بەخەوتن بوو. ئەو سندوقانەی لە عێراق لە مێشکما ناشتبوومن دەستیان کردبوو بەهەڵتۆقین‌و هەندێك جاریش نەمدەتوانی بیانخەمەوە ژێرەوە.

دوای گەڕانەوەم لە گەشتە دورودرێژەکانی بۆسنیا، ئیتر نەمدەهێشت ئەمجەد دەستم بۆ بەرێت. هەر چیرۆکێکی لە بۆسنیا دەمبیست ئازاری لاقەکردنەکەی خۆمی تازە دەکردەوە. نەمدەتوانی بگریەم. لەوە دەترسام دووگیان ببم‌و منداڵم ببێت‌و نەمدەزانی چی بکەم تاکو ئازاری نەدەم. لەهەمانکاتدا شتە پێچەوانەکانیش هەردەم راست دەردەچوون، دەمزانی‌و ئەوەش راستییەك بوو کە ئەمجەدم هەم خۆشدەویست‌و هەم لێشی دەترسام. ئەمجەدی داماو، ئەو کەسەبوو

زۆر خۆشمدەویستو زۆریش لێی تۆقیبووم. لەوە دەترسام سنوورم بۆ دابنێ یان ناپاکیم لەگەڵدا بکات، سەرەڕای ئەوەش ئەوە من بووم ململانێم لەگەڵ بەڵێنو پەیمانی خۆشەویستیدا هەبوو. لەبیرمە وەها بیرمدەکردەوە کە خۆشەویستیش جۆرە قەفەسێکە. هەتاکو ئەو پشتیوانکارترو خۆشەویستتر بوایە، من زیاتر هەستم بە بێدەسەڵاتیو گیرۆدەیی خۆم دەکرد.

هەندێکجار وامدەزانی لاستیکی پارەبەستن بەو تائاستی لێکپچڕان لێکراکێشرابووم. هەرکات هەستم بەبەهێزی خۆم بکردایە شتێك لەناخمدا لێك دەترازاو هەستم بەوە دەکرد لاستیکەکە دەگەڕایەوە شێوەکەی پێشوی، دەگەڕامەوە بۆ ئەو منداڵەی دەسەڵاتی نەبوو. هەتاکو دڵخۆشتر بوومایە، زیاتر بێ ئارام دەبوومو گەڕانەوە بۆ هەستە کۆنەکانی پێشوو مسۆگەرتر دەبوو، وەك بێهێزبوونو ترسو هەستی گیرۆدەبوون. زۆر کۆششم دەکرد تاکو بۆشاییەك لەناو دڵمدا بدۆزمەوە، بەڵام تێیدا نەبوو.

بێگومان لەو کاتەوەی منداڵ بووم، ژیانم هەر نازارو ناخۆشیو مەینەتی بوو. بەلامەوە ئەو ژیانە وەك قۆناغێکی ئەشکەنجەو ئازار وابوو، دەمزانی دوای ئەشکەنجەو ئازار مردن دێت. ئەوە پاداشتی ئەو ئازادکردنە بوو.

رۆژێکیان دوای ئەوەی لە گەشتێك گەڕامەوە، لەگەڵ ئەمجەد تووشی دەمەقاڵێیەك بووین. بیرم نییە لەسەر چی بوو. نزیکەی کاژێر ٥ی ئێوارە بوو، هێشتا دەرەوە رووناك بوو، کاتێك بوو مێشکم شۆرتی کردو تەقەمەنییە کیمیاییەکانی دەستیانکرد بە تەقینەوە. لێیان تێنەدەگەیشتم. تەنها دەمویست لەجەستەمدا بێمە دەرەوە. ئارامگریم لەسەر خۆمو ئەو قەفەسەی تێیدا دەژیام نەمابوو. دەبوایە لە مێشکمو لاشەم بهاتمایە دەرەوە. بۆ جاری دووەم بیرم لێنەکردەوە کاتێك چوومە سەر چەکمەجەی دەرمانەکان لەسەرخۆم نەمابووم. رابردوو رانەبەردوو لەمێشکمدا تێك ئاڵابوونو کاتێك بەیەکدا دەچوون وایەرەکان شۆرتیان دەکرد. ترس لە دیوارەکانی خانووی ناو مەزراکە، ترس لەبێدەسەڵاتی، ترس لە گیرۆدەبوون بەخۆشەویستی ئەمجەدەوە، ترس لە ژیان گوزەراندن لە قەفەسەکەی دایکمدا، ترس لە ژیانی دەرەوەی قەفەسەکە دایگرتبووم. بینیبووم دایکم زۆرجار ئەو کارەی کردبوو، ئیتر سەرەی منیش هاتبوو ئەو کارە ئەنجام

بدەم. سەرەی من بوو تاکو بەئاسانترین ڕێگا خۆم دەرباز بکەم هاوشێوەی ئەو هەوڵەی دایکم دابووی.

لەیادمە بیرم لەوە دەکردەوە ئەوەی لە تاکی دەرمانەکاندابوو ڕەنگبوو بەس نەبێت بۆ کوشتنم، بەڵام چەندێك حەبم دۆزییەوە خستمە دەستمەوە. چوومە سوچێکی شوقەکەوەو لەسەر ئەرزەکە حەبەکانم دانا. فەرشەکە ڕەنگی بێجی بوو، نەخشەکەیم لەیادماوە. لەبیرمە لەو حەبانەی سەر ئەرزی ژووری نوستنەکەی دایکم دەچوون کە یەکەم شەوو شەوەکانی تریش دەیویست خۆی پێ بکوژێت. هەندێکم قوتدا، بەڵام زۆریش دەترسام بەجارێك هەموویان بخۆم لەبەرئەوە لەسەرخۆو بەویستی خۆم کەم کەم دەمخواردن. زیاتر بیرم لەو ململانێیەی ناو مێشکم دەکردەوە نەك لەوەی خەریکی چی بووم. من کچێکی بچووك بووم کە لاسایی دایکی دەکردەوەو دەیویست بمرێت تاکو ئازاد بێت.

پاشان ئەمجەد هاتو دەموچاوی ترس دایگرتبوو. هاتە بەردەمم و لەتەنیشتمداو لەسەر ئەرزەکە دانیشت.

تکای لێکردم "وامەکە، زەینەب. تکایە وامەکە. خۆشم دەوێیت. هەر شتێکم پێبکرێت ئەنجامی دەدەم تاکو دڵشادت بکەم. بەس خۆت مەکوژە، تکات لێدەکەم".

ئەو سیناریۆیەی لەمنداڵیمدا وەرمگرتبوو دووبارەم کردەوە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ڕۆڵی خۆی نەبینی. دەبوایە ئەو لەسەر قەنەفەکە دابنیشتایەو بە ویسکی خۆی مەست بکردایە. لەجیاتی ئەوە بەچاوە جوانەکانی دەگریا ئیدی ئەوکارەی سەری لێتێکدام. کاتێك ئەو ئازارەم لەچاوەکانیدا بینی، وازم لە خواردنی حەبەکان هێنا. لەو ئازارە تێدەگەیشتم. کتومت دەمزانی چۆنە. نەمدەویست ئازاری بدەم. خۆشمدەویست.

پێمگوت "ئۆو، ئەمجەد داوای لێبوردن دەکەم. داوای لێبوردن دەکەم. تکایە بمبەخشە". هەوڵی لەگەڵم دا تا ئەو حەبانەی خواردبووم هەڵیانبهێنمەوە، بەڵام ئەو ئەم ڕۆتینەی نەدەزانی. پێمگوت پێویست ناکات بڕۆم بۆ نەخۆشخانە لەبەرئەوەی دەمزانی هێندەم حەب نەخواردبوو هەتاکو بەڕاستی بمکوژێت. تەنها من باسی شیرەکەم دەزانی. دەمزانی، چونکە من بووم خوازیاری مردن بوومو ئەو منداڵەش بووم کە دایکمم لە مردن ڕزگار کرد. لەبیرمە دوایی باوەشم بە

ئەمجەددا کردو هەوڵمدا بیرکردنەوەکانی ناو مێشکمی بۆ روونبکەمەوە کە تەنانەت خۆشم لێی تێنەدەگەیشتم، دەربارەی ڕێگەدان بەخۆم بۆ چەشتنی ئەو ئازارەی لەناخمدا هەڵمگرتبوو لەو ڕۆژەوەی عێراقم بەجێهێشتبوو. ڕێگەم بەڕۆیشتنی ئەو پاسەوانانەی چواردەوری قەڵاکەم دابوو، بەڵام بەبێ ئەوانیش نەمدەتوانی بەرگری لەخۆم بکەم.

بەڵێنم بە ئەمجەد دا داوای هاوکاری بکەمو ڕۆژی دوایی یارمەتی دام بۆ دۆزینەوەی پسپۆڕێکی دەروونی. بۆ ماوەی کاژێرێك قسەم لەگەڵدا کرد، بەڵام باسی یەك شتی ژیانم لەگەڵ عەمودا بۆ نەکرد. بەدەر لە ئەمجەد متمانەم بەکەس نەبوو تاکو چیرۆکی کچی فرۆکەوانەکەو ئەو ژیانەی گوزەراندبووی بۆ بگێڕمەوە. تەنها باسی ئەو شتانەم بۆ کرد کە بێ مەترسی بوونو تایبەت بوون بە کەسێتی خۆمەوە. ئەویش فشارو زەبری دەروونی تێدا دەستنیشانکردم کە بەهۆی کارەکەمەوە تووشی هاتبووم. پێیگوتم ئەو ژنە بێگانانە بۆ خۆپارێزییان ئازارەکانیان بەخشیبووەوەو من تا ئەو کاتەش فێرنەببووم چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو بەسەرهاتانەدا بکەم. هیچ پشوویەکم بەخۆم نەدابوو، لەوکاتەوەی گەیشتبوومە ولایەتە یەکگرتووەکان هیچ جۆرە پشوویەکم وەرنەگرتبوو.

پسپۆڕەکە پێیگوتم "ئەگەر بەنیازیت لە کارەکەت بەردەوام بیت، پێویستە فێربیت چۆن ئازارەکانیان لێ دەردەکەیت. وەك ماسی هەناسە بدە، ئۆکسجین وەربگرەو پاشان هەرکات پێویستت پێی نەما فڕێی بدە دەرەوە. ئەو بەسەرهاتانە وەربگرە کە بۆ کارەکەت پێویستەو هەموو شتەکانی تر لەناختدا بکەرە دەرەوە". بەڵام هێشتا فێرنەببووم چۆن هەناسە بدەم.

ئەوەی ئەو نەیدەزانی ئەوە بوو لەوە دەترسام کە نەمدەتوانی تەنانەت بۆ یەك هەفتە واز لە بەجێنەهێنانی ئەرکەکانم بهێنم، لەبەرئەوەی ئەگەر پشووم بدایە، شتی خراپتری زیاتر دەردەکەوتنو کاریگەرییان لەسەر خۆم دەبوو. هێشتا تاوتوێی ئەو لاقەکردنەم لەمێشکمدا دەهێناو دەبرد کە خۆم تووشی هاتبووم، بەڵام تەنانەت باسکردنی ئەوەش بۆ چارەسەرسازەکە بەلامەوە سەخت بوو، چونکە دەبووە هۆی کردنەوەی دەرگای رابردوو کە نەمدەویست باسی لێوە بکەم. تەنانەت لەوەش دەترسام دەستم لێبدرێت. جارێکیان، هاوڕێیەکم شانی گرتم تاکو

ئۆتۆمبیلێك لێم نەدات، منیش یەكسەر پێمداكێشا.

پسپۆڕە دەرونییەكە پرسیاری رابردووی لێكردم كە بووە هۆی كردنەوەی تەواوی بۆكسێكی تازە كە بەهیچ شێوەیەك بیرم لە كردنەوەی نەكردبووەوە. كاتێك پرسیاری دایكمی لێكردم، باسی ئەوەم بۆ كرد چۆن هەوڵیدەدا خۆی بكوژێت لەوكاتەی من منداڵ بووم‌و هەستم بەچی دەكرد كاتێك ئەو شتانەی واز لێدەهێناو دەكردەوە كە پێی گوتبووم، چۆن متمانەم پێكردبوو پاشان ناپاكیم لەمەڕ ئەو متمانەیە دەرهەق كرابوو. چەند نموونەیەكی بچووكم بۆ گێڕایەوەو پاشان قسەی ترم نەكرد. هەستم بەوە دەكرد زۆر بەتاسەوە گوێی بۆ گرتبووم، وەك جۆرە پەیامنێرێك كە بەسەرهاتەكەم شیبكاتەوەو لەوە دەترسام ببمە سەرباسێك بۆ لێكۆڵینەوەو گفتوگۆ پرۆفێشناڵەكان. لەكۆتاییدا داوای لێكردم ئەو شتانە بۆ دایكم بنوسم كە نەمدەتوانی بە ئەوی بڵێم.

نكۆڵیم كرد "بەڵام نامەوێت دایكم ئازار بدەم. ئەویش ئازارو نارەحەتی خۆی هەیە". پێیگوتم "پاشان نامەكان بدڕێنە. بیانسوتێنە. فڕێیان بدە. هەرچییەكیان لێدەكەیت لێیان بكە. ئەو نامانە بنوسە تەنها بۆ ئەوەی ئازارەكانت لەناختدا دەربكەیت".

بۆ كاژێرێك لە پاركی سەیارە راگرتنی ئۆفیسەكەی دانیشتم‌و دەستمكرد بەگریان پێش ئەوەی بتوانم لێبخوڕم بۆ زانكۆ. چاویلكە هەتاوییەكەم لەچاو كرد لەوكاتەی بەرەو پۆل ڕۆیشتم‌و هەركە بەناو ئەو چیمەنە سەوزە جوانەدا دەڕۆیشتم جارێكی تر هەستمدەكرد وەك تارماییەك وام. دونیا بەدەورمدا دەخولایەوە بەبێ ئەوەی بمبینێت‌و منیش لەناو مێشكە تەنهاكەمدا گیرۆدە ببووم‌و زۆر بیرەوەری مێشكیان پڕكردبووم. ئاخۆ من هەرگیز وەك ئەوانم لێدێت؟ بێ خەم؟ بتوانم ژیانێكی خۆش بەسەربەرم‌و فێرببم؟ زۆر بەچڕی سەرقاڵی زانكۆ بووم، هەتاكو ئەو ڕۆژە هەرگیز خۆم لە تاكە وانەیەكیش نەدزیبووەوە. شوێنێكی گەورەی بەتاڵم بەدیكرد لەناو چیمەنەكەداو كەسی لەدەور نەبوو، پشتم لەو خوێندكارانە كرد كە بەرەو پۆلەكانیان دەڕۆیشتن تاكو كەس دەموچاوم نەبینێت. ڕۆژێكی خۆشی مانگی نیسان بوو، چاوم بەنێو ئەو درەختە بێشومارانەدا دەگێڕا كە چواردەوری زانكۆیان دابوو. قەڵەمەكەم گرتە دەست‌و نەمدەزانی لەكوێوە

دەستپێبکەم، وەڵێ دەستمکرد بەنوسین بۆ دایكو باوکم.

بەلێشاو تورەییم لێدەرچوو لەحاڵێکدا لەوەوپێش هەرگیز ڕێگەم بەخۆم نەدابوو هەستی پێبکەم. بەلێشاو پرسیاری تورەم بۆ دروست بوو کە وەڵامێکم بۆیان نەبوو.

بۆچی نەڕۆیشتن کاتێك عەمو هاتە ژیانمانەوە؟ متمانەم پێتان کرد! ئێوە دایكو باوکمن. دایكو باوك چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکرێت منداڵەکانیان بپارێزن نەوەك بیانخەنە بەر مەترسی. هەڵبژاردنەکەتان تەنها ژیانی ئێوەی نەگۆڕی بەڵکو ژیانی منو براکانیشمی گۆڕی. ئێوە بیرتان لەچی دەکردەوە؟ نەتاندەزانی ئەو چەند خراپ بوو؟ مەگەر نەتاندەخوێندەوە وەختێ گەشتی دەرەوەی وڵاتتان دەکرد، خەڵکی پێی نەدەگوتن ئەو کێیە؟ مەسەلە چی بوو، نکوڵی دەکەن یاخود پێی لێدەنێن؟ بۆچی سەرتان لەو خۆڵەدا ناشتبوو، بۆچی دەمتان، گوێتان، چاوتان داخستبوو؟ نەتاندەزانی ئەو شەیتانی گەورە بوو، نەك تەنها بۆ سەر ژیانی ئێوە بەڵکو بۆ سەر ژیانی منیش؟ چۆن توانیتان ئەمەم لەگەڵ بکەن، لەگەڵ منداڵی خۆتان، لەبەندیخانەیەکدا گەورەم بکەن سەرەڕای ئەو پەیوەندییەی نێوانتان کە ڕقم لێی دەبووەوەو دەمزانی خۆشتان حەزتان بەیەکتری نەدەکرد؟ باوکە، بۆچی نەتبردینە دەرەوەو هەڵنەهاتین؟ باوکە، جارێکیان بەڵێنت پێدام فێری فڕۆکە لێخوڕینم بکەیت، لەبیرتە؟ لەجیاتی ئەوە، لەلای پیاوێك بەجێتهێشتم کە دەتزانی هیچو پوچە؟ بۆچی بەتەنها لە وڵاتێکی بێگانەدا بەبێ هیچ پاڵپشتێك بەجێتهێشتم؟

دایکم، ئای دایکە تۆ خۆشەویستی ژیانمی. زۆرم خۆشەویستی. متمانەم پێکردیت. منداڵییەکی جوانت پێبەخشیمو منیش ژیانم دایە دەستی تۆ. پاشان ناپاکیت لەخۆمو متمانەکەشم کرد بەشێوەیەك کە بەجێتهێشتمو منت کردە شتێك کە لەژناندا رکت لێی بوو، ئەویش بێدەسەڵاتی بوو. چۆن توانیت ئەوەم بەرامبەر بکەیت؟ ئەو هەموو پیاوە هاتنە داخوازیم، بۆچی دڵڕەقترینیانت هەڵبژارد؟ دایکە، ئەو لاقەی کردم. ئەوە دەزانی؟ متمانەم پێکردیت، تەماشا بکە چیت بەسەر هێناوم! پاشان تۆشو باوکیشم لێرە بەبێ پارە بەجێتان هێشتم. بۆچی خۆمو خەونەکانمو خوێندنەکەمتان لەگۆڕنا دوای ئەوەی وا پەروەردەتان

کردبـووم زۆر بایـەخیان پێبـدەم؟ داخـۆ هـەرگیز ئیسـتێکتان نـەکردو بیرێکتـان نـەکردەوە ئـەوە گـوزەرانی ژیـانی مـن دەبێـت نـەك هـی ئێـوە؟ هـەرگیز داوام نەکردبوو بێم بـۆ ئەمـەریکا، مەگـەر داوام کردبـوو؟ ئـەوە خـەونی ئێـوە بـوو نـەك من. باوکم لەو بارەیەوە راستی دەکرد کە تـۆ بەتـەواوەتی هاتبویتـە ژیـانی منـەوە لە سـەردەمی لاویمـەوە. تەماشـاکە چۆن مێشـکت گێرۆدە کـردووم. تەماشاکە بـەم حەبانـە چیم لـەخۆم کـردووە. دایکـە، وەك تـۆ خـەریك بـوو خـۆم بکوژم. دایکـە، ئازاری کەسێك دەدەم کە هەروەك تۆ زۆر خۆشمدەوێت.

هەر نامەیەك کە دەمنوسی لەوەی پێشتر زیاتر بەتورەیی بارگاوی بوو. پاشان رۆژێکیان هەموو نامەکانم دڕاند. جاری دواتر، دایکم کاتژێر ۲ی شەو تەلەفۆنی بـۆ کـردم‌و پێمگـوت کـە رەوا نییـە لـە گێروگرفتـەکانی خۆیـدا بمنێـژێت لەکاتێکـدا نەمدەتوانی هیچ شتێکی بۆ بکەم، مـن منـداڵی ئـەو بـووم نـەك دایکـی. هێشـتا لـە رۆژانی پشوودا تەلەفۆنم  بۆ دەکـردن، بـەڵام لەمێشـکم دەرمکـردن. پێویسـت بـوو سەرنج بخەمە سەر خۆم.

چەند مانگێك دواترو لە کانونی یەکـەمی ساڵی ۱۹۹۵دا، لـە کۆشـکی سـپییەوە تەلەفۆنێکم بۆ کراو پێیان راگەیاندم رێکخراوەکەی ئێمە یەکێك بـووە لـەو شـەش رێکخـراوەی خـەڵات کرابـوون بـۆ کـارکردن لـەپێناو ژنـانی پەنابـەر. دوو سـاڵ تێپەڕیبوو بەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو چیرۆکانەی لە گۆڤاری "تـایم"ی ئەمـەریکادا بڵاوکرابوونەوەو ئێمەش خەڵاتێکمان پێدەدرا لەبەرامبەر کارەکانمان وەك بەشـێك لە هەوڵەکانی سـەرۆك کلینتـۆن بـۆ پیشـاندانی ئـەوەی ئەمریکاییـەکان بایـەخیان بەخەڵکی بۆسنیا داوە. ئەوەش رۆژێك بـوو پـێش ئـەوەی (رێککەوتنامـەی دەیـتن) لە فەرەنسا ئیمزا بکرێت.

ماوەیـەکی زۆربـوو هـەر بلـوزو کـابۆی رەشـم لەبـەردەکردو پـارەی کڕینـی جلوبەرگی جوانم نەبوو. کاتێك ئەو رۆژە خۆمگـۆڕی بۆ کۆشـکی سپی، ئـەو جلانـەم هێنایـە پێشـەوە کـە مـاوەی پێـنج سـاڵ بـوو هـەڵمگرتبوون‌و لەگەشـتێکماندا بـۆ ئەوروپا بەپارەی عەمو کڕیبومن‌و بریتیبوون لە قاتێکی مۆنـدی لەگـەڵ کراسـێکی ئێسـکادا، چاکەتێکی دیـۆرو جوتێـك پـێڵاوی چـەرم کـە لـەجێ پەنجـە گـەورەکانی هەریەکێکیاندا کونێکی تێدا بوو. هەرگیز ئۆفیسـی سـەرۆکم نـەبینیبوو، بـەڵام زۆر

حەزم بەبینینی سەرۆك كلینتۆن دەكرد. كاژێر ١٠ی سەر لەبەیانی بوو ئەو لەسەرخۆو قۆز بوو، سەهۆڵی ناو پەرداخی كۆكا كۆلاكەی دادەخرماند. قاچم خستە سەر قاچ بۆ شاردنەوەی كونی پێڵاوەكەم و ئێمەی ڕێزلێنراو گفتوگۆمان لەگەڵ بێل كلنتۆن و هیلاری كلنتۆن دەكرد لەبارەی پەنابەرەكان لە بۆسنیاو كرواتیا. كاتێك ڕۆیشتم، بەرنامەیەكی تەلەفزیۆنیم هەبوو لەگەڵ بانگێشت نامەیەك تاكو ڕۆژی دواتر لەگەڵ سەرۆك بەگەشتێكی ئاسمانی بڕۆم بۆ پاریس بۆ ئیمزاكردنی ڕێككەوتننامەی دەیتن، بەڵام بەهۆی مانگرتنی كرێكارانەوە ئەو گەشتە هەڵوەشایەوە. هەستێكی بەرزم بۆ دروست ببوو، بەبێ خەم وخەفەت هەتاكو دەنگی باوكم هاتە بەر گوێم "ئەمە مەخەرە مێشكتەوە".

كاتێك ئەو ڕۆژە من و ئەمجەد كۆشكی سپیمان جێهێشت و بە لیمۆزینی ڕاگەیاندن بەرەو چاوپێكەوتنێكی ستۆدیۆ بەڕێكەوتین، تەنها ٥ دۆلارمان پێبوو. ئەوە وایلێكردم قسەیەكی كۆنی دایكمم بیربكەوێتەوە كە دەیگوت "ژیان وەك خەیار وایە، ڕۆژێك لەدەستتدایەو ڕۆژی دواتر لە قونتدایە". لە بەغدا لەڕووی داراییەوە لەدەممدا بوو لەڕووی سیاسیشەوە لەپاشمدا بوو، هەموو شتێكم هەبوو كە بەپارە بكرایە بەڵام ئازادیم نەبوو. لێرە ئازادیم هەبوو بەڵام ئیفلاس بووم. بەڵام لەخۆشەویستیدا بووم و ئەو كارەم دەكرد كە مەبەستم بوو بیكەم.

هەفتەیەك دواتر، كاتێك تاقیكردنەوەكانی كۆتایی ساڵ تەواو بوون دانیشتم و بۆ یەكەمجار دوای گەڕانەوەم لە كرواتیا دەستمكرد بەگریان. كە دەستمكرد بەگریان دواتر نەمدەتوانی لە گریان بوەستمەوە. بێ ئەوەی بتوانم دەست بەسەر خۆمدا بگرم كەوتمە ناڵەو هاوار. هێندە بەردەوام بووم كە ئەمجەد تەلەفۆنی بۆ ئەمبولانس كرد تاكو یەكێك بنێرن دەرمانی هێوركەرەوەم بۆ بهێنن. كاتێك یاریدەدەرە پزیشكییەكان گەیشتن، دەستیانكرد بەپرسیاركردن و منیش بەهەنسكەوە وەڵامم دەدانەوە.

كچێكیان پرسی "مێردەكەت خراپ مامەڵەت لەگەڵ دەكات؟" گوتم "نەخێر، زۆرم خۆشدەوێت".

"دڵنیایت كە ئازاری نەداویت" ئامادەبوو ئەمجەد بە سەیارەیەكی پۆلیس ببات، ئەی ئەو لەكوێ بوو كاتێك هاوسەری فەخری بووم؟

گوتم، "بەڵێ، دڵنیام. زۆرم خۆشدەوێت. ئەو هەرگیز ئازاری نەداوم".

"ئەی دەربارەی ئیش و کارو خوێندن هیچ گرفتێکت هەیە؟"

"لە خوێندن پلەی نایابم هێناوەو تازەش خەڵاتێکم لە کۆشکی سپییەوە وەرگرتووە بۆ ئیش و کارەکانم".

"لێت تێناگەم، بەقوربان. پێم بڵێ چی بووە؟"

هەر دەمگوت "هیچی خراپ روووینەداوە. هیچ شتێك نییە. هەموو شتێك باش دەڕوات لەژیانمدا. نازانم چۆن لەم گریانە بوەستمەوە!"

# لەبیرەوەرییەکانی عالیەوە

سەدام هەرگیز نەدەوەستا لە بەکارهێنانی ئافرەت بۆ خۆشییەکانی خۆی. بەشێوەیەك باسی بەغدای دەکرد وەك ئەوەی ژنێك بێتو ئەویش خۆشەویستی لەگەڵدا بکات. باسی دارخورماو رووبارو خاكو ژنەکانی بەغدای دەکرد. دەیگوت هێندە بەغدای خۆشدەویت ناتوانێت بیر لەوە بکاتەوە کە لە دووری ئەو بژی.

هەرگیز لە ژن تێر نەدەبوو لەگەڵ ئەوەی چەندین ژنی لەبەردەستدا بوو. هۆکاری ئەمەی بەوە رووندەکردەوە، گوایە دەیەویت قەرەبووی رۆژە سەختەکانی ژیانی گەنجیو چالاکی سیاسی بکاتەوە. لەئێوارەیەکدا، پێی گوتین

کاتێك لەزینداندا بووە تەنانەت چێژی لەجوتبوونی دوو باڵندەش بینیووە. لەبەرئەوە، هیچ سنورێك نەبوو تاکو رێگری لێبکات لە دەستگەیشتن بەچەند ژن کە بیەویت، هەر لە ژنانی شارەوە هەتاکو ژنانی ناوچە گوندنشینەکان.

زۆر جار عێراقو گەلەکەی لەلایەن زۆرێك لەهێزەکانەوە دەستدرێژی کراوەتە سەر، بەڵام هیچ شتێك بەراورد ناکرێت بەو کارانەی سەدام دەرهەق بەو وڵاتەو گەلەکەی کردویەتی. هیچ شتێك بە زەبروزەنگی سەدام بەراورد نەدەکرا. دەبوایە بەرامبەر ئەم تاوانانە شایەتحاڵێکی بێدەنگ بوینایە. لەبەرامبەر ئەو شتانەی لەژیانمدا بینیومن، هەستم وەك منداڵێکی کۆستکەوتوو وەهایە.

# ئازادبوونم

ماوەی پێنج ساڵ بوو دایکم نەبینیبوو

قسەمان دەکرد، بەڵام وەرگرتنی تەلەفۆنە نێودەوڵەتییەکان قورس بوون و رقە دانەمرکاوەکەشم زۆری بۆ هێنابووم. تەنانەت ئەگەر بشمویستایە ئەو تووڕەییەم دەربڕم، چۆن بمانتوانیایە گفتوگۆیەك بکەین رازونیازی خۆم تیا دەربڕیایە لەکاتێکدا دەمزانی بەلایەنی کەمەوە کەسێکی هەواڵگر لە عێراق و رەنگە یەکێکیش لە ئەمەریکا گوێی بۆ قسەکانمان بگرتایە. ئەو گفتوگۆیانەی دەمانکرد شتێکی چاوەڕوانکراو بوون و بەکورتی هەر باسی بابەتە هەست و سۆزییەکانمان دەکردو هەمیشە بەوە کۆتاییمان پێدەهێنا کە دایکم داوای لێدەکردم بەسەردانێك بڕۆمەوە بۆماڵەوەو باسی ئەو ئاهەنگانەی بۆ دەکردم بەو بۆنەیەوە بۆمان سازدەکات. گێڕانی ئاهەنگێك تا بۆ هاوڕێکانی دایکمی بسەلمێنم دواجار هاوسەرگیرییەکی پەسەندم کردبوو دواهەمین شت بوو کە دەمویست. هەواڵگرە عێراقییەکان بەشێوازی کۆن هەواڵگرییان دەکرد ئەویش گوێگرتنی کەسێك بوو لە قسەکانی نێوان دوو کەسی تر، جارێکیان کەوتە قسەو لایەنی دایکمی گرت و گوتی "کچێکی باش بە، سەردانێکی ماڵەوە بکە". تەنانەت لە ئەمەریکاش پۆلیسە نهێنییەکانی عەمو پەیوەندییە تەلەفۆنیەکانیان دەبڕیم. دوای ئەوە، منیش هەمیشە دەمویست راستەوخۆ قسە لەگەڵ گوێگرەکە بکەم و دەمگوت "ئەمڕۆ چۆنی، دەنگوباسی عێراق چییە، هێشتا هەموو کەس تۆقاون؟"

رۆژێکیان لەساڵی ١٩٩٧دا، دایکم تەلەفۆنی کرد هەتاکو پێم بڵێت تەندروستی باش نییەو تووشی شەلینێك بووە پزیشکەکانی بەغدا نەیانتوانیبوو دەستنیشانی نەخۆشییەکەی بکەن، داوای لێکردم ئەگەر بتوانم بینینێکی پزیشکی لە ئەمەریکا بۆ رێکبخەم؟ چاودێری تەندروستیش لە عێراق کە یەکێك بوو لە باشترین چاودێری تەندروستی لە وڵاتە عەرەبییەکاندا ببووە قوربانییەکی تری گەمارۆکان—سزایەکی تر بۆ سزادراوەکان. توانیم ڤیزای بۆ وەربگرم و بینینی

پزیشکی بۆ ڕێکبخەم، لەناکاو دایکم بەسواری عەرەبانەیەکی فڕۆکەخانە گەڕایەوە نێو ژیانم، چاکەتێکی فەروویی لەبەردابوو. لەبەر شەلینەکەی بەلامەوە سەیر نەبوو کە بەسواری عەرەبانە لە فڕۆکەکە دایانگرت، بەڵام کاتێك باوەشم پێداکرد هەستمدەکرد ئەو هێزو تینەی ساڵانی پێشووی تێدا نەمابوو. ئەو جوانییەی جارانیشی بزر ببوو. کاتێك زەردەخەنەی دەکرد پێستی دەوری لێوەکانی چرچ دەبوون، ئیتر زانیم پیر ببوو. منو ئەمجەد شوقەیەکمان کرێبوو لە ئەلێکساندریا لە ڤێرجینیا، یەك ژووری نوستنی تێدابوو وەك (هێلانە)ی خۆمان دامانناببوو. باڵکۆنییەکی بێدەنگمان هەبوو دەیڕوانی بەسەر دارو درەختو مەلەوانگەیەکداو هاوڕێکانمان لە چەندین وڵاتەوە کە سەردانیان کردبووین تیایدا لەگەڵماندا مابوونەوە. هەتاکو ئەوکاتە، ئەو شوێنە پەناگەیەکی ئارام بوو لە ڕابردووم. کاتێك چوینە ژوورەوە پەشۆکا بوومو ناخم پڕبوو لە هەستی ململانێکاری.

دایکم بەهۆی ئەو گەشتە دووردرێژەوە زۆر هیلاك بوو، زوو نوست.

پرسی "کەشتییەکەی نوح؟"

کەشتییەکەی نوح. هەستم بەگەرمی خۆشەویستییە کۆنەکەی جاران دەکرد بەرامبەری. کاتێك بچووك بووم بەجێگا نوستنەکەی دایکمان دەگوت کەشتی نوح، چونکە ئێجگار گەورە بوو. هەندێکجارو کاتێك باوکم لەماڵ نەبوو بەتایبەتی لەکاتی شەڕەکاندا، لەوکاتەی منو برا بچووکەکانم لەکاتی خەوتندا بەسەر جێگا نوستنەکەیدا ڕاماندەکردو هەڵبەزو دابەزمان لەسەر دەکرد دایکم هاواری دەکرد "کەشتییەکەی نوح!". ئەو شەوە ویستم لەگەڵیدا بخەوم بەهیوای گەڕانەوەی هەندێك لەو متمانەیەی لەنێوانماندا نەمابوو، بەڵام بەدەر لە خەمو مەراق هیچ ئاسودەییەکم لەنزیکبوونەوە لێی بەدینەدەکرد. لەوێ ڕاکشابوومو بیرم لەو شتانە دەکردەوە دەمویست پێی بڵێم، کاتێك خەوی لێکەوت چومە لای ئەمجەد لەسەر قەنەفەکە، هەروەك بۆ خەوتنیش بەکاردەهات.

بەبێدەنگی لەسەر سنگی ئەمجەد دەگریامو گوتم "تەنانەت ناتوانم باوەشی پێدابکەم، ناتوانم".

بێجگە لە شەلینەکەی، ڕۆژی دواتر گەلێ باشتر بوو. وەك کچێکی گوێڕایەڵ،

نانی بەیانیم بۆ بردە جێگاکەی خۆیو مەوعیدەکانم بۆ باسکرد کە ڕێکمان خستبوو لەگەڵ ئەو شوێنانەی دامانئابوو سەردانیان بکەین. دوای نزیکەی حەوت ساڵ ئەوە یەکەمجاربوو پێکەوە دابنیشینو کێشەی هاوسەرگیریمان نەبێت، بەڵام لە یەکەم ڕۆژەوە ڕوونو ئاشکرابوو کە هەریەکەمان پێداویستی جیاوازمان هەبوو. ئەو دەیویست ئەو کچە خۆشەویستەی جارانی دەستبکەوێتەوە، منیش دەمویست ئەو دایکە بەهێزە، سەربەخۆیەی جارانم بۆ بگەڕێتەوە. لەسەرخۆ دەستمانکرد بەدانسو ئەمجەدیش بەشەرمەوە تەماشای دەکردین. چوین بۆ پەیمانگای سمیسۆنیانو دایکم بەبێدەنگی ئاماژەی کرد بۆ تابلۆی کچو دایکێكو ماوەیەکی زۆر لێی ڕوانی. ڕۆیشتین بۆ سەنتەری کەنەدایی بۆ تەماشاکردنی "Phantom of the opera" کە بریتیبوو لە چیرۆکی گەنجێکی گۆرانیبێژی ئۆپرا کە لەلایەن تارماییەکی شێواوی چارەگرانی ماسك بەسەر، بەند کرابوو. گۆرانیبێژەکە بە کەسە ئازاردەرەکەی گوت "ئەوانەی دەموچاوتیان دیوە لەترسان کشاونەتەوە دواوە". منیش دەمویست بڵێم، دایکە ئەوەتا تەماشاکە "من ئەو ماسکەم تۆ پۆشیوتە". ئەوە دێوەزمەی ژیانمە کە تۆ بۆت دروستکردوم. نایبینی؟ من ئەو ماسکەم عەمو لە دەموچاوی دەکرد. هێشتا ئەم دێوەزمەیەم لەگەڵدایە کە دەموچاوم لێدەبێتەوەو خەڵکی دەموچاوی ئەو لەژێر ئەوەکەی منەوە دەبینن. دایکە، هەستی پێناکەیت؟ بەڵام ئەوەی ئەو دەیگوت هەر ئەوە بوو کە چەندێك نمایشەکەی بەلاوە خۆش بوو. جگە لەو جنێوانەی باوکی ئەمجەد بە سەدام حسێنی دەداو نەیدەزانی ئێمە دەیناسین، کەس باسی ئەو پیاوەی نەدەکرد کە شێوەی ژیانمی دارشتبوو یاخود بڵێن شێواندبوو.

شەوێکیان دایکم ژنو مێردێکی عێراقی بۆ نانی ئێوارە بانگێشت کرد کە وەها ڕێککەوتبوو سەردانی منداڵەکانیان بکەن لە واشنتۆن. بۆ ئێوارەکەی دایکم بەجوانی خۆی گۆڕیبوو، هەرکە دانیشتین بۆ نانخواردن هەستم بەو نیگەرانیو دوودڵییە لەڕادەبەدەرە کرد کە هەموو جارێك تووشی دەبووم لەوکاتەی پێکەوە دەچوینە ئاهەنگەکانی ناو کۆشکی ساجیدەو دایکم هەوڵیدەدا من دەربخاتو منیش دەبوایە زەردەخەنە بکەمو وا خۆم بنواندایە دڵخۆشم هەتاکو ساجدە خۆشحاڵ بکەم، بەڵام ئەم جارەیان جیاواز بوو. تەمەنم بیستو حەوت ساڵ بوو.

لەخانووی خۆمدا بووم. زۆر تێکۆشابووم هەتاکو ئەو نەریتە کۆنانە بشکێنم‌و ڕێمنەدەدا بمگێڕێتەوە بۆ ئەو حاڵەتە. بەڕێزەوە هەستام‌و چوومە لای تەسجیلەکەو گۆرانییەکی فارسیم خستەسەر بەدەنگی گۆرانیبێژ گوگوش. دەستبەجێ، قسەوباسی سەر مێزی نانخواردن وەستا. دەموچاوی دایکم سوور هەڵگەڕاو دڵۆپە ئارەق کەوتە سەر لێوی سەرەوەی کە هەمیشە وای لێدەهات لەوکاتەی تووڕە ببوایە یان شەرمەزاری دایبگرتایە. دایکم تەماشایەکی کردم من بۆ ماوەیەکی زۆر لەبیرم نەدەچووەوە. ئەمجەد واقی وڕمابوو. ئەو تەنها کەسێکی سەر مێزەکە بوو عێراقی نەبێت، قسەو ئاماژەی ترسی ئێمەی نەدەزانی، لەلێدانی گۆرانی دوژمن تێنەدەگەشت. لەکۆتاییدا، بارگرژییەکە نەما کاتێك پیاوە عێراقییەکە گوتی "ئەها، ئەم مۆسیقایەم لەیاد چووبوو. زۆر دەمێکە گوێم لێنەبووە". پاشان هەمووومان پێکەنین، دوای ساتێکی کەم بۆمان دەرکەوت چ نەزانییەکە دوای چەند ساڵ لەکۆتایی هاتنی جەنگەکە لە گۆرانییەك بترسیت هەرچەندە هەزارەها میل لە بەغداوە دوور بیت. دوای ئەوە چووینە سەر باسکردنی بابەتە بێ مەترسییەکانی ڕۆژە کۆنەکانی بەغدا. لەناخدا هەستم بەشەرمەزاری دەکرد کاتێك بۆمدەرکەوت چەندێك بێ هەست‌و ستەمکار بووم. نەمدەزانی ئاخۆ ئەو میوانانە بەعسی بوون یان نا. ڕەنگە هەواڵگر بووبن، لەبەرئەوە دەبوایە دایکم بۆ پاراستنی سەلامەتی خۆی لەکاتی گەڕانەوەیدا چارەسەری دەرەنجامەکانی ڕەفتارە نەزانیەکەمی بکردایە. لەجیاتی هاوبەشیکردنی سەربەستییەکەم لەگەڵ دایکمدا، سەریم دەخستە قوڕەوەو ژیانیم دەخستە مەترسییەوە.

یەکێك لەو شتانەی ڕێکمخستبوو پیشاندانی ئەو دەستکەوتانە بوو بەدەستم هێنابوون، سەرەڕای ئەو دەردەسەرییەی بەسەرمندا هێنابووی. دەمویست بەشێوە تازەکەم خۆمی پیشان بدەم، داکۆکیکارێکی ژنان کە ڕێکخراوێکی ژنانی نێودەوڵەتی دامەزراندبوو و شارەزابوو لەو ژنانەی لە جەنگ ڕزگاریان ببوو، نوسینی لەسەر ئەو بابەتە بڵاوکردبووەوەو لە تەلەفزیۆن دەرکەوتبوو، ئەو پەڕی هەوڵی خۆی خستبووە گەڕ بۆ بەدیهێنانی جیاوازی لە ژیانی خەڵکیدا. لەنێوان مەوعیدەکانی چوونە لای پزشك، دایکم برد بۆ ئۆفیسەکەمان‌و بەرنامەی

کارەکانم بۆ روونکردەوە کە لە هەوڵی راپەڕاندنیاندا بووین. باسی کەمپەکانی لاقەکردنم بۆ کرد لە بۆسنیا لەگەڵ لاقەکردنە بەکۆمەڵەکان لە رواندا و وێنەی ئەو ژنانەم پیشاندا لەو شوێنانە چاوپێکەوتنم لەگەڵ کردبوون. گوێی بۆ هەموو ئەو شتانە دەگرت کە باسمدەکرد، ئەویش وەك خۆبەخشێك دەستیکرد بەکارکردن لەگەڵماندا، ئەو نامانەی ژنان لە بۆسنیاو کرواتیاو رواندا دەیاننارد دەیخوێندنەوەو دەیخستنە فایلەوە. کاتێك بینیم کاردانەوەی چۆن بوو، دەمزانی ئەو دایکەی فێری کردبووم گرنگی بە ژنان و گیروگرفتەکانیان بدەم هێشتا لەناخیدا بوو. ئەو تاکە کەس بوو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە هانی دابوومو پشتیوانی کردبووم، لەرێی خۆی وەك نموونەیەك و ئەو کتێبە فێمینیزمیانەی پێیدابووم. بریارمدا ئەو بەرهەمە فێمینیستیانەی بخەمە بەردەست کە هەڵبژاردەی خۆم بوون و هەندێکیان دەربارەی پەیوەندییەکانی نێوان کچ و دایك بوون و لەسەر یەك بۆمدانا بەو شێوەیەی خۆم دەمویست بیانخوێنێتەوە. کتێبەکانیش ئەمانە بوون: (یانەی خۆشیی بەخت) لە نوسینی ئەیمی تان، (رەنگی مۆر) نوسینی ئالیس وۆلکەر، (هەستی دلفرێنی مێینە) نوسینی بێتی فریدان، (شاژنە لەبیرکراوەکانی ئیسلام) نوسینی فاتمە مارنیسی.

دوای خوێندنەوەی تەنها بەشێکی ئەیمی تان، دایکم لە مەبەستەکەم تێگەشت.

پرسیاری لێکردم "دەتەوێت پێم بڵێیت من دایکێکی باش نەبووم بۆت؟"

ئەوە کردنەوەی ئەو بابەتە بوو کە دەمویست باسی بکەین. دوانیوەڕۆیەکی خۆرەتاو بوو، دایکم تووشی سەرسوڕمانی کردم. بۆ ماوەیەك گومانم لە باسکردنی بابەتەکە هەبوو. بەشێوەی نەریتباوی عێراقیانە وەڵامم دایەوەو سێ جار لەسەر یەك گوتم "نا نا نا، تۆ دایکێکی زۆر باشیت و زۆرم خۆشدەوێیت".

بەڵام دایکم زەردەخەنە روکەشەکەی دەزانیم کاتێك بینیمی.

چەند رۆژێك دواتر پێیگوتم "شتێك هەیە زەینەب، چی بووە؟ چیمکردووە زەینەب؟ بۆچی ئەوەندە لێم تورەی؟"

لەسەر کورسییەك دانیشتبوو پێکەوە بەرگمان تێگرتبوو. من لەتەنیشتییەوەو لەسەر ئەرزەکە دانیشتبووم. هەستمدەکرد هەموو تورەیی و

شێتگیریی‌و بێئومێدیم بە تەوژمێك خەشم‌و كین‌و تاوانباركردنەوە هەڵدەقولا. دەستمپێكرد "دایكە، هەرچی شتێكت كە یارمەتیت دابووم بونیادیان بنێم لەناوبرد! بۆچی ئەو كارەت بەسەر هێنام؟ لەدوا ساڵی كۆلێژ دەرتهێنام؟ لە خێزان‌و هاورێكانمت دوورخستمەوەو منت دا بەپیاوێك كە هەر نەمدەناسی، پیاوێك كە ئازاری پێگەیاندم؟ بۆچی وازت لێهێنام‌و بەتەنها لەم وڵاتە بێگانەیەدا بەجێتهێشتم؟" دەستمكرد بەهەنسكدان.

"ئۆ، زەنوبە، تۆ نازانیت".

"زانین، چی هەیە كە نەیزانم، دایە؟ تۆ گاڵتەت بەو كەسانە دەكرد كە مێردیان بە كەسانی نەناس دەكرد! پێتدەگوتم كۆلێژ تەواو بكەم‌و كارێك بكەم‌و ببمە ژنێكی بەهێز، بەڵام تەماشاكە چیت لە كچەكەت كردووە! بڕوام پێت هەبوو دایە، تۆ بەدرێژایی نیوەی جیهان منت دوورخستەوەو منت كردە باوەشی پیاوێكەوە كە هیچ ڕێزێكی بۆ ئەو شتانە نەبوو كە فێرت كردبووم گرنگیان پێبدەم. دایە، ژیانم دایە دەست تۆو متمانەم پێكردیت! تۆ ئەو كەسە بوویت ئامۆژگاریت دەكردم كە هەرگیز نابێت بهێڵم هیچ پیاوێك خراپ مامەڵەم لەگەڵ بكات، بەڵام تۆ چیت كرد؟ منت دایە پیاوێكی قێزەونی ساردوسڕ كە دوو جار لاقەی كردم!"

نازانم چۆن باسی ئەو نیگایە بكەم كە خستییە سەرم. نیگایەكی تێكشكاوی شكستخواردوو لەناكامی لەدەستدەرچوونی شتێك. بینیم پەرێشان بوو، شانەكانی داكەوتن، دانەوییەوەو سەری خستە سەر دەستەكانی‌و دەستیكرد بەگریان.

دواجار گوتی "دەبوایە رزگارت بكەم ئازیزەكەم، دەبوایە. ئەو تۆی دەویست، زەینەب. هیچ ڕێگەچارەیەكی ترم نەبوو".

"ئەو، ئەو كێیە؟"

ماوەیەكی زۆر بوو لە ئەمەریكا بووم. لە عێراقدا تەنها یەك (ئەو) هەبوو، ئەویش عەمو بوو".

كەواتە دایكم منی نەناردبوو بۆ ئەمەریكا بۆ بەدیهێنانی خەونەكەی؟ ئەو منی دابوو بە فەخری، لەبەرئەوەی دەترسا عەمو لاقەم بكات؟ من لاقە بكات؟ تێگەشتن لە قورسی‌و ڕێ تێنەچوویی ئەم قسەیە ئاسان نەبوو.

پێمگوت "بەڵام دایکە من تەنها نۆزدە ساڵ بووم". زۆر لە شتێکی ساویلکەو بێ مانا دەچوو.

"زەینەب، لە چاوەکانی ئەودا تۆ ژن بوویت. دەزگیراندار بوویت. پاش ئەوەی لە دەستگیرانەکەت جیابوویتەوە. تۆ ژن بوویت ئیتر".

تکای لێکردم تێگەشتنم هەبێتو گەڕایەوە بۆ ئەو کاتانەی لەگەڵ عەمودا بەسەرم بردبوونو من ویستبووم لەبیر خۆمیان بەرمەوە، بەوهیوایەی ئەو کاتانەم بیربخاتەوە وەك چۆن خۆی بینیبووی.

"ئەو شەوەت لەبیرە لەسەر بالکۆنی تەنیشت رووبارەکە وەستابویتو منو ئەو تەماشامان دەکردیت؟ لەو مانگە شەوەدا شنەی با قژتی شانە دەکردو ئەویش وەستابوو چاوی تێبڕیبووی وەك ئەوەی هەڵتمژێت. من لەتەنیشتییەوە وەستابووم، ئازیزەکەم. ئەوجۆرە تەماشاکردنەیم دەناسی. تەنانەت لەوکاتەی پێیگوتم "کچەکەت زۆر جوانە" رووی لێ وەرنەگێڕایت. ئەو شەوە زانیم پێویستە لەتۆ دووری بخەمەوە بەوەی رەوانەی دەرەوەت بکەم".

"بەڵام، دایکە.." زمانم لاڵ ببوو، دەمویست لەو تاوانە بگەم کە هەرگیز بەسەرمدا نەهاتبوو عەمو ئەندێشەی وەهای هەبێت. "ئێمە وەك خێزانی ئەو وابوین، نەیدەتوانی، ئازاری نەدەدام، وانەبوو؟"

"ئای، شیرینەکەم، هیواخواز بووم هەرگیز ئەم شتانەت پێنەڵێم، بەڵام دەمبینی دڵی بەتۆدا چووبوو. ئەو زەردەخەنەیەی لەگەڵدا دەکردیت، دەزانی کامە، زەردەخەنە جوانە سەرنجڕاکێشە بەماناکەی. دەمزانی مەبەستی لەو زەردەخەنە نەفرەتییە چییە. متمانەم پێبکە زەینەب، نازانی ئەو چۆن بوو".

ئەوکاتەم بیرکەوتەوە کە یەکەم شەو بوو بینیم دوای ئەوەی لە دەستگیرانەکەم جیاببومەوە، بۆ ماوەیەکی زۆر چاوی بڕیبووە چاوەکانمو من پێموابوو سۆزو بەزەیی پێمدا دێتەوە. ئەوە هەمان ئەو شەوە بوو کە بەنیگایەکی نەرمەوە تەماشای دەکردمو سەمای بلو دەنوبیم دەکرد، وامدانابوو سزای سارا دەدات. مەگەر لەوە زیاتر شتی تر هەبوو؟ بەڵێ، یەکەسەر زانیم، هەبوو.

سەیری چاوە جوانەکانی دایکمم کرد، ئێجگار سوور بوونو لەئازاردا گوشرابوون بەهۆی ئەوەی چەندە بەناڕەوایی مامەڵەم لەگەڵ کردبوو. هەستم

بەلێشاوێك متمانـەو خۆشەویسـتی دەكـردو خـۆمكردە باوەشـیەوەو پێكـەوە هەنسكمان دەدا لەوەی عەمو چی بەسـەر هەردوكمانـدا هێنا لەگەڵ ئـەو ساڵانەی لەدەسـتمان دان. هەسـتم بـەئازارەكانیو دەربڕینـی بەژانوسـوێی دەكـرد. ئـەوە یەكێك بوو لە چركەساتە هەرە كاریگەرەكانی ژیانم. ئەوساتە بوو كە جارێكی تـر بوومەوە بە كچیو ئەو ساتە بوو ئەویش توانی ئاسودەییم پـێ ببەخشێت. داوای لێخۆشـبوونم لێكـرد، ئـەویش بەهـەمان شـێوە. لـەكوێ بیزانیایـە كـە لەدەسـت لاقەكردن رزگارم دەكاتو دەمنێرێتە باوەشی لاقەكەرێكی ترەوە؟

دوای ئـەوەی هـەردوكمان هێـور بووینـەوە، پێیگـوتم ئـەوو دایـكو باوكـەكانی تـریش نیگـەرانی كچـەكانیان بـوون ئـەو رۆژەی عـەمو سـواری ئۆتۆمبێلـە وەرزشییەكەی كردین بەبێ ئەوەی ئەوان ئاگادار بكاتەوە.

"كچـینە، چـەندێك نیگـەرانتان بـووین! كاتێـك گەڕانـەوە، ئـەو هەسـتی بەتێكچـونی دەموچـاومان كـردو ئێـوەی بـەرێكرد. پاشـان ئێمـەی بـردە لاوەو بەتوڕەییەوە پێی گوتین "چۆن دەوێرن بەشێوەیەك بیربكەنـەوە كە شتێك لە كچەكانتان دەكەم!"

گوێبیستی دەنگی عـەمو بووم لـە دەنگی دایكمدا. ئاوازی دەنگیم دەزانـیو موچڕك بەهەموو لەشمدا دەگەڕا.

ناحەقیان نـەبوو بترسێن كاتێك ببینن سـەدام حسێن كچەكانیان دەبات بـۆ پیاسـە لەحاڵێكـدا هـەموویان لـە تـافی لاویـدا بـوون. ئـەوان هیچـیان لەدەسـت نەدەهاتو بێدەسەڵات بوون. دەیتوانی هەرشتێكمان لێبكات كە پێی خـۆش بێـتو ئەوانیش هیچ شتێكیان پێنەدەكرا. بەهیچ شێوەیەك خـەیاڵم بـەلای هـیچ شـتێكی مەترسیداردا نەدەچوو. تـەنها دوو جارم لـەبیرە كە بەڕاسـتی كـاتێكی خۆشـیم لە هاوەڵێكردنی ئەو بەسەربردبێت، ئەو دوانیوەڕۆیە یەكێك بوو لەو دوو جارە. دوای ئەو هەموو ساڵو هەموو خوێندنە، بەلای منەوە هەرگیز ئەو سـەدام حسێنەی كـە جینۆسـایدی ئەنجامـدا لەگـەڵ ئـەو سـەدام حسـێنە یەكناگرێتـەوە كـە ئـەو رۆژە بەئۆتۆمبێلـە سـوورە وەرزشـییەكەی پیاسـەی پێكـردین. لـەڕووی مەعریفییـەوە تێدەگەشـتم، بـەلام لـەڕووی هەسـتو سـۆزەوە تێنەدەگەشـتم. هێشـتا جیـاوازیو بەربەسـتی نێـوان ئـەو سـەرلێدەركردنو سـەرلێدەرنەكردنە لەمێشـكمدا گینگڵی

دەدا، جیاوازییەکەش زۆر بوو.

دواتر، کەسێك کە هەرگیز لەژێر دەسەڵاتی سەدام حسێندا نەژیابوو چەند پرسیارێکی لێکردم وەڵامدانەوەیان بەلامەوە سەخت بوو. بەدەر لەو هاوسەرگیرییە رێکخراوە، مەگەر هیچ رێگەیەکی تر نەبوو بۆ دەربازبوون؟ ئاخۆ نەدەکرا دایکم راستییەکەم پێبڵێت، بەتایبەتی دوای ئەوەی وازم لە فەخری هێنا؟ بەشێکی وەڵامی ئەو پرسیارانەم دەزانی کە دەکەوتە سەر لایەنە لۆجیستیکی وەك سنوردارییەکان لەسەر گەشتکردنو حەواڵەکردنی پارەو تەنانەت بڕوانامەی زانکۆش، بەڵام خودی پرسیارەکان تێنەگەشتنێکی بەرچاویان پیشاندەدا لەوەی چیمان دەزانی پێویست بوو ئەنجامی بدەین تاکو لەژیاندا بمێنینەوە. لە عێراق هەرگیز ئەو ئازادییەمان نەبوو تاکو بەو شێوەیە بیربکەینەوە. ترسو تۆقین باریکترین گوزەری سەلامەتی لەمێشکماندا هەڵتەکاندبوو، بەردەوام مێشکمان بەو جۆرە بوو. ئەگەر دایکم پێی بگوتمایە لەبەرچی منی دابوو بە فەخری، هەموو ئومێدێکی لەناودەچوو، لەبەرئەوەی بەلای ئەوەوە هاوسەرگیرییەکی باش بوو. لەجیاتی ئەوە، ئەو بیرە هەڵەیەی پاراستو هەلێکی پێدامو ئەو ئەگەرانەی سنوردارکرد تاکو عەمو هەست بە مەرامەکانی دایکم نەکاتو ئەویشو خێزانەکەشی سزا نەدات. هەر رێگەیەکی دەربازبوونی کرداری هەبووبێت، ئەم شێوەیان تاکە رێگە بوو کە زۆرێك لە دایکە عێراقییەکان پێیان باش بوو تاکو کچەکەیان لەدەست لاقەکردنی عودەیو خودی عەموش بپارێزن. ئاواتەخواز بووم بزانم چەند کەسی تری هاوشێوەی من هەبوون؟ چەند کەسمان مێردی کردبوو بە وێنەو دەنگی کەسێك لەتەلەفۆندا؟

دایکم ئەو کارەی ئەنجامدابوو کە هەر دایکێك لەبێچارەیدا ئەنجامی دەدا. وەك دایکی موسا چۆن کوڕەکەی کردە سەبەتەیەکەوەو بە شەپۆلەکانی نیلی سپارد، هاوشێوەی دایکە ڤێتنامییەکان کە داماوانە منداڵەکانیان بۆ سەربازە ئەمەریکاییەکان فڕێدەدا کاتێك لەکۆتایی جەنگی ڤێتنامدا دەڕۆشتنەوە بۆ وڵاتەکەیان، وەك ئەو ژنانەی لە کەمپەکانی پەنابەران لێمدەپاڕانەوە کچەکانیان لەگەڵ خۆمدا ببەم، دایکیشم بەوشێوەیە دەستی لەمن هەڵگرتبوو. منیش ئازارو سزام دابوو بەوەی هێندە خۆشی ویستبووم.

نەخۆشییەکەی دایکم بەخەمۆکی درێژخایەن دەستنیشانکرا، دەرەنجامێك کە قسەکردن لەسەری قورس بوو، ئەمە بێجگە لە زیاتر دەرکەوتنی نیشانە دیارەکانی گرفتی جەستەیی. هەرچەندە نەیانتوانی هۆکارەکەی بدۆزنەوە، پزیشکەکان هەستیان کرد شەلینەکە گرفتێکی جیاواز بوو کە دەکرا دواتر لە عێراق چارەسەر بکرێت. هەوڵمدا رازی بکەم لەگەڵماندا بمێنێتەوە، بەڵام دەیگوت پێویستە بگەڕێتەوە بۆ لای برا بچوکەکەم کە هێشتا لە بەغدا لە قوتابخانە بوو. ئەمجارەیان بە کۆڵێك ئازارو ترس‌و دوودڵییەوە سواری فڕۆکەکەم کرد، هاوکات لەگەڵ برێك دەرمانی پرۆزاك بۆ چارەسەرکردنی خەمۆکی‌و نیگەران بوونی.

باش نەبوو. چەند مانگێك دوای ئەوە پشکنین‌و چارەسەری پزیشکی زیاتری بۆ کرا تاکو دوای حەوت مانگ کار گەیشتە ئەوەی نەشتەرگەرییەکی کوشندەو ناپێویستی بۆ بکرێت لە عەممان. لەو ماوەیەدا توانیم ئاستەنگەکانی گەڕانەوەی بۆ رابماڵم‌و بیهێنمەوە بۆ ئەمەریکا تاکو لەتەکمدا بێت. ئێجگار نەخۆش بوو لەگەڵ ئەوەشدا کەس نەیدەزانی بۆ وایە. چەند مانگێکی لە نەخۆشخانە ئەمەریکاییەکان بەسەربردو ماوەیەکی زیاتر لەوەشی لەچارەسەرکردنی ئاساییدا مایەوە پێش ئەوەی دواجار نەخۆشییەکی مەترسیداری تێدا دەستنیشان بکرێت کە بەخەیاڵدا نەدەهات. نەخۆشی ALS، کە نەخۆشییەکی مەترسیداری دەمارییەو هەردەم وەك "بەندیخانەی ژیان"باسی لێوە دەکرێت، چونکە خانەکانی دەوری مێشك بەبەردەوامی هەر بەرەو خراپتر دەڕوات تاکو دواجار هەمووی پێکەوە لەکاردەکەوێت. ماسولکەکانی جەستەی دایکم هێندە لاواز ببوون بەدەگمەن دەیتوانی بجوڵێت‌و دواتر بەتەواوەتی شل‌و شۆڵ‌و بێهێز بوو. بەڵام مێشکی وەك خۆی مایەوەو هەتاکو کاتی مردنی ئاگای لەهەموو چرکەساتێکی بوو. لەگەڵ ئەوەی نەدەزانرا بارودۆخەکەی ئەو پەیوەندیی هەبوو یان نە، (ALS) بەسترابووەوە بە (نیشانەکانی نەخۆشی جەنگی کەنداو)ەوە کە تووشی سەربازە ئەمریکی‌و بەریتانییەکان ببوو لەودەمەی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست خزمەتی سەربازییان کردبوو.

تەمەنی دایکم پەنجاو یەك ساڵ بوو. نەخۆشییەکە چارەسەرنەکراو بوو. پێدەچوو دوو ساڵی مابێت، یاخود دە ساڵی لەژیاندا مابوو ئەگەر بەخت یاوەری

بوایە هەرچەند هەندێك دەیانگوت بەخت ڕەشییە. ترسی لەدەستدانی دایکم کە بەدرێژایی ژیانم لەگەڵمدا بوو خەریك بوو بە وجود دەهات.

پێیگوتم "دەمەوێت لە وڵاتی خۆماندا بمرم. ئەوە تاکە ئاواتمە".

من و ئەمجەد ماڵەکەمان گواستەوە بۆ شوقەیەك دوو ژووری نوستنی تێدا بوو، ڕووناك و خۆش و بۆ کەمتواناش لەبار بوو. دایکم دەیویست لەسەر جێگایەکی ئاسایی لەسەر ئەرزەکە بخەوێت و لەسەر کورسییەکی ئاسایش دابنیشێت و تاکو بکرایە ژیانێکی ئاسایی بگوزەراندایە، چونکە نەیدەتوانی بەبێ یارمەتی کەسێکی دیکە بجوڵێت. ئەو کورسییە کۆنەی بۆی کڕیبووم بەقوماشێکی شەرابی پاکستانی چاکم کردەوە و چواردەوریم بە ڕووەك دەورە دا. ژووری نوستنەکەیم بە ڕەنگی شەرابی و سەوز کە جوانترین ڕەنگ بوون بەلایەوە ڕازاندەوە، هەروەها تابلۆی کۆنی بەغدام بە دیواری ژوورەکەیدا هەڵواسی هەرچۆن لە ژووری دانیشتنەکەمان لە بەغدا هەڵمانواسیبوون.

لەوکاتەی هێنامان تاکو لەگەڵماندا بژی (لەگەڵماندا بمرێت)، نەیدەتوانی بڕوات و تەنانەت نەیدەتوانی سەریشی بجوڵێنێت و نەبوایە کەسێك سەری بۆ بجوڵاندایە. زەردەخەنە جوانەکانی نەمابوون. ماسولکەکانی جەستەیی و دەموچاوە جوانەکەی شل ببوون و پێستی دەموچاویشی وەك پەردەی پەنجەرەیەکی داخراو هاتبووە خوارەوە. سەردەمانێك دەموچاوەی زۆر ڕوون و گەشاوە بوو، بەڵام بێجگە لە چاوە گەورە قاوەییەکانی کە بەهۆی نەخۆشییەکەوە زیاتر گەورە ببوون تەواوی دەموچاوی تێکچووبوو. تەنانەت نەمدەتوانی باوەشی پێدا بکەم لەترسی ئەوەی نەوەك هەناسەی بوەستێت. لەژوورەکەیدا ئۆکسجینمان بۆ دانا بوو. نەیدەتوانی قسە بکات، بەڵام بەشێوەیەکی سەیرو خۆشبەختانە هێشتا دەیتوانی دەستی بجوڵێنێت. لەبەرئەوە ئەگەر قەڵەمێکمان بدایەتە دەستی دەیتوانی لەڕێی نوسینەوە قسەمان لەگەڵدا بکات.

یەکەمجار بەسواری کورسییەکەی دەمانبرد بۆ گەشتکردن بەدەوری شارەکەدا، بەڵام بۆ هەر شوێنێك بڕۆیشتینایە خەڵکی ڕادەوەستان و چاویان تێدەبڕی. لەسەرەتادا میوانیشمان هەبوو، بەڵام کە تەماشایان دەکرد یەکسەر دڵیان پڕ دەبوو دەستیان دەکرد بەگریان. ئەو شتەی پێویستی نەبوو بەزەیی پێداهاتنەوە

بوو، لەبەرئەوە مانگەکانی کۆتایی ژیانی بەقالبوون لەگەڵ خێزانەکەی و نامە نوسین بۆ هاوەڵەکانی و لەگەڵ بەخێوکارێکی تەنزانی بەناوی فاتمەوە بەسەربرد کە چاودێریی دەکرد لەوکاتەی منو ئەمجەد لەماڵ نەبوینایە. ئەمجەد لە دواساڵی خوێندنی پارێزەریدا بوو کاتێکیش دەهاتەوەماڵەوە تەلەفزیۆنەکەی بۆ دەخستە سەر بەرنامەی بوکەڵەکانی منداڵە کڵاوبەسەرەکە (Beanie Baby Puppet Show). ئەمجەد حەوزێکی ماسی بۆ کڕیو پڕیکرد لە ماسی گۆڵدفش تاکو لەڕۆژدا دایکم بۆخۆی تەماشای بکردایە، ئەگەر یەکێکیان لێ بمردایە ئەوا یەکسەر دانەیەکی تری لە جێگای دادەنا پێش ئەوەی دایکم بیزانیایە کە مردووە. خوێندنەوەی شیعرەکانی رۆمی بۆ دایکم ببووە خوییەکی شەوانە. حەیدەری برام کە لەبیرم بوو کۆمپیوتەر ببووە خەوو خۆراکی تازە ڤیزای وەرگرتبوو تاکو لە دیترۆیت نیش بکاتو هەرکاتێکیش بیتوانیایە سەردانی دایکمی دەکردو دەیشۆردو قژی شانە دەکردو خۆشەویستیو میهرەبانییەکی نێجگار زۆری بۆی هەبوو. تاکو ئەوکاتە نزیکەی ساڵێك بوو دایکم حەسەنی برا بچوکمی نەبینیبوو، زۆر خەمی بوو. هەوڵێکی زۆرمان داو نێجگار لە بەرپرسە ئەمەریکاییەکان پاڕاینەوە تاکو بتوانێت سەردانی دایکم بکات بەڵام ڤیزەیان پێنەدا. کاتێك بە تەلەفۆن قسەمان لەگەڵ دەکرد، گوشی تەلەفۆنەکەم دەنا بەگوێی دایکمەوەو گوێی بۆ حەسەن دەگرت کە قسەی لەگەڵ دەکرد پاشان گوشی تەلەفۆنەکەم نزم دەکردەوە بۆ بەردەستی دایکمو سێ جار پێیدا دەکێشا (تگ، تگ، تگ) تاکو حەسەن بزانێت گوێبیستی قسەکانی بوو.

ئەمە ئەو چارەنوسە نەبوو کە هیچ کام لە ئێمە بۆ دایکمی خواستبێت. لەگەڵ ئەوەشدا بۆی دەنوسیم ئەو ساتانە خۆشترین رۆژەکانی ژیانی بوون. ئەگەرچی گەڵێ خەمناك بوو بەلامەوە، بەڵام لە نەخۆشییەکەی تێدەگەشتم. کۆششێك نەبوو بۆی بکەین، هیچمان پێنەدەکرا، ئەمەش بۆخۆی جۆرە ئارامییەکی خۆی هەبوو. کاتمان هەبوو پلان دابنێینو ئامادەیەکمان دانا کە پێم بڵێت دوای مردنیشی دڵی لەلامە، ئەویش هەستی دەستپێداهێنانی پشتی پەنجەکانی بوو بەڕوومەتمدا. لە قاتی حەوتەمی شوقەکەدا بووینو بەسەر دیمەنێکی ڤێرجینیادا دەڕوانی کە لەگەڵ ئاسماندا لەیەکیدابوو. هاوشێوەی

زۆرێك لە عێراقیەكان لەساڵانی نەوەدەكاندا دایكم زیاتر رووی لە ئایین كردبوو. یەكەمجار بەلامەوە سەیر بوو كە بینیم تەسبیحی هەڵگرتبوو نزای دەكرد بەبێ ئەوەی لێوەكانی بجوڵێنێت یاخود دەنگێكی لێوە بێت. وێرای ئەوانەش، جۆرە جوانیو خۆشییەك لەو رۆژانەدا هەبوو. ئەو ترسەی ماوەی بیستو پێنج ساڵ لەگەڵیدا ژیابوو نەمابوو، ئەوەش وەك هاندەرێك بوو بۆم كە دەمبینی هێندە بێ فیزو خۆڕاگرە لەسەروبەندی دوایی هاتنی ژیانیدا. ئەو سورەتەی قورئانی بۆ دەستنیشانكردم كە دوای كۆچكردنی بۆی بخوێنمو دەستیكرد بەنوسینی نامە بۆ هاورێ كۆنەكانی لە عێراقو پێی رادەگەیاندن چەندێك خۆشی دەویستنو داوای گەردن ئازادی لێدەكردنو گەردنی ئەوانەشی ئازاد دەكرد، ئەگەر ناخۆشییەك لەنێوانیاندا دروست بووبێت. كاتێك لە نیش دەگەڕامەوە، هەمیشە شتێكی تازە روویدابوو، وەك وێنەكێشانی دەموچاوی پوورێكم بەرەنگێكی درەوشاوەی بۆیەی ئاوی كە بەبیری خۆی كێشابووی، نامەیەك تاكو بۆ هاورێیەكی كۆنی بنێرم، خواردنێكی عێراقی كە شێوازی ئامادەكردنەكەی بە بەخێوكارەكەی گوتبوو تاكو بۆم لێبنێت.

ئەوكاتە لە بەغدا دایكم گازندەی ئەوەی دەكرد كە دەستەكانی زۆر گۆشتن بوون. ئێستا بەشێوەیەكی سەیر جوان ببوون، لەلایەن خودایەكی بەخشندەوە كەرەستەكانی قەشەنگیان پێبەخشرابوو. دوو بەتانی چنی، دانەیەكی زەرد بۆ منو دانەیەكی سپی بۆ ئەو منداڵەی كە بەڵێنم دابوو هەرگیز نەمبێت، لەسەر كاغەزێك نوسیبووی "لەكاتێكدا مێشكت گۆڕی تاكو منداڵت هەبێت، ئەم بەتانیە بۆ ئەو". لەگەڵ هەر تەقەڵێكدا نزای دەكردو داوای لێخۆشبونی لە خودا دەكرد "خوایە لێمخۆش بە، خوایە لێمخۆش بە، خوایە لێمخۆش بە". بوو بەجۆرە مۆدێلێكی جیاواز بۆ من. ئەو جوانییەی رۆژانێك بەسەر روخسارییەوە بوو، گۆڕابوو بۆ ریزێك جوانیو بەهێزیی لە ناخیدا. لەم لایەنەدا نموونەیەك بوو بۆمو دوای ئەوە هەوڵمدا هەموو ئەو بەدحاڵیبوونانە لەژیانمدا بسڕمەوە نەوەك لەپڕ مردن یەخەی منیش بگرێت.

پاش چەند ساڵێك لە هەوڵدان بۆ سڕینەوەی رابردووم، دواجار درکم بەوە كرد زۆر پێویست بوو لەو رابردووە تێبگەم. دەبێت چەندێك شتی لێ

شاردبێتمەوە لەوکاتەی گەورە دەبووم؟ خۆپەرستانە لەوە دەترسام کە کۆنترۆڵی دەستەکانی لەدەست بدات پێش ئەوەی بە نوسینیش قسە لەگەڵ تاکە کچەکەی بکات، لەبەرئەوە شەوێکیان داواملێکرد شت بۆ منیش بنوسێتو ئەویش رازی بوو.

ئیتر لەوکاتە بەدواوە نەیدەتوانی قسە بکاتو بە نوسین ژیانی بەڕومدا کردەوە. باسی ئەو شەوەی دەکرد کە بۆ یەکەمجار لەگەڵ باوکمدا چاویان بە عەمو کەوتبوو. من لەو شوێنە بووم. کاتێک گەنج بووم باسی دورگەی بەرازی بۆ کردبووم، ئەوێکات بەلامەوە وەك چیرۆکێکی خەیاڵی وابوو. لەوکاتەدا ئەگەرچی نوسینەکانی رەنگدانەوەی جۆرە بێباکیو سەرکەشییەك بوو، من وەك ئاماژەیەکی رەشی رووداوەکانی دواتر دەمبینی، وەك ئۆپراسیۆنێکی گەریلا کە لەلایەن کەسێکی ستراتیژی بێ بەزەییو دڵڕەقەوە پلانڕێژی بۆ کرابوو هەروەها بەباشی چەکەکانی دەستی هەڵبژاردبوو کە بریتی بوون لە تفەنگو شامپانیا. دایکم بەخەیاڵی خۆمدا دەهێنا لەوکاتەی پێنج ساڵ لە ئێستای من گەنجتر بوو، گەنجێکی قەشەنگی کەیفخۆشی تێروتەسەل، چەند ساڵێکی کەم بوو زانکۆی تەواو کردبوو لەگەڵ پیاوێکی کەشخەی قۆزدا سەمای دەکرد لەپێش تیپێکی میوزیکی راستەوخۆدا لەتەك کەسە گەنجترەکانی وەك پوورە لەیلاو مازنی هاوسەریو پوورە نەداو قەیسی هاوسەریدا.

هەستم بە بزوێنەری بەلەمەکان دەکرد کە بەپێچەوانەی تەوژمی دیجلەوە دەهاتنو لە دورگەی بەراز کەناریان دەگرت، خەڵکەکە راستەوخۆ بەرەو پیری باوەشی پیاوێکی قۆزی کەشخە دەرۆشتن کە جلوبەرگی سپی پۆشیبوو وەك ئەکتەرێك لەسەر شانۆ بێتو روناکی مانگی لەسەر بێت. هەرکە دابەزین ئەم کەسە بەرگ سپییە چەقەنەی لێدەداو بەلەمی تریش لە تاریکاییانەوە دەردەکەوتنو چواردەوریان گرت، گوایە خاوەنی ئاهەنگەکە ئەم میوانداریيەی بۆ رێکخستبوون. سەربازەکانیش نزیك دەبوونەوەو سینی شامپانیایان هەڵگرتبوو. هاورێیان لەناو خۆیاندا پرسیاریان دەکرد، ئەم پیاوە کێیە؟ بەڵام تەنانەت دوای ئەوەی ناسێنرا، خەڵکەکە ئەو ناوەیان نەبیستبوو. هەموو کەس سەرۆکی دەناسی، بەڵام کێ سەدام حسێنی ئامۆزای دەناسی کە جێگری سەرۆك بوو؟ بێشك دایكو

باوکم نەیاندەناسی. دایکم هێندە بێباکانە پرسی بووی "سەدام حسێن کێیە؟" وەك ئەوەی جارێکی تر ناوی نەهێنێتەوە.

کاتێك ئەم نوسینەی دایکم خوێندەوە، پێڵاوە سپییەکانی عەموم هاتە پێشچاو لە لم و قوڕی دورگەی بەرازدا. لەناو ئەو لمەدا گەمەم کردبوو، بەهەستێکی منداڵانەو خۆتاوانبارکردنەوە، بەداخ بووم بۆ ئەوەی سەدام ئەو شوێنەی هەڵبژاردبوو بۆ پەلاماردان و رکێفکردنی ژیانمان. لەبیرمە باوکم خلیسکانی سەرئاوی دەکرد بەدەوری دورگەی بەرازدا، کەشخەو باڵا رێك و لەدوایەوە شەپۆلی ئاو بەکەوانەیی کەفی دەکردو دەموچاوی شێوەی سەیری دروستدەکردو ناوبەناو قاچێکی دەهێنایە دەرەوە تاکو من و ئامۆزاو پوورزاکانم بخاتە پێکەنین. ئاواتەخوازم بمزانیایە ئێستا دایك و باوکم چۆن دەبوون ئەگەر سەدام حسێن وازی لێبهێنانایە خۆیان بن؟ دواجار کەی بوو باوکم شتێکی وەها بێمێشکانەی کردبێت؟ ئاخۆ ئەوکاتەش دایکم هەر لێرە لەلاشەیدا بەند دەبوو تەنانەت لەوکاتەی بەرەو گیاندانیش دەچوو؟

عەمو بەفێڵ و تەڵەکەی راوچییانەوە شوێن دایك و باوکم کەوتبوو. بۆ ماوەی دوو ساڵ بانگێشتنامەی بۆ دەناردن، بەڵام ئەوان پاساویان دەهێنایەوە تاکو خۆیانی لێ بەدوور بگرن. لەساڵی ١٩٧٤دا ئارامی لەبەرهەڵگیرابوو، لەبەرئەوە تەڵەیەکی نایەوە: داوای لە مەحمود کرد کە هاوڕێی هەردوولا بوو ئەویش لە دورگەی بەراز ئاهەنگی سەرەتا یەکتربینینی رێکخستبوو بێنەوەی بە دایك و باوکم بڵێت کە سەدام دێت بۆ ئاهەنگەکە. کاتێك لەزەنگیاندا مەحمود وەڵامی دایەوەو ئاگاداری کردنەوە کە سەدام حسێن لەژوورەوەیە. لەبەردەم دەرگاکەدا وەستان و بەوردی بیریان لەو بژاردانە کردەوەو یەکێکیان هەڵبژارد. ئەگەر بڕۆشتنایە عەیبێکی گەورە دەبوو بەلایانەوە.

دایکم نوسی "لەبەرئەوە ماینەوە، ئەمەش ژیانمانی گۆڕی".

ئەوان مانەوەیان بەزیندویی هەڵبژارد، خۆیان بەڕێزو ئەدەبەوە پیشانداو دواجار بووە زیندانمان. هەوڵمدا خۆم بخەمە جێی دایکم کە لەو بەردەرگایەدا وەستابوو، لەپەشۆکاویدا هەر تفم قوتدەداو لەگەڵ هاوسەرەکەمدا هەر تەماشای یەکترمان دەکردو بەخێرایی دەرەنجامەکانمان هەڵسەنگاند کە ڕەنگە لەسەر

ئێمەش‌و منداڵەکەشمان بکەوتایە ئەگەر بێ چاوو روو بوینایە. دەمزانی، منیش هەر دەچوومە ژوورەوە. ئەوە یەکەم هەنگاو بوو کە لەگەڵ شەیتان گرتیانەبەر. جارێکیان دایکم بە شەیتانی گەورە ناوی هێنا. مەگەر شەیتان فریشتەیەکی نەفرەت لێکراو نەبوو کە دەسەڵات‌و جادوی خۆی هەبوو بۆ ئەوەی تاف تاف خەڵکی بخاتە ریزی خۆیەوەو تا کار بەوە گەشت بتوانێت ئەو شتانەتان لێ ببات کە پێتان وابوو گرنگترین شتی ژیانتانە؟

بۆی نوسیم "سەرەتا، پێمان وابوو ئەگەر وریابین دەتوانین پەیوەندییەکە چارە بکەین". لەو کاتەدا ویستم هاواربکەم‌و بڵێم دایکە مەحاڵ بوو! تەماشای ئەو دەرەنجامانە بکە کە دەبێت هەمووومان باجەکەی بدەین!

لەگەڵ ئەوەشدا، لەنوسینەکانیەوە لوتبەرزییە بێئاگاکەیم بۆدەرکەوت لەهەڵگرتنی بەرپرسیارێتی نەزانییدا. ئەوان ساویلکانە لە بەغدا مابونەوەو بێئاگابوون لەوەی لەپێشیانە. مەحمود، کە وادەردەکەوێت لێزانتر بووبێت وڵاتی بەجێهێشتبوو. هەرگیز چاوم بە مەحمودی هاورێیان نەکەوتبوو، بەڵام لەخوێندنەوەی نوسینەکانی دایکمداو بەخەیاڵمدا هات ئەو کەسێکی زیرەکی سەرکێش بووبێت، هێند چاونەترس ببوو خۆی خستبووە بەر مەترسی شوێنێکی نادیار لەکاتێکدا دایک‌و باوکی من مانەوە. ترسابوون ئەو هەنگاوە بنێن‌و ساویلکانە وایان دانابوو هەرچۆنێك بێت دەتوانن بەسەلامەتی بمێننەوەو ماڵەکەمان بپارێزن. بۆچی ئەوان هێندە جەربەزە نەبوون تاکو وەك مەحمود وڵات بەجێبهێڵن؟ بۆچی هەندێك خەڵك رۆیشتن‌و هەندێکیش مانەوە؟ قورس بوو تەماشای دایکم بکەم‌و نەبینم چەند پەرێشان‌و بێهیوا ببوو لەهەموو هەوڵەکانی هەڵهاتنی‌و لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك یاداشتەکانیم دەخوێندەوە هەستمدەکرد هێشتا دەتوانم کەمێك وێنای ئەو دایکە گەنجە بەسەزمانە لەچاوەکانیدا ببینم.

هەموو شەوێك کە لەنیش دەهاتمەوە ئەوەی نوسیبوی وەك زنجیرەیەك دەمخوێندەوە. هەندێکجار چەند رستەیەکی کەمی دەنوسی‌و هەندێك جاریش زیاتر. دایکم پیشانیدام کە سەدام حسێن وەك زۆردارێکی گەنج بەرەو هەڵکشان دەچێت پێش ئەوەی سەرنجی دونیا بۆ لای خۆی رابکێشێت. لەترسەکانی خۆمەوە کە بۆ کاری سینەمایی دەشیا لەگەڵ بیرەوەرییەکانی دایکم وایان لێکردم وێنای

عەمو وەك كوندەپەپویەكی راوكەری شەو بكێشم كە بەشەقامەكاندا دەورو خولی دەكردو دایكوباوكم‌و كەسانی تری لەخەو رادەپەڕاند بۆ سازدانی ئاهەنگ یاخود بۆ ئەوەی ماوەیەكی دوورودرێژ گوێی بۆ بگرن. گەلێ كاتم بیردێتەوە جێگای بێزاری بوون: دایكم بەپەلە ناو چەكمەجەكانی كەوانتەرەكە دەگەڕا بۆ فستەق تا لەسەر مێزە ساجییەكە بۆ عەموی دابنێت، عەمو بەزەردەخەنە كەمەندكێشەكەیەوەو سندوقێك شیڤاس ریگاڵەوە خۆی دەكرد بەژووردا، باوكم لەسەر قەنەفە شینەكەمان دەیخواردەوە، پەست‌و بێزار بوو لەم (هاوڕێیەتییە ناهاوتایە) هەروەك دایكم‌و باوكم وایان پێدەگوت، لەگەڵ ئەوەشدا زیاتری دەخواردەوە، دایكم ژیرانە دەنگی تەسجیلەكەی كزدەكرد تاكو منداڵەكانی بەخەبەر نەیەنەوە كە لەقاتی سەرەوە خەوتبون ئەوانیش من‌و حەیدەر بووین، بۆگەنی تێكەڵاوی ویسكی‌و قۆڵۆنیاش ئەو ناوەی پڕ دەكرد.

خوێندنەوەی ئەو شتانەی نوسیبونی هەم خۆشی بەخش‌و هەم ئازاردەریش بوون، هاوشێوەی تەماشاكردنی فیلمێكی تراژیدی بوون كە تیایدا بەدەر لە پاڵەوانەكان هەموو لایەك كارەساتی دواتریان دەبینی. ماوەیەكی زۆر بوو پوورە نەحلەم نەبینیبوو. یەكێك بوو لەباشترین هاوڕێكانی دایكم. لەنێستادا لەڕێی نوسینەكانی دایكمەوە دەیبینم لەسەرەخۆ لەگەڵ عەمو سەما دەكات دوای ئەوەی عەمو هێندە ویسكی دەرخواردی مێردەكەی دابوو كەوتبوو و پێویستی بەیارمەتی هەبوو، هێشتا پوورە نەحلەی گرتبوو تاكو سەمای هێواشی لەگەڵ بكات. دیمەنی رووی نەحلەم بەسەر شانی عەموەوە دەهێنایە پێش چاوم، سەرشاربوو بەترس لەكاتی سەماكردنیداو نەشیدەتوانی بڕوات‌و یارمەتی هاوسەرەكەی بدات. ئەو هونەرمەند بوو، ئێواران لەگەڵ دایكمدا پێكەوە دادەنیشتن بۆ خواردنەوەی قاوەی توركی‌و دەنگی فنجانە بچوكەكانی قاوەكەم بیردێتەوە كە لەسەر ژێرەكەی سەرەونخونیان دەكرد تا وێنەی دەرچوو لە خڵتەی قاوەی بنی فنجانەكە بخوێننەوەو پێشبینی رووداوەكانی دوارۆژیان دەكرد. رۆژێكیان دایكم بەچاوی گریاناوییەوە هاتەوەو كاتێك پرسیارم لێكرد چی رویداوە، گوتی پوورە نەحلە لەپێش چاوی عەمو غەیبەتی كردووە. هەرگیز پێی نەگوتم نەحلە چی گوتبوو، بەڵام دەمزانی بەتوندی ئازاری دابوو. دەمزانی زۆر دڵشكاندنی لەم بابەتە هەبوو،

دەمبینی کە بێتاقەتییەکەی زیادی دەکرد لەبەرئەوەی یەك لەدوای یەكو زۆرێك لەپوورەکانم لەژیانماندا نەمان لەسەردەمی خانووی مەزراکەدا. ئێستاش دوای پانزە ساڵ، دایکم نامەیەکی دایە دەستم تاکو بینێرم بۆ پوورە نەحلە کە پێی راگەیاندبوو خۆشی دەوێتو گەردنی ئازاد کردبوو هەروەها داوای گەردن ئازادیشی لێکردبوو. لەبەرچی بوو، نەمدەزانیو پرسیاریشم نەکرد چی روویدابوو لەنێوانیاندا. لەهەندێك شوێنی نوسینەکانیدا سڕینەوەی پێوە بوو کە شەوان بۆی دادەنام. دەمزانی سڕینەوە چەند بەلایەوە قورس بوو چونکە توانای بەسەریدا نەدەشکا.

رێکخراوی (ژنان لەپێناو ژنانی نێودەوڵەتی) لەوکاتەدا لەگەورەبوندا بوو. چوار ئۆفیسمان هەبوو، لەکۆسۆڤۆ جەنگ دەستی پێکردبوو هەموو ئاماژەکانی کارەساتێکی تری مرۆیی پێوەدیار بوو. نامەی ئەو ژنانەم دەخوێندەوە کە لەناوچەکانی جەنگەوە دەیانناردن، پاشان دەڕۆیشتمەماڵەوەو یادەوەرییەکانی دایکم دەخوێندەوەو زۆر شتیش لەنێوانیاندا هاوشێوە بوون. هەمان راستی گێڕانەوە، گەواهیدەرێکی بەجەرگ دەرهەق بەناحەقییەکان، هەمان ترسو تۆقین بەشێوەیەکی جیاواز. بیرم لەو سەدەها یاخود هەزارەها روخسارەی ئەو ژنانە دەکردەوە کە بینیبووم بەهۆی لاقەکردن یاخود جەنگەوە داڕوخابوون. بێجگە لە ئەجسا، دەموچاویان سڕ ببوو، بەڵام هیچ کامیان هاوشێوەی دایکم سڕ نەببوون.

ئەو بەدەگمەن هەستەکانی خۆی دەنوسی. هەردەم بەچیرۆك دەستی پێدەکرد بەڵام تەواوی نەدەکرد. شتی بێبایەخی لەگەڵ رووداوی مێژووی تێکەڵ دەکردو لە لێوردبونەوەکانی بۆ جلوبەرگو کۆشکەکانو سەردەمی منداڵی عەمو دەستی پێدەکردو دەگەیشتە دانپێدانانەکانی عەمو بۆ کوشتنی خەڵك. زۆرێك لەوانەی دایکم دەینوسی، یان دەمزانی یاخود بەخەیاڵمدا هاتبوو. هەندێك لەو چیرۆکانەم لە سەدام خۆی بیستبوو یان لەقوتابخانە فێر ببووم، بەڵام کە دەمخوێندنەوە بۆمدەرکەوت دایکمو باوکم هەر لەسەرەتاوە لەوە تێگەشتبوون کە توانای کوشتنی خەڵکی هەیە. ئەو لەسێدارەدانی سیاسیەتمەدارە رکابەرەکانی نەدەشاردەوە، لەبەرئەوە هیچ هۆکارێك نەبوو سەرم لەو راستییە بسوڕمێت کە خۆیهەڵدەکێشا بەکوشتنی هاوڕێکانی بەپەنهانی. بەڵام ئەوەی هەندێك کات

لەناخمدا ببووە گرێو ئەوی لەمنداڵیمەوە لەبیرم بوو، ئەوە بوو شەوێکیان دایکم گوێبیستی دانپێدانانەکەی بوو کە خۆی پێوەهەڵکێشا بوو، پاشان بۆ بەیانییەکەی منی برد بۆ قوتابخانە. تەنها دوای چەند ڕۆژێکی کەم لەوەوە دایکم ئامۆژگاری کردم کە بیرکردنەوە لە "عەمو" وەك تیرێك لەمێشکم بهاوێژمە دەرەوە وایە، بۆخۆی دەبوو گوێ بۆ عەمو بگرێت کە شانازیدەکات لەو دواییەدا برادەرێکی فالگرەوەی بەتەمەنی بەدەستی خۆی کوشتبوو. ژنێکی خۆشەویستی لەکاتێکدا کوشتبوو کە لەگەڵ دایکیو کچە سێ ساڵەکەی خەوتبوو، سەرەتا کچەکەی هاواریکردبوو کە سەدام دایکی کوشتوە، بەڵام دوایی هیچی تری لێ نەبیسترا دەربارەی ئەو بابەتە. دایکم نوسی "دەبوایە ئێمە بینەرێکی بێدەنگی تاوانەکانی بوینایە، ئێمە لەنێو ئەو قوربانیانەدا بووین چونکە کەس نەیدەتوانی لەزەبروزەنگەکانی ئەو رزگاری ببێت. بەهۆی ترسەکانمانەوە بەردەوام لەزیندانـدا دەژیاین، دەترساین پێی بڵێین وا نابێت یاخود تەنانەت وا خۆمان دەربخستایە کە لەکارەکانی دەترسین".

بەدەگمەن دەمزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ چیرۆکەکانی ئەو ژنانە بکەم کە لەناوچەکانی جەنگدا کارم بۆ دەکردن. نەمدەزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو چیرۆکانە بکەم دایکم دەیگێڕانەوە دەربارەی ئەوەی لە عێراق چی بینیبوو. بەخۆمم دەگوت وەك ماسی هەناسە بدە. هەناسەدانت لەبیربێت.

دواجار پرسیم "دایکە، ئەی بۆ مانەوە؟" ئەوە پرسیارێك بوو لەهەموو شتەکانی تر بەلامەوە پڕبایەختر بوو، هەوڵیشمدا بەشێوەیەك ئەو پرسیارە بکەم کە لۆمەکردنی تێدا نەبێت. لەوەڵامدا، تەنها بەچاوی بزی گەورەوە تەماشای کردم. بەچاوەکانی هەم پێدەکەنیو هەم دەشگریا هەرچەندە چیتر فرمێسکیان تێدا نەمابوو. بەچاوەکانی دەیگوت، مەڵێ تێناگەم بۆ مانەوە، ئەو دەمەبۆڵانەت بیرچوەتەوە کە منو باوکت تووشی دەبوین. زەنوبە، هێندە دەمێکە ڕۆیشتویت بیرت چوەتەوە حاڵو گوزەرانمان چۆن بوو؟

لەگەڵ خوێندنەوەی یاداشتەکاندا، لەوە تێدەگەشتم کە هاوشێوەی توندوتیژی عەمو حەزی بۆ سێکسیش بەهێز بوو.

پێموانییە هەرگیز ئەم لایەنانەی ئەوی پێبگوتمایە ئەگەر کارەکانی

نەبینیایە. ئەو باسی حەنناى بۆ دایكو باوكم كردبوو، واتە ئەو خانمەى خۆشیویستبوو پاشان بەدەستەكانى خۆى كوشتبووى. پاشان باسى ئەمەل كە مێردەكەى رەتیكردبووەوە هاورێیەتى لەگەڵ عەمو ببەستێتو دواجار لەسەر رێگاى فرۆكەخانە كۆتایى بەژیانى هات. هەروەها سەمیرەى خوشكى ئەمەل، ئەو ژنە خاتونەى كە رێزنەگرتنى لەلایەن باوكمەوە واى لە عەمو كردبوو ئەو شەوە بەسەر دایكمدا بقیژێنێت. ئەوەى بەمێشكمدا دەهات كاتێك سەرگوزەشتەكانى دایكم دەخوێندەوە ئەوە بوو كە ئەم شتانە چەند بێ شەرمانە بوون، عەمو كاتێك ویسكى دەخواردەوە پاساوى بۆ پێویستى ژن دەردەبڕى چونكە لەوكاتەى لەبەندیخانەدا ببوو لەسێكس بێبەش بوو، بۆیە تەنانەت لەجوتبونى چۆلەكەش لەودیو پەنجەرەكەوە چێژى بینیبوو. ئەو شەوەى (موسڵ)م بیركەوتەوە كە سەمیرە سەرى پەنجەكانى بەهێواشى بەڕانى عەمودا دەهێنا. سەرسام نەبووم لەوەى بۆچى باوكم نەیدەهێشت بێتە ماڵمان.

دایكم بەوچاوە گەورانەیەوە كە پڕبوون لە پرسیارو خوازیاریى شت زانین لێیدەڕوانیم، منیش دەمزانى دەیویست پێى بڵێم من بیرم لەچى دەكردەوە. لەڕێى پیادەكردنى ئەو وانانەى لەكامپى پەنابەراندا فێریان ببووم، تەنها سۆزو بەزەییم بۆ دەردەبڕى. ماچمدەكردو دەستەكانیم هەڵگرتو پێمدەگوت خۆشمدەوێت. ئەوپەڕى هەوڵى خۆممدەدا تاكو پیشانى بدەم كە كوێرانە بڕیار نادەم. بەخۆم دەگوت "بەهێزبە! تاكو نیگەران نەبێت لەوەى كە ناتوانم ئەو شتانەى دەیانگێڕێتەوە هەرسیان بكەم ئەگینا واز لەباسكردنیان دەهێنێت. ئاگات لێى بێت، واى لێ مەكە ئەو ئاگاى لێت بێت". ئەوەى نەیدەزانى ئەوە بوو، هەر ساتێكم بۆخۆم بەسەربردایە دەچوومە ژورەوەو دەرگاكەم دادەخستو بەسەر جلەكاندا دەگریام.

شەوێكیان ئەوەى نوسى كە عەمو چەندە (رۆژى گەل)ى پێخۆش بوو، رۆژێك بوو كە هاوڵاتیان دەچوونە لاىو داواى هاوكارییان بۆ كێشەكانیان لێدەكرد. ئەو دەمەى جەحێڵ بووم (رۆژى گەل) زۆر باو بوو. عەمو بەئۆتۆمبێلەكەى بەناو عێراقدا دەگەڕاو بەروانكەى سپى پزیشكى لەبەردەكرد وەك چارەسەرسازێكو خەڵكى تایبەتو هاوڵاتیانى كۆدەكردەوەو بەئاشكرا پاساى دەخستە ئەولاوەو

پارەی دەبەخشیە کەسێك و ژنێکی لەدەست پیاوێکی نابەدڵ جیادەکردەوە بۆ نواندنی بەخشندەیی خۆی. دایکم نوسی، ژنانی بانگێشت دەکردو هەوڵیدەدا سەرنجی جوانترینیان رابکێشێت بۆ کاری سێکسی. ئەگەر هەوڵەکەی شکستی بهێنایەو خۆیان بەدەستەوە نەدایە ئەوا لاقەی دەکردن. دوای ئەوەش رێگەیان پێدەدرا برۆن و زۆر جاریش یارمەتییەکی کەم دەدران، چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکرا سوپاسگوزاری خۆیان دەربڕن و بڵێن "زۆر سوپاست دەکەین جەنابی سەرۆك". هەندێکجار دەبوایە لەپێش چاوی کامێراکانی راگەیاندن سوپاسی سەرۆکیان بکردایە. دایکم نوسی، خۆشترین شوێن بەلایەوە لە (رۆژی گەل)دا گوندێك بوو لە سامەرا لەنزیك شوێنی لەدایکبونی نیهاب کە بە هەبوونی ژنی جوان تێیدا ناسرا بوو.

دایکم نیوەی بیرەوەرییەکانی تری منی لابوو کە مانای نیوەکەی لای منی تەواو دەکرد. نوسینەکانی بیرەوەری سەردەمێکی هێنامەوە یاد کاتێك من و دایکم چوین بۆ ماڵی یەکێك لەپوورەکانم بۆ نانی ئێوارەو هەر میوانەو شتێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆ خواردن. وابزانم نۆ یان دە ساڵ دەبووم. لەژووری دانیشتنەکەدا لەگەڵ گەورەکان دانیشتبووم. پوورە لەمیعە قسەی دەکرد، بێوەژنێکی قەشەنگ بوو، باسی ئەوەی بۆ ژنەکانی تر دەکرد چۆن رۆیشتبوو بۆ بینینی سەرۆك بۆ خستنەڕووی ئەو کێشەیەی هەیبوو کە پێموایە گرفتی دارایی بوو. لەهۆڵی چاوەڕوانی لەگەڵ چەند ژنێکی تردا چاوەڕێی کردبوو کاتێك سەرۆك هاتبووە دەرەوە ژنەکان بەبازنەیی بەدەوریدا کۆببونەوەو هەریەکەیان باسی کێشەی خۆی بۆ کردبوو. کاتێك پوورە لەمیعە باسی گرفتەکەی خۆی کردبوو، عەمو پێی گوتبوو کێشەکەی ئەو "ناڵۆزە" ئەو وشەیەم لەبیرماوە لەبەرئەوەی بەلامەوە مانای زۆری هەڵگرتبوو. داوای لێکردبوو تاکو بچێتە ئۆفیسە تایبەتەکەی خۆی و بەدوورو درێژی گفتوگۆی لەسەر بکەن. دایکم و هەموو هاوڕێکانی سەریان نا بەسەری لەمیعەوە، ئەویش دەستیکرد بەچرپە چرپ. چەند ساتێك لەوەوبەر ژوورەکە پڕ بوو لەقاقای پێکەنین و دەنگە دەنگ، پاشان خامۆشییەك ژوورەکەی داپۆشی. لەبیرمە دانیشتبوم و هێندە هەستم بەتەنیایی دەکرد نەمدەزانی بمێنمەوە یان برۆمە ژورەکەی تر، لەبەرئەوەی هەموو ژنەکان قۆڵیان کردبووە قۆڵی پوورە

لەمیعە کە هەمان ئەو کارەیان لەگەڵ پوورەکانی تر دەکرد لەباخچەکەمانداو دەچوونە دەرەوە کاتێك دەیانویست شتێك بڵێن‌و من نەزانم. گوێم لێبوو پوورە لەمیعە لەنێوانیاندا دەگریا. کاتێك ژنەکان بڵاوەیان کرد، پوورە لەمیعە فرمێسکەکانی دەسڕی. هەموو ژنەکان بەدایکیشمەوە زۆر خەفەتبار بوون.

لەگەڕانەوەماندا بۆ ماڵەوە لەدایکم پرسی "پوورە لەمیعە چییەتی؟"

ئەویش گوتی "باش دەبێت. زەینەب، کچم واز لەم بابەتە بێنە".

نەمدەتوانی لەیادی بکەم. ببووە خۆرەی ژیانم.

دەمزانی زۆرینەی لاقەکردن لەلایەن ئەندامانی خێزانەوە یان هاوڕێکانیانەوە ئەنجامدەدران‌و تاکو ئێستاش لە عێراق‌و زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکاندا تەنها کاتێك ژنان وەك کەسێکی بێتاوان دەبینرێن ئەگەر کەسانی ئەناسی چەکدار پەلاماریان بدەن‌و لاقەیان بکەن. لەقوتابخانەی ئامادەیی دەنگۆی وەهام بیستبوو کە موخابەرات ژنانیان کردبووە ئامانجی لاقەکردن‌و بەڤیدیۆ وێنەیان دەگرتن تاکو وەك هەڕەشە بەکاری بهێنن لەدژیان ئەگەر نەبونایە بە هەواڵدەر. ئەگەر ژنەکان باسی لاقەکردنەکانیان بکردایە ئەوا خۆیان دەخستە بەر مەترسی دەستلێهەڵگرتنیان لەلایەن هاوسەرەکانیانەوەو جیابونەوەیان لەمنداڵەکانیان، لەبەرئەوەی ژنان شەرەفی خێزانەکەیان هەڵگرتبوو. دەمزانی لەکولتوری عەرەبە پارێزکارەکانداو چەند بەشێکی تری جیهانیشدا شەرەفی خێزانەکە بەڕەفتاری ژن هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت، بەڵام لەڕاستیدا پیاوان خاوەنی ئەو شەرەفەن: هاوسەرەکەی، باوکی، براکانی یاخود کوڕەکانی. بۆ پاراستنی شەرەفی خۆی، پیاوەکە بەمافی خۆی دەزانێت کچەکە لە لاقەکارەکە مارە بېڕێت یاخود تەنانەت بیکوژێت. ئەگەر لاقەکارەکە ئەندامێکی خێزانەکە بێت، ئەوا چاوپۆشی لێدەکرێت یاخود پەردەپۆش دەکرێت. ئەگەر لاقەکارەکە تاوانکارێك بێت، ئیتر ژنەکە وا دادەنرێت کە بەکەڵکی هاوسەرگیری نایەت. بەڵام ئەگەر لاقەکارەکە خودی حکومەت بێت، ژنەکە دەبێتە قوربانی‌و پیاوەکەش لەپیاوەتی کەمدەبێتەوە، چونکە هیچ شتێکی پێناکرێت. دەگوترا کە پیاوەکان لەسەر ئەم جۆرە لاقەکردنانە خۆیان دەکوشت یاخود دەستیان لە ژن‌و منداڵەکانیان هەڵدەگرت‌و هەمووشی لەبەرخاتری پاراستنی شەرەفی خێزانەکەیان بوو.

هیچ گومانم لەوەدا نەبوو سەدام حسێن لاقەکردنی وەك رەهەندێکی ئاسایی کۆمەڵایەتی لێکردبوو وەك چۆن لەناو کۆمەڵگادا رق‌و کینەی بەرامبەر فارسەکان‌و شیعەکان چەسپاندبوو. هەمان تاکتیکەکانی ملیۆسۆڤیچ‌و ستالینی پێش ئەویشی بەکاردەهێنا کە بریتی بوون لەبەکارهێنانی ژنان بۆ ناردنی پەیامی سیاسی بۆ پیاوان لەپێناو پتەوکردنی پێگەی دەسەڵاتی خۆی. هەتاکو زیاتر بیرم لێبکردایەتەوە زیاتر هەستم بە بەدکاری‌و ترسی ئەو پیاوە دەکرد کە راهێنرابووم بە عەمو بانگی بکەم‌و ئەوەشی زۆرتر لێی دڵنیابووم ئەوە بوو سێکسی بەکارهێنابوو بۆ پێکەوە لکاندنی تۆڕی ترسەکانی‌و خۆخزاندنە نێو هەموو ئەو پەیوەندییە مرۆییانەی دەستی پێبگەیشتایە، بەهاوسەرگیریشەوە. بەدەر لە کوەیت‌و بەشێکی ئێران عەمو هەرچییەکی بویستایە بەئاسانی بەدەستی دەهێنا، هەر لەئاڵتونەوە هەتاکو هەنار. ئیتر ژنیش چۆن ناکەوێتەوێتەوە ئەو بازنەیەوە؟

رۆژێکیان لەدایکم پرسی "دایکە، مەبەستت چی بوو کاتێك پێتگوتم من نەمدەزانی عەمو چۆنە؟". بەچاوە گەورەکانی تەماشای کردم‌و زانیم پرسیاری چیم لێدەکات: زەینەب، دڵنیایت دەتەوێت گوێبیستی ئەمە بیت؟

بەڵێ.

باسی ژنە قەرەج‌و ئەو ژنانەی تری کرد کە لەگوندەکانەوە سواری پاس دەکران بۆ ئاهەنگەکان. هەندێکجار ژنان لەلایەن پۆلیسی نهێنییەوە لەسەر شەقامەکان ریێان پێدەگیراو دەبران، لەبەرئەوەی عەمو یان براکانی یاخود کورەکانی پێشتر چاویان پێیان کەوتبوو، نیازێکیان هەبوو. ژنێك هەبوو تەلەفۆنی بۆ ژنان دەکردو بانگێشتی دەکردن بۆ شوقەکەی بۆ (چا خواردنەوە) دەشزانرا کە خانمی بەردەستی عەمو بوو. ژنێکی ناسیاوی دایکم بانگێشتنامەیەکی چا خواردنەی پێگەیشت‌و دەترسا ئەو داوایە رەتبکاتەوە. لەبەرئەوە، کابۆیەکی زۆر تەسکی لەبەرکرد لەگەڵ بەستنی قایشێکی گەورەو جلوبەرگی زۆری تر بەسەریدا بەو هیوایەی ئەگەر عەمو گەیشتەجێ ئەو جلانە رێگری لێبکەن. لەجیاتی ئەوە، زۆر خراپتر مامەڵەی لەگەڵ کردبوو بەزۆر خۆیدابوو بەسەر ژنەکەدا.

بەترسەوە گوتم، "لاقە کرا".

دایکم نوسی "دەتوانیت بڵێت ئەوە لاقەکردن بوو یاخود کارێکی سێکسی زۆر

خراپ بوو". پێموابوو ئەوە خەمناکترین شت بوو هەتاکو ئەو کاتە لەژنێکەوە بیستبێتم کە یەکەمجار باسی سێکسی وەك شتێکی خۆش بۆ کچەکەی کردبێت.

ئەو شەوە کە چووم بخەوم، راکشام بەڵام نەمدەتوانی بخەوم. دەستمکرد بە پرسیارکردن بۆ بریارلێدان سەبارەت بەپێشێلکاریی فەخری بەرامبەرم. ئاخۆ ئەوە لاقەکردن بوو یاخود "کارێکی سێکسی خراپ" بوو؟ داخۆ پێشتر لەبریارلێدانەکەم هەڵەبووم؟ رقم لەوەبوو کە گومانم لەخۆم هەبوو. بیری جێگا نوستنەکەو بەرگەسەرینە گوڵ گوڵاوییەکەم کەوتەوە کە تاکو ئەوکاتەو ئێستاش هەڵمگرتووە. لەبیرمە هەستم بەوە دەکرد لەهەموو لایەکەوە پێشێلکاریم بەرامبەر کرابوو. نە بەشێکی جەستەم، نە تۆزێك لەگیانم بەشدارنەبوون لەو کارەدا. رەنگە بەلای ئەویشەوە وەك لاقەکردنی پارچە تەختەیەك وابوبێت. بەزۆر بوو، بەسوێ بوو، رقم لێی بوو، دژی وەستام. کارێکی سێکسی خراپ نەبوو، لاقەکردن بوو لەبەرئەوەش بەجێمهێشت.

دوای ئەوەی لەکارکردن تەواو بووم و گەشتمەوە ماڵەوەو دەرگاکەم کردەوە، دایکم لەسەر قەنەفەکە خۆشحاڵ و شادمان دەردەکەوت. لەراستیدا زۆر سەیر بوو، کە دەیتوانی هێندە هەستو سۆز لەرێی چاوەکانیەوە بنوێنێت. بەتەواوی تاكو تەنها بوو، ئەمجەد خۆی بۆ تاقیکردنەوەی پارێزەری ئامادە دەکرد، چاودێریکارەکەشی رۆیشتبوو.

لەوکاتەی بەهێواشی باوەشێکم پێداکردو بۆنی ئەوم هەڵدەمژی، پێموایە ئەویش بونی منی دەکرد، بەرقەوە پرسیم "دایکە، فاتمە لەکوێیە؟"

بەفیزەوە نوسی "پێمگوت برواتەوە. بامیەمان بۆ لێنایت. برۆ بیهێنەو لەگەڵمدا دابنیشە". بامیە خۆشترین خواردن بوو بەلامەوە بە سیرو دۆشاوی تەماتەو تەمەرندەوە تا مزربێت، هەڵبەت بەشێوازی عێراقی. نانی ئێوارەم خواردو دانیشتین بۆ تەماشاکردنی زنجیرەی (زێنا)، خانمە شازادەیەکی جەنگاوەر بوو شەوان کاتمان پێ بەسەردەبرد. (هەرقل)ێکی مێیینە، واتە داهێنراوی ئەفسانەی یۆنانی بوو، ڤێرژنێکی تازەی چیرۆکی ئەو (گوندی ژنان)ە بوو کە کاتی خۆی پوورەکانم قسەیان لەبارەوە دەکرد. زێنا کۆمەڵێك تەماشاکەری لەناو ژنە بەندکراوەکان و لێزبیانەکان و کچە هەرزەکارەکان و یەك دایکی عێراقی هەبوو کە

لەوکاتەدا لە ئەلیکساندریای ڤێرجینیا دەژیا.

دایکم نوسی "قورسترین لایەنی ئەم نەخۆشییە ئەوەیە کە ناتوانیت پێبکەنیت".

بۆ ماوەیەك یاری تاوڵەمان کرد، دەنگی ئەو زارەی پێی ئاشنابووین ئاماژەیەك بوو بۆ ئەو کاتە سنوردارەی پێکەوە بووین‌و پەس پەس بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت. لەماڵی خۆمدا لەگەڵ دایکمدا تەنها بووین، هیچ کەسێکی لێنەبوو بمانترسێنێت، دیوارەکان گوێگر نەبوون، لەوساتەدا هیچ پیاوێك لەو (گوندی ژنان)ەی ئێمەدا نەبوو. ئیتر زانیم دواجار دوای چەندین ساڵ ئەو دەرفەتە هاتوەتە پێش ئەو پرسیارانە لەدایکم بکەم کە بەمنداڵی نەمدەتوانی لێی بپرسم. ئەوە زەینەب سالبی نەبوو کە کاری بۆ ژنانی قوربانی جەنگ دەکرد، بەڵکو من بووم، کچەکەی. پێویست بوو نرخی ئەو باجە بزانم بۆ هاوڕێیەتیکردنی سەدام دابوومان.

"لەبیرتە تەلەفۆنت بۆ کردم لەوکاتەی من لە سارگەیفۆ بووم‌و لەتەلەفۆنەکەدا دەگریایت‌و پرسیاری ئەوەت لێدەکردم بۆچی خۆم خستوەتە جەنگێکەوە لەکاتێکدا هەموو شتێکت خستبووە بەر مەترسی تاکو لە عێراق بمبەیتە دەرەوە؟ دایکە، زۆر بیرم لەو قسەیەت کردەوە. بەم شێوەیە بیرم لێدەکردەوە، پێموایە لەجەنگێکەوە چومە نێو جەنگێکی ترەوە تاکو پرسیار لەژنانی تر بکەم بۆ دۆزینەوەی چەند وەڵامێك کە تەنها تۆ دەیانزانیت دایکە، ئێستاش دەبینم لەپێش چاوم دانیشتویت. دایکە، ئەم ئازارە لەناخمدایەو دەرناچێت. تۆش ئەم ئازارەت لەناختدا چەشتووە. خوازیارم بزانم کە ئاخۆ هەمان ئازارمان هەیە. دایکە، دەبێت لێت بپرسم، بۆچی بەدرێژایی ئەو هەموو کاتە ئازارت دەچەشت؟ دایکە، عەمو ئازاری دایت؟"

تیانوسی یادەوەرییەکانی لەکۆشیدا بوو، چنینەکەشی لەتەنیشتیدا دانابوو. هەوڵیدا بنوسێت، بەڵام دەستەکانی کەوتنە لەرزین. کەوتە هەناسەبڕکێ‌و دەموچاوی ئارەقەی کرد. روخساری سوور هەڵگەڕا. لەوە دەترسام لەدەستم بچێت‌و بمرێت. رامکردە ژووری نوستنەکەی بۆ هێنانی پەمپەکەی‌و ئۆکسجین تاکو هیچ نەبێت بۆ چەند رۆژو هەفتەی تر ژیانی رزگار بکەم. لەوساتەدا هیچ

شتێکم بەلاوە گرنگ نەبوو لەژیاندا مانەوەی دایکم نەبێت. ئەگەر بژاردەیەکم لەبەردەست بوایە، ئەوا تۆم هەڵدەبژارد دایکە. جارێکی تر پرسیارم لێنەکردەوە.

ئاياری ١٩٩٩ بوو، پەنابەران بەلێشاو لەجەنگی کۆسۆڤۆ هەڵدەهاتن و بەرەو ئەلبانیاو مەسەدۆنیا دەکەوتنەڕێ، زۆربەیان ژن و منداڵ بوون. دایکم کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنەکەی بەدەستەوە بوو بەردەوام تەماشای ئەو هەواڵانەی دەکرد. دوای ئەوەی لاقە دەکران و بەرەڵا دەکران، ژنان لەناوەڕاستی شەقامەکاندا بە سەرلێشێواوی و نیوە روتی دەبینران، ئێمەش باسی ئەوەمان دەکرد ئەو ژنانە چەندە بێدەسەڵاتن کە لەناوجەرگەی ئەو شەڕە بێسەرەو بەرەیەدا دەگیرێن و لاقە دەکرێن. ئەگەر لەبەر دایکم نەبوایە، بەچرکەیەک گەیشتبومە کۆسۆڤۆ بۆ دەستپێکردنی بەرنامەیەکی تازە لەو وڵاتەدا، بەڵام نەمدەتوانی بڕۆم. دایکم گرنگترین شت بوو لەژیانمدا.

پێیگوتم "زەینەب، پێویستە بڕۆیت بۆ کۆسۆڤۆ. ئازیزەکەم، بڕۆ یارمەتی ئەو ژنانە بدە".

"نا دایکە، پێویستە لای تۆ بمێنمەوە. تۆ گرنگترین کەسی بەلامەوە".

"زەینەب، پێویستە بڕۆیت. خەمی منت نەبێت. چاوەڕێی گەڕانەوەت دەکەم".

"بەڵام دایکە دەمەوێت لای تۆ بم پێش ئەوەی بەجێمبهێڵێت. نامەوێت لێت دوور بکەومەوە".

"زەینەب، بەڵێن بێت نەمرم لەکاتێکدا تۆ لێرە نیت".

دوای هەفتەیەک گەڕامەوە، بەهۆی گەشت و نیش و کارو چەشتنی ئازاری ئەو خەڵکە سەرلێشێواوەوە بڕستم لەبەربڕابوو. دایکم بەڵێنەکەی بردبووە سەرو تەماشای وێنەی ئەو ژنانەی دەکرد کە چاوم پێیان کەوتبوو، پرسیاری ئەوانی لێدەکردم و هێندە لەهەندێک وێنەیان وردبووەوە هەستمدەکرد دەیویست چیرۆکی ژیانی پشت روخساریان بزانێت. لەوکاتەی لەوێ نەبووم کۆمەڵێک وێنەی ژنانی گەنجی کۆڵنەدەری بە بۆیەی ئاوی کێشابوو، بەڕەنگی وەها ڕەونەقدارو جوان کە هیچ کەس بەخەیاڵیدا نەدەهات ژنێک لەسەر لێواری مەرگ بێت و ئەو وێنانەی کێشابێت، وەک کارتی سڵاوکردن و ئەحواڵ پرسین وێنەکانی لەسەر کارت کێشا

بوو. دواهەمین دانەیانی بۆ من دانابوو.

ماوەیەکی کەم دوای ئەوەی گەڕامەوە، بەخێوکارەکەی دایکم پێیگوتم دەڕوات بۆ پشوو. دڵم ڕێگەی نەدا کەسێکی تازە بهێنم کاتێك زانیم هێندە لەمەرگ نزیك بووەوە، لەبەرئەوە شەوو ڕۆژ خۆم چاوەدێریم دەکرد. پێنج ڕۆژ دواتر، لەوکاتەی پەرستاری نەخۆشخانەکە هات بۆ سەردانی هەفتانەی، لەڕووی جەستەییو هەستو سۆزەوە داڕوخابووم‌و بەخواردنەوەی قاوە مابومەوە، چ جەستەو هەستو چ سۆزو هێزم لێبڕابوو بۆ هێشتنەوەی دایکم بەزیندوویی. پەرستارەکە پێشنیازی ئەوەی کرد دایکم بۆ چەند ڕۆژێك بچێتە نەخۆشخانە تاکو پشویەك بدەم‌و دواتر چاوەدێری بکەمەوە، دایکم بەنابەدڵی ڕازیبوو.

حەیدەر گەیشتەجێ‌و لەو نەخۆشخانەیە لەلای دایکم مایەوە. دوای دوو ڕۆژ کاتێك من‌و ئەمجەد ڕۆیشتین بیهێنینەوە بۆماڵەوە کار لەکار ترازا بوو. بینیم دەیویست قەڵەمەکەی بگرێت بەدەستیەوە، بەڵام دەستەکانی هێندە بێهێز ببوون نەمدەتوانی بیخوێنمەوە چی نوسیبوو. من‌و حەیدەر هەریەکەو دەستێکیمان گرتبوو لەوکاتەی ئەمجەد قورئانی لەسەر دەخوێند. بینیم دەیویست یەك هەناسەی تر هەڵمژێت‌و ئیدی گیانی سپارد. بڕوام نەدەکرد. نەدەبوایە بمرێت. دەبوایە بمبردایەتەوە بۆ نیشتمانی خۆی تاکو لەوێ گیان بسپێرێت. بەڵێنم پێدابوو لەماڵەوە بمرێت. هەروەك ئەوە تاکە داوای ئەو بوو لەمنی کردبێت. بەردەوام داوام لەپزیشکەکە دەکرد ترپەو لێدانی دڵی بگرێت، لەبەرئەوەی لەوەپێش زۆرجار لەمەرگ نزیکببووەوە.

پزیشکەکە پیاوێکی ڕێکوپێك بوو، لەکۆتاییدا بەنەرمی پێیگوتم "دایکت کۆچی دوایی کرد، بەڵام هەمیشە لەگەڵتاندا دەبێت‌و کاتی وەها دەبێت هەست بەبوونی دەکەیت. من لەمە تێدەگەم. دە ساڵ لەمەوبەر دایکم کۆچی دوایی کردو هێشتا جاری واهەیە کاتێك ئۆتۆمبێل لێدەخوڕم یاخود شتێك دەکەم هەستدەکەم دەست دەدات لەدەستم. هەمیشە لەلاتان دەبێت".

بەیارمەتی ژنێکی مسوڵمان جەستەیم شۆرد. لەوکاتەی فرمێسکەکانم دەتکانە سەر ئەو کفنە سپییەی لەجەستەی دایکم پێچرابوو، تەنها هەستم بەخەم‌و پەژارە نەدەکرد بەڵکو هەستم بەتاوانێکی زۆریش دەکرد. لەوکاتەی ئەو

سورەتەی قورئانم دەخوێندەوە کە بۆی دەستنیشان کردبووم تەنها بیرم لەشتێك دەکردەوە کە داوای لێکردبووم، ئەویش بردنەوەی بوو بۆ نیشتمان تاکو لەوێ گیان بسپێرێت، بەڵام نەمتوانی. دەستخەڕۆم کرد.

داوای لێکردبووم لەتەنیشت نەنکمەوە بینێژین لە نەجەف، بەڵام زیاتر لەهەفتەیەکی پێچوو تاکو کاروباری یاسایی گەڕانەوەی تەرمەکەی بۆ عێراق بۆ رێکبخەم. لەبەر ئابلۆقەکان هێشتا گەشتی راستەوخۆ نەبوو، سەرەنجام دوای دوانزە کاژێر فرین بۆ ئوردون، دوانزە کاژێری تریش بەئۆتۆمبێل رێمانکرد بۆ بەغدا. ماوەی نۆ ساڵ بوو باوکم نەبینیبوو. زۆر پیر ببوو تەسبیحی بۆ ویردخوێندن بەدەستەوە گرتبوو هاوشێوەی زۆرێك لەو عێراقیانەی کە لەلایەن عەموەوە هاندەدران روبکەنە خوا بۆ ئارامبەخشی لەدەست دژواریی ئابلۆقەکان. ماوەی هەفتەیەك بوو نەوەستابووم لەبەر رێکخستنی ئیش‌و کاری پرسەکەو هێزم لێبڕابوو زۆر خەفەتبار بووم‌و دەمویست بچمە باوەشی باوکمەوە تاکو سەبوریم پێببەخشێت‌و پێمبڵێت ئیتر سەروکاری هەموو شتێك دەگرێتە ئەستۆ. لەبری ئەوە، باوکم خۆی کردە باوەشمەوەو هەنسکی دەداو هەر دەیگوت "زەینەب، دایکتم زۆر خۆشدەویست". چاوەڕێی ئەوەی لێدەکردم لە خزمەتیدابم‌و ژیانمان بکەمەوە سەر رەوتی ئاسایی خۆیی‌و منیش هەستمدەکرد کەسێکی گەورەم، دایکێکم نەك منداڵێك. دوای ئەو هەموو ئەهامەتییەی بەسەرمدا هاتبوو، ئەو کارە بەلامەوە رەوا نەبوو. باوکم بەدرێژای شەو خەوتبوو لەوکاتەی لەرێگا دوورو درێژەکانی بیابانەوە بەرەو بەغدا بەڕێوەبووین‌و لەو شەوە درێژەدا بوو کە دواماڵئاوایم لەدایکم کردو هەستمدەکرد گیانی هێواش هێواش بەجێمدەهێڵێت.

کاتێك بەرەو خانووەکەمان دەڕۆیشتین باوکم پرسی "دراوسێکانمان ئاناسیتەوە؟"

نەمدەناسینەوە، لەبەرئەوەی ماوەی نۆ ساڵ بوو وڵاتم بەجێهێشتبوو. لەو ماوەیەدا، ئەو دەساڵەیەی ئابلۆقە ئەوپەڕی کاریگەری خراپی بەسەر دانیشتوانەوە هەبوو. عێراقیەکان باجی زوڵم‌و زۆرداری سەدامیان دابوو. هەموو شتێك کۆن‌و پیرو رەنگ لێبڕاو بوو. شەقامەکان ماتەم دایگرتبوون. شەقامی گەڕەکە یەك دەروازەکەمان پڕ ببوو لەخزم‌و کەس‌و کار کە لەبەردەم ماڵماندا

بەرەشپۆشی چاوەڕێی منیان دەکرد. چاوم بۆ حەسەنی برا بچوکم دەگێڕا کە جێمهێشت تەمەنی ١١ ساڵ بوو، بەڵام کە باوەشم پێداکرد کوڕێکی بیست ساڵ بوو لەخەفەتدا ریشی هێشتبووەوە. خەڵکی لەدەورم کۆبوونەوە، دەمویست پوورزاو ئامۆزاکانم بناسمەوە، هەمویان ماچیان دەکردمو دەگریان. لەناوەڕاستی ئەوکاتەدا کەسێکی نەناسراو وەك سەرۆك هۆزەکەمان خۆی ناساند. بەپەشۆکاوییەوە بیرمکردەوە، کام هۆز؟ لەوکاتەدا خۆمان ئامادە کردبوو بەپەلە تەرمی دایکم بەرین بۆ نەجەف هەروەك ناشتنی زۆر دواکەوتبوو. لەئۆتۆمبێلەکەدا پوورە سەمەر لەگەڵمدا دانیشتو پێیگوتم کە قورئان بەسەر دایکمدا بخوێنم تاکو خوا لەدوا گەشتی دنیایدا رەحمی پێبکات.

بۆ چەندین سەدە بوو خانەوادە شیعەکان مردوەکانیان لەناوەڕاستی بیابانێکی لمینی زەردی بەرفراوانی باشوری عێراقدا دەناشتو ببووە یەکێك لەگەورەترین گۆڕستانەکان لەجیهاندا. لەبیرمە ئەو دەمەی بۆ پرسەی ئەنکم رۆیشتین رەنگە بۆ ماوەی پانزە خولەك بەناو مەزارگەی ترسناکی مردووەکاندا بەپێ گوزەرمان کردبێت کە پیاوی گەنج قورئانیان بەسەر مردووەکاندا دەخوێندو ژنانیش گوڵاویان بەسەر گۆڕی ئازیزەکانیاندا دەپرژاند هەتا دواجار گەیشتینە ئارامگاکانی خانەوادەی دایکم. گۆڕستانەکە پڕ ببوو لەقوربانیانی جەنگ، ئاستەم بوو رێبکەیتو خۆت نەدەیت لەکێلی گۆڕەکان. بەڵام بۆ دایکم راستەوخۆ بەئۆتۆمبێل چووینە ئارامگاکە. قەبارەی گۆڕستانەکە نیوەی ئەو کاتە بوو گەرچی بەدڵنیاییەوە لەماوەی ئەو نۆ ساڵەدا خەڵکی زیاتر لەو گۆڕستانەدا نێژرابوون. ئەی چی بەسەر گۆڕەکانی تردا هاتبوو؟ کاتێك منداڵ بووم، زۆر لەو شوێنە دەترسام، کتومت بەو چەشنەی منداڵان لەفیلمی خوێنمژەکانو هەستانەوەی مردووەکان دەترسان. لەکاتی ناشتنی دایکمدا هەستم بەترسێکی جیاواز دەکرد، تەنانەت وەك ئەوەی مردووەکانیش بترسێن قسە بکەن.

لەپوورە سەمەرم پرسی "ئێرە چی بەسەرهاتووە؟" تەماشایەکی ئەملاولای کرد، ئەو تەماشا پڕ ترسو پەشۆکاوییەی دەموچاوی لام ئاشنا بوو.

بەهێمنییەوە پێیگوتم "سەدام فەرمانیدا گۆڕستانەکە تەخت بکرێت وەك سزایەك دەرهەق بە شیعەکان لەبەرامبەر راپەڕینیان دژی ئەو لەساڵی ١٩٩١دا.

بەڵام کاتێك بلدۆزەرەکە هات، پاسەوانێك رایکردە سەرەوەو گوتی 'راوەستە، ئەو ئارامگایە هی هاوڕێکانی سەرۆکە'. ئا بەو شێوەیە مردووەکانمان رزگارییان بوو".

سەدام حسێن مردوەکانمانی بەخشیبوو، بەڵام ژیانمانی نەبەخشیبوو.

گەرمام بوو، شەکەت ببووم، هەستمدەکرد کەسێك دڵمی لەسنگم بەگوشراوی دەرهێنابوو کاتێك تەماشای تەرمی دایکم دەکرد شۆڕدەکرایەوە بۆ ناو لمە زەردەکە بەتەنیشت نەنکمەوە، ئەمە سەختترین شت بوو لەژیانمدا بینیبێتم. ژیانی دایکم بۆ هەتا هەتایە کۆتایی پێهات. لێم پرسی، دایکە، هەرگیز لەمردن نەدەترسایت، وابوو؟ دایکە، عەودالی پشوودان بویت؟ ئێستا ئەو پشووە دەدەیت؟ دایکە، ئێستا هەست بە ئارامی دەکەیت؟

لەماوەی سێ رۆژی پرسەکەدا ماڵەکەمان پڕبوو لەخەڵك. ژنانو پیاوان بەجیا کۆببونەوەو ماڵەکەمان لێوان لێو بوو لەژنی رەشپۆشو قورئانیان بۆ دایکم دەخوێندەوەو دەگریان. هەندێکیان وەك دیارییەك کەسانی شیوەنکەریان بەکرێگرتبوو کە پیشەیان خوێندنەوەی چیرۆکی ئایینیو لاواندنەوەی مردووەکەبوو، هەموو لایەکیان دەهێنایە گریان بۆ دەرکردنی خەمو پەژارەکانیان. هەموو کەلوپەلەکانمان لەبەشی سەرەکی خانووەکەدا لابردو پڕمانکرد لەدۆشەك تاکو شوێنی تەواو هەبێت بۆ میوانەکان، تەنها چەند کورسییەکمان بۆ کەسە گرنگەکانی وەك خوشکەکانی سەدام دانابوو کە دەهاتنو سەرەخۆشییان لێدەکردین.

هیچ کەس چاوەڕێی ئەوەی لێنەدەکردم بەرامبەر هیچ یەکێکیان بەرێزبم. پوورەکانم پێیان دەگوتم "شیرینەکەم، هەتاکو دەتوانیت بگری". منیش بۆ ماوەی ئەو سێ رۆژە گریام. هەموو ژنەکان زۆر غەمبارو هیوالێبڕاو دەردەکەوتن. لەبیرمە خوازیاربووم بزانم ئاخۆ بۆ دایکم دەگریان یان بۆ خۆیان. وەك ئەوە وابوو هەموو وڵات لەپرسەدا بێت لەبەرامبەر ئەو لەدەستدانەدا.

دابونەریتی خاوەن پرسە وەهایە لەئێوارەی رۆژی سێیەمدا ئێوارەخوانێك بۆ پرسەگێڕەکان ئامادە بکات. ئەو شەوە سەدەها ژن هاتنو زۆربەیان ئەو ژنانە بوون کە لەسەردەمی ژیانی قوتابخانەمو ئێوارە خوانەکانی دایکمەوە کە بۆی ئامادەدەکردن نەمبینیبوون. ئەوان ئێوارە خوانەکەیان بۆ رێکخستبوینو کاتێك

داواملێکرا فەرموی ژنەکان بکەم بۆ باخچەکە، بینیم پڕبوو لە گلۆپ و رووناکیو ئەو خواردنانەی دایکم حەزی لێیان بوو وەك بەرخی ئاخنراو، فەسەنجون، تورشەناو دۆلمە سازکرابوون. باخچەکە هێندە رازێنرابووەوە لەئاهەنگی هاوسەرگیری دەچوو. ئەوساتەی پێمخستە باخەکەوەو بینیم ژنەکان چییان کردبوو، گریانەکەم نەما. هەستم بەجوانی شەوانی عێراق دەکرد لەگەڵ شنەبایەکی بیابان کە لەدەموچاومی دەدا هاوشێوەی پشتی پەنجەکانی دایکم کە بەرومەتمیدا دەهێنا.

پوورە سەمەر ماچی کردم و گوتی "زەینەب، بێگومان گیانی دایکت لێرەیە. لەچواردەورماندایە. ئەمە شەوێکی پیرۆزە. هەستی پێدەکەم".

لەکاتی پرسەکەدا عەمو شوفێرێکی بۆ ماڵمان نارد. داوای باوکمی کرد، بەلام ئەو لەوێ نەبوو، لەبەرئەوە شۆفێرەکە پرسەو سەرەخۆشی عەموی پێراگەیاندم لەگەڵ زەرفێکدا کەبڕی ٥٠٠ دۆلاری تێدابوو بۆ خەرجی پرسەکە. گیانم رەق بوو، بەبێ بیرکردنەوە ترسە کۆنە بانگێشتنەکراوەکەم بۆ گەڕایەوەو هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهاتبوو. بەزەردەخەنە دەستکردەکەم بزەیەکم بۆ کردو سوپاسم کرد. دوای چەند رۆژێك بەبێ هەبوونی هیچ پلانێکی گەڕانەوە عێراقم بەجێهێشت.

لەسنوری ئوردون زۆر چاوەڕێم کرد. خەڵکی بەلێشاو دەیانویست وڵات جێبهێڵن، زۆر بەووردی خەڵکیان دەپشکنی. لەوێ بۆمدەرکەوت قەدەغەبوو هیچ پارچەیەکی هونەری یان زیاتر لە پەنجا دۆلارت پێبێت و عێراق بەجێبهێڵیت. هەموو ئەو شتە بەبەهایانەی پێمبوو دەستی بەسەردا گیرا، تەنانەت بەو نیگارە بچوکەشەوە کە دایکم کێشابووی. لەوێ، لەسنووری عێراق – ئوردون، دایکم دواخەلاتی ئالتونی بەخشی کە بریتی بوو لەقوتویەکی بچوکی پڕ زێڕو زیو، دایکم بە پوورمی سپاردبوو کە ئەگەر کۆچی دوایی کرد بیداتە دەست من. لەناویدا ملوانکەیەکی یاقوتی شینی تێدابوو لەلایەن سەدام حسێنەوە پێی بەخشرابوو.

# دواهەمین نامەی عالیە

بۆ روناکی چاوەکانم زەینەب،

ئەو رۆژەی تۆ لەدایکبووی خۆشترین رۆژی ژیانم بوو. تۆ جوانترین منداڵ بویتو هەموو چرکەیەکی ژیانم خۆشمدەویستیت. لەتەمەنی سێ ساڵیتەوە بووی بەهاوڕێم. ئێستاش زەینەبە خۆشەویستەکەم دەبینم خاوەن کەسایەتییەکی بەهێزو رەوشتێکی جوانو سەرکەوتنە لەکارە مرۆییەکانیدا. بریا زانیبات چەندە شانازیت پێوەدەکەم. هەموو خەونەکانی منت بۆخۆت بەدەستهێناوە. گەلێ سوپاسی خودا دەکەم تۆی هێنایە ژیانمەوە. خۆشحاڵم کە دەبینم دڵخۆشو سەرکەوتویت، هەمیشە لەخودا دەپاڕێمەوە لەهەموو خراپەکاریو ئازارو کاری خراپەی خەڵکی وەدورتخات. هەمیشە لەگەڵ ئەمجەد دڵخۆشو کامەرانو سەلامەت بیت.

ئەو دایکەی خۆشی دەوێیت.

#

# ماسی دووەم

تیانوسی یادەوەرییەکانی دایکم خستە ناو ئەو جانتا سپییەی لەفرۆکەخانە جەنجاڵەکاندا لەسەری دادەنیشتمو جانتاکەم هەڵگرت. ماوەیەکی زۆر داخو پەژارەم بۆ دایکم خواردو کاتەکانم لەگەڵ ئەمجەد بەسەربرد. دوای کۆچی دایکم بۆمدەرکەوت پێویستە منو ئەمجەد گرنگی بەخۆمان بدەین، بۆیە بۆ پشوودان گەشتمان کرد هەروەك دایکم بەڵێنی لێوەرگرتبووین ئیسراحەت بەخۆمان بدەین. دەستمکرد بە لەگوێگرتنی ڕێنوێنییەکانی، چوون لەودەمەوەی منداڵێکی بچوك بووم بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم: چێژ لەژیان بکەم، گۆرانی بچڕم، سەما بکەم، بژیمو جوانییەکانی دەوروبەرم ببینم. لەو ساتەوە، وەك (گیانێکی سەربەست) بیرم لەخۆدەکردەوە، هەرچۆن هەردەم خوازیاربوو بەو شێوەیە بم. شەوێکیان لەوکاتەی لەگەڵ ئەمجەد سەمامان دەکرد، پرسی "ئەم خانمە کێیە؟ پێشتر لەکوێ خۆت شاردبووەوە؟" وەك ئەوە بوو دایکم ئەو خەڵاتی گیانی گەنجێتیو دەمبەخەندەییەی بەخشیبێتە من کە چەندین ساڵ بوو لەناخیدا دەرگای لەسەر کلۆم دابوو. ساڵێك دوای مەرگی دایکم، بڕیارمدا کار بۆ بڕوانامەی ماستەر بکەم. ڕەنگە خەونی بەدەستهێنانی دکتۆرام بۆ نەچوبێتە سەر، بەڵام بڕوانامەی ماستەرم لە سکوڵی ئابووری لەندەن وەرگرتو لەوکاتەدا ئەمجەد ڕۆیشت بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین تاکو بەشداربێت لە دانوستانی ئاشتییانەی فەلەستین – ئیسرائیل. دوای ئەوەی ساڵێك لەدەرەوە ژیاینو کاتێك گەڕاینەوە بۆ واشنتۆن دی سی، ئیتر بیرم لەپاشەڕۆژ دەکردەوە نەك ڕابردوو.

(ڕێکخراوی ژنان لەپێناو ژنان) لەو ناوجەرگەیەی هەندێکجار بەلامەوە وەك پەتایەکی گەردونی توندوتیژیو ڕەشەکوژی وابوو زۆر بەخێرایی گەشەی کرد. هەموو ئەو شوێنانەی بۆیان دەچووم بۆ هەڵسەنگاندنی پێویستی هەبوونی خزمەتگوزارییەکانمان تیایاندا، وەك نایجیریاو ڕوانداو کۆماری دیموکراتی کۆنگۆو وڵاتە پڕ توندوتیژییەکانی تر کە ئۆفیسمان تێدا دانان، بەجۆرەها زمان گوێبیستی

ژنـان دەبـووم باسـیان لەهـەمان بەسـەرهاتەکانی توندوتیـژی سێکسـی دەکـرد. لەبەرئەوە، هەرکات سوپا درەندەکان پەلاماری شوێنێکیان بدایە، جا گرنگ نـەبوو بەخۆیان بگوتایە شۆڕشگێڕ یان سەرباز، لەپاڵ ناوچە ناکۆکی لەسـەرەکان ژنانیـان دەکردە قوربانی. ئەوە بابەتێکی سیاسی نەبوو، بەڵکو پیاوسالاری بوو. بەڵێ، هـەر لەسەرەتای ژیانەوە ئـەو کارە بـەردەوام لەڕوودانـدا بـووە، بـەڵام ئـەوەی منـی زۆر پەست دەکرد ئەوە بوو ئەم جۆرە توندوتیژی دژ بەژنانە هێشتا چاوەڕێی روودانی دەکـرا، تەنانـەت ئـەو سـەربازانەی نوێنەرایـەتی نەتـەوە یـەکگرتووەکانیان دەکـرد لاقەکردنیان ئەنجامدەدا، وەك ئەوەی مرۆڤ بڕیاری لەسەر خۆی دابێت لەچاوەڕێی ئـەو توندوتیژیانـەدا بێـت. لـەجیاتی ناسـاندنی توندوتیـژی دژی ژنـان وەك رەنگدانەوەیـەکی ئـەو کۆمەڵگایـەی دیاردەکـەی تێـدا روودەداو وەك ئامـاژەیـەکی سەرەتایی بۆ جینۆساید، جیهان لەئاست ئەو دیاردەیە بێدەنگ‌و بێباك بوو.

لە ١١ی سێپتێمبەری ساڵی ٢٠٠١ دا لەگـەڵ ئەمجـەد لـەمانگی هـەنگوینی بـووین لە ئیسپانیا گەرچی لەوادەی خۆشی ئێجگار دواکـەتبوو. ئـەو رۆژە بـوو کـە هێـرش کرایە سەر سەنتەری بازرگانی جیهانی لە نیویۆرك. بەهەزارەها رەوەندی ئەفغانی روویان کـردە سـنور تـاکو بچنە پاکسـانەوە لەترسی تۆڵەکردنـەوەی ئەمـەریکا لـە تاڵیبان بەرامبەر ئـەو رۆڵـەی هـەیبوو لـە پشـتیوانکردنی تیرۆرسـتەکان. لەوکاتـەی چاوپێکەوتنم هـەبوو لەگـەڵ کۆمـەڵێك ژنـی سـەرکردەی ئـەفغانی کـە لـەڕێکخراوە ناحکومییەکانـدا کاریـان بـۆ پەنابـەرەکان دەکـرد، پێمـان راگەیـەنرا تاڵیبـان روخێنراوە. لەمێژووی نوێـدا، تاڵیبـان یەکێکە لەستەمکارترین رژێـم دەرهـەق بـە ژنـان، لەبـەر ئـەوان بـەو هەواڵـە زۆر دڵخـۆش بـووم. وا بەخەیاڵمـدا هـات لەنوسـینەوەی دەسـتورێکی تـازەدا یارمـەتی دەربـن‌و جـارێکی تـر ئـازادبن بـۆ کارکردن‌و خوێندەوار کردنی کچەکانیان، هاوکات ئەو بورکا[١٧] فڕێبدەن کە وەك کفن وایەو تاڵیبان سەپاندبووی بەسەریاندا لەبەری بکەن.

پێمگـوتن "مەگـەر شـتێکی خـۆش نییـە؟ کـە ئێسـتا هـەموو شـتێك لەدەسـتی خۆتاندایەو تاڵیبان چیتر فەرمانڕەوایی ناکات!"

---

[١٧] بورکا، جۆرە پۆشاکێکە لەهەندێك وڵاتی ئیسلامیدا ژنان لەبەری دەکەن، کە سـەرتاپایان دادەپۆشێت بەدەموچاویشیانەوە.

بێگومـان بەڕووخانـدنی تالێبـان زۆر دڵخـۆش بـوون، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا گوماندارو دوودڵ بوون لەوەی کێ جێگەیان دەگرێتەوە. یەکێك لەژنەکان پێیگوتم "ئێمە مسوڵمانین‌و ئەمە گرنگترین بەشی ناسنامەکانمانە. نابێت هیچ کەس رق‌و کینەی ئێمە بەرامبەر تالێبان تێکەڵاو بکات لەگەڵ ئیسلامدا". ئـەو ژنانـەی ئـەو رۆژە چاوپێکەوتنم لەگەڵ کردن پێیانراگەیاندم کە دەیانەوێت شـەریعەتی ئیسلام ببێتە یاسا بۆ رێکخستنی کۆمەڵگاو هەر پلانیشیان وابوو خۆیان دابپۆشن بەڵام بە بورکا نا. لێیان تێگەشتم‌و رێزم بۆ ناسنامەی ئیسلامەتییان هەبوو، بـەڵام هەسـتم بـەبێ ئومێدبوونی خۆمکرد لێیان. مـن دەمویسـت بەیاسـاکانی عەلمانیـەت بگـەن، چـوون پێموابـوو یارمـەتی سەربەسـت بوونیـان دەدات. لـەجیاتی ئـەوە، بیریانهێنامەوە کە بورکای سیاسی خـۆم بـەوەی رۆژاوایـم هاوشـێوەی ئـەو جبانـەی ئەم ژنانە ناچارکرابوون لەبەری بکـەن کوێرانـەبوو. کـاری مـن یارمەتیـدانیان بـوو لەدەستکەوتنی نامانجەکانیان نەك سەپاندنی نامانجەکانی خۆم. من لەکولتورێکدا دەژیام تێیدا ژنان‌و پیاوان لەسەر تەلەفزیۆن باسیان لەلایەنە تایبەتەکانی ژیانیان دەکرد، لەبەرئەوە دەبوایە ئاگام لەخۆم بێت‌و نەبمە کەسێکی بێهەست بەرامبـەر خـەباتی ژنـانی ئـەفغانی‌و هـەموو ئـەو ژنانـەی لـەژێر شـێوازە جۆراوجۆرەکـانی زۆرداریدا تەواوی ژیانیان بەسـەربردبوو. بەلای ئەوانـەوە، هەنگاوی ئازادی دوای نـەمانی زۆرداری دەسـت پێناکـات، بـەڵکو گەشـتێکی سـەخت‌و دوورودرێـژی تاکـە کەسییە.

هەر گەشتێکم بۆ کامپێکی پەنابەران بەسـەرهاتێکی ناخۆشـتری بـەدواوە بـوو و هاوخـەمیمی قـوڵتر دەکـردەوە بـۆ ئـەو ژنانـەی دەمبینـین. بـۆ هـەر شـوێنێك بچوومایە دەمـدی پیاوان کرابوونـە پاڵـەوان بـۆ بەرگـەگرتنی ئەشـکەنجەو ئـازارو ژنـانیش پشـتگوێ خرابـوون‌و تەنانـەت دەسـتیان لێهـەڵگیرابوو بـۆ مانـەوەیان لـەو ژیانە سەختەی کە بەرەو بێدەنگییەکی مەترسیدار دەچوو لەسەر هـەردوو ئاستی کۆمەڵایـەتی‌و تاکـە کەسیشـدا. بـەبینینی هـەمان شـێوازی دووبارەکردنـەوەی چەوسـاندنەوەو توندوتیـژی لەجیهانـدا لێـوان لێـو ببـووم لـە تـوڕەیی‌و پەسـتی، لەبەرئەوە ئەو ژنانـەی دەمبینـین هانم دەدان بەئاشـکرا بێنـە قسـە لـەبارەی ئـەو توندوتیژییانـەی لـەژیانیان‌و کۆمەڵگاکانیانـدا چەشـتبوویان. بەپـەنهانی‌و لەسـەر

تەلەفزیۆن و لەکۆنفرانسە نێودەوڵەتییەکانـدا پـێم رادەگەیانـدن ئەگـەر ئێمـە نەبینە خاوەن دەنگی خۆمان هەرگیز گۆڕانکاری نایەتـە کایـەوەو هـەرگیز توانـای ئەوەمان نابێت فشار بخەینە سەر سەرکردە حکومیی و کۆمەڵایەتییـەکان تـاکو بـاس لەپێداویستییە تایبەتییەکانی ژنانی قوربانی جەنگ بکەن و راگرتنی توندوتیژی و بەدادگا گەیاندنی تاوانکارە لێپرسراوەکانیشمان بەوجود نایەت.

هەرگیز وەها داوایەکم لەژنان نەکردووە کە کارێك بکـەن بـەخۆم نـەکرابێت. دیـدارم لەگـەڵ سـەدەها ژنـی لاقـەکراو کردبـوو، بـەڵام بـەدەر لـە دایکـم و ئەمجـەد هەرگیز بۆ هیچ کەسێکم باسـنەکردبوو چی بەسـەر خۆمـدا هـاتبوو. هـەرگیز بـیرم لەبـەراوردکردنی ئـەو ئەزمونـە تاڵـەی خـۆم بـەو زەبـرە دەرونییـەی ئـەو ژنانـە نەدەکردەوە کە لەو وڵاتانەدا چاوم پێیـان کـەوتبوو، تەنانـەت لەلاقەکردنیشـدا مـن لەهەموویان بەختـەوەرتر بـووم. هـانی ژنـانم دەدا بـاس لـە نادادپـەروەری ژیانیـان بکـەن، کەچـی تەنانـەت لەماڵەکـەی خۆشمـدا زۆر دەترسـام نـاوی سـەدام حسـێن بهێنم. دەمزانی هەتاکو سەدام فەرمانڕەوای عێراق بێت بەهیچ شێوەیەك نـاتوانم باسـی بکـەم. ئـەو ترسـە هێنـدە لەژیانمـدا قوڵبـووەوە بەتـەواوی لەخوێنمـدا دەسوڕایەوە. هـەتاکو ئەوکاتـەش لەهـەر شـوێنێك بومایـە دووجـار تەلەفۆنەکـەم دادەخستەوە تاکو دڵنیابم کەس گوێمان لێناگرێت.

ئێستاشی لەسەربێت ئەو کارە هەر دەکەم.

بۆ ماوەیەکی زۆر پێموابوو لەڕێی کارەکەمەوە بەرەنگاری ترسەکانم دەبمەوە، بەڵام تەنها خوازیار بووم باس لەو نادادپەروەرییە بکەم کە پەیوەنـدی بەمنـەوە نەبوو. دەمویست باسی میلۆسۆڤیچ بکەم، بەڵام سەدام نا، باسی زۆرداری لە رواندا بکەم بەڵام لە عێراق نا، باس لە نەهامەتی ژنانی ئەفغانستان بکەم بـەڵام هـەرگیز باسی ژنانی عێراقی نەکەم. رەنگە بۆ ماوەی چەند سـاڵێك لەسـەر ئـەو رێچکەیە رۆیشـتبم، بـەڵام هێشـتا ولایەتـە یـەکگرتووەکان راینەگەیانـدبوو سـەدام حسـێن خاوەنی چەکی کۆکوژەو هەڕەشـەیەکی جیهانی لێکەوتۆتـەوە. لەودەمـەی جیهـان مشـتومڕی بـوو دەربـارەی پێشـنیازی ئەمـەریکا بـۆ داگیرکردنـی عێـراق، هەسـتی چڕوپڕو تێکـەڵاوم بـۆ دروسـت بـوو. ئەوپـەڕی ناواتـەخواز بـووم سـەدام دەسـەڵاتی نەمێنێت، بەڵام دەمزانی گەلی عێراق بەخانەوادەکەی خۆشمەوە سزاکەی دەچێژن.

لەکانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٢دا، کاتێک ڕوودانی جەنگ نزیک بوو، بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ عێراق. دەمویست بۆخۆم بزانم کە عێراقییەکانو ژنانی عێراقی بەتایبەت تێڕوانینیان چی بوو دەربارەی گریمانەکانی جەنگەکە. هەروەها دەمویست حەسەنی برا بچووکم لە عێراق دەرباز بکەم نەوەك لەحاڵەتی خۆئامادەکردن بۆ جەنگ بەسەرباز بگیرێت.

بەدەر لەڕۆشتنەوە بۆ پرسەکەی دایکم کە خەمو پەژارە چاوەکانمی لەبەرامبەر هەموو شتێکدا کوێر کردبوو، لەوکاتەوەی بۆ مێردکردن بە فەخری ڕۆشتبووم بۆ ئەمەریکا ماوەی سیانزە ساڵ بوو نەگەڕابوومەوە بۆ عێراق. لەگەڵ لە فڕۆکەخانەوە بەرەو ماڵەکەمان بەڕێکەوتم، وا هەستمدەکرد لەدوو ڕەهەندەوە بەژیانی خۆمدا بۆ ڕۆژانی رابردوو دەگەڕێمەوە؛ هەم وەك کەسێتیم هەم وەك عێراقییەکیش. چاوەکانی عەمو لە پۆستەرو پەیکەرەکانی ناو هەموو کوچەی شەقامەکان لەمنیان دەڕوانی. ئەو شەقامانەی منو دایکم بەئۆتۆمبێل هاتوچۆمان پێدادەکرد بەشێوەیەك بوون دەڵێی خۆیان رادەستی عەمو کردبێت. ئەوەی پێشتر قەدەغەبوو ڕێگەپێدراو بوو، ئەوەی پێشتر ڕێگەپێدراو بوو قەدەغە کرابوو. کحول قەدەغە بوو، لەشفرۆشەکان بەئاشکرا لەسێدارە دەدرانو سەریان لەپێشی دەرگای ماڵی دایكو باوکیان فڕێدەدرا. لەکوچەی شەقامەکاندا گوێبیستی خەڵکی دەبووم بە زمانی فارسی دەدوانو ئێرانییەکان ببوونە (دوژمنی خۆشەویستمان)و ئەمەریکاییەکانیش ئەو دوژمنانە بوون خەریکبوو هێرشیان دەکردینە سەر.

کاتێك بەرەو خانووە کۆنەکەمان ڕۆشتم، نامۆترین هەستم لادروست بوو. ئیحساسم بەسەرما دەکرد لەبەردەم دەروازەی چوونە ژوورەوەو ترسێکی زۆریشم هەبوو. لەناو خانووەکەدا هیچ شتێك نەگۆڕابوو. حەسەن کوڕێکی قۆزو خوێندکاری زانکۆ بوو، لەو وڵاتەی بەگشتی مناڵ لەگەڵ خانەوادەیان هەتاکو هاوسەرگیریش دەکەن دەمێننەوە، ئەو بەتەنها لەوێ دەژیا. بەرگی کەلوپەلەکان شڕودڕ ببوون. سەر مێزەکان پڕبوو لەوێنەو ئەو شتانەی بۆ جوانکاری دایکم دایبنابوون، هەر لەشوێنی خۆیاندا بوون. باوکم لەگەڵ ژنە تازەکەیدا لەخانوویەکی تردا دەژیا، بەڵام هەموو ڕۆژێك سەردانی حەسەنی دەکرد. بینینی ئەو دووانە کە هەوڵیاندەدا دەست بگرن بەهەندێك لەو کارانەی خانەوادەکەمان پابەندبوو

پێوەی ئازاربەخش بوو. لەیەکەم شەومدا لە عێراق حەسەن بەشەرمەوە داوای لێکردم لەگەڵیدا رابکشێم هەتاکو خەوی لێدەکەوێت بەوچەشنەی لەمنداڵیدا هەر من دەمخەواند. هەرکە لەتەنیشتیەوە راکشام، ئەو کوڕە گەورەیە خەوی لێکەوتو منیش هەر بەخەبەر بووم. هەستم بەترس دەکرد بەهۆی ئەو بەسەرهاتانەی ئەو خانووە بەخۆیەوە بینیبووی. بەبێ دایکم، هیچ شتێك لەوماڵەدا وەك خۆی نەبوو.

کاتێك باوکمم بینی چەند هەستێکی تێکەڵاوی بەنێش تەوژمیان بۆ هێنام. هەرچەند تەمەنی تەنها شەست ساڵ بوو، بەڵام لەوەدەچوو تەندروستی باش نەبێت و کەم لەو باوکەم دەچوو کە بەیانیان پێش ئەوەی برۆیشتمایە بۆ قوتابخانە گوڵێکی گاردینیای تازەی بۆ لێدەکرمەوە. ئەمو باوکمی دەرکردبوو، بەختەوەرانە وازیلێهێنابوو دوای ئەوەی بەبڕوای ئەو دایکم ناپاکی لەنیشتیمانەکەی کردبوو و بەرەوە ئوردون هەڵهاتبوو، هەروەها ئەو سنورداریێتییە نێودەوڵەتیانەی خرابووە سەر گەشتە ئاسمانییەکانی عێراق وای کردبوو (باوکم) کاپتنی پێشووی فرۆکەی ئێرلاینسی عێراقی ٧٤٧، زیادە بێت و چیدی پێویست نەبێت. بۆخۆی دەستی بەئیشێکی بچوك کردبوو داهاتێکی مامناوەندی دەستدەکەوت و لەمێژبوو وازی لەخواردنەوە هێنابوو. پێیگوتم "ئەم تەسبیحە زیاتر ئاسودەیم پێدەبەخشێت لەو ویسکیانەی دەمخواردنەوە". پوورە سەمەر، ئەو کەسە گورجوگۆڵە جوانەی پێشوو کە زۆر بەجوانی سەمای دەکرد، شەوو رۆژ لەماڵەوە نوێژی دەکردو لەسەر بەرماڵ بوو. وازی لەدنیا هێنابوو و پەنای بردبووە بەر تەسبیح و بەرماڵ. ئێجگار دەترسا لەوەی ناوی سەدام بهێنێت تەنانەت لەبەرچاوی منیشدا.

هەموو کەسێك لەچاوەڕوانی جەنگێکی تری چارەنوسسازدا بوو کە روودانی مسۆگەر بوو. داودی ئامۆزامم بینی چاوی پڕ فرمێسك و خەفەتبار بوو. گوتی "زەینەب، یەکەم قوربانی ئەم جەنگە کوڕەکەم بوو". خێزانەکەی بەئۆتۆمبێل لە عێراق بردبووە دەرەوەو لەڕوداوێکدا کوڕەکەی لە ئوردون لەدەستدابوو. داودو هاوسەرە کوردەکەی بڕیاریاندابوو بگەڕێنەوە بەغدا بۆ ناشتنی کوڕەکەیان و تا لەنزیك کەس و کاریان پێکەوە بژین و بمرن. هەمان ئەو وشەو باس وخواسانەم

بیرکەوتەوە کە لەجەنگی ئێراندا سەرباس بوون. بۆچی دەبوایە ئەو شتانە هەڵبژاردەی ئێمە بوونایە؟

گەمارۆ ئابوورییەکان دوا وزەو هیوای عێراقییەکانی بڕیبوو، هەڵبەت گەر رۆژێك لە ڕۆژان هەیانبووبێت. گوێبیستی هەر رستەیەك دەبووم ترسێکی سەیری تێدابوو. ئەگەر ناوی سەدام بهێنرایەو هەرکەسێك گوێی لێبوایە دەیگوت "گەورەمان! سەرکردەمان! سەرۆك سەدام حسێن! خوا بیپارێزێت!" واتە ئەو دەستەواژانەی راهاتبووم گوێبیستی بم، لەکاتێکدا ناوی کەسایەتییە ئایینیە مێژووییەکانی وەك محەمەدی پێغەمبەر یان عیساو موسا دەهێنرا. دیاربوو عەمو چووبووە قۆناغێکی تازەوەو بیروباوەڕی کۆنباوی عێراقیانەی دەربارەی چارەنووس وروژاندبوو، هەروەها بەرپرسیارێتی ئازارو ناڵینی گەلەکەی خستبووە ئەستۆی خواوە.

لە دڵشکاوی عێراقییەکان تێنەدەگەشتم. لەڕێی هاوڕێو خزمانەوە توانیم لەژێر سانسۆری حکومەت دەربچمو خێزانی کۆمەڵگە پەراوێزخراوەکان ببینمو بەتوێژەرێکی کۆمەڵایەتی ئاشنا بم. هەژاری زۆربەی ژیانی خەڵکی تاڵکردبوو، چونکە پەلەقاژەیان بوو لەژێر باری قورسی ئەو گەمارۆ ئابوورییانەدا کە بەناوی ئازادکردنیانەوە بەسەریاندا سەپێنرا بوو. بۆ یەکەمجار لەژیانمدا، ژنی خوێندەوارم بینی کچەکەی نەخوێندەوار بوو. پارە نەبوو بۆ کڕینی کتێب یاخود ئەو بەخششانەی مامۆستاکان داوایان دەکرد، لەبەرئەوەی موچەکانیان هێندە کەمبوو نەیاندەتوانی پێی بژین. پرسیارم لەکچێك کرد دەربارەی خەونەکانی دوارۆژی: لەوەڵامدا گوتی "خەونەکانی دوارۆژ شتەکانی رابردوون کە چیتر لەدەستماندا نەماون". بینیم پێڵاوی بن بەرزی دەساڵ لەوەوپێشی لەپێدابوو دیاربوو رۆژێك لەڕۆژان خەونی بەبوونە نمایشکاری جلوبەرگەوە بینیبوو. ژنێکی تر گوتی "بۆمبێکی تر جیاوازییەکی وەها ناهێنێتە کایەوە. رەنگە کۆتاییمان پێبهێنێتو لەم ژیانە رزگارمان بکات".

لەیەکێك لەو خانووانەی سەردانم کرد بیستو سێ ژنی لێبوو هەموویان رەشپۆش بوون. مێردیان یاخود کوڕیان لەجەنگەکانی پێشوودا تیاچوبوون. داپیرەیەك بەهۆی نەبوونی دەرمانەوە چاوەکانی لەدەستدابوو، هەموو خێزانەکە

لەژێر سایەی کرێکاریی کوڕێکی حەڤدەساڵیدا دەژیان. هیچ کەلوپەلێکی ناوماڵیان نەمابوو لەبەرئەوەی هەموویان فرۆشتبوو.

کاتێک ویستم بڕۆم، ژنێك كە لەتەمەنی خۆمدابوو كەوتە ئاخاوتن:

"تۆم لەبیرە. جلەکانتم لەبیرە. ئۆتۆمبیلەكەشتم لەبیرە. من تۆم لەبیرە".

راچڵەکیم. منی لەبیربوو؟ پێیگوتم لەقوتابخانەی ئامادەیی پێکەوە بووین، بەڵام من ئەوم لەیاد نەمابوو. سەرم داخستو هەستم بەشەرمەزاریو بێدەسەڵاتی دەکرد بەرامبەر بەو جیاوازییانەی لەژیانماندا هەبوو. کە رۆیشتم تاکو ماوەیەکی زۆریش ئەو جۆرە تەماشاکردنەیم هەر لەبەرچاو بوو. دەمزانی ئەو کەسەی لەبەردەمی وەستابوو ئەو جەوانە خواپێداوە بوو کە دەیزانی هاوڕێی سەدامە.

شەوی سەری ساڵی ٢٠٠٣ م لەگەڵ براکەمو هاوڕێکانی بەسەربرد، شەمپانیای قەدەغەکراویان لەژێر مێزەکەدا دانابوو دەیانخواردەوە. پێش ئەوەی لەگەڵ حەسەن بڕۆین بۆ ئوردون، لەگەڵ باوکم وێنە خێزانیەکانمان لەدیواری ژووری دانیشتنەکەدا لێکردەوەو ئەلبومەکانی خێزانەکەم کۆکردەوە تاکو نەفەوتێن ئەگەر ماڵەکە تالانکرا. باوکم خوازیاری زانینی ئیشەکەم بوو بۆ پەنابەرەکانو منیش پێمگوت ئەو بەڵگەنامەو وێنانە بێئەندازە گرنگن بەلای ئەو هەموو پەنابەرانەی چاوم پێیان کەوتبوو. ویستم پرسیاری رابردووی لێبکەم، بەڵام زانیم کە تازە سودی نەمابوو. لەباتی ئەوە، لەوکاتەی وێنەکانمان رێکدەخست هەروا ویستم قسەی لەگەڵدا بکەم.

"باوکە، دەترسیت؟"

بۆیداچوو...

"ئازیزەکەم، من ماندووم. ئەگەر تۆو براکەت سەلامەتو دڵخۆش بن، هیچی ترم لەم ژیانە ناوێت".

دوای ئەوەی لەو گەشتە گەڕامەوە، بەڵێنمدا جارێکی تر بۆ عێراقی سەدام حسێن نەگەڕێمەوە. بڕیارمدا چیتر بەغدا بەنیشتیمانی خۆم دانەنێم. چەمکی نیشتیمان بۆ ماوەیەکی زۆر سەری لێ تێکدابووم. نیشتیمانم لەکوێ بوو؟ لە عێراق کە لێی لەدایکبووم؟ لە ئەمەریکا کە لەگەڵ هاوسەرەکەمدا دەژیام؟

لەیەکێك لەو وڵاتانەی ئیشم تێدا کردبوو و خۆشەویستیشم بۆیان هەبوو؟ لەکاتی گەڕانەوەم بۆ واشنتۆن دی سی بۆ ماوەیەکی زۆر بیرم لەواتای نیشتیمان کردەوە. هەستمکرد هیچ کامیان نیشتیمانم نەبوون. ئاسمان لەهەر وڵاتێکی بمزانیایە زیاتر نیشتمانم بوو، چونکە لەبەر کارەکەم بەردەوام لە وڵاتێکەوە دەفڕیم بۆ یەکێکی تر.

لە مانگی ئازاری ساڵی ٢٠٠٣دا، تەماشای تەلەفزیۆنم دەکرد کاتێك جارێکی تر ولایەتە یەکگرتووەکان جەنگی دژی عێراق بەرپاکرد. ئەو جەنگەی لە تەلەفزیۆندا تەماشام دەکرد هیچ لەو شەڕانە نەدەچوو کە بەچاوی خۆم بینیبوومن. دەنگی موشەکی دژە فڕۆکەو بۆمبو گوللەو وردوخاشبونی پەنجەرە نەدەهات. هیچ شتێك نەبوو ئەوە بگەیەنێت چۆن تەواوی خانووەکەت دەلەرێتەوە کاتێك موشەکێك لەو نزیکانە دەتەقێتەوە. هەتا ئەمڕۆش، کاتێك گوێم لەزرمەیەکی پڕتاو دەبێت یەکسەر رادەچڵەکم و هەندێك جاریش چاوم پڕدەبێت لەفرمێسك. جەنگ شتێکی قێزەون و بێ بەزەیی و ئازاربەخشە، بەڵام لەکاتی پەلاماردانەکەدا لاشەی مردوو یاخود قاچی شینبووەوەی مردووی ناو تابوت لە هەواڵەکانی تەلەفزیۆنە ئەمەریکاییەکاندا پیشانی رۆژاواییەکان نەدەدرا. لەبیرمە کامێراکان روویان نەدەکردە ژنان و پیاوان تاکو دیدو بۆچوونەکانیان وەربگرن کە ترسیان لەهەر کەسێك هەبوو جلوبەرگی سەربازی لەبەربوایە، خۆشم هەر وابووم. دەنگی گریانی هیچ دایکێك نەدەهات رۆڵەکانی لەدەستدابێت و دەنگی خوێنەری راپۆرتەکە بگۆڕێت بەدەنگێك کە پێی ئاشنابووم. لەجیاتی ئەوە بە بەرنامەی گرافیکی کۆمپیوتەری، موشەکەکان بەسەر نەخشەی جوان و روونی بەغداوە دەڕۆیشتن کە باکگراوندەکەی ئاسمانێکی شینی روون بوو.

رقم لەهەموو جەنگێکە، لەبەرئەوەی هەموویان کاریگەریی خراپیان بۆ سەر ژیانی خەڵکی هەیە. هێشتا پێموایە ئەو رۆژەی زانیم سەدام حسێن لەدەسەڵات لابراوە خۆشترین رۆژی ژیانم بوو. پەرۆش بووم بگەڕێمەوەو یارمەتی هاووڵاتیانی عێراقی بدەم چوون بەدایکم گوتبوو رۆژێك دێت ئەو کارە بکەم. دەمویست یارمەتی بونیادنانەوەو دامەزراندنی ئۆفیسێك لە بەغدا بدەم تاکو ئەو شتانەی

لەمیانەی کارکردنم لەگەڵ ژنانی وڵاتەکانی تردا فێرببووم، ببەخشمە ژنانی عێراقی. کاتێک سێ هەفتە دوای ئەوەی جەنگەکە کۆتایی پێهات بەرەو عێراق بەڕێکەوتم، نەمدەزانی تا چەند ترسناک و خۆش دەبێت. دوای سێ هەفتە لە یەکەم هێرش بۆ سەر بەغدا گەڕامەوە. لەو گەشتە ئاسمانییەدا، لەهەشت سەرنشین زیاتری تێدا نەبوو، هەموویان کاریان بۆ ڕێکخراوە ناحکومییەکان دەکرد. کاتێک فڕۆکە بچووکەکەمان لەو فڕۆکەخانە نیشتەوە کە کاتی خۆی باوکم بەڕێوەی دەبرد، بەبینینی سەربازە ئەمەریکاییەکان و فڕۆکەکانیان لەسەر فرگەی وڵاتەکەمان کە بە فڕۆکە و تانکی سوتاوی عێراقی دەوردرابوون، هەستێکی قوڵی تێکەڵ و پێکەڵم بۆ دروستبوو.

لەهۆڵی کەسانی کاربەدەستدا گەرچی لەو جارەوە ئەو هۆڵەم نەبینیبوو کە چاوەڕێی فڕینم دەکرد بۆ ئەمەریکا تاکو هاوسەرگیری لەگەڵ فەخری بکەم، کاپتنێک کە خەریکی مامەڵەکان بوو پرسی "کێ لە ڕێکخراوی ژنان لەپێناو ژنانی نێودەوڵەتییە؟"

بە پەشۆکاوییەوە گوتم "من". بەدرێژایی ژیانم سڵم لە جلوبەرگی سەربازی دەکردەوە.

کاپتن چەیستین تەوقەی لەگەڵ کردم و گوتی "بەخێربێن بۆ عێراق! لێرە پێویستمان بە تۆو ڕێکخراوەکەشتە".

لەوکاتەی تەوقەی لەگەڵ کردم هیچ قسەم پێنەکرا. سەربازێک پشتیوانی لەکارەکانم دەکات؟ بۆم دەرکەوت لەبەرنامەی ئۆپرادا منی بینیبوو، بۆ ماوەی دوو ساڵ خۆی و ژنەکەشی یارمەتیدەری ڕێکخراوەکە بوون. پێیگوتم بەلای ئەوەوە پێویستبوو ئەمەریکا زیاتر سەرنج بخاتە سەر پشتیوانیکردنی ڕێکخراوەکانی هاوشێوەی ئەوەی ئێمە وەک لە گرتنەبەری لایەنی سەربازی بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی گەلی عێراق. ئەو چاوپێکەوتنە وەک ئاماژەیەک وابوو بۆ من کە ڕێگەی ڕاستم گرتبووە بەر. هەرکە لەو فڕۆکەخانە زەبەلاحە چۆڵ و هۆڵەدا بەڕێکەوتم بەرەو شار، دەروازەمان بەرەو خانووی مەزراکە تێپەڕاند. کەوتمە ڕوانینی ئاسۆی بەغدا، دارخورماکانی هەڵقرچابوون و شارەکە تاڵان کرابوو، هێشتا دوکەڵی لێوە بەرزدەبووەوە. سەرشێتانە هەست و هەڵچوونەکانم دەهاتن و

دەچوون. فرمێسك بەڕوومەتمدا دەچۆڕایە خوارەوە. شارەکەم ئازاد بوو، شارەکەم وێران بوو. موخابەرات نەمابوو. لەسەر شەقامەکان، منداڵی دەساڵانە رووی کلاشینکۆفیان دەکردە خەڵکی. هەرچەندە توندوتیژی لەژێر دەسەڵاتی سەدامدا بەشێوەیەکی ستوونی لەلایەن حکومەتەوە کۆنترۆڵکرابوو، بەڵام دوای ئەو بەشێوەیەکی ئاسۆیی بە گەڕەکەکاندا بڵاوببووەوە هەرکەسێك دەیتوانی بە دەمانچەیەك یاخود هەبوونی نیازی تاوانکاری یان تۆڵەسەندنەوە، دەستدرێژی سێکسیو دزیو راوڕووت بکات.

فرمێسك لە چاوی هەموو کەسێك بەرێچکە دادەباری. باوکم زۆر توندتر باوەشی پێداکردم وەك لە جاران. پێیگوتم لەکاتی بۆردومانەکاندا وابیری کردبووەوە جارێکی تر منداڵەکانی نابینێتەوە. باوکمو خزمەکانمان پەناگەیەکی قایمیان بۆخۆیان دروستکردبوو. لەوکاتەی پارچەی تەقینەوەکان کەوتبوو بەسەریاندا، باوکم جەڵدەی مێشك لێی دابوو. لەو دە کەسەی لەناویدا بوون، پێنجیان بریندار بوونو سێ رۆژی ویستبوو هەتاکو دەستیان بە پزیشکێك راگەشتبوو.

هێشتا سەدام حسێن خۆی حەشار دابوو، بەڵام لەژیانمدا بۆ یەکەمجار درزێك کەوتە ئەو دیواری ترسەی ئەو هەڵیچنیبوو. بەوپەڕی هێزەوە پاڵمدەنا بەو دیوارەوە، قسەم لەگەڵ ئەو ژنانە دەکرد کە لە مزگەوتەکانو بەندیخانەکان کۆببوونەوە بۆ سۆراخکردنی ئەوانەی دیار نەمابوونو منیش بەسەرهاتەکانیانم کۆدەکردەوەو هەرچییەکم پێ بکرایە ئەنجامم دەدا هەتاکو جارێکی تر نەهێڵم ژنان دەنگیان کپ بکرێت. چیرۆکی هەر ژنێك جیاواز بوو، هەریەکەیان جێی سەرنجو تێرامان بوون. کاتێك بۆ ماڵی خاڵە عادل رۆیشتم، دەستنوسێکم بەخانووی شیعەیەکی خاوەن کارگەیەکەوە بینی چەندین ساڵ لەوەوبەر دیپۆرتی ئێران کرابووەوەو تیایدا نووسرابوو "ئەم خانووە گەڕاوەتەوە بۆ خاوەنە راستەقینەکەی". چەند کاژێرێکم بە گوێگرتن لەو ژنەی کە لەوێ دەژیا بەسەربردو چیرۆکی بەزۆر ناردنەوەیو بەندکردنیم لای خۆم تۆمارکرد. کاتێك خۆیو خێزانەکەی دوای بەسەربردنی ٢٠ ساڵ لە تاراوگەی ئێران گەڕابوونەوە، خەرمانێك بەڵگەنامەیان دۆزیبووەوە لەگەڵ مێزێكو کەرەستەی کارەبایی لە

ژووری نووستنەکەدا. لەلایەن پۆلیسی نهێنییەوە خانووەکەیان بۆ ئەشکەنجەدان بەکارهێنرابوو. یەکێك لە قوربانییەکان وەسیەتێکی بەجێهێشتبوو، ئەشکەنجەدەرەکانی هەرگیزاو هەرگیز نەیانگەیاندبووە خێزانەکەی.

لەوکاتەی دەستمکرد بە هەڵسەنگاندنی ئەوەی چۆن پرۆگرامەکەمان لە بەغدا دابمەزرێنم، ئەو ئازارەی منداڵیم کە سەرکەوتوانە شاردبوومەوە سەریهەڵدایەوە. چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەو لێپرسراوە ئەمەریکاییانە دەکرد کە کۆشکە دێرینەکانی عەمویان بە تارمایی‌و بەلۆعە ئاڵتونییەکانیەوە داگیرکردبوو و من پێیان ئاشنابووم. کاتێك شۆفێرەکەم زانی نیشەکەم چییە بۆمدەرکەوت دەستگیرانەکەی لەلایەن عودەیەوە لاقەکرابوو. پاسەوانێکی تایبەتی یەکێك لە براکانی سەدام ئەوەی بۆ ئاشکراکردم لەکاتی خۆیدا کچانی لاوی لاقەکردبوو. ژنێکم بینی پێیگوتم عودەی گۆی مەمکی یەکێك لە هاوڕێکانی بڕیبوو، ژنێکی تر پێیگوتم برایەکی سەدام حسێن خوشکەکەی کوشتبوو لەبەرئەوەی هەڕەشەی ئەوەی لێکردبوو لاقەکردنەکەی ئاشکرا دەکات. پاسەوانێکی ئەمن باسی ئەوەی بۆ کردم چۆن ژنان وەك سزایەك لاقەدەکران‌و پزیشکێکی ژنی هاوڕێی دایکم ئاشکرای کرد توانیبووی لەسەرەخۆ چارەسەری ژنانی قوربانی لاقەکردن (بەرەچەڵەك ئێرانی) بکات کە لەگەڵ منداڵەکانیان خرابوونە بەندیخانەوە لەبری ئەوەی دیپۆرت بکرێنەوە. ئەبێت چەندە چیرۆکی هاوشێوەی ئەوانەی ئەو هەبوون؟ چەند ژن لاقە کرابوون؟ بەغدا هاوشێوەی بۆسنیا کامپی لاقەکراوانی نەبوو یاخود وەك رواندا‌و کۆنگۆ بەو رێژە زۆرە لاقەکردنی تێدا نەبوو. لێرە کارکردن بۆ من زۆر خراپترو قورستر بوو. دەمزانی لە وڵاتانی تر چۆن کار بکەم‌و بەباشیش ئەنجامی بدەم، بەڵام خۆم ئامادەنەکردبوو بۆ ئەوەی کارکردن لە وڵاتی خۆمداو لەگەڵ هاونیشتمانیەکانم‌و بە زمانی خۆم چی دەگەیەنێت‌و هاوبەشی ئازارێکیان بم کە خۆی لەخۆیدا بەشێك بوو لە ژیانی خۆم. بەنەمانی دەسەڵاتی عەمو کە هێشتا بێسەروشوێن بوو، من داخوازی یەکسانیم بۆ ژنانی عێراقی دەکرد. یەکسانیم بۆ ئەو ژنە قەرەجانە دەخواست کە عەمو بۆ خۆشی خۆی رایگرتبوون دوای ئەوەی مێردەکانیانی ناردبوو بۆ جەنگ، هەروەها بۆ ژنانی ئەو گوندانەش کە دەمزانی سەدام بەبیانوی یارمەتیدانیانەوە لاقەی کردبوون. دواجار

خوازیار بووم بزانم چی بەسەر ئەو تاکە ژنەدا هاتبوو کە دایکی خۆم بوو. هەوڵیدەدا چیم پێبڵێت لەو دەمەی دەیویست دوا هەناسەی هەڵمژێت؟

بڕیارمدا سەردانی هاوڕێکانی دایکم بکەمو لەگەڵ یەك بەیەکیان قسەبکەم بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕاستییەی لای دایکم بوو. خۆم ئامادەکرد بۆ باسکردنی ئەو خاڵە گرنگانەی لەمێشکمدا بوون. وامدانابوو بڵێم دەتوانن متمانەم پێبکەن هەروەك چۆن متمانەتان بە دایکم کرد. دایکم زۆر شتی پێگوتم، بەڵام دەزانن چەند نەخۆش بوو، لەکۆتاییدا تەنانەت نەیدەتوانی قسەش بکات. پێم بڵێن، چی بەسەر هاتبوو؟ من کچی ئەوم. ئێستا گەورەم. چیتان بەسەر هات؟ متمانەم پێبکەن، نەك تەنها لەبەرئەوەی کچی هاوڕێکەتانم بەڵکو لەبەرئەوەش کە من لە جیهاندا کار بۆ ژنانی قوربانی جەنگ دەکەمو لەو چەند ساڵەشدا بوومەتە گەواهیدەرێك لەهەمبەر ئەو بەسەرهاتە ترسناکانەی لەکاتی جەنگدا ژنان ڕووبەڕووی ببوونەوە.

لەپوورە نەحلەوە دەستمپێکرد، ئەو ژنەی لەبیرمە لە ئێوارەخوانەکەدا باسی ڕۆیشتن بۆ (ڕۆژی ڕاوێژکاری گەل)ی دەکرد لەگەڵ عەمودا.

کاتێك بینیمی هاواریکردو باوەشی پێداکردم "زەنووویە! ئەو نەما! ئاخ خۆزگە دایکت لێرە لەگەڵمدا بوایە بۆ گێڕانی شادی!"

فەرمووی لێکردم، هاوسەرەکەیو کچەکانیو کچەزاکانی لێم کۆبوونەوە. زۆر پێکەنینو قاوەی تورکیو کولیچەو پاقلاوەمان خوارد. سەردانێکی خۆشبوو. ماوەیەکی پێچوو تا توانیم بەتەنیا لەگەڵیدا بم.

گوتم "پوورە نەحلە، دەمەوێت پرسیاری چەند شتێکت لێبکەم دەربارەی دایکم".

"ئۆی، بەقوربان، منو دایکت نەهامەتیمان زۆر چەشت! خۆشحاڵم ئێستا دەتوانم ئەو شتانە لەیاد بکەم. زۆر بیری دایکت دەکەم. کاتێك سەدام فەرمانڕەوایی دەکرد، ڕۆژانێکی سەخت یەخەی گرتبووم بەجۆرێك ئاواتەخواز بووم بمرمو بچمە لای دایکت".

باسی هەموو چەشنێك لە تاوانانەکانی سەردەمی سەدام حسێنی بۆ کردم، بەڵام باسی ژنی نەکرد. بەهێواشی هانمدا تاکو ئەو کەلێنانەم بۆ پڕبکاتەوە کە لە

ژیانی دایکمدا هەبوو.

سینییەکی لەبەردەمم داناو گوتی "دەتوانین رۆژێکی تر دابنیشین‌و باسی رابردوو بکەین، بەلاّم با ئێستا هەندێك میوە بخۆین‌و کاتێکی خۆش بەسەردانەکەت بەسەربەرین!"

لەوکاتەی تەماشای مالّ‌و مندالاّنەکانی دەکرد لەدەوری کۆببوونەوە چاوەکانی تکایان لێدەکردم ئەو رابردووە نەهێنمەوە پێشەوە.

کاتێك سەردانی پوورە نەدام کرد، لوماش لەوێ بوو. سەرم سوڕما کاتێك بۆمدەرکەوت نکۆڵی لە ڕاستییەکان دەکەن.

پوورە ئەدا گوتی "زەینەب، تێناگەم بۆچی هەموو کەس ناهەنگ بۆ ئەمانی عەمو دەگێڕن. ئەو هەرگیز ئازاری ئێمەی نەدابوو".

لەناخمدا پرسیارم لەخۆمکرد، ئەی ئازاردانی خەلّکی تر؟ گرفت نییە خەلّکی ئازاریان چەشتبێت‌و هەموو دانیشتوان توشی نەهامەتی بووبن؟

لوما بەهەمان ئەو دەنگەی لەبیرم بوو هاتە قسە "ئەو هیچ شتێکی خراپی نەکردبوو! ئەوان تەنها سەرزەنشتی بۆردومانکردنی کوردەکانی لێدەکەن!"

لەگەلّ ئەواندا بوون، هاوشێوەی قسەو باسی ئاشپەزخانەکەمان بوو لە خانووی مەزراکەدا. کاتێك لەگەلّ هاوڕێ نزیکەکانی سەدام دانیشتبووم‌و سینییەك کوپی قاوە لەپێشماندا دانرابوو، هێشتا هەستم بەو ترسە کۆنە دەکرد. دوای ئەوەی گریمانەکانم هەلّسەنگاند تا شتێکی بەکەلّکم دەستبکەوێت، ئیتر زانیم قسەکردن لەگەلّیاندا بۆ ئەو مەبەستەی من دەمویست سوودی نییە.

پرسیم "سارا چۆنە؟"

لوما گوتی "ئۆی، ئەو خوشکە شێتەی من! لەوکاتەوەی چووەتە بەریتانیا نازانم چی بەسەرهاتووە!"

بۆ ماوەیەك قسەمان کردو پاشان رۆیشتم. بۆمدەرکەوت سارا بەخۆشەویستی هاوسەرگیری کردبوو. دواتر لەسەردانێکمدا بۆ بەریتانیا سەرێکم لێداو بەشەرمەوە لە حالّ‌و گوزەرانی یەکترمان پرسی. پاشان پێیگوتم دوای ئەوەی لەدەرەوەی ولاّت ژیابوو، ئنجا بۆی دەرکەوتبوو کە سەدام چۆن بووە. هێندە رقی لە دایك‌و باوکی هەستابوو بۆ چەند ساڵێك نەیدەزانی چۆن مامەلّەیان لەگەلّدا

بکات. ئاشتببوونەوە، بەڵام پێیگوتم هێشتا تێنەدەگەشت بۆچی ئەوەندە نکۆڵییان لەو کارە خراپانەی سەدام دەکرد. گوتی لەگەڵ هاوسەرەکەی‌و منداڵەکانیدا بەخۆشی دەژین، بەڵام نەیدەویست رابردوو هەڵبداتەوە. هەوڵی بینینەوەی یەکتریمان نەدایەوە. ئێمە بیرخەرەوەی یەکتربووین لەوەی ئەو دێوەزمەیە راستەقینە بوو.

هەموو ئەو (پوورانەی)* سەردانم کردن وەك دایکم مامەڵەیان لەگەڵ دەکردم، هەرچەندە جگەرەم نەدەکێشا، جگەرەیان بۆ دەهێنام‌و قاوەی تورکی بێ شەکریان بۆ دادەنام چونکە دایکم حەزی لێبوو، بەڵام بەو شێوەیەی قسەیان لەگەڵ دایکم دەکرد قسەیان لەگەڵ من نەدەکرد.

پوورە لەیلا پێیگوتم "زۆر لە دایکت دەچیت! زۆر بیری دەکەم!"

ئەو لە هەموو هاورێکانی دایکم زیاتر کراوەبوو. ئەوەم بیرکەوتەوە جارێکیان لەسەر قادرمەیەکی کارەبایی لەناو مۆڵێکی دەرەوەی وڵات پێکەوە بووین گوتی "با باسی عەمو بکەین!" بەڵام لەوکاتەدا عەمو وای لە دایکم کردبوو متمانەی بە هاورێکانی نەبێت‌و لەبیرمە دایکم رووی لێ وەرگێرا.

شتێکم لێپرسی کە هەردەم خولیای زانینی بووم. گوتم "پوورە لەیلا، دەزانیت پارە ئاسنینەکەی سەردەمی عەباسیی دایکم چی بەسەرهات؟"

ئەوە پرسیارێکی ئاسان بوو دەمویست لەو رێگەیەوە بابەتەکانی تر بهێنمە پێشەوە. پێیگوتم ئەو شەوە لەوێ بوو کە دایکم ئەو پارەی دابوو بە سەدام.

"دوای ئەوەی عەمو پاکێجەکەی کردەوە رۆیشت‌و بیری چووبوو. دایکت چوو بەدوایداو بیریخستەوە تا لەگەڵ خۆی بیبات".

گوتم "پوورە لەیلا، دەمەوێت دەربارەی چەند شتێك قسەت لەگەڵدا بکەم کە تۆو دایکم‌و ژنەکانی تر پێیدا گوزەرتان کردووە. دەتوانیت هاوکاریم بکەیت؟"

"بەقوربان، من دەمەوێت بەخۆشی بژیم". کۆڵم نەداو پێویستم بوو قسەم بۆ بکات.

ئاگاداری کردمەوە ئاگام لەخۆم بێت لەبەرامبەر رەغدو رانادا. باشە چییان

---

* لێرەدا مەبەستی نووسەر ئەوەیە ئەو ژنانە پووری راستەقینەی نەبوون، بەڵام لەبەر ئەوەی هاورێی نزیکی دایکی بوون پێی دەگوتن پوور. و.ك.

دەکرد ئەگەر بیانبیستایە باسی عەمومان کردووە؟ گوتی "هێشتا لێیان دەترسم. بۆ لەئێستادا ئەم شتانە بهێنینە پێشەوە زەینەب؟ هێشتا ئەوان لەم دەوروبەرەن. رەنگە دواتر بتوانین قسە بکەین".

لێم پرسی "چەندێك دواتر، پوورە لەیلا؟ کاتێك کچەکانی عەمو مردن یان کاتێك کچەزاو کورەزاکانی نەمان یاخود کاتێك تەواوی هۆزەکەی نەمان؟ تاکەی دەبێت رێ بەخۆمان بدەین هەر زیندانی ترسەکانمان بین؟"

کاتێك ماڵی پوورە لەیلام بەجێهێشت، بێئومێدو بێزار بووم. بەلامەوە وابوو ئەو پوورانەم راهاتبوون لەگەڵ ئەو ترسانەدا بەهەمان ئەو شێوەی خەڵکی لەگەڵ نیش‌و کاری ناخۆش‌و هاوسەرگیری خراپدا راهاتبوون. لەوە تێگەشتم کە قسەکردن لەسەر بابەتە تایبەتیە خێزانییەکان‌و بەتایبەتیش شتێك پەیوەندی بەکاری سێکسی ژنەوە هەبێت سەخت بوو، زانیم ئەو بابەتە قسەوباسی لێدەکەوێتەوە یاخود تەنانەت دەبێتە هۆی ئابڕووبردن. بەڵام هەتاکو گەورەبوونم وەها بیرم لە پوورەکانم دەکردەوە کە ژنانی سەربەخۆو ئازادن. دەمناسین. بەهەمان زمان دەدواین. زۆربەی ئەو ژنانە لە وڵاتەکانی تردا کارم بۆ دەکردن لەرووی کۆمەڵایەتی‌و ئابورییەوە پەراوێز خرابوون‌و کاتێك زیاتر بیرم لێکردەوە بۆمدەرکەوت بەشێك لە دوودڵبوونی پوورەکانم پەیوەندی بەچینی کۆمەڵایەتییانەوە هەبوو. ئەوان لە خەمی ناوبانگی خێزانەکەیان‌و رێزی کۆمەڵایەتی خۆیاندا بوون. رێزی کۆمەڵایەتی چیتر خەم‌و مەراقی ئەو ژنانە نەبوو کە هەموو شتێکیان لەدەستدابوو، بە هاوسەرو منداڵ‌و خێزان‌و ماڵ‌و هەندێك جاریش تەواوی دانیشتوانی ناوچەکەشیانەوە.

بەشێك لەناخمدا هەبوو دەیویست سەری رێزو نەوازش بۆ نەبەردی ژنێك دابنەوێنێت کە لەجیهاندا وێنەی ئەوم نەبینیبوو. بیرم لە نابیتۆ دەکردەوە، ژنێکی ئاوارەی خەڵکی گوندێکی بچووکی کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ بوو. لەو وڵاتەداو لە جەنگێکی بێ سەرەوتدا چوار ملیۆن کەس گیانیان لەدەستدابوو، هەروەها دەیان هەزار ژن لاقەکرابوون. تەنانەت لەنێوان ژنە نەبەردەکانیشدا، نابیتۆ شکۆمەندی تایبەتی هەبوو. نابیتۆ ژنێکی قژ سپی‌و دایکی دوانزە منداڵ بوو، درەندەترین لایەنی مرۆڤایەتی بە چاوەکانی خۆی بینیبوو. کۆمەڵێك پیاو

گەلەکۆمەکیان خستبووە سەری‌و لەوکاتەی لاقەیان کردبوو قاچو قۆڵ‌و سکیان بە چەقۆو کێردی گەورە بریندار کردبوو، هێندە بەخراپیش قۆڵیان شکاندبوو کە بۆ هەمیشە باسکی خوار ببوو. فەرمانیان بە کوڕێکی کردبوو لاقەی بکات، بەڵام کاتێك ڕەتیکردبووەوە بە فیشەك کوشتبوویان. لەهەمان کاتدا گوێی لە قیژەی کچەکانی بوو کە لەنزیك خۆیەوە لاقە دەکران. لەوکاتەی بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕامەوە لەناخمدا دەلەرزیم.

پرسیارم لێکرد "نابیتۆ، دەبێت من چی بکەم کاتێك گوێبیستی بەسەرهاتی وەك ئەوەی تۆ دەبم؟ ئەو زۆردارییەی تووشی تۆ هاتووە بەجیهانی رابگەیەنین کە ڕەنگە ببێتە مایەی راگرتنی ئەوەی بەسەر ژنانی تردا دێت، یاخود نهێنییەکانمان بۆ خۆمان بپارێزین، چی بکەین باشە؟"

نابیتۆ تەماشای نێو چاوی کردم‌و گوتی "ئەگەر بمتوانیایە بەجیهانم رادەگەیاند کە چیم بەسەرهاتووە تاکو ئەو کەسانەی وایان لێکردم بەسزای یاسایی خۆیان بگەن یاخود رێگە لە ئازاردانی ژنانی تر بگیرێت، بەڵام ناتوانم. تۆ برۆ بەسەرهاتەکەم بۆ هەموو دونیا بگێڕەوە، بەس بۆ دراوسێکانی باس مەکە".

لەوکاتەی چارەنوسی عێراق ناشکرابوو، بەردەوام لە گەشتکردندا بووم بۆ وڵاتانی تر. لە گەشتێکی ترم بۆ کۆنگۆ هەرچۆنێك بێت نابیتۆم دۆزییەوە. ئەو رۆژە کارێکم ئەنجامدا کە هەرگیز لەوەوپێش نەمکردبوو. سەرم خستە باوەشی ژنێکەوە کە دەمویست یارمەتی بدەم‌و دەستمکرد بەگریان. نابیتۆ وای لێکردم هێزو وزەی لێ وەربگرم بێ ئەوەی هەرگیز بپرسێت بۆ وادەکەم. هەرچۆنێك بێت یارمەتیدام تاکو ئەوە بزانم کە لە عێراق من دراوسێی بووم. هەر خەریك بووم بەزۆر (راستییەکە) لەو پوورانەم دەربهێنم، جا راستییەکە هەر شتێك بووبێت لەگەڵ ئەوەی پەیوەندیشی بە ئەوانەوە هەبوو نەك من. چەند نەزان بووم کە داوام لێدەکردن بەسەرهاتەکانیانم پێبڵێن تاکو ئاسودەبم‌و ئەوەی دەمویست بیزانم دەستم بکەوێت! من چ مافێکم هەبوو تاکو بەردەوام بپرسم بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارەی کە دایکم نەیدەتوانی پێمبڵێت کاتێك زیندوو بوو؟ هەروەها ئەم بیرو بۆچوونانەش بەرەو شتێکی تریان بردم: تەنها مافی یەك بەسەرهاتم هەبوو، ئەویش ئەو بەسەرهاتە بوو کە بەسەر خۆمدا هاتبوو. ئەوەی

لەگەڵ فەخریدا بەسەرمدا هاتبوو هیچ نەبوو بەبەراورد لەگەڵ بەسەرهاتی ئەو ژنانەی چاوم پێیان کەوتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەوێرا بۆ کەسی باس بکەم، بەشێکی لەبەرئەوە بوو هەستمدەکرد لاوازم دەکاتو منیش دەمویست وەك کەسێکی بەهێز ببینرێم. رەنگە لەبەرئەوەی ئەوان وایان گوتبوو، وەك ژنێکی نەبەرد لەخۆمم دەڕوانی کە ویستی وابوو راستییەکان بڵێت. بەڵام دەمزانی جیهان گەڕابووم بۆ باسکردنی خۆڕاگری ژنانی تر. ئاخۆ منیش بەهەمان شێوە لەگەڵ ترسەکەم راهاتبووم؟

ئێوارەیەکیان لەدەرەوەی ماڵی خاڵم دانیشتبوومو تەماشای ئاسمانی سەر دیجلەم دەکرد سوورهەڵدەگەڕا لەکاتی خۆرئاوابوونیشدا رەشەبایەکی خۆڵاوی هەڵیکرد. هەزارەها نەورەس بەناو هەورەکاندا دەهاتنو دەچوونو دەردەکەوتنو دیارنەدەمانو جارێکی تر دەردەکەوتنەوە. ئاخۆ ئازایەتی چی بوو؟ هاوکاری ژنانی ترم دەکرد قسەبکەنو چیرۆکەکانیان بۆ جیهان بگێڕنەوە تاکو خەڵکانی تر لەو نەهامەتیانە تێبگەن کە پێیدا تێپەڕیبوون، بەڵام تەنانەت بۆ جارێکیش ئاخی خۆمم هاوشێوەی ئەو ژنانە دەرنەبڕی کە کارم بۆ دەکردن. ئامۆژگاریم دەکردن بێدەنگییەکەیان بشکێنن، لەکاتێکدا خۆم لە شکاندنی بێدەنگییەکەم دەترسام. ئامۆژگاریم دەکردن دژی ترس بن، خۆم دەترسام. ئامۆژگاریم دەکردن دژی نادادپەروەری راپەڕن، لەکاتێکدا هەرگیز کارم نەکردبوو بۆ گەلەکەی خۆم دەرهەق بەو نادادپەروەرییەی لە وڵاتەکەماندا هەبوو.

ئازایەتی بریتی نەبوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی نادادپەروەری کەسانی تر، بەڵکو بریتیبوو لە هەڵماڵینی نهێنییە هەرە گرنگەکانمانو مەترسی ئازاردانی ئەوانەی خۆشماندەویستن. نەمدەویست وەك دایکم یان نەنکم بم کە بەبێدەنگی مردنو بەسەرهاتەکانی ژیانیان لەگەڵ مەرگیان برد. نەمدەویست وەك ئەو ژنانە بم کە بەبێدەنگی مردن، لەبەرئەوەی نەیاندەویست هەستی مێردەکانیان ئازاربدەن یان شەرەفی خێزانەکەیان لەکەدار بکەن. ئاخۆ ئەو ئازایەتییەم هەبوو کە ئەو وێنەیە بشێوێنم کە بەوپەڕی توانامەوە کارم کردبوو بۆخۆمی بنەخشێنم وەك ژنێکی بەهێزو سەربەخۆ کە داکۆکی لە مافەکانی ژنان دەکات؟ ئەو ئازایەتییەم هەبوو کە ئاشکرای بکەم منیش بێدەسەڵات بوومو لە

هاوسەرگیرییەکی ڕێکخراودا ژنێکی چەوساوە بووم؟ داخۆ ئەو بوێرییەم هەبوو ئەوەی لەدڵمدابوو بیڵێم، ئەگەر ببووایەتە هۆی ئەوەی دڵۆپە فرمێسکێك لەچاوی باوکم بهێنێت؟

بەردەوام بیرم بەلای هۆنراوەیەکدا دەچوو کە لەلایەن ڕۆمییەوە نووسرابوو کە شاعیرێکی سۆفیگەری سەدەکانی ناوەڕاست بوو، منو ئەمجەد هەمیشە ئەو هۆنراوەیەمان بۆ یەکتری دەگوتەوە. هۆنراوەکە دەربارەی سێ ماسی دەریاچەیەك بوو کە تەماشای ڕاوچییەکانیان دەکرد لەودەمەی بە تۆڕەکانیانەوە لێیان نزیك دەبوونەوە. یەکەمین ماسی، زیرەکترینیان بوو. کاتێك ڕاوچییەکانی بینی گوتی "من دەڕۆم"و بڕیاریدا ڕاوێژ بە ماسییەکانی تر نەکاتو گوتی "ئەوان تەنها لە بڕیارەکەم ساردم دەکەنەوە، لەبەرئەوەی ئەم شوێنەیان زۆر خۆشدەوێتو بەجێی ناهێڵن. ئێرەیان بەماڵی خۆیان داناوەو بەهۆی نەزانییانەوە لێرە دەمێننەوە". ماسییە زیرەکەکە دەستبەجێ بە گەشتێکی سەختی دوورودرێژدا بۆی دەرچوو و خۆی گەیاندە شوێنێکی سەلامەتی دەریاکە. ماسی دووەمیان نیمچە زیرەك بوو. گوتی "ڕێنیشاندەرەکەم نەما. دەبوایە لەگەڵیدا بڕۆیشتمایەو ئێستاش هەلی دەربازبوونم لەدەستچووە". لەبەرئەوە خۆی کرد بەمردوو سەرناو خستو سەرپشت گەڕا تاکو نەخورێت. ماسیگرێك بە کلك هەڵیگرتو تفێکی لێکردو فڕێیدایە سەر زەوییەکە. دواتر لەسەرخۆ بەرەو دەریاچەکە خۆی خلۆر کردەوەو ڕزگاری بوو. ماسی سێیەم، کە بێ ئەقڵەکەیان بوو، لەوکاتەی تۆڕەکە چواردەوری گرت کەوتە بازدان بۆ ئەوەی پیشانی بدات کە چەند زیتەڵەیە. کاتێکیش خرایە ناو تاوەکەوە، گوتی "ئەگەر لەمە ڕزگارم ببێت، جارێکی تر لەدەریاچەدا ناژیم. دەچمە ئۆقیانووسو ئەوێ دەکەمە ماڵی خۆم".

لەیەکەمجارەوە کە ئەو هۆنراوەیەم خوێندبووەوە، دایكو باوکم وەك "ماسی دووەم" بەخەیاڵدا دەهات. مەگەر منیش بەهەمان شێوە "ماسی دووەم" بووم؟

چارەنووس شێوازی خۆی هەیە بۆ مامەڵەکرن لەگەڵ هەر کەسێك. چارەنووس DVD یەکی ئاشکراکرد کە فیلمی بۆنەیەکی تێدابوو لەگەڵ کۆمەڵێك ڤیدیۆی تر لە کۆشکەکانی سەدامدا تاڵانکرابوو. یەکێك لەو شتانەی لە بەغدا بەلامەوە خۆشبوو بینینی خاڵۆزاو ئامۆزاکانمو منداڵەکانیان بوو. ڕۆژێکیان لە

ماڵی خاڵە عادل بووم، هاوسەرەکەی داود پێیگوتم "زەینەب، تۆمان لەیەکێك لەو DVD یانەدا بینی کە لەسەر شەقامەکان دەفرۆشرێن. منداڵە نۆ ساڵەکەم تۆی لەو دی ڤی دییەدا ناسییەوە.

"چی؟"

سی دییەکی دایە دەستم کە بەخراپی وێنەی عەموو کچەکانی لەسەر بەرگەکەی کۆپیکرابوو. لەناو دارو پەردوی یەکێك لە کۆشکەکانی عەمودا، کەسێك شریتێکی ڤیدیۆی ئاهەنگێکی ناو کۆشکی دۆزیبووەوەو کۆپی کردبوو وەك چیرۆکی بەسەربردنی ژیانی ناو کۆشك دەیفرۆشت. ئەو شەوە لە ماڵی خاڵە عادل هەتاکو هەموویان نەخەوتن تەماشای ڤیدیۆکەم نەکرد. لەنزیك تەلەفزیۆنەکە دانیشتم و ڤیدیۆکەم ئیشپێکرد. دیمەنەکانی ناو ڤیدیۆکە دەپچڕاو خێرای دەکردو دەپەڕی چونکە تاڵانچییەکان بێشومار کۆپییان لەبەرگرتبووەوە. ڤیدیۆکە بە ڕەش و سپی دەستیپێکردو پاشان ڕەنگاوڕەنگ بوو. ئەو ژنانەی پیشانددرا کە چەندین ساڵ بوو نەمبینیبوون و لەبەر مۆسیقای ئەو سەردەمەو بە جلوبەرگی ناوازەی پولەکەداری ساڵانی هەشتاکانەوە سەمایان دەکرد. کە بینیمن پێی تێکچووم و هەموو ڕق و کینە کۆنەکانم وەك خۆیان هاتنەوە یادم. ساجیدە لەوێ بوو، هێندە ماکیاجی کردبوو ڤێزەون دەردەکەوت لەگەڵ حەلەی کچە بچووکیدا بوو، کە پاسەوانەکەی وەك تۆپی دووگۆڵی یاری بە حەسەن دەکرد. ڕەغدو ڕانام بینی و دەمویست غیرەتی ئەوەم هەبێت بەزەیم پێیاندا بێتەوە لەکاتێکدا دەمزانی ڕۆژێك باوکیان مێردی هەردووکیانی کوشتبوو، بەڵام هێشتاش نەمتوانی.

کام ئاهەنگە بوو؟ نەمدەزانی. لە ژوورێکی گەورەی فەرشڕێژدا بوو لە شوێنێکی بەغدادا، ڕەنگە یەکێك لە کۆشکەکان بووبێت، لەگەڵ ئەوەشدا سەخت بوو بزانرێت کوێ بوو. بەدەر لە دەنگی گۆرانیبێژەکە ئەوەی گوێم لێبوو ژاوەژاوی ژنان بوو بە دەنگێکی کەمێك بەرز قسەیان بۆ یەکتری دەکرد هەروەك لەهەموو ئاهەنگێکدا هەروایە. هەندێکجار دەنگی ڤیدۆکە نەدەماو ژنەکان بەبێدەنگی سەمایان دەکردو دەست و قۆڵیان بەرزدەکردەوەو تێکەڵاو بەیەکتری دەبوون. پاشان لەناکاو خۆم هاتە بەرچاو، ڕووبەڕووی ئەو کچە بوومەوە کە خۆم لێدەشاردەوە، کچی فرۆکەوانەکە، کچێك لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا، نیوەی

تەمەنی ئێستام. قژم لولو درێژ بوو. عەزییەکی خۆڵەمێشیم لەبەردا بوو، لەسەر یەکێك لەو دەرزەنە قەنەفانە دانیشتبووم کە لە ئاهەنگەکەدا ریزکرابوون. دەبێت وێنەگرەکە سێپای کامێرەکەی لە ژوورەکەدا بەرامبەر من دانابێت، لەبەرئەوەی لەپشتەوە دەردەکەوتمو خۆشم هەمیشە دەمویست لەوێ دابنیشم. لەبەرخۆمەوە چەپڵەم لێدەداو لەگەڵ چەپڵەلێدانی ژنەکانی دەوروبەرم یەکینەدەگرتەوە. دواتر ئەو کچە (کە من بووم) بەشەرمەوە هەستایە سەرپێو زەرەخەنەیەکی درۆینەی کردو چووە ناو ریزی ئەو خەڵکەوە بۆ سەماکردن لەوکاتەی سرودێکی نیشتیمانی لێدەدرا.

هەموو ئەو نیگەرانییە کۆنانەی پەیوەندییان بەو ئاهەنگەوە هەبوو گەڕانەوە بۆم. هەموو ئەم شتانەم پشتگوێ خستبوو، هەڵبەت بەو شێوەیە نا کە ئەو ژنانە ژیانی پێشووی خۆیان وەلانابوو، بەڵام کەسێك ئەم رقە کۆنەی هێنایەوە پێشو جارێکی تر ژیانە دەستکردەکەمی وەك راستەقینەکەی خۆی لێکردەوە. لەوکاتەدا ئەوەم هەڵبژارد وەك سەرۆکی رێکخراوێکی نێودەوڵەتی ژنان لە عێراق بمێنمەوە نەك وەك منداڵێك کە رۆژانێك بوو بە (خۆشەویست) بانگدەکرا لەلایەن زۆردارێکەوە کە ئەو ئاژاوەو بێسەروبەرییەی نابووەوەو ئێمەش ژیانمان تێدا دەگوزەراند.

شەوێکم بە نەخەوتوویی لەهەمان ئەو ژوورەدا بەسەربرد کە جارێکیان تیایدا دایکمم لەباوەش گرتبوو، لەبەرئەوەی دەترسام لەدەستم بچێت دوای ئەوەی هەواڵی خۆکوشتنی دابوو. دەترسام، لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لە تۆقینەکەم دەترسام. نەمدەتوانی چیتر ژیانم بەو پارچە پارچەییە بەسەربەرم. نەمدەتوانی ئەو کەسێتییەی پێشووم فەرامۆش بکەم، نەشمدەویست ئەو کەسێتییە تازەم بکەم بە قوربانی. پێشتر ئەو کچەی ئەو کاتە بووم. ئێستاش ئەم ژنەم. هەردووکیانم.

ئەوکاتەی هەواڵی دەستگیرکردنی سەدامم بیست لە کۆنفرانسێکدا بووم لە ئوردون. لە تەلەفزیۆنەکەدا تەماشای عەموم کرد چۆن بەگاگۆڵکێ لەو شوێنە دەهاتە دەرەوە کە سەربازە ئەمەریکاییەکان پێیان دەگوت (کونە جاڵجاڵۆکە). لەو ژێرزەمینەدا ئێرکۆندشنی تێدا نەبوو. کەنتۆری شتومەکی لەقوتوکراوی تێدا

نەبوو یاخود سندوقە ویسکی لێنەبوو، تەنانەت پاسەوانێك یان دەستە سابونێکی لێنەبوو. لە خاکی تکریتو لەناو کونێکدا دەژیا کە خۆی هەڵیکەندبوو. هەرکە لەو کونەوە بە گاگۆڵکێکردن هاتە دەرەوە، بەشێوەیەك چڵکنو شێواو بوو هەرگیز بەبیرمدا نەهاتبوو رۆژێك بێت وەهای لێبێت. پێموایە ئەو پیاوەی پێمدەگوت عەمو لەگەڵ ئەو دیکتاتۆرەی پێمدەگوت سەدام حسێن دواجار بەلای منەوە یەکیان گرتو بوون بەیەك کەس. تووشی شۆك بووم کە بینیم فرمێسکی بەزەیی دەڕێژم. فرمێسکەکانم زیاتر بۆ خۆم بوون نەك بۆ ئەو، نەمدەویست چیتر لە ریسوابوونی کەسێکی تر ببینم ئەگەرچی دوژمنیشم بێت. لە کۆنفرانسەکەداو لەوکاتەی هەمووەمان تەماشای دەستگیرکردنیمان دەکرد، ژنێکی عێراقی رووی تێکردینو گوتی "ئەمە لە تۆڵەی باوکمە!" ئەو رۆژە زانیم کە باوکی هەمان ئەو رۆژە کوژرابوو کە باوکی بەسماشی تێدا کوژرا. پیاوێکی عێراقی گوتی "ئەمە لە تۆڵەی براکەمە". منیش لەبەرخۆمەوە گوتم "لە تۆڵەی دایکمە". چیتر پاساوم نەبوو تاکو بترسم. من حکومەت نەبووم، لەبەرئەوە نەمدەتوانی عەمو تاوانبار بکەم، بەڵام دەمتوانی راستییەکانی ژیانم باس بکەمو رێکیان بخەم.

دەمویست قسە لەگەڵ باوکم بکەم. هەوڵم بۆ دابوو، بەڵام وادەردەکەوت لەنێوان رابردوو ئەو کاتەدا گیرۆدە بووبێت، گیانێکی ونبوو بوو، بەدوای ئارامیدا وێڵ بوو، نێوارانی لەگەڵ ژنە تازەکەیدا بەسەردەبردو هەموو بەیانییەکیش چەند کاژێرێکی بە پیاسەکردن بەرەو گەڕەکە کۆنەکەمان یاخود نیشکردن لەباخەکەماندا بەڕێدەکرد.

لەماوەی ئەو ساڵانەی رۆیشتبووم، باوکم هێدی هێدی دارو پەرژینەکانی خانووەکەی بەشێوەی پەیکەری گەورەی باڵندە بڕیبوو. ئەو چیتر نەیدەتوانی بفڕێت، بەڵام لە گەڕەکی ئێرلایەنس کاتێك لە ناوەڕاستی باخچەی دواوەی خانووەکەمان رادەوەستا، چواردەوری بە باڵندەی گەڵاداری گەورە دەدرا کە رەگەکانیان لە خاکدا داکوتابوو باڵەکانیان کردبووەوە، وەك ئەوەی خەریك بێت بفڕن.

باوکە، بۆچی هاوشێوەی خەڵکانی تر بە فڕۆکەکەت نەتبردین بۆ شوێنێکی سەلامەت؟

دوای جیابوونەوە دژوارەکەی دایكو باوکمو وەك پیشاندانی دڵسۆزییەك بۆ دایکم، هەرگیز چاوم بە ژنە تازەکەی نەکەوتبوو، بەڵام ڕۆژێکیان بڕیارمدا لە خێزانەکەمدا بەشوێن ئاشتەواییەوە بم لەبەرئەوە بۆ یەکەمین جار بەرەو ماڵە تازەکەی باوکم بەڕێکەوتم بۆ بینینی خێزانەکەی. کاتێك باوکم بەخێرهاتنی لێکردم، بەچاوی پڕ فرمێسکەوە باوەشی پێداکردمو بەخێزانەکەی ناساندم. زڕدایکەکەم هێندە دڵفراوانبوو منو باوکمی بەتەنیا جێهێشت تاکو قسەو باسی خۆمان بکەین. پێکەوە لەباخچەکەدا دانیشتین، چامان دەخواردەوەو فستەقو بادەمی تازەمان دەخواردو بەنێرگەلەکەی باپیرم توتنی شیشەمان بەتامی نەعنا دەکێشا. ئێوارەیەکی قەشەنگ بوو. لای ئەو زۆر هەستم بەئارامی دەکردو دەمبینی بارگرژییەکەی سەر ڕوخساری ئەویش کاڵدەبووەوە. بە خۆبەکەمزانینەوە توانیم پرسیاری ڕابردووی لێبکەم.

گوتم "باوکە، دەمەوێت لەبارەی عەمووەوە قسەت لەگەڵ بکەم. دایکم زۆر شتی پێگوتم. دواجار هەرچی چۆنێك بێت لەگەڵ ئەو هەموو شتانەی لە ڕابردوودا ڕوویاندا خۆم گونجاند، هاوسەرگیرییەکەم، بەجێهێشتنم لە ئەمەریکا، هەموو ئەو شتانە".

گوتی "زەینەب، خۆت دەزانی من نەمویست تۆ بەجێبهێڵم".

"وابوو باوکە، دەزانم، هەمیشە جێ دەستت بەرز ڕادەگرم. بەڵام ئێستا لەم دەرفەتەدا دەمەوێت لە تۆوە پەیوەندی ئێمەو عەمو بزانم. لەئێستادا ئەو نەماوە. حەز دەکەم لەگەڵ تۆدا باسی ئەو شتانە بکەم کە لەوەوپێش هەرگیز نەماندەتوانی قسەی لەبارەوە بکەین. باوکە، لەهەموو شتێك زیاتریش دەمەوێت ئەمە بزانم: بۆچی تۆ لەم وڵاتە نەڕۆشتیت؟"

بیرێکی لێکردەوەو دڵنیا نەبووم وەڵامم دەداتەوە یان نا.

"دەزانی زەنوبە، من هەرگیز حەزم بەو پەیوەندییە نەدەکرد، دایکیشت حەزی پێنەدەکرد. ئێمە بەهیچ شێوەیەك حەزمان لە سیاسەتو سیاسەتمەداران نەبوو، هەردەم بە خۆمانمان دەگوت نابێت زۆر لێمان نزیك ببێتەوە. ئەوکاتەی دەستیگرت بەسەر ژیانماندا، ئیتر کاتی ئەوە نەمابوو لەدەستی ڕابکەینو بۆ خزمەکانیشمان زۆر مەترسیدار بوو لەدوای خۆمان بەجێیان بهێڵین".

بۆ یەکەمجار لەژیانیدا باوکم دانی بەوەدا نا کە لە عەمو دەترسا. وایلێکردم خوازیاربووم بزانم لە پیاسەکانی رۆژانەیدا بیری لەچی دەکردەوە.

"زەینەب، لەگەڵ ئەوەشدا عێراق نیشتمانمە. ئێرە وڵاتەکەمە. من سێ منداڵم هەبوو، بەرپرسی خوێندنو پەروەردەو سەلامەتیتان بووم. چۆن ژیانم بۆ دەستەبەر بکردنایە ئەگەر لەم وڵاتە بمبردنایەتە دەرەوە؟ زەینەب، ئەگەر برۆیشتینایە نەمدەتوانی ئەو ژیانەتان بۆ دابین بکەم کە دەتانگوزەراند. کاتێکیش دەرفەتێك هەڵبکەوتایە لەبەرامبەریدا دەبوو باجەکەشی بدەیت، منیش خوازیاری ئەو کارە نەبووم".

"هیچ دەرفەتێکت هەبوو وڵات بەجێبهێڵیت، بەڵام نەڕۆیشتبیت؟"

بەسەرهاتێکی بۆ گێڕامەوە کە چەند ساڵێك لەوەوبەر بیستبووم، بەڵام بەڕوونی بیرم نەمابوو هاوکات نەمدەزانی کتومت کەی بوو. چیرۆکەکە دەربارەی بەڕێوەبەرێکی کۆمپانیای فرۆکەی بۆیین بوو کە پەرۆشی ئەوەبوو فرۆکە بە سەدام حسێن بفرۆشێت. جارێکیان باوکم لە نۆفیسی بەڕێوەبەرەکە ببوو، ئەویش چەکێکی بانکی بەتاڵی ئیمزا کردبوو خستبوویە بەردەمی باوکمو پێی گوتبوو "بنووسە، ملیۆنێك؟ زیاتر؟ چەندت دەوێت بنووسە!"

باوکم گوتی "چەکەکەم خستەوە بەردەمی. وەرگرتنی ئەو پارەیە بەواتای لەدەستدانی هەموو شتێك دەهات کە خاوەنیان بووم وەك، خوڕەوشتم، ویژدانم، ڕێزی کەسایەتیم. زەینەب، نەمتوانی ئەو کارە بکەمو هەرگیز پەشیمانیش نەبووم. باجمان دا بۆ مانەوەمان لە عێراق، بەڵام لەوە باشتر بوو باجی لەدەستدانی ئەوە بدەم کە لەچاوی خۆمەوە کێ بووم".

هەمان ئەو پیاوە کەللەڕەقەم وەبیرهاتەوە کە نەیهێشت سەمیرە بێتە ماڵمان لەبەر هەڵسوکەوتو رەوشتی. بۆ یەکەمجار لەو چەند ساڵەدا سۆزو بەزەیم بۆ باوکم جوڵاو ڕێزێکی بێشومارم بۆی لەلا گەڵاڵەبوو. باجی بۆ سەرراستیو دەستپاکییەکەی دا، بەڵام هیچ نەبێت لەوە تێگەیشتم کە بۆچی دەبوایە ئەو باجە بدات. لەو حاڵەتەی ئەودا چی بەمانای نەبەردی دەهات؟ مەگەر ئەوە سازش نەبوو لە خوڕەوشتەکانی خۆی؟ وێڕای ئەو باجەی خانەوادەکەم دابووی، کاتێك قسەی کرد زیاتر پێم باشبوو کچی پیاوێك بم کە ئەو بڕیارەی سەرەوەی دابوو

وەك لە كچی پیاوێك كە بەرتیلی وەرگرتبێتو وڵاتەكەی فرۆشتبێت. كێ وتوویە ئازایەتی تەنها بەیەك جۆر پێناسە دەكرێت؟ ماسییە زیرەكەكە یەكەم ماسی بوو؟ كاتێك لەگەڵ باوكمدا دانیشتبووم لە خەیاڵی خۆمدا دەمگوت، ئای خوایە، كێ ئەو مافەی پێبەخشیوم دایكو باوكم دادگایی بكەم؟ هەریەكەمان دەبوایە رێچكەی خۆمان بدۆزیایەتەوە. ئەو كاتە من لەوە تێدەگەشتم، دەمخواست باوكیشم تێبگات.

گوتم "تۆ لە خۆشی كەسێك منت ناوناوە كە بە ئازایەتیو داكۆكیكردن لەسەر دادپەروەری ناسرابوو. منیش وەك هاوشێوەی ئەو كەسە لەخۆمم دەڕوانی تاكو باس دەهاتە سەر پرسی قسەكردنم بەئاشكرا لەبری خۆمو خانەوادەكەشم؟"

دەستمكرد بە باسكردنی شتە هەرە تایبەتیەكانی ژیانم بۆ باوكم. باسی فەخریم بۆ كردو قسەكانم دەهێناو دەبرد ئاخۆ باسی ئەوەشی بۆ بكەم چی بەسەرهێنابووم یان نا. پێمگوت كە هەستمدەكرد لە دوو ژیاندا ژیابوومو پێویست بوو باسیان لێوە بكەم. ئەمدەتوانی چیتر بێدەنگ بم. بڕوام بەوە نەبوو كە شەرەفی خێزان دەكەوێتە سەر شانی ژن لەكاتێكدا باجی ئەو شەرەفە بێدەنگ بونیانە لەو شتانەی خۆشیانو خێزانەكانیشیان ئازار دەدات. خەمی ئەوەم بوو كە ئەگەر بێمە دەنگ لەبارەی خەمو نیگەرانییەكانی خێزانەكەم، ئەوانە نا كە پەیوەندییان بەسێكسەوە هەبوو، وەها لە هەندێكیان بكات وادابنێن ئابڕووی كەسە خۆشەویستەكانم دەبەم. بەڵام ئەگەر ژن هەرگیز خاوەنی شتێك نەبووبێت، مەگەر ئەو شتە دەنگی نەبووە؟ ئەگەر من بۆ گێڕانەوەی چیرۆكی خۆم دەنگم هەڵبڕیایە، چۆن بمتوانیایە لە چیرۆكی كەسە خۆشەویستەكانمی جیابكەمەوە؟

بە باوكم گوت "تۆ بڕاردەكانی خۆتت ئەنجامدا تاكو لەبەرامبەر بەهاكانت سەرڕاست بیت. ئەمڕۆش سەرەی منە هەمان شت ئەنجام بدەم، بۆ ئەو كارەش پێویستم بەپشتیوانی تۆیە. پێویستە دەسەڵاتم بەسەر دەنگی خۆمدا هەبێتو ئەوەش بەشكاندنی ئەو بەڵێنەی خێزانەكەمان دەبێت كە نەدەبوایە دەربارەی پەیوەندییەكانمان لەگەڵ عەمودا قسە بكەین. باوكە، خێزانەكەمان هەمیشە بووەتە قوربانی نێوان دوو جیهان. خەڵكەكانی ناو كۆشك ئێمەیان بە كەسانی دەرەوەی كۆشك دانابوو، كەسانی دەرەوەی كۆشكیش ئێمەیان بەهاوڕێی سەدام

دانابوو. ئەگەر بەبێدەنگی بمێنینەوە، خەڵکی وەها بیردەکەنەوە کە بێدەنگیمان رازیبونمانە بە سەدام. ناتوانم چیتر بێدەنگ بم. ئەگەر خۆمان راستییەکان نەنوسینەوە، ئەوا مێژوو بۆمان دەنوسێتەوە".

دواجار گوتی "زەینەب، ئەوە بڕیاری خۆتە. تەنها دەمەوێت ئەوە بزانیت هەمیشە ویستومە باوکێکی باش بم بۆت".

لەوە زیاتر هیچ داوایەکی ترم لێی نەبوو. "دەزانم، باوکە. خۆشم دەوێیت".

کۆتاییمان پێهێناو باوەشمان بەیەکداکردو هەوڵماندا لە ڕێچکەو پلانی یەکتری‌و ئەو باجانەی بۆماندابوون تێبگەین.

کاتێك بچووك بووم، باوکم فێری ئەوەی کردم مەبەست لە فڕین چییە. دواتر، دایکم لە قەفەسەکە دەریهێنام. ڕێگەی فڕینم نەگرتە بەر ئەگەرچی بۆم ڕێکخرابوو، بەڵام هەردووکیان باڵیان پێبەخشیم.

نۆفیسی (ڕێکخراوی ژنان لەپێناو ژنانی نێودەوڵەتی)مان لە خانووەکەی باپیرمدا کردەوە. دایکم هەمیشە ئەوەی پێدەگوتم ئەو خانووەی ئەوی تێدا پەروەردە کرابوو ماڵی خێرخوازی بوو. دوای ئەوەی گەیشتمەوە بەغدا گەڕام بەشوێن ئەو خانووەدا. گەڕەکەکە نەداربوون‌و سڵیان لە کەسانی دەرەوەی خۆیان دەکردەوە. شەقامەکان پڕبوون لە خۆڵ‌و خاشاك‌و پاشەڕۆی زێراب، ئەوەش بەشێکی بەرنامە بۆداڕێژراوی سەدام بوو بۆ کەنارخستنی گەڕەکە زۆرینە شیعە نشینەکان لە بەغداو شوێنەکانی تریش. هەرکە بە شەقامی ئەو گەڕەکە کۆنەی دایکمدا سەرکەوتم‌و دەمویست خانووەکەی بدۆزمەوە، هەستمکرد لە پەنجەرەکانەوە تەماشا دەکرام.

پیاوێك بەتاسەوە لێی پرسیم "بەدوای چیدا دەگەڕێیت؟"

ناوی باپیرم بردو گوتم "من کچەزای حاجی محەمەدم. کچەزای ئەوم".

ڕووخساری بەتەواوەتی گۆڕا. باوەشی کردەوەو گوتی "بەدڵنیاییەوە".

یەکسەر چواردەورم بە منداڵ گیراو کۆمەڵێك ئەناس بۆ ناو خانووە کۆنەکەیان بردم. ماڵێکی ئاوارە لەوێ دەژیان‌و چاودێری خانووەکەیان بۆ دەکردین‌و چایان بۆ هێنام. لەهەموو شوێنێك کۆتر هێلانەی کردبوو، پەنجەرەکان شکابوون. بەڵام ماڵی منداڵیی دایکم نۆژەند کردەوەو کردمان بەشوێنێك تیایدا

ژنان کۆدەبوونەوەو شارەزای ئیشی تازە دەبوون و ئیشەکانیان ڕێکدەخست. دۆشەکمان لە ژوورەکان راخست و تیایدا ژنان باسیان لە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی خۆیان دەکرد لە کۆمەڵگاداو هاوبەشی خۆشی و ناخۆشی یەکترییان دەکرد. لەو ڕۆژەی بۆنەیەکمان سازکرد بۆ ئاهەنگگێڕانی سەرکەوتنێکی بچووك بەڵام گەورە، شتێکم بەتایبەتی لەبیرە: گەڕەکەکە کەمپینێکی ڕێکخستبوو تیایدا ژنان ئەو نەریتەیان نەهێشتبوو کە عەیب بوو ژنان شەقامەکان پاکبکەنەوە. سەدەها ژن بە عەبای رەشەوە گۆڕەپانەکەیان پڕکردبوو. نەمتوانی خۆم بگرم، فرمێسك بە چاوەکانمدا هاتە خوارەوە. ئەو چیرۆکانەم بیرهاتەوە کە دایکم بۆی گێڕابوومەوە دەربارەی عاشوراو بۆنەکانی تر کاتێك باپیرو نەنکم دەرگای ماڵەکەیان ئاوەڵا دەکرد. ئەو ڕۆژە هەمان ئەو مەنجەڵانەمان هێنایە دەرەوە کە وەختی خۆی باوانی دایکم بەکاریان هێنابوو، بەڵام لەبری فەسەنجون تورشەناو برنج، مەنجەڵەکان پڕکرابوون لە کەباب و پیتزاو قوتوە بیبسی.

گوتم "دایکە، من گەڕامەوە. خۆزگە لێرە لەگەڵمدا بویتایە". چوومە ژوورەکەیەوە لە قاتی سەرەوە کە کردبوومانە ئۆفیس و لەوێشەوە چوومە باڵکۆنەکە. بەسەر ڕووبارەکەدا دەمڕوانی شەپۆلەکانی دەهاتن و دەچوون و دوور لە سەدام هەناسەم دەدا. تەماشای سێبەری ئەورەسەکانم دەکرد کە بەسەر ئاوە لێڵەکەدا بە پەرشوبڵاوی دەفڕین و ئەوەم بیری خۆم خستەوە کە ئەو بژاردانەی لەبەردەستماندا بوون ئاسان نەبوون. عەمو فەرمانی بە ماسی کردبوو لە دەریاچەکەیدا مەلە بکەن. ئاوی دیجلەی لە ڕێڕەوەکەی لادابوو ئەو هۆڕە دێرینانەی وشککردبوو کە دەڕژانە دەریاکەوە. کەی کاتی بژاردەکردنی ئێمە دەهات؟ گوێم لە بانگ بوو لە مزگەوتێکی نزیك مەزارگەی لەمێژینەی (خزر)ی پێغەمبەر کە بە (ئیلیا)ش ناسراوە. بەسەر ڕووبارەکەدا ڕوانیم تاکو چاوم چووە سەر شوێنێك کە تیایدا کەشتیوانەکان جارێکی تر دەیانتوانی بەلەمەکانیان لەنگەرپێبگرن، هەر لەو ناوچەیەدا یەکێك لە دێرینترین زانکۆکانی جیهان هاتە پێش چاوم. دواتر، لە ئاسمانێکی ناخۆشی دوانیوەڕۆیاندا بینیم دوکەڵ بەرزدەبووەوە. چەند شار لەسەر زەویدا هێندە ئاواتەخوازی مانەوە بوون و لە هەوڵدانیاندا خۆیان وێران کردبوو؟ چەندە شار ئەوەندە کۆن بوون، بەڵام

هێشتاش بەشار نەببوون؟ بۆنی هەوای شێداری دیجلە گێڕامیـەوە بۆ یـادی منـاڵی. چاوە پڕ کلەکانی دایکمـم بیرکەوتـەوە لەوکاتـەی چەندین سـاڵ لەوەوبەر لەسـەر ئەم باڵکۆنییە وەستابوو. دایکە، شـتی زۆر خـراپ روودەدەن، بـەڵام عـەمو نـەماوە. لـەنێوان جیهـانی چـاکەکاریو جیهـانی خراپەکاریـدا خـاڵێکی پێکگەیشـتن هەیـە. دەزانم باخچەیەك هەیە کـە چیتر پێویسـت ناکات ژنـان تیایـدا بـەگوێی یەکتریـدا بچرپێنن. موحەمەد گوتی، وڵاتی راستەقینەی تۆ ئەو شـوێنەیە کـە بۆی دەچیت، نەك ئەوەی تێیدایت.

# دەربارەی کتێبەکە

(لەنێوان دوو جیهاندا) لەیادکردنی مەحاڵەو چیرۆکی راستەقینەی گەورەبوونی زەینەب سالبییە لەژێر دەسەڵاتی سەدام حسێندا لە عێراقو پەیوەندی خێزانەکەی لەگەڵ ئەو دیکتاتۆرەو ئەو سەرکوتکارییەی لە عێراق بینیویەتی لەگەڵ مامەڵەی خراپی رژێمەکە لەگەڵ ژناندا.

چیرۆکێکی کاریگەرو ئەوپەڕی ئازادی گەڕانی ژنێکە بۆ راستییەکانو بەرەنگاربوونەوەی زۆرداریو ململانێ بۆ دروستکردنی پێناسێکی تازە. (لەنێوان دوو جیهاندا) یەکەم باسو خواسی ناوخۆی عێراقی مۆدێرنە لەلایەن ژنێکی عێراقییەوە.

چیرۆکێکی تری دایكو کچە، بەڵام جیا لەوانی ترو گەڕانێکی سەرنجڕاکێشە بۆ راستییەکان، تێگەیشتنمان قوڵدەکاتەوە لە بابەتگەلێکی دەروەست بە جیهانی دەسەڵاتو ترسو ملکەچی رەگەزیو ئەو پرسیارەی ئەوەیەك لە ئەوەکەی پێش خۆی دەکات: چۆن رێگەتان دا ئەم بارودۆخەمان بەسەردا بێت؟

# دوا وتە

دوای ئەوەی لە پایزی ٢٠٠٢ دا بەئامادەبوونی کۆمەڵێك ژنی ڕۆژنامەنووس وتارێکم پێشکەشکرد دەربارەی گەشتی دژواری ژنانی پەنابەر، ژمارەیەکی زۆر لە ئامادەبوان بۆ پرسیارو سەرنجەکانیان هاتنە سەر ستەیجەکە. شێوەی یەکێك لەو ژنانەم دەکرد کە لەو شوێنەدا وەستابوو، بەڵام یادم نەمابوو لەکوێ بینیبووم تاکو خۆی وەك لۆری بێکلەند ڕۆژنامەنووس لە ڕۆژنامەی لۆس ئەنجەلوس ناساند. کاتێك دەستیکرد بەپرسیارکردن دەستبەجێ قسەکانم پێبڕی. "لە ڕۆژنامەی لۆس ئەنجەلوس تایمز چیرۆکێك دەربارەی من نووسراوە سەبارەت بە جەنگی یەکەمی کەنداو. ئەو ڕاپۆرتە لەلایەن کەسێکەوە نووسراوە بەناوی لۆری ...." هەنگاوێك گەڕایە دواوەو پرسی، "تۆ هەمان ئەو زەینەبە نیت، مەگەر ئەوێت؟" بڕوای نەدەکردو سەرسامی پێوەدیار بوو. موچڕك بەهەموو لەشمدا دەگەڕا لەوکاتەی وەڵامم دایەوە "بەڵێ، من ئەوم. ئێستا جیاواز دەردەکەوم. ئێستا ئیتر جیاوازم".

لە جەنگی یەکەمی کەنداودا، لۆری ڕومالی بارودۆخی عێراقییە ئەمەریکاییەکانی دەکرد، لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا چاوی بەمن کەوتبوو کە لەلایەن کۆمەڵگەی عێراقی – ئەمەریکاییەوە سازکرابوو لە لۆس ئەنجەلوس. لەو کۆنگرەیەدا تێبینی ژنێکی کردبوو لەپەنایەکدا بۆخۆی بەبەردەوامی دەگریا. چیرۆکێکی سەبارەت بەمن نوسیبوو کە چۆن لە ئەمەریکا گیرمخواردبوو، نەمدەزانی خێزانەکەم لە عێراق مابوون یان تیاچوبوون. ئەوە یەکێك بوو لەو ژمارە چیرۆکانەی لە لۆس ئەنجەلوس تایمز بڵاوکرابوونەوەو زنجیرەیەك چاوپێکەوتنی بەدوادا هات لەسەر تەلەفزیۆنە ئەمەریکایی‌و نێودەوڵەتییەکان دەربارەی ژیانی عێراق کە بەچاوەکانی خۆم بینیبوومن‌و دەربارەی ئەوەی کە چۆن عێراقییەکان خێزانێکی ئاسایی‌و ژیانێکی پرۆفێشناڵیان هەبوو، تەنانەت دەربارەی ئەو نامەیەی دایکم لەکاتی جەنگەکەدا بۆی ناردبووم‌و تیایدا باسی ئەو ئەهامەتییانەی کردبوو کە پێیدا تێپەڕیبوون بۆ ئەوەی بەسەلامەتی بمێننەوە.

لەکاتێکدا زۆرێك لە عێراقییە ئەمەریکاییەکان لەبەر دابونەریتی نەتەوەییان هەراسانکرابوون، بەڵام من بەسۆزترینو میهرەبانترین لایەنی ئەمەریکاییەکانم بینی، ئەویش بەزۆری لەڕێی رومالکردنەکانی لۆری رۆژنامەنووسەوە بوو. لەو مۆڵەی ئیشم تێدا دەکرد خەڵکی دەهاتنەلامو لێیان دەپرسیم پێویستیم بەچییەو باوەشیان پێدا دەکردمو نزایان بۆ سەلامەتی خانەوادەکەم دەکرد.

ئەو کاتەی بۆ جارێکی تر لەو کۆبوونەوەی رۆژنامەنووسانەدا لۆریم بینی، ولایەتە یەکگرتووەکان لەسەر لێواری جەنگێکی تر بوو لەگەڵ عێراقدا. دەمزانی هۆیەك هەبوو بۆ ئەو کۆبوونەوەیەو باوەشم پێداکردو ناو بەچاومدا دەهاتە خوارەوە لە بینینی ئەو ژنەی کاتی خۆی رومالکردنەکەی بەردەوامیو هیوای پێبەخشیبووم.

بەتێپەڕبوونی رۆژو مانگ جەنگێکی تر لەگەڵ عێراق هەڵگیرسا. ئەمجارەیان سەدام روخێنرا، منیش بڕیارمدا کتێبێك دەربارەی ژنان لە عێراق بنوسم، چونکە وا هەستمدەکرد شتێکی کەم دەربارەی ژنانی عێراق زانراوە. پەیوەندیم بە خاتوو لۆرییەوە کردو داواملێکرد کتێبەکەم لەگەڵدا بنوسێت. زۆر بیرم لە گرفتەکانی نووسینی کتێبەکە نەکردەوە، چونکە دوو ساڵ لەوەوپێش بۆ ئەو مەبەستە چاوم بە لۆری کەوتبوو.

ئەم کتێبە وەك یادەوەرییەك دەستی پێنەکرد. نەمدەویست یادەوەری بنوسم. بەخۆمم دەگوت، من کێم تاکو یادەوەری بنوسم؟ بێگومان هاوشێوەی زۆرینەی ئەو ژنە عێراقییانە مەینەتیم نەچەشتبوو. من لە خانەوادەیەکی خاوەن مافی تایبەتیدا لەدایکببووم، بەدەر لەوەش لە تەواوی وڵات دابڕابووم. دەمویست دەربارەی ئەوە بنوسم کە ژنانی عێراقی لەسایەی رژێمی سەدام حسێندا چ ئازارو نەهامەتییەکیان چەشتبوو. کاتێك داواملێکرا لە کتێبەکەدا زیاتر سەرنج بخەمە سەر بەسەرهاتەکانی خۆم، بەتوندی رەتمکردەوە. گریام، قیژاندم، کاتێك دەستمپێکرد دەمویست هەرچی شت هەیە بینوسم بەدەر لە بەسەرهاتەکانی خۆم. ترسم لەوە هەبوو کە چیرۆکەکەم جێی رەزامەندی نەبێت. نەمدەویست جارێکی تر ببمە کەسێکی تایبەتمەندو تێڕوانینەکانم بە جیهان بگەیەنم. چیرۆکی ژنەکانی ترم دەگێڕایەوەو لەکارەکەمدا تەنها خۆم وەك پەیامبەرێك دانابوو لە

(ڕێکخراوی ژنان لەپێناو ژنانی نێودەوڵەتی). نەمدەویست دەنگم بەسەر چیرۆکی ئەو ژنانەوە بێت تەنها لەبەرئەوەی دەستم بە ڕاگەیاندنە نێودەوڵەتییەکان دەگەشت‌و ئەوان ئەو توانایەیان نەبوو. دواجار خاڵێك هەبوو تیایدا هەستمدەکرد دەبوایە ببمە خاوەنی دەنگ‌و ڕاستی‌و بەسەرهاتەکانم. لەنێو نەهامەتی ژنانی تردا ژیابووم‌و لە ئازایەتی ئەوانەوە توانیم پەرژینی گوتنی ڕاستییەکان بشکێنم. پێدەچێت، ئیدی سەرەی من بێت ئەو بازە بدەم‌و بێمە گۆ. لەبەرئەوە، ئەوەتا لێرەم‌و لەڕێی گێڕانەوەیانەوە بوومەتە خاوەنی بەسەرهاتەکانم.

ئەو ئەزموونە هەستێکی خاکیبوونی بەمن بەخشی. نووسینی ئەم کتێبە بڕیاری خۆم بوو، بەبێ باسکردنی خێزانەکەم‌و هاوڕێکانیشم نەمدەتوانی بینووسم. بۆ پاراستنی ناسنامەو تایبەتێتی خێزانەکەم‌و هاوڕێکانم، ناوی خوازراوم بۆ داناون. یادەوەرییەکانی دایکمم لە کۆمەڵە نووسینێکەوە وەرگرتووە کە لەو چەند مانگەی نەخۆش بوو بۆی نوسیبووم‌و لە زمانی عەرەبییەوە وەرمگێڕانە سەر زمانی ئینگلیزی‌و هەندێك پێداچوونەوەم بۆ کردوون بەمەبەستی ڕێککردن‌و ڕوونکردنەوەیان.

بیرکەوتنەوەی یادەوەرییەکانی منداڵی‌و چرکەساتە بەئازارەکانی ژیان بەلای هەموو کەسێکەوە سەختە. یادەوەرییەك، دانەیەکی تری بەدوادا دێت‌و پاشان دانەیەکی تر. ئەوپەڕی هەوڵمداوە تاکو وەك خۆیان بیانگێڕمەوە. هەوڵمداوە کەمێك لە ئایین‌و کولتوری عێراقی بە خوێنەرانی ڕۆژاوا ئاشنا بکەم، بەڵام ئەمانە بە فلتەرێکی زۆر تایبەتدا تێدەپەڕن. دواهەمین شت کە دەیڵێم نوێنەرایەتیکردنی هەموو ژنانی عێراقە نەك هەموو ژنانی عەرەب یان هەموو عێراقییەکان. من تێکەڵێکم لە دابونەریتەکان‌و چەند سەردەمێك کە تیایاندا مافی تایبەتی ژیانم هەبووە.

زەریایەك فرمێسکم ڕشتووە لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەدا، بەڵام لەکۆتاییەکەیدا خۆشحاڵ بووم بەرامبەر ئەم ئەزموونە. گەشتمە تێگەشتنێکی باشترو ڕێزی زیاترم بۆ دایك‌و باوکم هەبوو. ئێستا تێگەشتن‌و پێزانینی زیاترم بۆ بەخت‌و تەنانەت بەدبەختیشم هەیە. هەروەها بۆ یەکەمجار لەژیانمدا دڵسۆزو بەئەمەك بووم بۆ خۆم‌و ئەو ژنانەی ئیشم لەگەڵ کردن.

بەبێ خۆشەویستیو پشتیوانی زۆرێك لەو كەسانەی لە چواردەورم بوون نەمدەتوانی ئەم كارە بەئەنجام بگەیەنم. سوپاسو پێزانینی بێ پایانم هەیە بۆ لۆری بۆ یارمەتیدانی لە ئەنجامدانی ئەم كارەداو هاندانم تاكو زیاترو زیاتر بەرەو رابردووم بگەڕێمەوەو بچمەوە نێو ئازارەكانم لەكاتی گەڕانم بەشوێن وەڵامەكاندا، هەروەها ئارامگریو میهرەبانییەكەی لەم كارەدا بەرز دەنرخێنم. سوپاسی تایبەت بۆ كارمەندمان ساندی دجكستراو لیز بیانكۆی هاوڕێمان بۆ یارمەتیو ئارامگریو متمانەیان بەم كتێبەو ئەو تێبینیو پشتیوانیانەی پێشكەشی منو لۆرییان كرد. سوپاسی بێشومارم بۆ كارمەندانو ئەندامانی بۆردی رێكخراوی ژنان لەپێناو ژنانی نێودەوڵەتی هەیە لەهەمبەر ئەو تێگەیشتنو پشتیوانیكردنەیان لە پرۆسەی نووسینی ئەم كتێبەدا پێویستم پێیبوو.

بەتایبەتی زۆر سوپاسی ئەو هاوڕێیانە دەكەم (بەهاوسەرەكەشمەوە) كە بەشێك لەو چیرۆكانەی لەم كتێبەدا گێڕدراونەتەوە یەكەمجار بۆ ئەوانە. ئەم پرۆسەیە بەگروپێك كەسانی نەناس دەستیپێكرد كە لە دەشتو كێوەكانی كەنەدا بینیمن لەماوەی خولێكی چڕوپڕی سەركردایەتیكردندا كە لەلایەن دەیڤد باوم-ی هاوڕێمەوە دەگوترایەوە. لەوانەوە فێربووم لەژیاندا چەند شوێنێك هەیە پێویستە خۆمانی تێدا دەرباز بكەین. لەو خولەدا بوو كە بۆ یەكەمجار گوێبیستی ئەو هۆنراوەیە بووم لەسەدەی سیانزەدا لەلایەن رۆمی شاعیری سۆفییەوە نووسراوەو سروشی دانانی ناونیشانی ئەم كتێبەی لێهەڵگۆزراوە: (لەپشت بیرۆكەكانی چاكەو خراپەوە جیهانێك هەیە، لەوێ دەتبینم).

هەروەها زۆر سوپاسگوزاری هاوڕێ نزیكەكانم هودا، رێنی، نیراج، ئەمێرجت، نەرەیان، فەیسو فەرەح دەكەم بۆ ئەو كاردانەوەو باوەشە گەرمانەی پێیان بەخشیم. هاوكارییانكردم حاڵیبم كە رابردووم ئێستام ناسڕێتەوەو سەدامیش لەناوم نابات كاتێ بەسەرهاتەكانم دەگێڕمەوە. سوپاسی زۆر تایبەتم بۆ هاوڕێی زێدە ئازیز عیماد فرەیتخ كە لە نووسینی ئەم كتێبەدا زۆر یارمەتیدام، بەچەندین جار خوێندنەوەی دەستنوسەكانو پێدانی تێبینیو سەرنجەكانیو یارمەتیدانم لەچەند توێژینەوەیەكداو هەروەها كاركردنی وەك هاوڕێیەكی دڵسۆز لەم پرۆسەیدا. سوپاسی دەكەم.

سـوپاس‌و خۆشەویسـتی تایبـەتم هەیـە بـۆ بـاوکم‌و براکـانم لەبەرامبـەر تێگەیشـتنیان لـە پێویسـتی نووسـینی ئـەم کتێبـەدا. گـەڵ زۆرم خـۆش دەوێـن. سوپاسـی بێکۆتـام هەیـە بـۆ هاوسـەری خۆشەویسـتم ئەمجـەد عەتـەڵا کـە خۆشەویسـتی‌و بـەهاناوەهاتنی پشـتیوان‌و هاوکـارم بـوون بـۆ بوونـە ئـەو کەسـەی ئەمڕۆ هەم. زۆر سوپاسی دەکەم بۆ ئـارامگری‌و پشـتیوانی‌و ئـەو متمانەیـەی پێـی بەخشـیم لەگـەڵ لەبەرچـاوگرتنی ویسـت‌و ئـارەزووم لـە پرۆسـەی نووسـینی ئـەم کتێبەدا. سوپاست دەکەم نازیزەکەم بۆ ئەو جوانییەی بەژیانی منت بەخشی.

ئـــەم كتێبـــە وەك یادەوەرییـــەك دەســـتی پێنـــەكرد. نەمدەویست یادەوەری بنوسـم. بـەخۆمم دەگوت، من كێم تاكو یادەوەری بنوسم؟ بێگومـان هاوشێوەی زۆرینـەی ئـەو ژنـــە عێراقییانـــە مەینـــەتیم نەچەشـــتبوو. مـــن لـــە خانەوادەیەكی خاوەن مافی تایبەتیدا لەدایكببووم، بـەدەر لـەوەش لـە تـەواوی وڵات دابڕابـووم. دەمویسـت دەربـارەی ئـەوە بنوسـم كـە ژنـانی عێراقـی لەسـایەی رژێمـی سـەدام حســێندا چ ئـــازارو نەهامەتییـــەكیان چەشـــتبوو. كاتێـــك داواملێكـــرا لـــە كتێبەكـــەدا زیـــاتر ســـەرنج بخەمـــە ســـەر بەســـەرهاتەكانی خـــۆم، بەتونـــدی رەتمكـــردەوە. گریـــام، قیژاندم، كاتێك دەستمپێكرد دەمویسـت هەرچی شت هەیـە بینوسم بەدەر لە بەسەرهاتەكانی خۆم. ترسـم لـەوە هـەبوو كـە چـیرۆكەكەم جێـی رەزامەنـدی نـەبێت. نەمدەویسـت جارێكی تـر ببمـە كەسێكی تایبەتمەندو تێڕوانینـەكانم بـە جیهان بگەیەنم.

